PDF 4 KURD

# تەنگژەی کەرکووک

## سیاسەتی ئیتنیکی لە کێشمەکێش و چارەسەرە تەوافوقییەکاندا

PDF 4 KURD

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- تەنگژەی کەرکووك
- نووسینی: لیام ئاندرسن
- وەرگێڕانی بۆ عەرەبی: عەبدول ئیلاھ ئەلنعێمی
- وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئومێد عوسمان
- نەخشەسازی ناوەوە: وەرگێڕ
- بەرگ: ڕێمان
- نرخ: ٥٠٠٠ دینار
- چاپی یەکەم: خانەی موکریانی ٢٠١٣
- تیراژ: ٧٥٠
- چاپخانە: موکریانی (هەولێر)
- لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٥٩٨)ی ساڵی ( ٢٠١٣)ی پێ دراوە

زنجیرەی کتێب ( ٧٧٤)

**هەموو مافێکی بۆ خانەی موکریانی پارێزراوە**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

PDF 4 KURD

## دەروازە

بەم سالاّنەی دوایی، عێراق کۆمەڵێك مێژووی گرنگی بەخۆوە بینی. لەدوای داگیرکردنی عێراق لەساڵی (٢٠٠٣) کە رووخاندنی رژێمی بەعسیش دەرئەنجامی ئەو داگیرکارییەبوو، رووداوەکانی ئەم ولاّتە بوونە جێگەی سەرنجی ماس میدیاکانی جیهان، بەجۆرێك کە رۆژێك نەبووە بەبێ رووداوێکی گەورە یان کارەساتێکی خوێناوی گوزەر بکات.

بەلاّم لە تەموزی ساڵی(٢٠٠٨) دا بەبەراورد بە مانگەکانی پێشووتر مانگێکی ئارامتربوو. بەدڵنیایشەوە مشتومڕە سیاسییەکانی نێوان فراکسیۆنە سیاسیە جۆر بەجۆرەکانیش لەبەغداد لەبارێکی دژواردابوو، هەروەها رەوشی ئەمنیش سەرباری ئەو پێشکەوتنەی بەبەراورد بە سالاّنی پێشووتر بەخۆوە بینیویەتی هێشتا مایەی نیگەرانییە و لەهەمان کاتیشدا پرسگەلە ناکۆکەکانیش بەبێ چارەسەر ماونەتەوە، هەرچی ئەو رێوشوێنانەشە، کە حکومەت دەیانگرێتە بەر هێندەی لەدروستکردنی نەیاراندا بەردەوامە هێندەنەیتوانیوە پشتیوانی بەدەست بهێنێت.

لەو رێو شوێنانەش، پرۆسەی ئەمنی بەردەوام لەدژی لایەنە سوننی و شیعە شەڕانگێزەکان (بەدیاریکراوی ئەو خێڵە سوننیانەی کە توانای بەرەنگاریبوونەوەی حکومەتیان هەیە، لەگەڵ میلشیای سوپای مەهدی بەسەرۆکایەتی موقتەدا ئەلسەدر) و هەروەها وتووێژە هەستیارەکانیش لەگەڵ حکومەتی ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ گەیشتن بە رێککەتننامەی رێکخستنەوەی باری هێزەکانی ئەمریکا (سۆفا SOFA) و رێککەوتننامەیەکی ستراتیژی فراوانتر.

دیسان ململانێی سیاسی تاڵی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی نەوت لە حکومەتی عێراقی لە راڤە کردنی ماددە دەستووریەکانی تایبەت بە ئیدارەکردنی یەدەگە نەوتییەکانی عێراق بووەتە هۆی دابەشکردنی بۆچوونەکان لەنێو حکومەت و سەرتاسەری

ولاتدا١، کەچی تەمووزی ساڵی ٢٠٠٨ نەبووە مایەی بایەخی ماس میدیاکانی جیهان بەبەراورد بە بەشێکی زۆرتری ماوەی دوای ساڵی ٢٠٠٣.

لەکاتێدا دەبوو ئەوە جێگەی بایەخی ماس میدیاکان بووایە، کە تیایدا ئاماژەکان دەریانخستبوو ژیانی سروشتی تا رادەیەك بۆ عێراق گەڕاوەتەوە، بەتایبەتیش دوای چەند مانگێك لە رەوانەکردنی هێزی زیاتری ئەمریکا بۆ عێراق بەڵام ئەوەی لەتەمووزی ساڵی ٢٠٠٨دا بووە جێی سەرنج و بایەخدان پرسی پەیوەست بە داهاتووی کەرکوك بوو، کە هێشتا بەبێ چارەسەر ماوەتەوە.

کەرکووك رۆژگارێکی زۆرە "بەرمیلێکی تەقەمەنی"یەو لەچاوەڕوانی تەقینەوەدایە ئەویش بەو پێیەی شارێکە بەسەر پێکهاتە ئیتنیکییە جۆراو جۆرەکاندا دابەشبووە: کورد، تورکمان، عەرەب (لەگەڵ تایەفەیەکی بچووکتری مەسیحی)، هەموو ئەو لایەنانەش خاوەنی دیدی جیاوازن لەبارەی داهاتووی کەرکووکەوە.

بەڵام دۆزینەوەی چارەسەری پرسی داهاتووی کەرکووك دەرکەتووە کە پرسێکی ئاڵۆزو دوورە و تەمووزی ساڵی ٢٠٠٨ یش ئەو کاتە گونجاوەی چارەسەرەکان بوو، کە بەکردەیی بەسەرچوو.

لەعێراقی نوێدا کورد بووەتە هێزێکی گرنگ لە سیاسەتی دەوڵەتدا، بەجۆرێك کە بەشێوەیەکی چالاکانە لە دامەزراندنی ئەنجوومەنی فەرمانڕەوایی عێراقیدا بەشدارییان کردوە، کە بەپەلە لەدوای نەمانی سەددام پێکهێنرا، هەروەها کورد ئەندامانی سەرکردایەتی بوون لە حکومەتی ئینتیقالیداو دواتریش لەدوای یەکەمین هەڵبژاردنی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥دا بەشداربوون لە و حکومەتە خاوەن سەروەرییەی کە دامەزرێنرا.

لەوەگرنگتریش ئەوەبوو لەو راپرسیەدا، کە بەر لە هەڵبژاردنی کانوونی یەکەم دەستووری تیادا پەسەند کرا، کورد دەریخست هەر بەتەنیا خاوەنی هێزی سەربازی نین (هێزەکانیان بەشێوەیەکی رێژەیی بەتواناتر بوون لە هێزی میلشیاو تەنانەت سوپای عێراقیش) بەڵکو

---

- بڕوانە

1Haynes,D.2008(Iraq Minister:US Combat Troops to pull out in Three Years under New Deal).The Times,14 August: Sabah,Z.,and Raghavan,S.2008.(Sectarian Biss Alleged in Iraqi Raids in Diyala.) Washington post,20 August:MacAskill, E.2008.(Iraqi Militia Leader to Order Followers to Lay Down their Arms.) The Guardian, 6August:Said,Y.2008.(Iraq Oil Dispute.) The Financial Times,23 july.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

پشتیوانیەکی میللییان لێدەکرێت لەلایەن دانیشتوانی کوردەوە کە ئارەزوویەکی ناسیونالیزمی پەرەسەندوویان هەیە.

بەدیدی کورد دەبوو لەعێراقی نوێدا چەند پرسێکی دیاریکراو چارەسەر بکرانایە، کە داهاتووی کەرکووکیش پێشەنگی ئەو پرسانەبوو، بەڵام رێگە دان بەوەی کەرکووک بچێتەوە سەر هەرێمی کوردستان کارێکی ئاسان نەبوو.

دیارە کەرکووك هەر بەتەنیا بەلای کوردەوە گرنگ نییە، بەڵکو زێدی ژمارەیەکی زۆری تورکمانیشە کە بوونیان دەبەستنەوە بەو بارو دۆخەی لەرۆژگاری ئیمپاتۆریەتی عوسمانیدا هەیانبووە.

دیسان پێکهاتەی عەرەبیش بوونی خۆی لەکەرکووکدا بەبوونێکی رەوا دەبینێت و پێیوایە کەرکووك لەبری ئەوەی کوردی یان تورکمانی بێت لەراستیدا جگە لەشارێکی عێراقی چیتر نییە.

کەرکووك سەنتەری پیشەسازی نەوتە لەعێراقدا و لەسەر یەکێك لە زەبەلاحترین کێڵگە نەوتییەکانی ولاتیش جێگیر بووە، لەبەر ئەوە پاراستنی ناسنامەی کەرکووك وەك شارێکی عێراقی رەگەزێکی بنچینەیی بووە لە سیاسەتی دەوڵەتدا لەماوەی ئەوسەردەمانەدا، کە عێراقی نوێ پیایدا تێپەڕیوەو، ئێستاشی لەگەڵدا بێت ئەو وتارە لەدوای ئەو هەلومەرجەی لە ٢٠٠٣ بەدواوە هاتوەتە ئاراوە بەبەهێزی ماوەتەوە.

گرنگتریش لە پرسی دیموگرافیای (دانیشتوان)، ئەو دەلالەتە رەمزییەیە، کە شارەکە هەیەتی و دیارە کەرکووکیش بەلای کوردەوە گرنگی خۆی هەیە، چونکە هەرگیز ئەو شارە لەژێر رکێفیاندا نەبووە، کە ماوەی نیو سەدەیە لەپێناویدا لەدژی حکومەتی عێراقی دەجەنگن.

دیسان کەرکووك بەلای تورکمانەکانیشە گرنگی خۆی هەیە بەو پێیەی سیمبولی شوێنەواری باڵادەستی و مەزنایەتیانە لەرۆژگاری عوسمانیەکاندا، هەرچی عەرەبیشە بەرجەستەی عێراقی فرە کلتووری دەکات.

لەکرۆکدا کەرکووك بەڵگەی توانای عێراقە لە تێپەڕاندنی ناسنامەی تایەفی و لەئامێزگرتنی بیرۆکەیەکی گشتگیر لەبارەی بوونی " ناسنامەی عێراقی"یەوە.

لەم روانگەیەشەوە "لەدەستدان"ی کەرکووك و چوونە پاڵ کوردستان نەك هەر دانپێدانانە بە شکستی پرۆژەی نیشتیمانی عێراقی و تایبەتمەندی کورد بەڵکو دانپێدانانیشە بەو توانایەو هێزەی کە بەم دواییانە کورد لە پاش سەردەمی سەددام بەدەستیان هێناوە.

لەگەڵ دواخستنی بڕیاردان لەسەر داهاتووی کەرکووك بۆ ماوەیەکی درێژخایانتر، ماددی ١٤٠ دەستووری ساڵی ٢٠٠٥ ئاماژە بە سازدانی راپرسی دەکات لەسەر داهاتووی کەرکووك بەهاتنی کۆتایی ٢٠٠٧.

بەڵام پاش چەند مانگێك لەدواکەوتنی راپرسیەکە تا ئەو وادەیە، ستیڤان دی میستۆرا، نێردەی تایبەتی ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان لەرێگەی دانوستانەکانەوە گەیشتە درێژکردنەوەی ماوەکە بۆ شەش مانگی تر.

هەرچی سەرکردایەتی کوردیشە بەهۆی ئەو درێژکردنەوەیەوە لەلایەن بنکەی جەماوەرییانەوەو لەرێگەی زمانی زبری راگەیاندنەکانەوە دووچاری رەخنە بوونەوە، بەتایبەتیش پاش ئەوەی بەڵێنیان دابوو کەرکووك بۆ سەر کوردستان بگەڕێننەوە بەڵام لەئێستادا دەستەودامان راوەستاون.

لەم دیدگایەشەوە جگە لە باری هێرشکردن لەبەردەم سەرکردایەتی کوردی رێگە چارەیەکی تر نەمایەوە کە لەکاتی دانوستانەکاندا ئەنجامیبدەن.

هاوکات نەیارانی خواستەکانی لایەنی کوردیش دەیانزانی، کە راستیەکانی سەر زەوی بەپلەی یەکەم پشت بە هەڵوێستی کورد دەبەستێتو ئەوەشیان دەزانی کە جگە لە هەوڵدان بۆ کۆت و بەندکردنی کورد بەرێگرتن لە بەردەم سازدانی راپرسیەکەو دواجاریش رەتکردنەوەی، ئاسۆیەك نەماوە بۆ سنووردارکردنی خواستی هەڵکشاوی کورد.

فراکسیۆنە ناکوردیەکانی نێو پەرلەمان ماددەی ١٤٠یان رەوانەی دادگای دەستووریی فیدراڵی کرد بۆ گەڵاڵە کردنی بڕیارێك سەبارەت بەوەی ئاخۆ وادەی جێبەجێکردنی ماددەکە بەسەرنەچووەو کاری پێدەکرێت١.

لەگەڵ کۆتایی هاتنی درێژکردنەوەی ماوەی شەش مانگەکە لە حوزەیرانی ٢٠٠٨دا، هەڵمەتەکانی دژ بەیەك لەنێوان بەغدادو هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان دەستییپێکرد.

کورد پێیوابوو بەغداد کات دەکوژێت، ئەمە جگە لەوەی بەغداد بەتوندی رەخنەی لەهەوڵی سەپاندنی ئەو دیفاکتۆیە دەگرت کە کورد دەیویست بەسەر کەرکووك و دانیشتوانە فرە نەژادەکەیدا بیسەپێنێت.

---

1:Janabi, N.2008.( Kirkuk's Article 140:Expirred to Not.) policy Watch 13535.The Washington Instiutute for Near Eest Policy,30 January.

PDF 4 KURD

خۆ ئەگەر داهاتووی کەرکووك پەیوەندییەکی تۆکمەی بە پرسە جەهەریەکانی تری تایبەت بە ناکۆکیەکانی هەولێر و بەغدادەوە هەبێت - بەدیاریکراویش پرۆژە یاسای نەوت (مافی کوردستان لە واژۆ کردنی گرێبەست و کنەکردن و بەشداریکردن لەبەرهەمهێنان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەبەغداد) ونەخشەرێژی ئەوەی بە " سنووری ناوچە کێشە لەسەرەکان" ناودەبرێت لەنێوان هەرێمی کوردستان و زەویەکانی دیکەی عێراقدا_ئەوا بارودۆخی کەرکووك بەخێرایی پێگەیەکی تایبەتمەند و بێ وێنەی لەسیاسەتی عێراقیدا داگیرکرد.

مانگەکانی هاوینی ۲۰۰۸ دژواریەکی زۆری بەخۆوە بینی تا ئاستی لێکترازان، ئەویش دوای ئەوەی سەرجەم لایەنەکان(کورد و عەرەب و تورکمان) لەحوزەیراندا ئەو ستراتیژەیان رەتکردەوە، کە نەتەوە یەککگرتوەکان ئامادەیکربوو بۆ گەیشتن بەچارەسەرکردنی بارودۆخی ئەو دەڤەرانەی، کە ناکۆکی کەمتری نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراقی لەسەربوو۱.

لە۲۲ی تەموزدا فراکسیۆنە عەرەبییەکان دانیشتنێکی داخراویان کرد بۆ تێپەڕاندنی پرۆژە یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان کە پێشنیازێکی دیارکراو بە کەرکووکی لەخۆگرتبوو.

لەکاتێکدا، یاسا میکانیزمەکانی هەڵبژاردنی بۆ ناوچەکانی تری عێراق دیاریکردبوو، ئەوا ماددەی ۲٤ی یاساکە بەکردەیی کەرکووکی لەپرۆسەی دیموکراسی دوورخستبووەوە و پێداگری کردبوو لەسەر دابەشکردنی یەکسانی دەسەڵات لەنێوان پێکهاتە نەژادییە سەرەکیەکانیدا.

ئەوەبوو لەکۆی ۱٤۲ پەرلەمانتار ۱۲۷ یان دەنگیان بۆ بەرژەوەندی یاساکەداو پەراوێزی نەسابی خۆی تەواو کرد بەڵام بەبێ بەشداریکردنی نوێنەرانی کورد۲.

لەبەرامبەر ئەو دەنگدانە نهێنیەدا کە مەحمود ئەلمەشهەدانی سەرۆکی پەرلەمان سازیکردبوو، سەرۆك جەلال تاڵەبانی — یەکێك لەهەردوو سەرکردە کوردییەکە- بێ دوودڵی

---

۳- دەکرێت سەرنج لەو رێنماییانە بدرێت کە لەلایەن نێردەی نەتەوە یەککگرتوەکانەوە بۆ یارمەتیدانی عێراق پێشکەشیکردووە UNAMI لەسەر سایتی ئەلەکترۆنی: www.uniraq.org/newsroom/getartical.asp?ArticleD702 ئەو رەتکردنەوەیە دەردەخات کە سەرجەم لایەنەکان بەرامبەر بەو رێنماییانە پیشانیانداوە، ئەمە جگە لەوەی ئەو لایەنانە بێتوانان لە درك کردنیان بە بەپێویستی تەوافوقە میانگیرییەکان لەهەندێك پرسی پەیوەست بەچارەسەری ناوچە کێشەلەسەرەکان بەگشتی و کەرکوك بەتایبەتی.

2- Parker,N.,and Hameed,S..2008(In Iraq Kurds Walk out of Parliaent in Protest)Los Angeles Times,23 July.

PDF 4 KURD

مافی ڤیتۆی لەبەرامبەر پرۆژە یاساکە بەکارهێناو رێگەی نەدا بچێتە بواری جێبەجێکردنەوە١.

بارودۆخەکەش بەر لە دەستپێکردنی پشووی هاوینەی پەرلەمان، یەکلایی نەکرایەوەو رێککەوتنیش لەسەر یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان و داهاتووی کەرکوك روونەدا.

بۆیە لەبری ئەوە رووداوەکان، کەشە سیاسییەکەیان بەشێوەیەکی مەترسیدار دژوار کرد و هەڵوێستی ئەلمەشهەدانی و ئەو پەرلەمانتارانەش کە لەدەنگدانە نهێنییەکەدا بەشدارییان کرد وای لە کورد کرد، بگەنە ئەو بڕوایەی کە ئەوان وەك هاوبەشێکی تەواو و یەکسان لە بەڕێوەبردنی وڵاتدا مامەڵەیان لەگەڵدا ناکرێت.

ئەوەبوو حکومەتی هەرێمی کوردستان بەزمانێکی هەڕەشەئامێز ئاماژەی بەوە کرد کە ئەو هەڵوێستە"گومانی زۆری خستوەتە سەر هاوپەیمانێتیەکانی پێشوو و رێکەتننامە سیاسیەکان کە لەنێوان زۆرێك لەلایەنەکان و سەرکردایەتی سیاسی لە کوردستاندا ئیمزا کراون"٢.

بەهەمان شێوەش نوێنەرانی عەرەب و تورکمان کەوتنە تۆمەتبارکردنی سەرکرایەتی کوردی بەتایبەتیش سەرۆك تاڵەبانی، بەوەی کە کار بۆ بەرژەوەندی عێراق ناکات بەڵکو کار بۆ خزمەتی مەرامە دێرینەکانی کورد دەکات.

لەرووی پراکتیکیشەوە ئەو روو بەڕوو بوونەوەیەی کە دۆزی کەرکوك تەقاندییەوە هەر بەتەنیا نەبووە هۆی پەکخستنی ژیانی سیاسی لەعێراقدا بەڵکو بووە هۆی لاوازکردنی ئەو تەوافوق(سازاندن)ە سیاسییە فشۆڵەش کە لەئارادابوو.

رەنگە زێدەرۆیی نەبێت گەر بووترێت داهاتووی عێراق پەیوەستە بە گەیشتن بەچارەسەرکردنی پرسی کەرکووك بەو جۆرەی کە بەلای سەرجەم لایەنەکانەوە پەسەندکراوبێت و

---

1- Abdul-Zahra,Q.2008.(Iraqi Presidential Council Rejecil Election Law). Associated Press.23July.

٢- حکومەتی هەرێمی کوردستان"بەیاننامە: حکومەتی هەرێمی کوردستان یاسای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان رەتدەکاتەوە و بە پێشێلکردنی دەستووری دادەنێت".٢٣ی تەمووز.

www.krg.org.articles.asp?map=02010100&Ingnr=12&anr=24961&rnr=223.

هەرهەولێكی بەزۆری كوردیش بۆ سەپاندنی چارەسەرێك بۆ گەڕانەوەی كەركووك بۆ سەر هەرێمی كوردستان، باكووری عێراق بەرەو نائۆقۆەییەكی توندی نەژادی بێ سنوور دەبات، لەبەرامبەریشدا هەرهەوڵدانێك بۆ سەپاندنی هەرچارەسەرێكی ناپەسەندكراو لەلایەن كوردەوە هەمان دەرئەنجامی هاوشێوەی دەبێت.

دیارە چارەسەری شیاو بریتییە لەو فۆرمە تەوافوقییە میانگیرییەی كە بەحوكمی پێناسەكەی شتێك دەداتە سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەكان بەڵام هەموو شتێك ناداتە تەنیا لایەنێك.

خۆئەگەر خوازراو بێت پرسی كەركووك بەشێوەیەكی ئاشتیانە چارەسەر بكرێت ئەوا فۆرمی تەوافوقی رێگە چارەیە و زۆرینەش لەگەڵ ئەو چارەسەرە پێودانگیەدان، لەبەرئەوەی دیموكراسی لەكرۆكیدا چارەسەری ئاشتیانەی بۆ مشتومڕە سیاسییە ناكۆكەكان پێیە ئەویش لەرێگەی ئامادەسازی بۆ بەستنی رێككەوتنەكان و دۆزینەوەی چارەسەری توافوقی و میانگیری.

تەنانەت لە سیستمی سیاسی زۆرینەشدا كە كار لەسەر رێسای "براوە هەموو شتێك دەبات" ئەوا پێودانگی چارەسەری میانگیری و تەوافوقی بریتییە لە زیندە خوێنبەری دروستكردنی دیموكراسیانەی بڕیارەكان، كەوابوو فۆرمی تەوافوقی لەرووی پراگماتی و پێودانگییەوە پەسەندە و هەركاتێكیش ئەوە لێتێگەیشتنی روون بوو ئەوا وشەگەلەكانی مشتومڕكردن روونێتی بێ پێچ و پەنایی بەخۆوە دەبینێت.

لەراستیدا ئامانج لەم كتێبە بەرگریكردن نییە لە پرسی ئەملایەن یاخود ئەو لایەنی پێكهاتەكاتە پەیوەندیدارەكان یاخود پێشكەشكردنی چارەسەرێكی دیاریكراو بۆ پرسی كەركووك، بەڵكو بۆ روونكردنەوەی مەرجەكانی(دیبەیت) مونازەرەیە.

زۆربەی "چارەسەرەكان" كە چاودێرانی خۆرئاوا یان لایەنە خودی پەیوەندیدارەكان پێشنیازی دەكەن چارەسەری شیاوو پەسەند نییە لەبەرئەوەی چارەسەری تەوافوقی نییە.

جگە لەوەش ئەو چارەسەرانە پەنهان و نارۆشن و نەشیاون لەبری چارەسەرە تەوافوقییەكان لەبەرئەوەی جێبەجێكردنیان پێویستی بەمومارەسەكردنی توندوتیژی ئەم لایەن یان ئەو لایەن هەیە.

رەنگە لە هەردولای دیبەیتەكەش لەسەر پرسی كەركووك لایەنێك هەبێت پێشوازی لە ئەگەری رێگەچارەی توندوتیژی بكات، بەڵام ئەگەر بخوازرێت عێراق داهاتووی هەبێت و تیایدا قەوارەی هەرێمێك بەئارامی و یەكانگیر بژی ئەوا پێویستە پرسی داهاتووی كەركووك بەئاشتیانە چارەسەر بكرێت و ئەوەش فۆرمێكی تەوافوقی و میانگیرانە دەخوازێت.

PDF 4 KURD

## هێڵكاریی كتێبەكە

بەشی یەكەمی كتێبەكە باس لە دیرۆكی كەركووك دەكات بەر لە ساڵی ٢٠٠٣، بۆ ساكاركردنەوەی شیكارییەكەش دوو ماوەی تایبەتمەند لەگەشەی مێژوویی كەركووك دیاری دەكەین.

ماوەی یەكەم بەدامەزراندنی كەركووك و دروستبوونی وەك شارۆچكە یان شارێك، كە دەكەوێتە دەڤەرە سنووریەكانی ئەو ئیمپراتۆریانەی، كە لەئارادابوون دەست پێدەكات و بە شكستی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەماوەی جەنگی یەكەمی جیهانیدا كۆتایی پێدێت.

بێگومان ئەوەش سەردەمێكی دووردرێژە لەمێژوودا، كەپڕە لە ئالۆزی كۆمەلایەتی و كلتووریو چارەسەركردنیشمان بۆ ئەو ماوەیە بەداخەوە چارەسەركردنێكی كورتكراوەیە و ئەوەش هۆكاری تایبەتی خۆی هەیە، كە ئامانجیش لەوە بریتییە لە دیاریكردنی بنەچەی پێكهاتەجیاوازەكانی كەركووكی نوێ تەنانەت ئەگەر ئەو دیاریكردنەش رووكەشیانەبێت، ئەمە جگە لەوەی كەچۆن ئەو پێكهاتانەی كەركووك لەمێژووی خۆی و دراوسێكانی دەروانێت و ئەوە بایەخەش كە هەیەتی.

ئەو راستیەی، كە لەكەركووكدا هەبووە بەتایبەتیش لە دوا قۆناغەكانی ئەو ماوەیەدا(واتە سەدەی هەڤدەیەم و دواتریش)، بەهەموو پێوادنگەكان شارێكی ئاشتیخوازو فرە ئیتنیك بووەو لە سیاسەت یان پەیوەندیە كۆمەلایەتیەتیشیدا بەبەراورد بەشارەكانی تر روو بەڕووی تەنگ و چەڵەمە نەبوەتەوە و ئەوەش خالێكی بەسوودە بۆ بەراورد كردن لەوەی دواتر لە سەدەی بیستەمدا روودەدات.

دوا بەدوای ئەوەش لەمێژووی كارەساتباری كەركووكدا هەڵوەستە دەكەین و بەدواداچوون بۆ فیلێ و تەڵەكەی ئیمپراتۆریەت دەكەین، كە چوونی ولایەتی موسڵی(كەركووكیش بەشێك بووە لەو ولایەتە) بۆپاڵ هەردوو ولایەتی بەغدادو بەسرەی بەخۆوە دیوە لە دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراق و دۆزینەوەی یەدەگی نەوتی كە شیاوی وەبەرهێنانە، ئەمە جگە لەوەی ئەو یەدەگە نەوتییە بووەتە هۆی گۆڕینی شێوەی كاركردنی بەریتانیەكان و ئەو رۆڵە یارمەتیدەرەش كە دیویەتی لە هەڵمەتی دەوڵەتی عێراقی نوێ لەپێناو لێكچواندن (تەعریب)ی دانیشتوانی عێراق لەناوچە ستراتیژییە گرنگەكاندا.

بەڵام هێزە بزوێنەرەكان كە هێزی بەیەكداچوون، بەدوور لە هەر رووداو و هەلومەرجێكی تری وەك بوونی نەوت هەر بەرەو پێشچوونێكی وەك دوژمنایەتی نێوان پێكهاتە نەژادیەكان

PDF 4 KURD

بەدرفت لێی دەڕوانن. لەگەڵ ئەوەشدا بەدیاریکراوی لەسەدەی بیستەمدا لەرێگەی چڕکردنەوەی سیاسەتی رەسمی و مەبەستداو بارودۆخی کۆمەڵایەتی_ئابووری لاواز و دواجاریش ئەفسانە دێرینە دروستکراوەکان، ناسنامە ئیتنیکیەکان فۆرمەڵە بوون و سیمای سیاسی و کۆمەڵایەتی خۆیان بەدەستهێنا.

بەشی دووەمیش تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە مێژووی کەرکوك لە دیدگای هەر سێ پێکهاتە سەرەکییەکەوەئامانجیش لێرەدا سووربوونە لەسەر ئەوەی کە چۆن یەك مێژووی هاوبەش بەشێوەی جیاجیاو ریشەیی لەلایەن ئەو سێ پێکهاتەیەوە راڤە دەکرێت.

ئەوەی کە بە "کوشتارگە"ی ساڵی ١٩٥٩ ناودەبرێت و تەوەرێکە لە گێڕانەوەی تورکمانی بۆ مێژووی نوێی کەرکووك بەشێك لەو تەفسیرانە پێشکەش دەکات کە لەپشت هۆکانی دژایەتیکردنی زۆرینەی تورکمانەوەن بۆ باڵادەستی کوردی.

سەبارەت بەکوردیش ئەوا سیاسەتی زۆردارانەی تەعریبکردن کە لە سەردەمی رژێمی بەعسدا جێبەجێکراوە، شەقڵێکی بەرچاوی مێژووی نوێی کەرکووکە و ئەوەش یارمەتیدەرە بۆ تەفسیر کردنی هۆکانی پشت ئاسەوارە پێچەوانەکانی ئەو سیاسەتەو گەڕانەوەی کەرکووك بۆ پێگەی شەرعی خۆی.

لەدیدی کوردەوە کەرکووك لە دڵی هەرێمی کوردستاندایەو لەرووی سۆزداریو رەمزیشەوە جێگەی بایەخەو ئەوەش بۆ خۆی گرنگی مادیی سەبارەت بە کۆنترۆڵکردنی یەدەگی نەوتی کەرکووك تێپەڕاندووە.

هەروەها گێڕانەوە پەرش و بڵاو و هەندێك جاریش دژ بەیەکەکان ئەوە دەردەخەن، کە ئاستەمە مێژوویەکی بابەتیانە بۆ کەرکووك پێشکەش بکرێت.

دیسان ئەو گێڕانەوانەش رووناکی دەخەنە سەر هۆی ئاستەنگەکانی نەگەیشتن بە دروست بوونی زەمینەی هاوبەش لەنێوان هەرسێ پێکهاتەکەدا تەنانەت لەسادەترین بنەمای وەك سەرژمێری دانیشتواندا.

ململانێ لەسەر کەرکووك لە جەوهەردا شەڕی ئەفسانەکان و بیرکردنەوەی ناسیونالیزمە لەبارەی ناسنامەوخاوەندارێتی کە پارێزگاری لە کاریگەریەتی خۆی دەکات تەنانەت لەبەرامبەر بەڵگە مادديیە حاشاهەڵنەگرە دژەکانیشدا.

هاوكات ئەو ململانێیە بەتایبەتی بۆ جەختكردنەوە لە راستییەكان وایكردوە لێكۆڵینەوە لەكەركووك پرۆسەسەكی ئاڵۆز بێت تا ئاستی نائومێدبوون، بەڵام دیسان پرۆسەیەكی ناوازەی بێ سنووریشە.

ئەوەی نائامادەیە لە شیكردنەوەكەدا هەر مشتومڕێكە لەدیدگای مەسیحییەوە.دانیشتوانی كلدو ئاشوری كە زۆرجار بەپێكهاتەی چوارەم دادەنرێن لەرووی ژمارەوە بەشێوەیەكی مەرگەساتبار پوكاونەتەوە تا ئەو ئاستەی هیچ سەنگێكی سیاسییان لەكەركوك و زۆربەی باكووری عێراقدا نەماوە.

هەڵبەت ئەو نائامادەیەش واتای ئەوە ناگەیەنێت، كە دیدگای مەسیحی لەكاتی تاوتوێكردن لەدیدگای پێكهاتەكانی ترەوە كەم بایەخترببێت –باسكردن لەوەی كە مەسیحیەكان دانیشتوانی دێرینی كەركووكن بەبەراورد بەپێكهاتەكانی دی راستیەكی حاشا هەڵنەگرە، بەڵام نائامادەبوونی دیدگای مەسیحی رەنگدانەوەی واقیعی سیاسی و كەمی ژمارەیانە لەئێستادا بەجۆرێك كە لەهەرفۆرمێك لەدیاریكردنی بارودۆخی كەركوك لەداهاتوودا پشكداری ناكات.

ئەو دیدگایانەی لە بەشی دووەمدا پێشنیازكراون بەزەرورەت بەرەو سادەكردنەوەی واقیعی ئاڵۆز دەچن و هەرئەوەشە بەتەواوەتی دانی پێدادەنێین.

لەنێو پێكهاتەكانی كەركووكدا پێكهاتەیەكی ئیتنیكی نییە بەیەك دەنگ بدوێت، هەروەها ئاماژەدان بە "روانینی كوردانە" یاخود" روانگەی عەرەبی" بەواتای زۆرجار ئاستێك لە چوونیەكی لەنێو یەك پێكهاتەدا بوونی نییە، بەڵكو لەچوارچێوەی یەك پێكهاتەدا فرەیی هەیەو هێماكردنی ئێمەش بە روانگەی پێكهاتە جۆراوجۆرەكان لەزۆركاتدا ئاسانكارییەكی ئەدەبیانەی لەپشتەوەیە نەك ئامانج لێی بۆ بەرجەستەكردنی ماددیانەی ناسنامەی ئیتنیكێك بێت.

بەشی سێیەمی كتێبەكەش شیكارییەكی بلاوی سەبارەت بە بەرەوپێشچوونە سیاسیەكانی كەركووك لەپاش ساڵی ٢٠٠٣وە پێشكەشكردووە و وەك پێشبینیش دەكرێت شیكردنەوەكە پێداگری لەسەر ئەو سەرنجە دەكات، كە كەركووك پرسێكی تەواو ئاڵۆزە و لەسەر ئاستە جۆرەبەجۆرەكانی شیكردنەوەشدا پەلكێشی لایەنە ئەكتیڤەكانی ناوخۆی و هەرێمی و نەتەوەیو نێو دەوڵەتی بەرەو دەوربەری خۆی كردووەوئەو شیكردنەوەیەش كرۆنۆلۆژیایەكی شیكاریانەیە بۆ ئەو گۆڕانكاریانەی لەدوای ساڵی( ٢٠٠٣) وە لەكەركووك روویانداوە، كە باس لە رەوتی ململانێكان دەكات لەپێناو كۆنترۆڵكردنی سیاسیانەی پارێزگاو شاری كەركووك.



PDF 4 KURD

دیسان دوای رووگەی هەڵمەتی لایەنی کوردی دەکەوێت لەسەر ئاستی نیشتیمانی بۆ چارەسەرکردنی پرسی کەرکووك بەشێوەیەکی دەستووریانە.

دیارە ململانێ لەسەر کەرکووك بەهۆی توندوتیژی هەڵکشاوی گروپە چەکدارەکانەوە سەریهەڵداوە، بەڵام رووداوی توندوتیژی کە پاڵنەری ئیتنیکی پێکهاتە جیاوازەکانی کەرکووکی لەپشتەوە بوو بێت کەم و دەگمەن بوون.

وێناکردنی کەرکووك لەماس میدیاکاندا بەو پێیەی " بەرمیلی تەقەمەنی" و" بۆمبی کاتیگر"ە و خۆشکردنی ئاگرەکەشی هەست و رق و کینەی ئیتنیکی لەپشتەوەیە نادروست و دوورە لەراستییەوە. بەڵکو چیرۆکی راستەقینەی نێو واقیع نەبوونی توندوتیژی ئیتنیکی ئەوتۆیە لەبەرامبەر توندترین ئیستفزازدا.

دواجار بەشی چوارەم لەشیکردنەوەیەکی جەوهەریانەوە بەرەو چەمگەرایی دەڕوات و لەفەسڵی دەیەمیشدا هەڵسەنگاندنێکی رەخنەگرانە لەبارەی شکستی پرۆسەی ماددەی ١٤٠/٥٨ بۆ دۆزینەوەی چارەسەری پرسی کەرکووك و ناوچە کێشەلەسەرەکانی تر پێشکەش دەکات.

کۆتاییهاتنی پرۆسەی ماددەی ١٤٠بەبێ سەرکەتن بەواتای پێویستە پرۆسەیەکی نوێ جێبەجێبکرێت بۆ دیاریکردنی بارودۆخی کەرکووك و نەخشەرێژکردنی سنووری کورد لەگەڵ ناوچەکانی تری عێراقدا.

خۆ ئەگەر کورد لەتوانایدا نەبوو هەموو ئەوەی کە هەوڵی بۆ دەدەن بەدەستیبهێنن لەرێگەی ئەو پرۆسەیەی کە ئێستا لەئارادایە، ئەوا ئاسەواری کەڵەکەبووی بێ بەشکردنی کورد لەهەر چارەسەرێك، کە پێی رازیبن لەسەر پرسە ناکۆکەکان ئاسوارێکی کارەساتبارانە دەبێت، هەربۆیە چارەسەری تەوافوقی میانگیری تەنیا رێگەیە بۆ بەرەوپێشچوون.

بۆیە لە فەسڵی یانزەیەمدا رووکاری چارەسەرە تەوافوقیەکان ئەوەی کە پەسەندەو ئەوەش کە پەسەند نییە دیاریکراوە و لەفەسڵی دوانزەیەمیشدا شیکردنەوە بۆ پرسەکانی پەیوەست بەکەرکووك بەرەو چارەسەرکردنی پرسی فەرمانڕەوایی چووەو ئامانجیش لەم فەسڵە دیاریکردنی چارەسەری "تەواوەتی" نییە بۆ پرسی کەرکووك بەڵکو هەوڵدانێکە بۆ بەرەو پێشبردنی دیبەیتەکە بەئاراستەیەکی سوود بەخش.

خۆ ئەگەر لایەنێکیش لەلایەنەکان ئامادەو توانای نەبوو بەردەوام بێت بۆ بەگەیشتن بە تەوافوق لەبارەی کەرکووکەوە، ئەوا پرسەکە مەحکوم دەبێت بەکۆتایی هاتنی بە خوێن رشتنن بەڵام خۆ

بەدەر گشت لایەنەکان ئامادەبن بۆ سەوداکردن بەوەی لەدەستچووە بە دەستکەوتەکان (واتە ئامادەبێت بەچارەسەری تەوافوقی میانگیری) ئەوا گەیشتن بەچارەسەری ئاشتیانە شیاو دەبێت.

## عێراق لەدووڕیانی کەرکووکدا

ڕووداوەکانی تەمووزی ٢٠٠٨ بوونە هۆی جۆشدانی ڕای گشتی کورد(هەروەك ئەو خۆپیشاندانەی لە ٢٩ی تەمووز بەبەشداری ١٠٠هەزار کەس لەهەولێر بەڕێوەچوو)لەبەرامبەر ماددەی ١٤٠ و سازدانی ڕاپرسی بۆدیاریکردنی داهاتووی کەرکووك.

لەگەڵ ئەوەی سەرکردەکانی کورد نەیانتوانی ڕوویەکی دیبلۆماسی سەبارەت بەو پرسە پیشان بدەن، بۆیە چوونە پاڵ هەستی ڕای گشی و مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیش ڕایگەیاند:"ڕێگە بەپەرلەمانی عێراق نادەین دەستکەوتەکانی گەلی کورد لەبار بەرێت، هەروەها عێراقیش دادەڕمێت گەر بێتوو پێشێلی دەستوور بکرێت"١.

لەبەغدادیش پەرلەمانتاران لەبەرامبەر ئەو هەڵکشانەدا لێدوانیان هەبوو، وائل عەبدوللەتیف کە خاوەن نفوزێکی زۆرە سەرۆك تاڵەبانی تۆمەتبار کرد بەبەکارهێنانی مافی ڤیتۆ بەشێوەیەکی نادەستووریانە هەربۆیە داوای دەست لەکارکێشانەوەی کرد.

لەکەرکووکیش ڕەوشەکە بەرەو خراپتر چوو، ئەوەبوو لە٢٨ی تەمووزدا هێرشێکی خۆکوژی لەدژی ئەو خۆپیشاندانە ئەنجامدرا، کە لەلایەن کوردەوە لەدژی یاسای هەڵبژاردن سازکرابوو، کە ئەوەش بەلانی کەمەوە کوژرانی ١٢کەسی لێکەوتەوە.

لەوەش خراپتر ئەوەبوو، کەلە ١٥ی ئابدا ڕوویدا و لەهێرشێکدا تیایدا کورد کرایە ئامانج نزیکەی ٢٥ کەس کوژران و ئەو کارەساتەش پەلاماردانی بارەگای بەرەی تورکمانی و سووتاندنی ئەو جێگەیەی لێکەوتەوە، کە بەسەدان کورد هەڵیانکوتایە سەر بارەگاکە(سەربای ئەوەی سوپای ئەمریکا لەوبڕوایەدا بوو هێرشەکە لەلایەن گروپێکی وابەستەی ڕێکخراوی

---

١- حکومەتی هەرێمی کوردستان. سەرۆك بارزانی هۆشداری دەدات لەهەڵوەشانەوەی عێراق هەرکاتێك دەستوور پێشێل بکرێت. بەیاننامەی ڕۆژنامەوانی کە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٧ی ئاب دەرچووە.

www.krg.org/articles.asp?smap=02010100&Ingnr=12anr=25113&;rnr=223.

قاعیدەوە ئەنجامدراوە)و ئەوەش تەئکید کردنەوەیە لەسەر ئەو واقیعەی کە پێمان دەڵێت گرژییە ئیتنیکیەکان لەشارەکەدا گەیشتوەتە پنتی هەڵچوون[1].

بەهاتنی پاییزی ٢٠٠٨ بۆجارێکی تر داهاتووی عێراق کەوتەوە تای تەرازووەوە.هاوکات لەگەڵ باشبوونی بەرچاوی رەوشی ئەمنی لەزۆربەی ناوچەکانی عێراقدا ئەوا زۆرێك لە پرسە سیاسیە جەوهەریەکان بەبێ چارەسەر مانەوە، لەپێش هەمووشیانەوە داهاتووی کەرکووك.

دیارە تا سەرکردە عێراقییەکانیش نەگەنە چارەسەرێکی تەوافوقی لەسەر ئەو پرسە، کە لەلای هەمووان پەسەند بێت و تاگەیشتنیش بەو چارەسەرە ئەوا داهاتووی عێراق بەوشێوە هەرێمایەتیەی ئێستای جێگەی گومان دەبێت.

1 -Hacaoglu, H.2008.(kirkuk Dispute Fuels Ethnic Tensions in Iraq.) Associated Press,15 August;Oppel,R.2008.(Kurdish Conrol of Kirkuk Creates Powder Keg.) The New York Times,18 August.



PDF 4 KURD

## کەرکووك و دەڤەرەکانی دەورو بەری

رەنگە هیچ ناوچەیەکی کێشە لەسەر هێندەی شاری کەرکووك و دەوروبەری ئالۆز نەبێت ۱. کەرکووك نموونەیەکی شارە دێرینە "دابەشبوەکانە"، کە تیایدا گروپەکان لەسەر دەسەلاّت و سەرچاوەکان لەململانێدان، هەروەها لەگۆڕەپانەکەیدا کێشمەکێشێکی بنەڕەتی هەیە لەسەر ناسنامەی کەلتووری شارەکە و پێگە رەسمیەکەی۲.

وەك ئاشکراشە کەرکووك هەربەتەنیا بێهاوتا نییە لەوەی کە شارێکی دابەشبووە و کەسانێکیش هەن ئامادەن لەپێناویدا بجەنگن و بمرن، بەڵکو قەبارەی کێشەکان تیایدا_ژمارەی پێکهاتەکانی پەیوەست بەکەرکووك و زۆرو زەوەندی سەرچاوەو رۆڵی نێو دەوڵەتی_هەموویان پێکەوە رەهەندی ئالۆزتری پێدەبەخشن و هێندێك کێشمەکێشی تری مولّکداریێتی هەرێمایەتی بۆ زیاد دەکەن. کەرکووك بەهەموو واتایەك شارێکی دابەشبووە.

کەرکووك شارێکی دێرینە لەزەویەکی دێریندا، وەك باویشە دەوترێت عێراق لانکی ژیارەکانە، کە ئەوەش ناڕاست و بێ ویژدانییە بۆ ئەو دەستەواژەیە لەواقیعدا بەبەراورد بە باکووری ئەم ولاّتە.

دەوروبەری کەرکووك دەکەوێتە سەر زەویەکی بەپیت کە لەکەنداوەوە بەرەو کەنارەکانی ناوەڕاست درێژبوەتەوە و کۆمەڵێك شارو جێگەی نیشتەجێبوونی لەخۆگرتوە، کە بە دێرینترین

---

۱-لەکاتی ئاماژەکردن بە بارودۆخی کەرکوك پێویستە جیاوازی بکرێت لەنێو شارو پارێزگادا.دیارە داهاتوشیان پێکەوە گرێدراوەو جیانابێتەوە بەلاّم تایبەتمەندی شار رەنگدانەوەی راستەوخۆی لەسەر پارێزگا نییە.

2 - Hepburn, A.2006.(Ethnicity and Power in Contested Cities: The Historical Experince.) Comparative Urban Studies Project: Urban Update no.7.Washington DC:Woodrow Wilson International Center for Scholars.

PDF 4 KURD

شوێن دادەنرێن و لەرابردووشدا چالاکی کشتوکاڵی بەشێوەیەکی سیستماتیك بەخۆوە دیوە_ئەمە جگە لەوەی ریشەی شارستانیەتی نوێشی تێدایە.

باکووری عێراق، خاوەنی مێژوویەکە لە نیشتەجێبوون و چالاکی کشتوکاڵی و ژیاری و ئەوەش بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە، باکووری عێراق تیانووسی گەشەی مرۆڤایەتییە کە رەنگە لەجیهاندا بێ رکابەر بێت.

شارستانیە دێرینەکان سەریانهەڵداو پووکانەوە، ئەوشەڕە گەورەکانی بەرپابوون و رەوتی مێژوویان دیاری کرد، نەتەوەکان کۆچیان بۆ ناوچەکە کردو هەندێکیشیان بونیادنەری پێکهاتەی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزن، ئایینە دێرین و نوێکان بەتەك یەکەوە ژیاون- پێکەوەژیان لەهەندێك جاریشدا نائۆقرەی و پەنگخواردنەوەی بەخۆوە دیوە، بەڵام لەزۆربەی کاتیشدا بەئاشتی لەگەڵ یەکتریدا ژیاون.

ئەم مێژووە دووردرێژە لە هەمەجۆری دانیشتوان و کارلێکە کۆمەڵایەتیە فرە رووەکان وایکردووە گەیشتن بەچارەسەری تەنگەتاویی ئیتنی- سیاسی لەکەرکووکدا گرانبێت، بەتایبەتیش کاتێك ئەم وێنە ئاڵۆزە بەبوونی کاڵای ستراتیژی_نەوت_ رەنگاورەنگ دەبێت، کە لەچینەبەردینەکانی ژێر زەوی ناوچەکەدا بەبڕێکی زۆرو زەوەند هەیە.

هاوکات کەرکووك و دەوروبەری بەدرێژایی هەزاران ساڵ هاوسنووری ئیمپراتۆری بووە و تۆماری مێژوویش بەروونی دەریدەخات، کەدروستبوونی ئەو شارە کۆزمۆپۆلیتییە بۆ سەردەمی ناوەند دەگەڕێتەوە و دانیشتوانەکەشی سەرباری ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی و ئیتنیکی و ئایینی پێکەوە هەڵیانکردووە. لەبەرئەوە کێشە دەرکەوتوەکانی ئێستای کەرکووك ریشەیەکی دێرینی نییە بەڵکو لەسەدە بیستەمدا سەریهەڵداوە کاتێك لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە ئایدیۆلۆژیای نەتەوەیی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشا.

هەروەها لە بارودۆخی پاش جەنگی یەکەمی جیهانیدا نەوت بووە هۆی گۆڕینی کەرکووك لەوەی کە بەشێك بێت لەخەڵاتی گەورەی ململانێی نێوان ئیمبراتۆرەکان بۆ ئەوەی کە خۆی ببێتە هەموو خەڵاتەکە.

لەماوەی سەدەی بیستەمدا گێڕانەوەی مێژوویی تایبەت بە هەرپێکهاتەیەك بووەتە گێڕانەوەیەکی بەسیاسیکراو و دژبەیەك و ئەوەش تا ئاستێکی دوور پاڵی بە خودی دەوڵەت و حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانەوە ناوە پشت بە ستراتیژی هێرشبەرانەی فراوان ببەستن لە

مومارەسەكردنی ئەندازەی كۆمەڵایەتیدا، كە ئامانج لێی ئیدارەكردنی ئەگەری هەڕەشە سیاسی و ئەمنیەكانی پیشەسازی نەوتی باكوور بووە، كە لەكەركووكدا دامەزراوە.

گومانی تێدا نییە پێشكەشكردنی مێژوویەكی بابەتیانە بۆ شاری كەركووك ئەركێكی دژوارە ودیسان خستنەرووی مێژووی گەشەی شارەكەش لەلایەن سەرجەم پێكهاتەكانیەوە پەسەند ناكرێت كە لەئێستادا بەكێشمەكێشەوە سەرقاڵ بوون.

بۆیە لەبری ئەوە گێڕانەوەی نەتەوە ركابەرەكان لەلای توركمان و كوردو عەرەب ئاشكرادەكرێن‌و لەفەسڵەكانی تردا لێكۆڵینەوەیان لەسەردەكرێت١.

بەڵام ئەوەش رێگر نابێت لەوەی هەندێك راستی تاڵ لەبارەی كەركووك و ناوچەكانی دەوروبەرییەوە ساغ بكرێنەوە، كە گونجاون بۆ تێگەیشتن لە بارودۆخی ئێستای شارەكە.

بێگومان جوگرافیای كەركووك و بەرزونزمی زەویەكەی جێگەی بایەخی یەكلاكەرەوەیە بۆ تێگەیشتن لە هۆكاری ململانێی هەرسێ پێكهاتەكە لەسەر شارەكە.

كەركووك خاوەنی مێژوویەكی سیاسییە و ئەوەش لەرێگەی پەیوەندی بە هێزە ئیمپراتۆریەكانەوە (عوسمان یاخود بەریتانی ) یە، كەسەپێنراوە، ئەمە جگە لە پێگە ئیداری لەچوارچێوەی دەوڵەتدا.

دیارە هێشتا رووداوەكانی ئەم دواییەش كاریگەری زۆریان هەبووە لەسەر بارودۆخی ئەمڕۆی شارەكە، كە دەكرێت زۆر بەرودی و بابەتیانە بەرباسبخرێن.

بێگومان ململانێی نێوان شۆڕشگێڕانی كورد بەرابەرایەتی مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ حكومەتی عێراقی كە لەژێر ركیفی سەددام حسێندا بوو، كە لەهەفتاكانیشدا خۆی سەرۆكایەتی كرد، بوە هۆی دروستبوونی ئەو دینامیكە پڕ بایەخەی كە ئێستا لەپشت زۆرێك لەگرفتەكانەوەیە.

١-بەشێكمان تایبەت نەكردووە بە تاوتوێكردنی دیدگای مەسیحیەكان/ئاشووریەكان،هەرچەندە مەسیحیەكان پێكهاتەیەكی گرنگن لەمۆزایكی ئیتنیكی-مەزهەبی عێراقدا و پەیوەندیەكی دوورودرێژیش بەكەركوكەوە گرێیان دەدات( لەراستیدا لەهەر پێكهاتەیەكی تر پەیوەندیەكی قوڵتری هەیە) بەڵام ژمارەیان لەكەركوكی هاوچەرخدا دیاریكراوەو ئەوەش وایكردوە نەبنە خاوەنی ئەو دەنگەی كە كاریگەری هەبێت لەمونازەرەكانی لەمەڕ داهاتووی شارەكەدا ، هەروەك ئەوەی كە كورد توركمان و عەرەب هەیانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەهەر كاتێكدا گونجاو بێت ئەوا لە دووتوێی كتێبەكەدا ئاماژە بە مەسیحی و ئاشووریەكان دەكەین.



PDF 4 KURD

بەهەمان شێوە دەکرێت بەرەنگاری زۆرێك لە گریمانە باوەکان ببینەوە سەبارەت بە دیمۆگرافیای کەرکووك بەرەنگاریبوونەوەیەك کە باوەڕی بە لێکۆڵینەوەی ژمارە ئاشکراو بەردەستەکان هەبێت لەپرۆسەی سەرژمێری دانیشتوان کە لەعێراقدا ئەنجام دراون.

دواجار بەشێوەیەکی رێژەیی تێگەیشتن لەکاریگەری نەوت لەسەر گەشەی کەرکووك و داهاتووی ئاسانتر دەبێت. هەروەها بەر لە دەستکردن بە پێشکەشکردنی گێڕانەوەی نەتەوە و پێکهاتە ناکۆکەکانی کەرکووك باشتر وایە سیاقی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی مێژووی کەرکووك هەرلە دێر زەمانەوە تا ئێستا فەراهەم بکرێت ئەویش بەبەرباسخستنی بنەچەی شارەکەو گەشەکردنی لەسایەی ئیمپراتۆریەتە یەك لەدوای یەکەکان و ئەو نەهامەتی و ناخۆشیانەش کە لەسەدە بیستەمدا هاتوونەتە ئاراوە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# فەسڵی یەکەم

## کەرکووک بەر لە عێراق

کەرکووك وەك شارو ناوچە بەجوگرافیا سروشتیەکەی و لە سەدەی بیستەمیشدا بە جوگرافیا سیاسی_ئابووریەکەی دیاری دەکرێت.

کەرکووك دەکەوێتە دەشتی میزۆپۆتامیا، کە چیای زاگرۆس لـەباکووری خۆرهەڵاتیدایـەو هەرچی سنووری باکووری خۆرئاوای بازنەی نفوزی کەرکووکیشە بەزێی خـوار نەخشەکێشـراوەو رووباری دیالەش کەتوەتە باشووری خۆرهەڵاتیەوە.

لەباشووری خۆرئاوای کەرکووکیش بەرزاییەکانی چیای حەمرینـە- کـە کـورد بـەو پـەڕی سـنووری کوردسـتانی باشـووری دادەنێـت- ئاسـتەنگێکی سروشـتیە لـەنێوان کـەرکووك و ناوچەوشکەڵاتەکانی باشووردا ١.

1- Kramers, J.H.2008.(Kirkuk,) Encyclopaedia of Islam Beaman ,P.,Th.Bianquis,C.E.Bosworth,E.van Donzel and W.P.Heinrichs(eds).Leiden:Brill

ئەم ناوچەیە- كە بەكردەیی لەسەدەی بیستەمدا بووەتە پارێزگای كەركووك- لە سەرچاوەی ئاوویی زێی دیجلەو زەوییە لەبارە كشتوكاڵیەكانیەوە سوودمەند بووە.

لەكاتێكدا ئاستەمە بەوردی بزانرێت كێن ئەوانەی ئەوناوچەی نیشتەجێبوونەیان دۆزیوەتەوە كە گەشەی كردوەو دواجاریش كەركووكی نوێی لێكەتوەتەوە.

دیارە كۆدەنگیەكی شیاو هەیە لەئەدەبیاتدا كە باس لەدامەزراندنی یەكەم ناوچەی نیشتەجێبوون دەكات لەلایەن حۆریەكان- نەتەوەیەك بوون، كە لەنزیكەی ٢٤٠٠ی بەر لەزایین لە باشووری ناوچەی قەوقازەوە داكشاون وزنجیرەیەك شانشین ودەوڵەتی یەك لەدوای یەكیان لە چیاكانی زاگرۆس و دەشتی میزۆپۆتامیادا دامەزراندووە.

یەكێكیش لە بەناوبانگترین ئەوشانشین و دەوڵەتانە شاری ئارافا_Arrapha یە، كە لەسەروبەندی ساڵی ٢٠٠ ی بەر لەزایین وەك دەوترێت لەسەر وێرانە شارێكی دێرینی ئاشووریەكان دامەزراوە١.

دامەزراندنی كەركووك — بەر لە نزیكەی پێنج هەزار ساڵ _ كێشمەكێشی گەورەی فیكری لەسەردەمی نوێدا لەنێوان كوردو ئاشووریە مەسیحیەكاندا دەتەقێنێتەوە.

هەرچی كوردە پێیوایە ئەوان سەر بەحۆریەكانن سەربای ئەو راستیەی كە هەیە سەبارەت بەزمانی حۆریەكان كە سەر بە خێزانێكە جیاوازە لەزمانی كوردو هیندۆئەورووپی.

بۆنموونە كەمال مەزهەر لە دەستپێكی كتێبەكەیدا(كركوك وتوابعها Kirkuk and its Dependencies_ ئاماژە بەو بەڵگەنەویستییەی مێژوو دەكات سەبارەت بەدامەزراندنی كەركووك لەلایەن لۆلۆی و حۆریەكانەوە، كەهەردو ئەو گەلەش رۆڵی بنچینەییان بینیوە لە پێكهێنانی گەلی كورددا٢.

هەروەها بۆچوونی تری هاوشێوە هێما بەوە دەكات، كورد راستەوخۆ لە گەلان و ژیارە دێرینەكانەوە سەرچاوەیان گرتوە، هەروەك ئەوەی كوردیش بۆخۆی لەدەبیاتیدا ئاماژەی پێكردووە.

بۆنموونە میهرداد ئیزادی، بنەچەی كورد لەچوارچێوەی شیكاریدا نەك هەر بۆحۆریەكان دەگەڕێنێتەوە بەڵكو بۆ رۆژگارێكی دێرینتر كە كەلتووری هەلەفیەكانە_Halaf دەگەڕێنێتەوە

---

١- مەزهەر،كەمال.٢٠٠٤"كركوك وتوابعها"، هەولێر.وەزارەتی رۆشنبیری:٦.

٢ - هەمان سەرچاوە. Izady,M.1993.(Exploring Kurdish Origing.)Kurdish Life,7.

كە نزیکەی بەرلە هەشت هەزار ساڵ لەئارادابووە١.هەرچی ئاشووریەکانیشە سوورن لەسەر پەیوەستبوونیان بە ئەو ئیمپراتۆریەتەی ناوی ئەوانی هەڵگرتووە و کەرکووکە ئەسڵییەکەش _ئارافا_شارێکی ئاشووری بوەو هەرنەتەوەیەکی دیکەش کە دواتر هاتوون، هەژموونی خۆیان بەسەرشارەکەدا سەپاندووە، بەڵام نەیانتوانیوە بانگەشە بۆ دامەزراندنی بکەن.

بێگومان کێشەی ئەم پاساوهێنانەوەیەش بۆ سەلماندنی پەیوەندی نێوان گەلانو نەتەوە نوێکان و گەلان و ئەوئیمپراتۆریەتانەیە کە بەر لە هەزاران ساڵ بوونیان هەبووە. تەنانەت ئەگەر توانراش پەیوەندیەکە بسەلمێنرێت ئەوا برەودان پێی بۆئەوەی سەنگێکی سیاسی هەبێت لەپاش هەزاران ساڵ دەبێتە ئەرك و تەحەدایەك بۆ ئەو کەسەی ئەوکارە دەگرێتە ئەستۆ.

رەنگە ئەوەی پتر پەسەندترە لە وبیرۆکەیەکی کە دەڵێت کورد نەوەی حۆریەکانە، ئەو بۆچوونە بێت، کەپێیوایە بنەچەیان بۆ گەلانی تر دەگەڕێتەوەو ناوی ئەو گەلانەش لە نووسراوی ئیمبراتۆرەکانی میزۆپۆتامیادا هاتووە.

ناوی کۆتیەکان(Quit) کە بەدێرینترین ناوهێنانی کورد دادەنرێت یەکێك بوون لەو گەلانەی لەچیاکانی زاگرۆسی هاوسنووری دەشتی میزۆپۆتامیا نیشتەجێبوون و پاشان ئارافاش لە بەرایی ساڵی ٢٤٠٠ی بەر لەزایینەوە٢، بە پایتەختی کۆتیەکان ناوبراوە.

دواتر دەردەکەوێت لە رووداوە مێژوویيە یەك لەدوای یەکەکاندا کۆتیەکان لەسەر دەستی ئاشووریەکان لە هەزارەی دووەمی بەر لە زایین دەبەزێنرێن و لەسایەی حوکمڕانیاندا ئارافا گەشە دەکات و دەبێتە شارێکی مەزن و گرنگ.

بەڵام تەحەدیەکی نوێ لەفۆرمی هۆزە هیندۆ- ئەوروپایەکاندا ئەوانەی لە خۆرهەڵاتی چیای زاگرۆسەوە داکشاون دەردەکەوێت.

لەو هۆزانەش میدەکان سەریانهەڵداوە- کە کورد ئەوانە بە رەچەڵەکی خۆیان دەزانن و لەساڵی ٦١٥ی بەر لەزاییندا ئاشووریەکانیان بەزاندوە٣.

پاشان کەرکوك لەمیدەکانەوە چووتە دەستی پارسیانەکان و دواتریش لەماوەی ٢٢٦-٦٥١ی دوای زایین کەوتوەتە دەست ساسانیەکان.

---

1-www.xs4all.nl/-tank/Kurdish/htdocs/his/org.html

2 -E lphinstone,w.g.1946.(The Kurdish Question)International Affairs,22,1:92

3 -Diakonoff, I.M.1985.(Media.) In I.gershevitch (ed) The Cambridge History of Iran:Volume 2: The Median and Achaemenian Period. Cambridge: Cambridge University Press:48-9;Roux,G.1964.



PDF 4 KURD

خۆ ئەگەر کەرکووك دەکەوێتە ناوچەیەکەوە کەلای ساسانیەکان بە گارمکان Garmkan ناوبراوە( ئەم ناوە لەلای کورد بە ناوچەی گەرمیان ناودەبرێت Garmian کە بەواتای وشە "ناوچەیەکی گەرم" دەگەیەنێت)، ئەوا کلتووری کەرکووکی مەسیحی لە ریشەیدا بۆ فەرمانڕەوایی ساسانیەکان دەگەڕێتەوە لەماوەی ٢٢٦ - ٦٥١ ی دوای زایین، پاش ئەوە شارەکە بوە سەنتەرێکی گرنگی نەستۆرەکان، ١ سەرباری ئەوەی بۆخۆشی سەنتەرێکی گەوەری ئیدار بوو٢.

ئەوەی جێگەی سەرنجە نە لە مێژووی کەرکووکی مەسیحی و نە لە مێژووە کوردیەکەیدا ئاماژە بە بوونی عەرەب نەرکراوە تەنانەت لە ماوەی ساسانیەکانیشدا - بەهەمان شێوەش ئاماژە بە تورکمان نەکراوە ئەویش لەبەر ئەوەی کۆچکردنیان بۆ کەرکووك بەو قەبارەیە نەبووە کە کاریگەری هەبووبێت.

لەدوای رووخانی ساسانیەکانیش کەرکووك (کە ئەو دەم بە کۆمەڵێك ناو دەناسرا "کرخا دبیس سلوخ، کرخینا"٣، بۆماوەیەکی کەم کەوتە ژێر دەسەڵاتی نەوەکانی بێگتگنید Begteginidەوە کە هەولێر بارەگای بوو بەر لەوەی بچێتە سەر ئیمپراتۆریەتی عەباسیەکانەوە.

هەرچی دەرکەوتنی عەرەبیشە لەگەڵ بەرەو پێشچوونی شالاوەکانی ئیسلام بۆ ولاتی میزۆپۆتامیا و چیاکانی زاگرۆس لەباکوورەوە خۆی دەبینێتەوە.

مێژوونوس کەمال مەزهەر دەڵێت فەتحی ئیسلامی یەکەمین لێکەوتنی راستەوخۆو فراوانی عەرەب بووە بۆ کوردو کوردستان و کەرکووك و پاشبەندەکانی٤.

هاوکات ئەو مێژوونووسە جەخت لەوە دەکاتەوە ئیسلام بارودۆخی کۆمەڵایەتی و کلتووریی کوردی بەئاسانی نەگۆڕی و رووبەڕووی هیچ تەحەددایەکیش نەبوونەوە لەسەر خاکەکەیان، بەڵکو ئاماژە بەوە دەکات، کە کورد بەپیر زمانی عەرەبی و قورئانەوە چوون و لەلایەن خۆشیانەوە

---

١- نستۆریوس Nestorious گەورە ئەساقیفەی قستنتینیە ٤٢٨-٤٣١، دامەزرێنەری ئەو باوەڕگەیەی کە دەبێژێت مەسیح لە دوو کەسدایە، مەسیح لە فۆرمی پیاوو و مەسیح وەك کوڕی خواوەند. پەیڕەوکارانی ئەم باوەڕگەیە —نەستۆرەکانی کلێسای ئاشووریەکان خۆرهەڵات-لەکلێسا بیزەنتی جیابوونەوە، پاش ئەوەی باوەڕگەکەیان لەلایەن ئەنجوومەنی ئافیسوس Ephesus Councilmەوە لەساڵی ٤٣١ سەرکۆنە کرا.

2 - Oates, j. The Fall of Assyria; In J.Boardman et at(eds) The Cambridge Ancient History, 2nd ed.Cambridge University Press:193.

٣- Kramers op.cit هەمان سەرچاوە.

٤- مەزهەر،هەمان سەرچاوە:١٣.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دەمێنسازانی عەرەب دانیان بە ناسنامەی کوردبوونی کەرکووکدا ناوە١. ڕەنگە پەسەندکردنی ئەوەش کەمێك گرانیش بێت ئەویش لەبەر نەبوونی بەڵگەیەك بۆ ئەوەی خودی کورد یان ئەوانیتر هۆزە جۆربەجۆرەکانی زاگرۆسیان بە کورد ناوبردبێت، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئەو بنەچانەی کورد لەدوای ئەوەی چوونە سەر ئایینی ئیسلام بارودۆخەکەیان گۆڕانی بەسەردا هات.

بەهاوبەشی لەگەڵ کوردو ئاشووریەکاندا، تورکمانەکانیش بوونی خۆیان لەعێراقدا نەك بۆ رابردوویەکی دیرین دەبەستنەوە بەڵکو بوونیان بە ئەرکی جوامێرانەو ژیارە بەهێزەکانەوە گرێدەدەن.

بەڵام بەپێچەوانەی کوردو ئاشووریەکان دیدی تورکمان بۆ بوونیان لەعێراقدا بۆ سەردەمێکی نوێ دەگەڕێننەوەو دان بەوەشدا دەنێن، کە ڕەچەڵەکیان بۆ هۆزە تورکەکانی ئاسیای ناوەند دەگەڕێتەوە کە بەرەو نیمچە دورگەی ئەنادۆڵ و عێراق لەچەند شەپۆلێك و لە چەند سەدایەکدا داکشاون و ئەو کۆچکردنەش لەرۆژگاری ئیمپراتۆریەتی عەبباسیدا لەوپەڕیدا بووە.

یەکەمین جار کە ئاماژە بە بوونی تورکمان کراوە لەعێراقدا بۆ سەدەی حەوتەم دەگەڕێتەوە، ئەویش بەو پێیەی سەربازی نێو ریزەکانی لەشکری شاڵاوبەری ئیسلامی بوون.

تەبەری ئاماژەی بە والی ئەمەوی لەعێراق عەبدوڵڵا کوڕی زیاد کردوە، کە ڕابەرایەتی نزیکەی هەزار جەنگاوەری تورکمانی لەم وڵاتە کردووە٢.

خۆئەگەر ئەمە راست بێت ئەوا پەیوەندی لەوجۆرە هەوڵدانە بۆ پێدانی جۆرە ڕەوایەتیەك بەبوونیان، بەتایبەتیش هەریەك لەکوردو ئاشووریەکان بانگەشە بۆ پەیوەندی مێژوویی دێرینتری خۆیان بەناوچەکەوە دەکەن. بەڵام ژمارەی جەنگاوەرە موسڵمانە تورکەکان سنووردارەبوون و ئەوەش نەبووەتە هۆی دروستبوونی ژمارەیەکی زۆری تورکمان تا ئەو کاتەی کۆچی هۆزەکانی ئاسیای ناوەند بەتایبەتیش هۆزەکانی ئۆغۆز لەکۆتاییەکانی سەدەی حەوتەمدا دەستیپێکردووە، کەکۆچێکی فراوانیان بەرەو خۆرهەڵاتی ناوڕاست و ئەنادۆل کردووە٣.

---

١ -هەمان سەرچاوەی پێشوو:١٤.

2 -Al-Hirmizi, E.2003. The Turkmen and Iraqi Homeland. Istanbul:Kerkuk: Vakfi:16;Kerkuki,I.2002.

(پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی نێوان کوردو تورکمان لەشاری کەرکوکدا)، لە(کەرکوك شاری پێکەوەژیانی نەتەوەکان). لەندەن، سەنتەری کەربەلا بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوە:٣١٢: هەروەها

Kerkuki,I.2007.Turkmen of Dublin: no publisher:18.

٣- کەرکوکی ،هەمان سەرچاوە،٣١٢، یەکەمین ئاماژەی ژێدەرە ئیسلامیەکان بەگەلی ئۆغۆز-تورکمان Oghuz-Tjrkmen ، دەگەڕێتەوە بۆ ناوڕاستی سەدەی یانزەیەم. بڕوانە:

پتەوبوونی پەیوەندی تورکمان و ئیسلام بۆ رۆژگاری خەلیفەکانی عەبباسی دەگەڕێتەوە، کە زۆر پشتیان بە و تورکمانانە بەستووە کە لەسوپادا خزمەتیان کردووە. بەڵام پەیوەستبوونی راستەوخۆ و بەهێزی تورکمان بە دامەزراوەکانی فەرمانڕەوایی لەعێراقدا لەماوەی حوکمڕانی سلجوقیەکاندا بووە لەسەدەی یانزەیەمدا.

هەروەها هاتنی ژمارەی زۆری تورکمانەکان بۆ عێراق لەگەڵ داگیرکاری تۆغرۆلدا، کە فەرمانڕەوایی دووەمی نەوەی سەلجوقیەکان بووە و لە ساڵی ١٠٥٥دا سەرکردایەتی لەشکرێکی کردوە، کە زۆربەی جەنگاوەرەکانی تورکمان ئۆغوز بوون.

ئیمپراتۆریەتی سەلجوقی دەوڵەتێکی سەربازی بوەو لەهێزی سەربازیشدا بە زۆری پشتی بە تورکمان ئۆغوز بەستوەو دواتریش بەهەمان شێوەلە فەرمانگەکانی فەرمانڕەوایدا.

سەلجویەکان لەپێناو پاراستنی ئیمبراتۆریداگروپە تورکمانیەکانیان بەدرێژایی رێگە گرنگەکانی بازرگانی جێگیرکردوە، بەتایبەتیش لەسەر هێڵی تەلەعفەر- هەولێر- کەرکووك- مەندەلی کە ئێستا تورکمان بە "تورکمان ئیلی"_ خاکی تورکمان ناویدەبات.

تورکمانەکان کە رەچەڵەکیان بۆ ناوچەکانی ئاسیای ناوڕاست دەگەرێتەوە پشت و پەنای فەیلەقی سەلجوقییە موسڵمانەکان بوون و بەپلەی یەکەمیش لێپرسراو بوون لە زیندوێتی کۆمەڵگەی ئیسلامی١.

لەسەدەی هەڤدەیەمدا کەرککوك لەبن دەسەڵاتی سەلجوقەیەکان مایەو دواتریش دەسەڵات چووە دەست نەوەکانی زەنکی تورکییەوەکە سەنتەرەکەیان لەموسڵ بوو٢.

بەڵام ئەو سەردەمە تەمەنی کورتخایان بوو، چونکە هێزێکی تازە لەخۆرهەڵاتەوە بەرەو عێراق و ناوچەکە هات و بەدرێژایی سەدەکانی دواتر بەردەوام بوو.

شاڵاوی داگیرکاری مەغۆلەکان لەقولایی ولاتانی ئیسلامیدا بووە هۆی هاتنی ژمارەیەکی زۆری کۆچبەران لە ئاسیای ناوڕاستەوە بۆ ئێران و عێراق و سوریاو ئەنادۆڵ و قەوقاز، کە لەنێو

---

Wood,J.1999 .The Aqquyunlu:Clan, Confederation, Empire.Salt Lake City,UT: University of Utah Press:25-26.

1 -Hodgson, M.G.1974. The Venture of Islam: Conscience and History in a World Civilization. Volum 2:The Expansion of Islam the Middle Periods. Chicago,IL: University of Chicago Prees:400.
2 -Nakip, M.2004 the Identity of Kirkuk. Columbia University Turkmen Symposiun, November.



PDF 4 KURD

ئەو کۆچبەرانەشدا خودی مەغۆڵەکانی تێدابوو، هەروەها ئە تورکمانانەش کەمتر نەبوون کە شاڵاوەکانی مەغۆل کۆچی پێکردبوون١.

شوێنەواری داگیرکاری مەغۆل زۆربوون، لەوانەش لاوازکردنی سەقامگیری خەلافەتی عەباسی کە رۆژێك بوو لە بەغداد بەهێز بوو.

لەژینگەیەکی سیاسی و کۆمەلایەتی وەك ئەوەی وودز( woods)بە"کۆمەڵگەی دوولایەن"ناویدەبات، کەسەرکردەکانی جەنگ (تورك)ی کۆچەری و دانیشتوانی ناوچەکە، کەداگیرکاری بەرۆکی گرتبوون، لەخۆگرتبوو، تورکمان وەك گردبوەوەیەکی فەرمانڕەوا لەباکووری عێراق‌و ناوچە دوورەکانی دیکەی باکوور سەریانهەڵدا، ئەویش وەك دەرئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە گەورەیەی جوگرافیا کە بەهۆی داگیرکاری مەغۆلەکانەوە کەوتەوە٢.

خۆ ئەگەر فیدراسیۆنی خێڵەکانی تورکمان لەوانەش (قەرە قۆینلۆ- بەرخی رەش، ئاق قۆینلۆ- بەرخی سپی) خرانە ژێر رکێفی سیستمی سیاسی مەغۆلەکانەوە، ئەوا ئەوکارە لەجێگەی خۆیدا بوو بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی سیاسی کە بەهۆی لاوازبوونی دەسەڵاتی ئەمیرە مەغۆلیەکانی جەنگەوە هاتبوە ئاراوە.

ئەو فیدراسیۆنە خێڵەکییەی تورکمان لەماوەی هەردو سەدەی چواردەیەم و پانزەیەم حوکمی لە ئێران و تورکیاو سوریاو عێراق کرد و بەرپرسیاریش بوو لە کۆچی نەتەوە بەبنەچە تورکەکانی ئاسیای ناوڕاست بۆ عێراق.

دیسان هێزی سەربازیی تورکمان دانپێدانانی هێزەکانی تری بەدەستهێناو بەئاسانیش هۆزە تورکمانەکان خزێنرانە نێو ئامێری سەربازی ئیمپراتۆریەتی سەفەویەوە.

ئەو جەنگاوەرە تورکمانانە ئینتیمایەکی بەهێزیان بۆ ئیسلامی شیعی هەبوو، کە دەوڵەتی سەفەوی لەسەر دامەزرێنرابوو.

ئەوانەبوونە هێزی بەسامی سەفەویەکان، کە بەقزڵباش(سەرسوور) دەناسران ئەویش بەهۆی ئەو کلاوە سوورەی کە لەسەریان دەکرد.

شائیسماعیلی یەکەمیش دەیزانی کە گرنگی عێراق بۆ ئیمپراتۆریەت چییە، بەتایبەتیش لاپاڵی بەپیتی چیاکانی زاگرۆس و دەشتە هاوسنوورەکانی، هەربۆیە بەئەنقەست ژمارەیەکی زۆری لە

---

١ - Woods، هەمان سەرچاوەی پێشوو،٣.

٢ -هەمان سەرچاوەی پێشوو،٢٨.

قزلباشەكانی هەواداری لەناوچەكانی دەوروبەری كەركووك و توزخورماتوو نیشتەجێكردو، دەسەڵاتی حوكمكردنی پانتاییەكی فراوانی زەویشی بەخشیە سەركردەی هۆزەكان١.

هەندێك پێیان وایە دابەشبوونی توركمان بەسەر تایەفەی سوننەو شیعەدا راستەوخۆ پەیوەندی بەنیشتەجێكردنی هۆزەكانی قزلّباش(هەرتیقی- Heretic)ەوە هەیە لەلایەن سەفەویەكانەوە، كە دواتریش عوسمانیەكان بوون و ژمارەی توركمانی سوننەیان پتەووزیاتر كرد.رەنگە هەر ئەوەش بووبێتە هۆی ئەوەی كە زۆرینەی دانیشتوانی توركمان لەسەنتەرەكانی ئیدارەی كەركوك (بەتایبەتیش خودی شارەكەوشارەوانیە گەورەكان)، سوننە بن و توركمانە شیعەكانیش لەگوندەكانی پارێزگاكەدا جێگیربووبن.

## ئیمپراتۆریەتی عوسمانی

لەدوای هەرەسی مەغۆل، ئاژاوە باڵی بەسەر باكووری عێراقدا كێشا، هەروەها ئاماژەی زۆری توركمانە هاوچەرخەكانیش بۆ ئەو سەردەمە تەنیا دیدێكی رۆمانسیانەیە بۆ ئەو ئیمپراتۆریەتە ئاوابووانە. بەڵام لەگەڵ فراوانبوونی ئیمپراتۆری عوسمانی لەسەدەی شانزەیەمدا پێگەی توركمان لەكۆمەڵگەی نوێی عێراقیدا جێگەی خۆی كردەوە و لەپاش شاڵاوی سلێمان قانونیش بۆ عێراق لەساڵی ١٥٣٥ی زایینی كەركوك بەشێوەیەكی جێگیرتر كەوتە ژێر ركێفی عوسمانیەكانەوە، كە لە تۆماری عوسمانیەكاندا بە "غۆكیورت"یان "نیشتمانی شین"ناوی هاتوە و ئەوەدەمەش ناسنامەی شاری كەركوك ناسنامەیەكی توركی پێدراوە٢.

لەسایەی عوسمانیەكاندا كۆچی تر بەرەوباكووری عێراق روویداوە و لەو ماوەیەشدا بەتایبەتی بانگەوازی توركمانە هاوچەرخەكان بۆ پەیوەستبوونیان بە وڵاتی ئەنادۆڵ و دەوڵەتی توركیاوە بووە.لەراستیدا ئەو داواكارییە بەشێوەیەكی بەرچاوو بەهێز پێشنیازكراوە و وەك "حنا بتاتۆ"ش ئاماژەی پێكردووە، نەژادپەرستی رۆڵی گرنگی هەبووە، لە دروستكردنی "ئەرستۆكراتی"فەرمانبەران لەعێراق لەدوا رۆژەكانی دەسەڵاتی عوسمانیدا٣.

---

1 -Huerwiz,J.C.1968.(Military Politics in the Muslim Dynastic States,1400-1750). Journal of the American Oriental Society,88,1:96-104.

٢- ناكپ Nakip ، هەمان سەرچاوە،٢

٣- بگاگو, Batatu,H.1978.The Old Social Classes and Revolutionary Movements in Iraq :A Study of Iraq's Old Landed and Communist, Ba atheists and Free Office Princeton NJ, Princeton University Press :212.

لەعێراق و لەماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا بانگەوازی ئینتیمابوون بۆ رەچەڵەکی تورکی بەپێی قەواڵە ماقوڵەکان، کلیلی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و سیاسی بووە، تەنانەت خێزانە تورکەکان کە سەر بە توێژە کۆمەڵایەتی- ئابوورییە باڵاکانی عێراق بوون گرنگترین پۆستی دەزگای ئیدارییان لەدەستدابووە.

هەندێك لەو خێزانانە لەگەڵ سوپای سوڵتان موراد لەساڵی ١٦٣٨ هاتوونەتە عێراقەوە، هەندێکی دیکەشیان دواتر لەگەڵ کەسایەتە ناسراوەکانی دیکەی عوسمانیەکاندا هاتوون.

وەك بەڵگەنەویستیەك کەرکوك بەلای ئەو خێزانانەوە زۆر جێگەی بایەخ بووە، چونکە بنەماڵە بەرەچەڵەك تورکەکان بەدرێژایی رۆژگارێك پۆستی باڵایان لەدەستدا بووە١. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناوچەکە هەر بۆن و بەرامێکی بەهێزی کوردانەی هەبووە و عوسمانیەکانیش لەکەرکوك و لەنزیك سنوورەکانی ئیمپراتۆری توند بوون و بەزەرورەتیش پشتیان بە میرو پیاوماقوڵانی کورد لەناوچەکەدا بەستووە بۆ پاراستنی ناوچە سنووریەهەستیارەکانی خۆرهەڵات.

جا بەدیدی ئەوان ئەو "میر"انە کوردبووبن یان زیاتر گرنگییان بە پێگەی کۆمەڵایەتی- ئابوورییان دابێت، ئەوا بێگومان ئەوە پرسیارێکی رەوایە بەڵام گێرانەوەی کوردی لەدیاریکردنی سروشتی بارودۆخەکە بەروونی تەئکید لەسەر دیدگای یەکەم دەکاتەوە، بەجۆرێك هەریەك لەسۆران و بتلیس و ئەردەڵان و بابان لەو شوێنانەی تر بوون، کە بەمەکۆی بزوتنەوە سەرەتاییەکانی ناسیونالیزم وەسف دەکرێن و سووربوون لەسەر بەرگریکردن لە زەوییە کوردیەکان لەدژی زیادەرۆیی سەفەویەکان.

هەربۆیە زووش کەرکوك لەنێو ئەو نووسینانەدا بووەتە جێگەی بایەخو بە پایتەختی شارەزوور کە لە ٣٢ ناوچە پێکهاتووە، ناوبراوە٢.

یەکێك لەو سەرچاوانەی کە بانگهێشکارانی کورد ئارەزووی ئاماژە پێکردنی دەکەن بۆ تەئیکد کردنەوە لە سەر کوردبوونی "کەرکووك"، ئەو ژێدەرەوە لەلایەن مێژوو نووسی عوسمانی"شەمسەدین سامی"یەوە نووسراوە.

لەوکارەیدا"قاموسی ئیعلام"کە لە ساڵی ١٨٩٧ بڵاوکراوەتەوە، باس لە شاری کەرکووك دەکات کە دەڵێت سێ بۆ چواری دانیشتوانەکەی کوردن و بەو چارەکەی تریش کە دەمێنێتەوە عەرەب و تورکمان و ئەوانی دیکەن.

---

١ - هەمان سەرچاوە.

٢ -کرایمرز – Kramers هەمان سەرچاوە.



PDF 4 KURD

خۆ ئەگەر کورد ئەو سەرچاوەیە وەك بەڵگەیەکی روون بۆ تەئکید کردنەوە لە زۆری ژمارەی خۆیان پەنای بۆ دەبەن، ئەویش نەك هەر بەتەنیا لەناوچە گوندنشینەکان بەڵکو لە خودی شارەکەدا، ئەوا ئەو بنەمایەی کە ئەو مێژوونەشە لەدیاریکردنی ستراکچەری دیموگرافیای دانیشتوانی کەرکووك پشتی پێبەستووە، روون نییە.

هەروەها هەوڵوێستیشی جیاوازە لەگەڵ هەڵوێستی چاودێرانی دیکە کە بەماوەیەکی کەم دوا بەدوای ئەو هاتوون، هەروەها لەلایەن زانایانی تورکمانیشەوە بەتەواوتی رەتیدەکەنەوە١.

وادیارە بەدەر لە وردبینی"قاموسی ئیعلام"، پێکهاتەی ئیتنیکی کەرکووك لەسەردەمی عوسمانیەکاندا بەئاشکرا دیاری نەکراوە و وێنای دەستەبژێریش وێنایەکی ئاوەژووکراوە لەنێوان دەسەڵاتداران عوسمانیو میرە کوردەکاندا.

هەروەها ئەو ئاوەژوو بوونە زیاتر دەبێت کاتێك مرۆڤ ژیانی رۆژانەی شارێکی عوسمانی بەهەند وەربگرێت، لەبەر ئەوەی کورد و عەرەب و تورکمان بەدوور لەیەکتر نەبوون و وەك ئاشکراشە هەردوو زمانی عەرەبیو کوردی دوو زمانی باو بوون و زمانی تورکی عوسمانیش کەمتر بووە بەتایبەتیش لەناوچە گوندنشینەکاندا، ئەویش بەو پێیەی دوو ئامرازی نارەسمی بەیەکگەیشتن بوون.

دیسان وشەی"تورکمان" بەتایبەتیش لەدوا رۆژەکانی ئیمپراتۆری عوسمانیدا بەزەرورەت مەرج نەبووە ئەو کەسە لەرووی ئینتیمای ئیتنیکییەوە تورك بووبێت، لەکاتێکدا کوردیبوون ئاوەڵناوێك بووە بۆ ئاماژەدان بە پێگەیەکی جوگرافی کە ناسنامەی گروپێکی ئیتنیکی پێ دیاریکراوە.

پرۆسەی "بەعوسمانیکردن" لەرووی کردەییەوە "بەتورککردن"ی خێرای ئەو ناتورکمانانەی کردوە، کەلە نێو دەزگای ئیدارەی عوسمانیدا کاریانکردووە و ناچاربوون فێری زمانی تورکی عوسمانی بن و پەیڕەوی داب و نەریتی عوسمانیەکان بکەن.

---

١ - یەکێك لەو توێژەرانە ، مۆفەق کەرکوکلو وە ، کە پێیوایە سامی لەبارەی کەرکوك و بەغدادەوە نووسیوویەتی بێ ئەوەی هەرگیز سەردانی شوێنەکانی کردبێت ، هەروەها کۆمەڵێك هەڵەی لەنێو دوتوێی تەواوی کتێبەکەدا ژماردووە.
کەرکوکلو Kerkulu هەمان سەرچاوە.

هەوکات نێوەندەکانی کارو بازرگانیش بەهەمان شێوە ئەوەی خواستووە، چونکە هەڵس و کەوت کردن لەشارە گەورەکاندا لەوانەش کەرکووك پێویستی بە " تورککردن"ی رەچەڵەکی ئەو ناوەندانە بووە١.

کەوابوو ئەوپرسیارەی کەپێویستە بکرێت ئەوەیە، چەند لە تورکمانەکانی ئەمرۆ بنەچە تورکیەکەیان بۆ سەدەی نۆزدەیەم و پێشتر دەگەڕێتەوە، چەند عەرەب یان کورد بەئاسانی فێری تورکی بوون بۆ ئەوەی بە پەیژەی کۆمەڵایەتی- ئابووری ئەو رۆژگارەدا سەربکەون؟ لەواقیعدا ئەوە پرسیارێکی بەسوود نییە، بۆ گەیشتن بەچارەسەرکردنی ئاریشەی ئێستا، کە پەیوەستە بەگەڕانەوەی ناوچە کێشە لەسەرەکانی باکووری عێراق، بەڵام تەئکید لەسەر ئالۆزی بارودۆخی دیوگرافیای ئێستا ناوچەکە دەکات.

ئەوەی مایەی سەرنجە مونازەرەکردن لەسەر زمانی هاوبەش لەکەرکووك یاخود ناسنامەی پێکهاتە ئیتنیکیەکانی لە سەدەی نۆزدەیەمدا باو نەبووە، بەڵکو ئەو دیبەیتە هی سەردەمی نوێیە و بۆ ناوڕاستی سەدەی بیستەم و دواتر دەگەڕیتەوەو لەبناغەشدا پەیوەستە بەهەڵکشانی سیاسەتی ناسنامە لە دەوڵەتی نوێی عێراق و کەرکووك بەتایبەتی، کە خاوەنی مێژوویەکی دوورو درێژی نیشتەجێبوونی فرە ئیتنیکەکان بووە، هەربۆیە قسەکردن لەسەر ناسنامەی راستەقینەی شارەکە یان مافی حوکمڕانی پێکهاتەیەك بەسەر پێکهاتەیەکی تر بەپێی زۆری ژمارەکەی دەبووە هۆی لەبارچوونی سەقامگیری شارەکە.

دیارە فاکتەری یارمەتیدەر لە سەرهەڵدانی ئەو دیبەیتەدا زیاتر پەیوەندی بە ئیستیغلالکردنی نەوت و تەقەلاکانی دەوڵەتەوە هەیە بۆ دوور خستنەوەی ئەگەری هەر هەڕەشەیەك لە ناوچەکانی بەرهەمهێنانی نەوتدا.

### نەوتی کەرکووك

سەرباری ئەوەی هەزاران ساڵە، زانراوە نەوت لەباکووری عێراقدا بوونی هەبووە بەڵام واقیعی ئەم ناوچەیە لە پێشبینیکردنی میانڕەوییەوە بۆ پشکنینی جددییانە دەستی بەگۆڕان

---

١- ئەوەی جێگەی بایەخە پرۆسەکە بەپێچەوانە لە هەولێردا روویداوە، بەبێ ئەوەی پێکهاتەی تورکمان روو بەڕووی پرۆسەی بە"کوردکردن"ببێتەوە لەبەرئەوەی ناوەندی بازرگانی زمانی کوردی بەکاردەهێناوە و رەنگە سروشتی دەزگا ئیداریەکانیش لەهەولێر بەبەراورد بەکەرکوك لەئاستێکی نزمتردا بووبن.

بەردووە، تا ئەو کاتەی هێزی پیشەسازی ئەوروپا پێویستی بە نەوت هەبووە بۆ پیشەسازییە فراوانەکەی یاخود لەحاڵەتی بریتانیادا بۆ بەرێکردنی نەوەی دووەمی کەشتیە جەنگیەکانی.

یەکەمین بەڵگەی بایەخپێدانی دەسەلاتدارانی عوسمانیش بەنەوتی ولایەتی موسڵ (بەکەرکووکیشەوە) بۆ کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم دەگەڕێتەوە، کاتێك سوڵتان عەبدولحەمید کۆمەڵێك ئیمتیازی هەردو ولایەتی موسڵ و بەغدادی بەخشیە "لیستی مەدەنی" حکومەتی، تا دەرفەتی واژۆکردنی گرێبەست هەبێت بۆ دەست بەکارکردن لەو دوو دەڤەرەدا.

ئەوەبوو یەکەمین کاری کنەکردن بەدوای نەوتدا لەعێراق بۆ ساڵی ١٩٠٢دەگەڕێتەوە لەناوچەی "جیاسورخ"، کە لەمڕۆدا دەکەوێتە پارێزگای دیالەوە١.

ململانێی نێوان هێزەکانی ئەوروپا لەسەروبەندی سەدەی نۆزدەیەم لەچوارچێوەی کۆمەڵێك کۆمپانیادا سەریهەڵدا، کە ئارەزووی دۆزینەوەی کێڵگە نەوتییەکانی باکووری عێراق و ئێرانیان دەکرد و هەروەها کاتێکیش گروپگەلە نێودەوڵەتیەکان لەماوەی نێوان ١٩٠٠- ١٩١٤ پێشکەشکرد دەرخستەی خۆیان لەبەرامبەر بەدەستهێنانی ئیمتیازدا٢.

لەساڵی ١٩٠٤دا لیستی مەدەنیانەی عوسمانیەکان لەگەڵ کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی ئەنادۆڵ ـبەپشتیوانی دارایی دۆیچە بانك Deutsche Bank_ گرێبەستێکیان واژۆ کرد، لەپێناو کاری رووپێوکردن لەهەردو ولایەتی موسڵ و بەغداد.

دیسان بۆ ئاگاداربوون لەو گرێبەستەی کە ساڵی پێشووتر لەنێوان کۆمپانیای هێڵی ئاسنینی عوسمانی لەئەنادۆڵ (ئەویش لەژێرکۆنترۆڵ دۆیچە بانکدا بوو) لەگەڵ دەسەلاتدارنی عوسمانی واژۆ کرابوو، بۆ گەیاندنی هێڵی نێوان بەرلین و بەغداد و بۆ زامنکردنی گەیشتنیش بە سەرچاوەکانی ناوچەکە، ئەو گرێبەستە مافی کنەکردن و گەڕان بەدوای کانزادا بەدرێژایی بیست کیلۆمەتر بەهەردولای هێڵە ئاسنینەکەدا بەخشیبووە لایەنەکانی نێو گرێبەستەکە٣.

هاوکات شانشینە یەکگرتوەکان لەبەرامبەر ئەو هەنگاوەدا بێ دوو دڵی دوانەکەوت و ولیام نوکس دارسی کە یەکێك لە ئەندازیارانی دەستپێشخەریەکەی بریتانیا بوو بۆ گەڕان بەدوای

---

1-Earle, E.1924.(The Turkish Petroleum Company-A Study in Oleaginous Diplmacy). Political Science Quarterly,39,2:265-279, quote at 266; Shwadran,B.1955. The Middle Oil and the a Great Powers. London: Atla:193.ntic Pres

2- Slugelett, P.1976. Britain in Iraq.Lonndon: Ithaca Press;103

3-Earle ، هەمان سەرچاوە، ٢٦٦.

PDF 4 KURD

نەوت لەوڵاتی فارسدا، یاداشتنامەیەکی دایە سوڵتان سەبارەت بە و مافانەی کە پێشتر بەخشیبوویە بانکی ئەڵمانی١.

دیارە هەوڵەکانی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، لەکاتێکدا کۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ-ئێرانی(The Anglo- Persian Oil Company(APOC، کە حکومەتی بریتانیا خاوەنی گەورەترین پشکی بوو، هاوکات لەندەن بەلانی کەمەوە درکی بەبوونی یەدەگی گەورەی نەوت دەکرد لە ژێر خاکی ولایەتی موسڵدا.بەڵام دواتر یاریزانێکی تر لەگۆڕەپانەکەدا لەماوەی نێوان ١٩٠٧- ١٩١٢سەریهەڵدا کە خۆی لەهۆڵەندیەکاندا دەبینییەوە.

ئەوەبوو هۆڵەندیەکان سەرکەوتن و بەریتانیەکانیش شکستیان خوارد و دانپێدانانی حکومەتی عوسمانییان بەدەستهێنا بەو پێیەی شایەنی ئەوەن ئیمتیازی نەوتییان پێببەخشرێت.

بەهاتنی ساڵی ١٩١٢، سێ گروپی ئەوروپایی جیاواز چالاکانە لەهەوڵی بردنەوەی ئیمتیازاتدا بوون لەدوو ولایەتدا، لەوانەش دۆیچە بانك و کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی و کۆمپانیای نەوتی هۆڵەندی ئەنگلۆ —ساکسۆنی.

هەریەك لەئەڵمانیاو بریتانیاش زۆرجار خاوەنی پشکی خۆیان بوون لەو کۆمپانیایانە.

بۆرێگرتنیش لەئاڵۆزبوونی بارودۆخەکە و بەلەبەرچاوگرتنی ئیعتیباری سیاسی زیاتر، ئەو گروپەکۆمپانیایە ئەوروپا سووربوون لەسەر دوورخستنەوەی هەر رۆڵێکی ئەمریکا(کە خۆی لە گروپی ئەمریکان چێستەر گروپ- American Cheter Group )دا دەبینییەوە لەناوچەکەدا، تەنانەت بریتانی و ئەڵمان و هۆڵەندیەکان یکەوە هەوڵەکانیان یەکخست بۆ گوشارخستنە سەر حکومەتی عوسمانی تا مامەڵە ی راستەوخۆ لەگەڵ هەردو حکومەتی بریتانیاو ئەڵمانیا بکات (هۆڵەندیەکان لەئاستی پراکتیکیدا لایەنێکی تێکەڵاو بوو بە دەستپێشخەریەکەی بریتانیا)٢.

دەرئەنجامی ئەو دیدارە سێ قۆڵییەی نێوان بریتانیاو ئەڵمانیاو ئیمپراتۆری عوسمانی لەساڵی ١٩١٢ کۆمپانیای نەوتی تورکی (The Turkish Petroleum Company(TPC، هاتە ئاراوە کە پێشتر ناوەکەی کۆمپانیای ئیمتیازی ئەفریقیو خۆرهەلاتی Africa and Eastern Concessions بوو، ئەویش بەمەرامی دەست بەسەراگرتنی سەرجەم مافەکان لەکێڵگە نەوتییەکانی ولاتی میزۆپۆتامیا.

---

1- هەمان سەرچاوە،٢٦٧.

2- Shwadran،هەمان سەرچاوە.

کۆمپانیای نەوتی تورکیایش لەژێر کۆنترۆڵی دامەزراوە بریتانیایەکاندا بوو لەوانەش بانکی نیشتیمانیی تورکی (دوا دامەزراوەی بریتانیا بوو)، کە خاوەنی ٥٠٪ی پشکەکان بوو، هەرچی نیوەکەی دیکەش بوو بەسەر کۆمپانیای ئەنگلۆ_ساکسۆنی و دۆیچە بانکدا دابەشکرابوون.

هێزە ئەوروپاییەکان بەتایبەتیش بریتانیا خواستی ئەوەیان هەبوو بەردەوام بن لەدەست بەسەر دا گرتنی سەرچاوە بەنرخەکان و ڕێگری کردن لە کۆمپانیاکانی ئەمریکا بۆ جێپێکردنەوەی خۆیان لەناوچەکەدا ١.

بەڵام لەگەڵ ئەو سەودانامە بازرگانیانەشدا بەریتانیەکان لەسەر ئاستی سیاسەتی ڕەسمی خۆیان مانەوەو لەبنەڕەتیشدا گوێیان بە ئەگەری بوونی نەوت لەولایەتی موسڵ نەدا تەنانەت تا ماوەیەکی درەنگ خایانی جەنگەکە.

ئەو گۆڕانکارییەش کە بووە هۆی جێگەی بایەخی دەرئەنجامی درککردنی بوو بە قەبارەی یەدەگی نەوت و هەر ئەوەش بوو وای لەبریتانیا کرد لەوبیرۆکەیەی کە هەیبوو، سەبارەت بەدامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لەجێگەیەکی باشووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ و ولایەتی موسڵ پاشگەز بێتەوەو واز لەو بیرۆکەیە بهێنێت٢.

هەڵبەت کۆمەڵێك هۆکاری جۆربەجۆر هەبوون لەپشت پاشگەزبوونەوە بریتانیا لەپشتیوانیکردن لەدامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لە باشووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ کە ڕەنگ بوو ولایەتی موسڵیشی لەخۆبگرتایە.

بەدڵنیایشەوە ئاسایشی پێدەشتەکانی هەڵکەوتووی میزۆپۆتامیا یەکێك بوو لەو هۆکارانە، ئەمە جگە لە زەرورەتی زامنکردنی زۆرترین ژمارە لە ڕعایەی سوننە بۆ سیستمی نوێی پادشایەتی کە بۆ فەرمانڕەوایکردنی عێراق ئامادە دەکرا، لەبەرامبەر ئەو گومانەی لە دانیشتوانی شیعەی باشوور هەبوو.دیارە ئەوەش بەو واتایە نییە بەریتانیەکان بێ ئاگابووبن لە سامانی نەوتی ولاتی میزۆپۆتامیا، بەپێچەوانەوە بەڵگەی روون و ئاشکرا هەیە لەسەر بوونی (لۆبی) بەهێز لە نێو حکومەتی بریتانیادا کەبەلانی کەمەوە لەهەشتاکانی سەدە نۆزدەیەمدا سەریهەڵداوەو ئەوەش خۆی

---

1- Sluglett، هەمان سەرچاوە،١٠٣-١١٦.

2- Brown, P.1924.(From Servers to Lousanne.). The American Journal of International Law,18,1, January:113-116, reference to 113. Also see Beck,P.('A Tedious and Perilous Controversy': Britain and the Settlement of theMosul Dispute), Middle Eastern Studiesm Vol.17,No.2,pp.256-276.



PDF 4 KURD

لەسەرکردە سەربازیەکاندا بینیوەتەوە، لەوانەش ونستۆن چەرچل کە رۆڵی فاکتەرێکی یارمەتیدەری دیوە لەگۆڕینی ئەو بەرژەوەندیانە بۆ ستراتیژ و دواجاریش نەخشە رێژی سنووری عێراقی لێکەوتوەتەوە، کە ولایەتی موسڵی بە کەرکووکیشەوە لەخۆگرتوە١.

بەهاتنی ساڵی ١٩١١ یەکێك لە کارەکانی چەرچل وەزیری دەریاوانی و لێپرسراوی گەورەترین هێزی ستراتیژی و سەربازی لەبەریتانیا و سیمبولی زۆرداری ئیمپراتۆر بریتانی تاوتوێکردنی چۆنیەتی برەودان بووە بە هێزی دەریاوانی پادشایەتی لەداهاتوودا و هەروەها چۆنیەتی بەگەڕخستنی تەکنەلۆژیای نوێ لەگۆڕینی هاوسەنگی هێز لە نێوان ململانێی گەشتیگەلەکانی هێزە ئەوروپایەکاندا.

هاوکات چەرچل کەشتیگەلێکی لەپاش بەجێما کە پشتی بە سووتەمەنی نەوت دەبەست لەفراوانکردن و برەوپێدانیدا٢. جا بۆ ئەوەی دەریاوانی بریتانیا بەباڵادەستی بەسەر دەریاوانی ئەڵمانیادا بمێنێتەوە کەبەخێرایی زۆر لەفراوانبووندا بوو، ئەو کەشتیانەی داهاتوو پێویستیان بەهێزێکی ئاگرینی کوشندەترو خێراتر بوو.

بۆیە تەنیا رێگەش بۆگەیشتن بەو خێراییە زۆرە گۆڕینی بزوێنەری کەشتیە جەنگیەکان بوو لەکارکردنیان بە هێزی هەڵم و خەڵوز بۆ بزوێنەری زەبەلاح کە بەنەوت کاری دەکرد.

دیارە بۆ ئەوەی توانای بەریتانیا لەرێگەی ئەو کەشتیە نوێیانەوە بگاتە ئاستی دەست بەسەردا گرتنی هەموو جیهان بوونی بەردەوامی نەوتە بە تێچوونێکی کەم.

ئەودەم بریتانیا پشتی بەهەناردەی ولایەتە یەکگرتوەکان و رۆمانیاو روسیا و مەکسیكو هۆڵەندا دەبەست، کە لەنێوئەوانیشدا ولایەتە یەکگرتوەکان بە جیاوازیەکی زۆر گەورەترین هەناردەکاربوو.

لە٨٠٪ی نەوتی بریتانیا لەولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە بۆی رەوانە دەکرا، کە هاوپەیمانی بوو، بەڵام بریتانیایەکان وەك رکابەرێکی چاوەڕوانکراوی ئیمپراتۆریەتەکەیان لێیان دەڕوانی٣.

هەربۆیە بریتانیایەکان هەوڵیاندا ئەو هەڕەشە چاوەڕوانکراوە بۆ سەر باڵادەستیان دووربخەنەوە و کاریان کرد بۆ ئەوەی ناوچە دەوڵەمەندەکانی نەوت بخەنە سەر ئیمپراتۆریەتەکەیان.

---

١- Sluglett هەمان سەرچاوە،١٠٣-١١٦.

2 - Reguer, s.1982. .(Persian oil and the First Lord:AChapter in the Career of Winston Churchill). Military Affairs, 46,3, October:134-138.

3 - Mejcher , H.1976.Imperial Quest for Oil:Iraq 1910-1928.London:Icatha Press.

سەرەتاش بایەخیان بە وڵاتی فارس داو کۆمپانیـای نـەوتی ئـەنگلۆ- ئێرانیـان لـە سـاڵی ١٩٠٩ دامەزراند. بـەڵام کاتێـك دۆزینـەوەی نـەوتی لـە زەویـەکانی ئیمپراتـۆری عوسمانیـدا ئاشکرابوو، بریتانیایەکان وەك بازنەیەکی نفوزی خۆیان لە وڵاتی میزۆپۆتامیایـان دەڕوانـی و نـاوی ولایـەتی موسـڵیش بەشـێوەیەکی بەرچـاو بـەر لـە جـەنگی جیهـانی یەکـەم لـە هەژمارکردنەکانی جیۆ- سیاسی ستراتیژسازانی بریتانیادا هاتووە.

ولیام نوکس دارسی لەکۆمپانیای نەوتی ئەنگلۆ- ئێرانی پێداگری دەکرد لەسەر زامنکردنی پێگەی پێشەوەی کۆمپانیاکەی لەهەر جموجۆڵێك بەئاراستەی خۆرئاوا ڕووەو ئێران.

بەڵام ئاخۆ خواستی نەوتیی چەرچل تەنانەت لەساڵەکانی دوایـی جـەنگیش ڕێگـەی خـۆی بەرەو ستراتیژێکی فراوانتر دۆزییـەوە، دیـارە ئـەم مەسـەلەیە جێـی مشـتومڕە، لەکاتێکـدا بریتانیایەکان بەر لەجـەنگیش بایـەخێکی زیاتریـان دابـووە وڵاتـی میزۆپۆتامیـا. بـەجۆرێك هەمیشە تەرکیزیان لەسەر پرسەکانی تری وەك زامنکردنـی ڕێگـەی بازرگـانی نێـوان دەریـای ناوڕاست و کەنداو بوو، لەگەڵ توانای بەکارهێنانی ناوچەکە بۆ نیشـتەجێکردنی "دانیشـتوانی زیاد" لەهیند یاخود تەنانەت هەڕەشەکردن لە" ناوچەی فشۆڵی ڕوسیا لە لەقەوقاز"دا١.

لەراسییدا بریتانیایەکان پەرۆشی مەسەلەی ئەگەری بوونی یەدەگی نەوتی ولایەتی موسـڵ نەبوون، بەڵکو گەرەکیان بوو هەوڵەکانیان لە وڵاتی فارسدا چڕبکەنەوە و ئەوەش بـەڕوونی لـە بەندەکانی ڕێککەوتننامـەی نهێنـی سـایکس _پیکـۆدا ئاشـکرایە، کـە لـەنێوان بریتانیـاو فەرەنساو ڕوسیا لەساڵی ١٩١٦ واژۆ کرا.

بـەپێی ئـەو پلانـەش کـە لـەپاش هەرەسـی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی ئامـادە کـرا و مولکدارێتیەکانی دابەشکرا، ولایـەتی موسـڵ کەوتـە بازنـەی نفـوزی فەڕەنسـاوەو هەرچـی بریتانیاشە بەغدادو بەسـرەی پێـدرا٢. هـەروەها بریتانیایـەکان ڕەزامەنـدی فەرەنسـیەکانیان بەدەستهێنا لەسەر ڕێزگرتنی مافە ئابووریەکانی هاوڵاتیانی بریتانیای لەناوچەکانی عوسمانیـدا

---

1 - وڵاتی میزۆپۆتامیا لە ١٩٠٣-١٩١٤ Cohen,s.1978.(Mesopotamia in British stratege, "الاستراتیجیە InternationL Journal of Middle Eastern Studies.9:171-181,quote at 172-3. البریگانیە ١٩٠٣-١٩١٤".

2- Fitzgerald, E.(France's Middle Eastern ambitions, the Sykes-Picot Negotiations and the Oil Fields of Mosul,1915-1918). The Journal of Modern of History, 66,4:697-725,quote at 697



PDF 4 KURD

کە دەرابوونە فەرەنسا لەوانەش چالاکیەکانی کۆمپانیای نەوتی تورکی. بەلاّم ئەو مافانە دەستەبەرنەکران تا ئەو دەمەی دواتر موسلّ گوازرایەوە سەر بازنەی نفوزی بریتانی١.

ئاشکراشە گرنگیدان بە نەوتی موسلّ بەلای وتوێژکارانی بریتانیاوە لەبەرامبەر بایەخدانی زیاتریان بە جیۆ- سیاسی لەپلەیەکی لاوەکیدا بوو، ئەمە جگە لە دامەزراندنی ناوچەیەکی دابڕاوی سەر بەفەرەنسیەکان لەنێوان میزۆپۆتامیاو سەرسەختترین دوژمنیان لە باکوور_رووسەکان٢. بەلاّم لەپاش جەنگی گەورە دیدی بەریتانیەکان لەبەرامبەر بارودۆخەکە گۆڕانێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی.

بەدرێژایی سالاّنی جەنگیش گروپی فشار کە لەلایەن گەورە لێپرسراوانەوە لەبرەوداندا بوو، لەمشتومڕی ئەوەدابوون کە کۆنترۆلّکردنی نەوتی میزۆپۆتامیا لەبەرژەوەندیە زیندووەکانی بریتانیادایە.

لەبەرچاوترین ئەو کەسە بەرپرسانەش سێر مۆریس هانکی Sir Maurice Hankey وەزیری دەولّەت بوو بۆ کاروباری ئەنجوومەنی وەزیران لە رۆژگاری جەنگدا.

ئەو خاوەنی هەست و سۆزێکی بەهێزی ئەوتۆبوو تا ئەو ئاستەی لەسالّی ١٩١٨دا نامەیەك بۆ ئارسەر بلفۆر، وەزیری دەرەوەی ئەو دەمە بنووسێت و بلّێت:

"نەوت لەجەنگی داهاتوودا جێگەی ئەو خەلّوزە دەگرێتەوە کە لەجەنگی ئێستادا پەنای بۆ دەبرێت یان بەلانی کەمەوە پێگەیەکی هاوتەریب بە پێگەی خەلّوز دەگرێتەوە.

تەنیا سەرچاوەی یارمەتی گەورەش کە دەکرێت بکەوێتە ژێر ركێفی بریتانیاوە بریتیە لەو سەرچاوە یارمەتیانەی کە لە ولاّتانی فارس و میزۆپۆتامیا هەیە..هەروەها کۆنترۆلّکردنی ئەو سەرچاوانەش یەکێك دەبێت لە ئامانجەکانی جەنگ لەلایەن بریتانیاوە"٣.

لەوەزارەتی دەریاوانیدا سێر ئیدمۆند سلاید Rear Admiral Sir Edmud Slade پسپۆڕی نەوتی و کارراپەڕێنەر زۆر بەئاشکرا داوای کۆنترۆلّکردنی سەرچاوەکانی نەوتی هەردو ولاّتی فارس و میزۆپۆتامیای لەلایەن ولاّتەکەیەوە دەکرد.

---

١- Earale ، هەمان سەرچاوە،٢٧٢، هەروەها Loder, A.de V.1923. The Truth About Mesopotamia, Palestine and Syria . London: Allen and Unwin:163-164.

2 -Stivers, W.1982. Supremacy and Oil:Iraq, Turkey and the Anglo-American World Order, Ithaca, NY: Cornell University Press:23.

3 -Yergin,D.1991.The Prize:TheEpic Quest for Oil, Money and Power.New York.Simon and Schuster :188.

PDF 4 KURD

لەلێکۆڵینەوەیەکیشیدا کە سلاید لە ٢٩ی تەموزی ١٩١٨ لەبارەی باروودۆخی نەوت لە ئیمپراتۆریەتی بریتانی ئامادەی کردبوو، تا پێشکەش بە ئۆفیسی ئەنجوومەنی وەزیرانی بکات، تیایدا رایگەیاندبوو:

"پێویستە هانی کۆمپانیاکانی بریتانیا بدرێت و یارمەتی بدرێن بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی زۆرترین دەڤەری بەرهەمهێنی نەوت لەوڵاتانی بیانیدا بکەن، ئەویش بەو مەرجەی بەرهەمی نەوت تەنیا بەکۆمپانیا دابەشکەرەکانی بەریتانیا بفرۆشرێن یاخود لەرێگەی ئەوانەوە بێت(بۆ رێگرتن لە بەرژەوەندی بیانی لەکۆنترۆڵکردنیدا). هەروەها دەکرێت برەو بەو ناوچانە بدرێت (هەردو وڵاتی فارس و میزۆپۆتامیا) بۆ یارمەتیدان لەدەستەبەرکردنی پێداویستیمان لە سەردەمی ئاشتی و پاراستنی سەرچاوەکانمان لەو زەویانەی بەریتانیادا بۆ جەنگ"١.

سەرکەوتن لەچانسی هانکی و نزیکەکانیدا بوو لە گروپی فشاردا.ئەوەبوو لەدوای هەرەسی ئیمپراتۆری عوسمانی، سیاسەتمەدارانی بریتانیایی درکیان بەو هەڵەیە کرد، کە لە رێککەوتنیان لەگەڵ هاوبەشە فەرەنسیەکانیان کردبوویان سەبارەت بەوەی بەرپرسیارێتی ولایەتی موسڵ لەئەستۆی ئەواندا دەبێت٢. جا بۆ راستکردنەوی هەڵوێستیان_کە بەکۆتایی هاتنی جەنگ ولایەتی موسڵیان داگیرکردبوو- لەگەڵ فەرەنسیەکان رێککەوتن لەسەر گۆڕینی بەندەکانی رێککەوتننامەی سایکس_پیکۆ ئەویش بەمانەوەی بریتانیا لە کۆنترۆڵکردنی ولایەتی موسڵ و بەغدادو بەسرە لەکاتێکدا فەرەنسا دەسەڵاتی ئینتیداب دەبن لە سوریاو لوبناندا.

لەپاش شکستی هێزەکانی تەوەر، ستراکچەری کۆمپانیای نەوتی تورکیا کە پێشتر لەسەری دامەزرابوو گۆڕانی بەسەرداهات، ئەویش بەوەی بەریتانیەکان دەستیان بەسەر پشکی ئەڵمانیادا گرت لەوکۆمپانیایەدا(کە بۆ دۆیچە بانك دەگەڕایەوە). بەڵام فەرەنسیەکان ویستیان لەبەرامبەر رازیبوونیان بە کۆنترۆڵکردنی بریتانیا بۆ ولایەتی موسڵ قەرەبوو بکرێنەوە.

دیارە قەرەبووکردنەوەکەش بە پشکەکەی دۆیچە بانك بوو لەکۆمپانیای نەوتی تورکیدا. کەدواتر بە رێککەوتننامەی لۆنگ بیرگنز Long u Beregner Ageemnet دەناسرێت و ئەوپشکە بۆ بەرژەوەندیەکانی فەرەنسا دەگوازرێتەوە.دواتریش ئەو سەودانامە نەوتیانە لەپاش ساڵێك، لە ١٩٢٠ دا بەپێی بەندەکانی رێککەوتننامەی سان ریمۆی نەوتی San

---

2- CAB21/19لە Hejcher وەرگیراوە ، هەمان سەرچاوە،٣٥-٤٢.

2 -Kent,M. 1976.Oil and Empire:British Policy and Mesopotamian Oil:1990-1920,London: Macmillan:13-14.

PDF 4 KURD

لەکاتێکدا لایەنی ڕێکخستنی Remo Oil Agreement فۆرمێکی ڕەسمی وەردەگرن١. پیشەسازی نەوتی عیراقی کە تازە لەدایکببوو، لەسەرەتی بیستەکانەوە لەنێوان پایتەختەکانی ئەوروپاو ولایەتە یەکگرتوەکان تاوتوێ دەکرا، بەڵام داهاتووی کەرکووك تا ساڵی ١٩٢٧هیچ گۆڕانکاریەکی بەخۆوە نەبینی، ئەویش دوای هەڵکەندنی یەکەمین بیرەنەوت لەوپەڕی دەوروبەری باشووری کەرکووك.

هاوکات زەویناسانی سەر بەکۆمپانیای نەوتی تورکی زۆر بەروونی هەوڵەکانیان لەناوچەی کەرکووکدا چڕکردەوە- چونکە نەوتەکە بۆ سەرزەوی دزەی دەکرد_هەربۆی زۆر بەخێرایی پانتاییەکیان بەدرێژایی ١١کیلۆمەتر دیاری کرد کە لە باشووری کەرکووکەوە بەرەو باکووری خۆرئاوای باشووری هەولێر درێژ دەبووەوە.چیرۆکی دۆزینەوی نەوت لەبیری ژمارە ١ی باوەگوڕگوڕ، بەچەشنی سیناریۆیەکی ئامادە کرابوو بۆ یەکێك لە فیلمەکانی هۆلیوۆد. ئەو نەوتەی لەو بیرەوە هەڵدەقوڵی بەبەرزایی ٥٠ پێ بۆ سەر بورجەکە بەرزبووەوەو بووە مایەی هەڕەشە بۆ سەر کەرکووك و تەنانەت گوندەکانی دەوروبەریشی، کە ئەوەش بووە هۆی گیان لەدەستدانی دوو کارمەند لەکاتی ئەنجامدانی پرۆسەکەدا.

هەڵبەتەئەوکات ڕێژەی بەرهەمی نەوتی بیری باوە گوڕگوڕ ڕۆژانە بە ٩٥ هەزار بەرمیل هەژمارکرابوو٢.لەو ساتەشەوە نەوتی کەرکووك کۆڵەکەی ئابووری دەوڵەت و سیاسەتیشی بوو. بۆ دڵنیابوون لە بایەخی نەوت لەچیرۆکی کەرکووکدا واباشترە بەکورتی گوزەرێك بەمێژووی سیاسی کەرکووکدا بکرێت و قسە لەسیناریۆیەك بکرێت کەجێگەی نەوتی تێدا نییە.

ئەگەر بهاتایە پێکهاتەی جیۆلۆژی خاکی کەرکووك ئاوی ژێر زەمینی لە چینە بەردینەکانیدا لەخۆبگرتایە لەبری کێڵگەکانی نەوت ئەوا بەدوور دەزانرا جێگۆڕکی بەزۆر دەرئەنجامی سیاسەتی تەعریب بە دانیشتوانەکەی بکرێت، بەڵکو پرسی دیمۆگرافیای دانیشتوان کە لەئێستادا چارەسەرکردنی زۆر گرانە ڕەهەندێکی جیاوازو بچووکتری وەردەگرت.هەڵبەتە بەدیهێنانی ئەم سیناریۆیەی دژ بە واقیعی کەرکووك کە تیایدا وێنای شارەکە بە بێ نەوت دەکات پێویستی بە جۆرێك لە برەوپێدانێکی قوڵە.بۆنموونە دەکرا بەریتانیەکان لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی و ڕێککەوتنی مۆدرۆس کە لەساڵی ١٩١٨ مۆرکرا، پشتیوانیان لە

---

1- Sluglett - هەمان سەرچاوە، ١٠٣-١١٦.

٢-الكيلانى Al-Gailani,M.2003.(Assessing Iraq's Oil Potential ).Geotimes,October, www.geotimes.org/octt03/feature-oil.html.Quote at2.

PDF 4 KURD

دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی بکردایە - کە لە سنوورەکانی ئێستای باکووری عیراقـەوە بـەرەو دەریاچەی وان لەقولآیی ئەنادۆڵدا درێژ بوەتەوە[1]. بەڵآم کاتێك درك بەبوونی نەوت کرا لە نێـو ئەو زەویەی کە کەرکووکی لەسەر راوەستاوە، کە نەدەزانرا بڕەکەی چـەندە بـەڵآم دەزانـرا زۆرو زەوەندە ئەوا بەریتانیەکان هەوڵوێستیان لەبەرامبەر ولایەتی موسڵدا گـۆڕانی بەسـەردا هـات، کە ئەوەش یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کەرکووك بخرێتە سەر شانشینی عێراق.کەوابوو شـێوازی دەوڵەت لـە ئیـدارەکردنی ئـەو سـامانە زۆرە و چـۆنیەتی پاراسـتنی پیشەسـازی نـەوتی لـە چاوتێبڕینی ئەوانیتر (راستەقینەو بیرلێکردنەوە) بەسەر کارەکانی دەوڵەت لە باکووری عێراقـدا زاڵبوون و ئەو دوو بابەتەش دەبنە جێگەی بایەخ لە ئێستاو داهاتووی مێژووی ناوچەکەدا.

---

١- نوری تاڵەبانی،٢٠٠١ "تعریب منگقە کرکوك". سلێمانی، خاك پرێس :٢٠.

PDF 4 KURD

# فەسڵی دووەم

## کەرکووک لەچاخی بیستەمدا

وێناکردنی کەرکووك بەر لەجەنگی یەکەمی جیهانی هەروا ئەرکێکی سانا نییەو ئەو وێنانەش، کە زۆرجار مێژوونووسانی عێراقی پێشکەشی دەکەن، زیاتر فۆرمێکی جەوهەری قوڵی پێدراوە و رەواج دانە بەوەی کەرکووك زۆرینەی تورکمان یان کوردە.

بەواتایەکی روونتر ئەو ژێدەرانە(سەرچاوانە) کەمن، کە خاوەن سوودێکی راستەقینەن و لەهەوڵدان بۆ بونیادنانی تێگەیشتنی دیمۆگرافیای کەرکووك لەو ماوە زووەی سەدەی بیستەمدا.

بەسوودترین گۆشە نیگا لەوێناکردنی وردی کەرکووك لەبەرامبەرییەکانی سەدەی بیستەمدا دەرخراوگەل (مکتشفات)ی ئەو گروپە رووپێوکارانەیە، کە لەلایەن هێزەکانی پاش دەسەڵاتی عوسمانی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانیو ساتەوەختی دروستبوونی دەوڵەتی عیراقی راسپێردراون.

پاش دارمانی ئیمپراتۆری عوسمانی ودواتریش دابەشکردنی مومتەلەکاتەکانی بەسەر قەوارەکاندا، دروستبوونی دەوڵەتی نوێ گەلاڵە بوو، هەروەها کۆمەڵێك داتای پەیوەست بە سەرژمێری پێشکەش

PDF 4 KURD

بە لیژنەی موسڵی سەربە کۆمەڵەی نەتەوەکان کرا، کە ئـەرکی چاوپیاداخشـاندنی بـارودۆخی ولایـەتی موسڵ (بەکەرکووکیشەوە) و بڕیاردان لەداهاتووی پێراسپێردرابوو.

ئەم خشتەیەی خوارەوە کۆمەڵێك ژمارەی لە خۆگرتوە کەبەنزیکەیی لەیەك کاتدا سەرچـاوە تورکی و بریتانی و عێراقییەکان بینیویانە.

خشتەی ٢- ١

دانیشتوانی ولایەتی موسڵ*

| | سەرژمێری حکومەتی عێراقی ١٩٢٢- ١٩٢٤ | خەملاندنی سوپای بریتانیا ١٩٢١ | ئاماری تورکیا پێشکەش بە کۆنگرەی لۆزانی کردووە ١٩٢٣ |
|---|---|---|---|
| کورد | ٤٩٤٠٠٧(%٦١.٧) | ٤٢٤٧٢٠(%٥٤) | ٢٦٣٨٣٠(%٣٩.٢) |
| عەرەب | ١٦٦٩٤١(%٢٠.٨) | ١٨٥٠١٣(%٢٣) | ١٤٦٩٦٠(%٢١.٨) |
| تورکمان | ٣٨٦٥٢(%٤.٨) | ٦٥٨١٥(%٨.٤) | ٤٣٢١٠(%٦.٤) |
| مەسیحی | ٦١٣٣١(%٧.٦) | ٦٢٢٢٥(%٧.٩) | ٣١٠٠٠(%٤.٦) |
| جولەکە | ....... | ١٦٨٦٥(%٢.١) | ١٧٠٠٠٠(%٢٥.٢) |
| یەزیدی | ٢٦٢٥٧(%٣.٢) | ٣٠٠٠٠(٣.٨) | ١٨٠٠٠(%٢.٦) |
| کۆچەر | | | ١٧٠٠٠ |
| کۆی گشتی دانیشتوان | ٧٩٩٩٩٠ | ٧٨٥٤٩٨ | ٦٧٣٠٠٠ |

* سەرچاوە: مارتن ڤان برۆنسن Martin Van Bruinessen لە میم کەمال ئـۆکی Mim Kemal Oke– Musul meselesi kronolojisti(1926- 1918) وەرگیراوە. Istanbul:Turk Dunyasi Arastirmalari Vakfi.157:1987(ژمارەکـانی ئـەم خشـتەیە لەنوسـخەی عـەرەبی کتێبەکـەدا بەهەڵەچـاپکراون بۆیـە لـە کوردیەکـەدا راستکراونەتەوە)- وەرگێڕ.

لەژمارەكاندا جیاوازیەكی بەرچاو بەدیدەكرێت، كە ئەوەش ڕەنگدانەوەی ڕاستەقینەی میتۆدی ئەو سەرژمێرانەیە كە لایەنە جۆربەجۆران بەكاریان هێنانەوە، بەجۆرێك كە میتۆدەكان زۆر جیاوازو یەكلاكەرەوەن.

ئەوەی زۆرگرنگ بێت ئەوەیە هیچ كاتێك ڕێككەوتن لەسەر ئەوە نەبووە، ئەوەی لەواقیعدا هەیە بەوەی مرۆڤ كورد، عەرەب، توركمان، مەسیحی بێت چ دەگەیەنێت، بەڵكو زمان باوترین ڕێگە بووە بۆ دیاریكردنی ناسنامەی ئیتنیكی، بەڵام ئەوەش بۆ خۆی گرفتێكی گەورەبووە لەسیاقی ولایەتی موسڵو كەركوك بەتایبەتی. لەهەولێردا كە لەكۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا ناسنامەی كوردیبوونی بەدەستهێناوە، زۆرێك لەوانەی بەرەچەڵەك توركمانن بەكوردی دەدوێن لەكاتێكدا زۆرێك لەكوردانی شار- ئەوانەی ڕۆژگارێكی زۆرە تێكەڵ بە دامەزراوەی سیاسی شاربوون- بەپلەی یەكەم لەوانەبوون كە بەتوركی قسەیان كردووە١.

دیسان پێویستە كارنامەی سیاسی لە شیكردنەوەی ئەو ئامارانەی كە لەمیانەی دانوستانەكانی كۆنگرەدا پێشكەشكراون ڕەچاو بكرێن.

بەدیدی بریتانیاش ئەو پەڕی هەوڵ دراوە بۆئەوەی پیشانی بدات بوونی توركمان بەوجۆرە نەبووە وەك ئەوەی حكومەتی توركی هەوڵی بۆداوەو ئاماژەی پێكردووە.هەروەها ژمارەیەكی زۆری كوردو عەرەبش لەسەر حسابی توركمان تۆماركراون.بەڵام كاتێك ئەو فشارانەی بەهۆی بەرباسخستنی پرسی موسڵ و جێگیربوونی ولایەتەكە لە سنووری شانشینی عێراقدا قەتیس بوون، ئەو دەم دیدی بریتانیایەكان بۆ كەركوك جۆرە گۆڕانكاریەكی بەسەردا هاتووە.

هەڵبەت لەبری ڕەواجدان بەو بیرۆكەی كە ئاماژە بە فرەیی كورد دەكات لەشارەكەدا، بەرپرسانی سیاسی بریتانیا سی. جی. ئیدمۆندز C.J.Edmonds و والاس لیون Wallace Lyon لەبارەی ئەزموونی ڕاستەوخۆی خۆیان لەكوردستان و كەركوك لەدوای جەنگی یەكەمی جیهانیەوە دەنووسن و دەڵێن توركمان لەكەركووكدا زۆرینەیان پێكهێناوە بەڵام دانیشیان بەوەداناوە كە كورد لەناوچە گوند نشینەكاندا زۆرینەن٢.

---

1 - Bruinessen, M. van 205."Kurdish Challenges". In Posch, W., Looking into Iraq (Chaillot Paper no.79).Paris:EU Institute for Security Studies:9.
2 -Edmonds, C.j. 1957. Kurds, Turks, and Arabs; Politics, Travel, and Research in North Eastern Iraq. 1919-1925. London; Oxford University Press: 266; Fieldhouse, D.(ed)2002.
Arabs, Kurds and Britons: The memoir of Wallace Lyon in Iraq. 1918-1944. London: I.B. Tauris:122&Bruinessen.

ئەو ئامارانەی پێشکەش بە لیژنەی موسڵ کراون لەئێستادا پشتی پێنابەسترێت و لەلایەن هەردو پێکهاتەی تورکمانی و تورکیشەوە بەتوندی بەگژیدا دەچنەوە - کە ئەوەش بۆخۆی ئاستەنگی بەردەم رەوینەوەی گرژییەکانە، بەلاّم هێشتا زۆرێك لە کۆمێنتسازانی کوردو تورکمان لەوتاری رۆژنامەوانی و سایتە ئەلەکترۆنیەکاندا هێما بەو ژمارانە دەکەن و لەگەلّ ملیۆنان جەماوەری خۆیاندا دەدوێن ئەو جەماوەرەی پەرۆشی پەسەندکردنی هەرپاساوێکی نوێن، کە پرسی پێکهاتەکەیان بەرەو پێگەیەکی بەهێزتر بەرێت.

لەساڵی ١٩٢٥دا رێککەوتننامەی کۆتایی سەبارەت بە سنووری دەوڵەتی نوێی عێراقی کە ولایەتی موسڵیشی خرایە سەر ئەنجامدرا١.

دۆزینەوەی کێڵگەی گەورەی نەوتی باوەگوڕ گوڕ لەکۆتایی ئەو دەیەیەدا کێشمەکێشی درێژخایانی نێوان کوردو دەوڵەتی عێراقی خستە سەر تەختەی شانۆ وخواستەکانی کوردیش سەبارەت بە دانپێدانان بە تایبەتمەندی نەتەوەیی دەرئەنجامێکی خوێناوی و نیگەرانی بەغدادی لێکەوتەوە لەسەر ئاسایشی کەرکووك و پاراستنی بەرهەمی نەوت.

سەبارەت بەکورد شارەکەوناوچەکانی دەوروبەری چەند سەدەیەکە بەشێك بوون لە نیشتیمانی کورد بگرە کەرکووك لەرۆژگارێکدا پایتەختی میرنشینێکی گەورەو گەشەسەندوی کورد بووەو دواتریش زۆرێك لەکورد لەنێویشیاندا مەلا مستەفا بارزانی دیدی خۆیان سەبارەت بە هەرێمی کوردستانی عێراق و کەرکوکی پایتەختی، کە بە نەوت دەوڵەمەندە پێشکەشکردووە.

هەرچی پێکهاتەکانی دیکەشە بەلایانەوە کەرکووك فرە ئیتنیکەو بەوپێیەش کە لەسەر رێگەی بازرگانی نێوان قولاّیی خاکی عوسمانی و بەغدادا بووە، شارەکە رۆژگارێکی دێرینە سەنتەرێکی گرنگی بازرگانی و ئابووری بووەو تیایدا بۆرژوازانی عوسمانی دەسترۆیشتوو و خاوەن سامانێکی فرە بوون.

لەبنەڕەتیشدا ئەو - بۆرژوازییە تورکمانییە- دژی بیرۆکەی ئەوەبوون کە کەرکووك نیشتیمانی کورد بێت.

---

هەمان سەرچاوە، ٩.

1- Lioyd, H.I.1926." The Geography of the Mosul Boundary". The Geographical Journal,47:104-13.

بەلای ناسیونالیستی عەرەبیشەوە جا لە لەنێو کەرکووك یاخود لەعێراقدا بووبن ئەوا هەرزوو کەرکووك بووەتە بەشێکی گرنگ و جیا نەبووە لەعێراقو هەرتانەو نکۆڵییەکیش لەناسنامەی کەرکووك "عێراقی و بەدیاریکراویش عەرەبی و سوننی بەکردەیی " هەربەتەنیا کێشەیەك نیە کە فۆرمێکی ناوخۆیی هەبێت و پەیوەست بێت بە خەونی کوردەوە بەڵکو کێشەیەکی ئەمنیی نەتەوەییە کە خاوەن واتای وجودییە بۆ سەرجەم عێراق.

پیشەسازی نەوت لەکەرکووکدا لە گەرمەی کێشمەکێشی نێوان حکومەتی عێراقی و کورددا کاری دەکرد، لەروانگەی بەغدادیشەوە ئەوا کەرکووك و پیشەسازیە نەوتیەکەی بەپلەی یەکەم پرسێکی هەستیاری جیۆ- سیاسی بووە.

پاشان دوای تێکچوونی پەیوەندی نێو خێڵە کوردەکان و عەبدولکەریم قاسمی سەرۆکی عێراق، مەلا مستەفا بارزانی بەرپابوونی "شۆڕشی کوردی" لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦١ جاڕدا.

ئەوەبوو هێزی پێشمەرگە سەرکەوتنی گەورەی لەدژی سوپای عێراقی بەدەستهێناو لەهەمان کاتیشدا بارزانی دەستپێشخەری کرد لە دروستکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ سەرکردەی خێڵەکانی تری کورد کە ئەوانیش خۆیان بەتێوەگلاو لەکێشمەکێش لەگەڵ بەغداد دەبینییەوە.

سەرکەوتنەکانی بارزانی لەگۆڕەپانەکەدا هۆکاربوون لەدوژمنایەتی سوپا بۆ قاسم، بەلام بەلادانی لەساڵی ١٩٦٣دا ئەوەی بۆ کورد بەدینەهێنا کە لەپێناویدا دەجەنگان- ئۆتۆنۆمی بەکەرکووکیشەوە. لەبری ئەوە پێویست بوو لەسەر کورد مامەڵە لەگەڵ رژێمی دەسەلاتداری نوێی بەعسی بکەن کە لەهەولّی کوشتنی کاتدا بوو بۆ بەهێزکردنی پێگەی ناوخۆیی خۆی تا جەنگێکی تاڵ لەچیاکانی کوردستاندا بەرپا بکات، کە ئەوەش ئەگەرو خواستی حکومەتی نوێ نەبوو بەلّام داواکاریەکانی بارزانی سەلماندیان کە لەوەگەورەترن حکومەت قبولّی بکات.

بارزانی لەچاوەڕوانی ئەوەدا بوو بەرەسمی دان بە ئۆتۆمنۆمی کورددا بنرێت لە سەر پارچە زەویەك کە تەواوی ولایەتی دێرینی موسڵ لەخۆبگرێت (بە کەرکووك و کێڵگە نەوتییەکانیشەوە)، جگە لەشاری موسڵ نەبێت١.

هاوکات حکومەت زۆربەی ئەو داواکاریانەی رەتکردەوە کە لەلایەن بارزانییەوە خرابوونە روو، بەلّام سووربوونی بارزانی لەسەر ئەوەی کەرکووك بخرێتە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی دوچاری دژایەتیەکی توند بووەوە و بەرپەرچدانەوەی دەوڵەتیش لەبەرامبەر خواستەنەتەوەیەکانی کورد

---

1 - McDowall, D.1996.A Modern History of the Kurds, London:I.B.Tauris:314

درێنە بەری رێو شوێنی سەرکوتکەرانە و دوورخستنەوەی هەر هەڕەشەیەکی راستەوخۆی هێزی پێشمەرگە بوو.

وشەی "تەعریب"بەکارهێنرا وەك ئاماژەیەك بۆ بارودخە جۆراوجۆرەکان لەسەرتاسەری خۆرهەڵاتی ناوڕاست و باکووری ئەفریقیا و وەك وەسفێك بۆ مومارەسەو سیاسەگەلێك، ئەویش هەر لەتەوزیفکردنی سیاسی زمانەوە لە مەراکیش و جەزائیر تا دەگاتە بەئامانجکردنی گروپە ناعەرەبیەکان لەلایەن میلشیای جەنجەوید لەهەرێمی دارفۆردا.

بەڵام دەبێت کەرکووك هاوواتای وشەی "تەعریب" بێت ئەویش بەهۆی پرۆسەی فراوانی ئەندازەی کۆمەڵایەتی کە لە سەرەتای هەفتاکان و بەدواوە جێبەجێکراوە.

دیارە ئەو پرسانەزۆر کەمن کەوەك پرسەکانی پەیوەست بە هاوسەنگی دانیشتوان لە نێوان پێکهاتەکانی کەرکووك و مێژووی ئەو گۆڕانکاریانەش کە بەسەر شارەکە و پارێزگاکەدا بەگشتی هاتوون دووچاری مشتومڕببنەوە.

هەڵبەت ئەو مونازەرەیەش جۆرە ئاڵۆزیەك بەخۆوە دەبینێت ئەویش لەبەر تێکئاڵۆزکانی پێکهاتەی جۆراوجۆر کە هەریەکەیان گێڕانەوەی جیاوازی هەیە لەبارەی بوونیەوە لە کەرکووکدا.

بەدڵنیایشەوە ئەوەی کە بارودۆخەکە ئاڵۆزتر دەکات ئەو ستراتیژانەیە کە رژێمی بەعس پشتی پێبەستوون لەگۆڕینی دیمۆگرافیای یەکە ئیداریەکان و دەستکاریکردنی سنوورەکانیان- ئەو ستراتیژانە نیشتەجێکردنی عەرەبی لە ناوچەکان و چۆڵکردنی ئەو ناوچانەی لەکەسانی غەیرە عەرەب لەخۆگرتوە، ئەمە جگە لەوەی ئەو ناوچانەی خستوەتە سەر پارێزگایەك یاخود دابڕینی پارچەیەکی تر بۆ زیادکردنی ژمارەی دانیشتوانی عەرەب و لەتەك ئەوەشدا ئەو تەقەلا فیکریەی کە هەر گروپێکی خاوەن بەرژەوەندی تایبەت داویەتی بۆ رەواجدان بە سەرچاوەی زانیاریەکانی یاخود بۆ بەدەستهێنانی راستگۆبوونی سەرچاوەکانی تر.

لەساڵی ٢٠٠٣شەوە گروپە نا کوردیەکان سکاڵای هاوشێوەیان هەیەو حکومەتی هەرێمی کوردستان و پارتە سیاسیەکان بە "تەکرید- بەکوردکردن"ی کەرکووك تۆمەتبار دەکەن، ئەویش لەرێگەی پڕکردنەوەی بە کوردە گەڕاوەکان کە زۆرێکیان بەپێی سکاڵاکان هیچ پەیوەندیەکی خێزانییان بە شاری کەرکووك یان پارێزگاکەوە نییە.

PDF 4 KURD

## گۆڕینی کەرکووك لەڕووی دانیشتوان و کارگێڕییەوە

پارێزگای کەرکوك، کە لـەمڕۆدا لـەنێو هەواڵەکانـدا باسـی لێـوە دەکرێـت هـەمان ئـەو ڕەهەندگەلە هەرێمایەتیەی نییە، کەئەوپارێزگایە لەبەراییەکانی سەدەی بیستـەمدا هـەیبووە، ڕەنگە بوونی یەکە ئیداری لەگۆڕینی فۆمیدا کارێکی سـەیر نـەبێت، بـەڵام ئـەو هۆکارانـەی کەبەراشکاوانە لەپشت گۆڕانکاریەکانی حاڵەتی کەرکووکەوەن هۆکاری ئیتنۆ —سیاسی بـوون. هەروەها ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەکەرکووکدا ڕوویانداوە بـێ وێنـەن ئـەویش بـەهۆی قـەبارەو زۆروزەوەندی ڕوودانیان.

لەگەڵ هەر گۆڕانکاریەك دوو بەرەوپێشچوونی پێکەوەلکاو ڕوودەدەن، یەکـەمیان گـۆڕانی گشتی لـەژمارەی دانیشـتوانی پارێزگاکـەدا، کەئـەوەش بەتایبـەتی لـە یەکـەمی سـەدەی بیستـەمدا دەسـتیپێکردوە، کـە ئـەودەم پێکهاتـەی گشـتی پارێزگاکـە لـەڕووی ناسـنامەی ئیتنیکیەوە زۆرێك جێی تێڕامان نەبووە.

بەڵام وادەردەکـەوێت لەگـەڵ گۆڕانکاریـەکانی کـە دواتـر ڕوویانـداوە، هاوسـەنگی نێـوان پێکهاتـەکان بەئەنقەسـت کراوەتـە ئامـانج بەتایبـەتیش بەجیاکردنـەوەی ئـەو شارۆچـکەو شـارەدێیانەی کـە زۆرینـەی کـورد یـاخود تورکمـان بـوون وپاشـان خراونەتـە سـەر پارێزگـا هاوسنوورەکان و هەروەها لکاندنی ئەو شارۆچکەو شارەدێیانەی کەزۆرینەی عـەرەب بـوون بـە کەرکووکەوە. لەبەرئەوە لەهـەر سـاتێکی دیـاریکراودا ئامارەکـانی دانیشـتوانی کـەرکووك و شەقڵی دیموگرافیای دانیشتوان پشت بە "فۆرم"ی زۆرینەی پرێزگاکە بەستووە.

هاوکات ئەو گۆڕانکاریە زۆرانەی کە لە سنووری کەرکووکدا ڕوویانداوە ئەوەیە کە لەسـاڵی ١٩٦٨دا، لەدوای گەڕانەوەی حزبی بەعس بۆ دەسەڵات ڕوویانـداوەو کاریگـەری بەرچاویشـی لەسەر ستراکچەری دانیشتوانی پارێزگاکە هەبووە.

دوای ئەوەی قەزای حەویجەو ناحیەی ڕیاز کە زۆرینەی عەرەب تیایـدا نیشـتەجێن لەسـاڵی ١٩٦١دا خرانە سەر کەرکووك (هەردو مەرسومی کۆماری ژمارە ٣٢٨ و ژمارە ٣٨٧ بـەدوای یەکدا)، لەگەڵ سەرلەنوێ گەڕانەوەی ڕژێمی بەعس بۆ دەسـەڵات لەسـاڵی ١٩٦٨دا، سـیمای کەرکووك گۆڕانێکی ڕیشەیی بـەخۆوە بینی(نەخشـەی ژمـارە ٤ سـنووری کـەرکووك لەسـاڵی ١٩٦٨دا دیاری دەکات).

هەروەها لەهەوڵێکی ڕووندا بۆ دروستکردنی زۆرینەی عەرەبی لە کەرکووك لەدوای کۆتایی هاتنی شۆڕشی کوردی بەرابەرایەتی مەلامستەفا، حکومەتی نوێ مەرسومی کۆماری ژمارە ٦٠٨ی لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٥ دەرکرد، کە بەو پێیەش هەردو قەزای چەمچەماڵ و کەلاری قەرەباڵغ بەدانیشتوان لەکەرکووك جیاکرانەوەو خرانە سەر پارێزگای سلێمانی، لەگەڵ جیاکردنەوەی قەزای کفری و لکاندنی بە پارێزگای دیالەوە. ئەو پرۆسەیە بە درێژایی دەیەی هەفتاکان بەردەوام بوو، ئەویش لەرێگەی سووربوونی حکومەتی عێراقی لەسەر جیاکردنەوەی ئەو قەزاو ناحیانەی کە پێیوابوو زۆرینەی خەڵکەکەی غەیرە عەرەبن.

لەکانوونی دوەمی ساڵی ١٩٧٦ یشدا بەپێی مەرسومی کۆماری ژمارە ٤١ بایەخ درا بە ناوەندی نیشتەجێبوونی تورکمان و قەزای دوزخورماتوو لەگەڵ ناحیەی قادرکەرەم لەکەرکووك دابڕێنرا و خرانە سەرپارێزگای سەلاحەدین.

هەرچی مەرسومی کۆماری ژمارە ٣٣شە، کە لە کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦ دەرکرا هەریەك لە ناحیەی کاندیناواوقەراجی لەقەزای مەخموری سەر بەپارێزگای هەولێر جیاکردەوەو لکاندنی بە قەزای دبسی زۆرینە عەرەبی سەر بەکەرکووك، هەروەها ناوچەی زێی سەر بەپارێزگای نەینەواشی خستە سەر قەزای حەویجە لەکەرکووك.

دیسان لەهەشتاکانیشدا ناحیەگەلێکی تری سەر بەموسڵ لکێنران بە کەرکووکەوە و بەوەش ناوچەیەکی زۆرینە عەرەب لە خۆرئاوای پارێزگای کەرکوك پەیدابوو کەراستەوخۆ گرێدراوبوو بە ناوچە عەرەبیەکانی هەردو پارێزگای موسڵ و سەلاحەدین و دیالەوە.

لەساڵی ٢٠٠٠یشدا گۆڕانکاری تر بەسەر نەخشەی کەرکووکدا هات کە ڕەنگە ئەویش وەك هەوڵێك بوو بێت بۆ ڕێگرتن لە هەر ئەگەرێك لەبەردەم بالادەستی بزوتنەوەی کوردی بەسەر تەواوی پارێزگای هەولێردا (بەسەر سەنتەری پارێزگاو زۆربەی زەویەکانیدا بالادەست بوو)، ئەوەبوو حکومەتی عێراقی بەپێی مەرسومی ژمارە ٢٤٥ی ساڵی ٢٠٠٠ ناحیەی سەرگەڕانی لکاند بە قەزای دبسەوەو بەوەش نەخشەی کەرکووکی بەو شێوەی ئێستا بۆ بەجێهێشتووین.

هەڵبەت چەند خاڵێك هەن کە لەگەڵ گۆڕینی جوگرافیای کەرکووك شیاوی باسکردنن، خاڵی یەکەمیش بەدڵنیاییەوە بەرتەسکبوونەوەی ڕووبەری کەرکووکەلە سیەکانی سەدەی رابردووەوە، ئەویش دوای ئەوەی پانتاییەکە ی لە پەنجاکاندا زیاتر لە ٢٠ هەزار کیلۆمەتر دووجا بوو، بەلام لەئێستادا بووەتە ٩٦٧٩کیلۆمەتر دووجا و زۆربەی ئەو زەویە دابڕاوانەی کەرکووکیش زۆرینەی کوردن، لەگەڵ ناوچەنیشتەجێبوەکانی کەزۆرینەی تورکمان بوون.

لایەنێکی تر سەرنجڕاکێش لەتەرزی ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر سنووری پارێزگاکەدا هاتووە، داکشانی کەرکووکە بەئاراستەی خۆرئاواو ناوچە عەرەبیەکان(جەویجـە، زێ) و دوورکەوتنـەوەی لەناوچەکانی زۆرینەی کورد لەخۆرهەڵاتدا (چەمچەماڵ، کەلار).

دیارە کـەرکووکی ئیمـڕۆ کـەرکووکی جـاران نـەماوە و پێویسـتە ئـەو واقیعـەش لەهـەر شیکاریەکی پەیوەست بە دیموگرافیای پارێزگاکە رەچـاو بکرێـت.بـۆ دڵنیـابوونیش لـەو خاڵـە پێویستە لەهەردوو نەخشەی (٤- ٥)دا هەڵوەستە بکرێت کەهەردووکیان کەرکووك دەردەخـەن بەڵام نەخشەی یەکەمیان روونیدەکاتەوە کەرکووکی ئیمڕۆ دەکەوێتە کوێوەو ئەگـەر مەرسـومە کۆماریەکانی پەیوەست بە کەرکووکیش رەتبکرێنەوە نەخشەکە چی بەسەر دێت.

بێگومان گەڕانەوەی قەزاکانی چەمچەماڵ و کەلارو کفری و گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆریش لە کۆچپێکراوان لەنێوخۆی کەرکووکدا هاوسـەنگی ئینیکـی پارێزگاکـە دەگۆڕێـت و بـۆ ئـەو مەبەستەش حکومەتی هەرێمی کوردستان لەوپێناوەدا هەوڵەکانی چڕکردوەتەوە.

مادامەکی بیرکردنـەوە لەوگۆڕانکاریانـە لەسـنوورو رووبـەری هەرێمایەتیـدا ماونەتـەوە، ئەواچەقی بایەخدانەکان بۆگۆڕانکاریەکانی پێکهاتەی دانیشـتوانی کـەرکووك دەگوازرێتـەوە و بێگومان ئەو گۆڕانکاریانەش رەنگدانەوەی لەسەر ئـەو پرۆسـەی جیاکردنـەوەو پێوەلکاندنانـە دەبێت کە لەسەرەوە باسکراون، بەڵام دیسان ئەوەش پێویسـتی بـە هەوڵـدانێکی زیـاترە لـەو گەمە فیلاویەی بەناسنامەی ئیتنیکی کـەرکووك کـراوە لەرێگـەی ئـەو پرۆسـەی راگواسـتن و کۆچپێکردنەی کە بەفەرمانی دەوڵەت کراون.

PDF 4 KURD

## قۆناغی یەکەم لە تەعریبکردن، ١٩٢٥ - ١٩٥٨: پاراستنی نەوت

لەڕوانگەی کوردییەوە لەتەك هەڵمەتەکانی ئەنفال و خاپوورکردنی هەڵەبجەوە بۆ تێگەیشتن لە نەهامەتیەکانیان و تەعریبکردنی خاکەکەیان لەسەر دەستی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراقەوە لەچوارچێوەی بەرچاوترین بەسەرهاتەکاندا دەبێت.هەڵبەت تەعریبکردن وەك ئەوە نییە کە باوە، واتە ئەو سیاسەتەی کە رژێمی بەعس بۆ یەکەمجار پیادەی کردووە، بەڵکو تەعریبکردن راستەوخۆ دەدرێتە پاڵ ئەو رۆژەی کەرکوك وەك سەنتەری پیشەسازی نەوت لەعێراقدا دەرکەوت، ئەویش پاش دۆزینەوەی کێڵگە زەبەلاحەکەی لە ساڵی ١٩٢٩ و هەڵقوڵینی نەوت لەیەکەم بڕی بازرگانی لە ساڵی ١٩٣٤دا.

هەرلەسەرەتاشەوە روونبوو، کە کەرکوك عەمباری زیندە یەدەگی گرنگ و زەوەندەو ئەوەش بەئاشکرا بۆ یەکەم حکومەتی عێراقی لەدوای کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی داگیرکاری روونبوەوە کە کەرکووك"شارێکی عەرەبی نییە"، بەڵکو کەرکوك بەدیدی کوردی شارێکە دانیشتوانەکەی کوردەورووونیشە کە بەشێکە لەکوردستان.بەهەمان شێوە روانگەی تورکمانیش لەگەڵ ئەوەی وەك کورد دەستەواژەی روونی نەتەوەیی دیاری ناکات بەڵام پێیوایە کەرکووك شارێکی خاوەن ناسنامەی تێکەڵاوە.

لەراستیدا حکومەتی عێراقی گەیشتبووە ئەو بڕوایەی کە لەکەرکووکدا کوردو تورکمان بوونیان هەیە بۆیە پێویستە دەوڵەت دەسەڵاتی زیاتری بەسەردا بکێشێت چونکە پێگەیەکی گرنگ و ستراتیژی هەیە.

یەکەمین قۆناغی تەعریبکردن بە دامەزراندنی پیشەسازی نەوت و ژێرخانی ئابووری کەرکووکەوە گرێدراوە. یەکەمین کۆمپانیای نەوتیش کە بەشێوەیەکی سیستماتیك وەبەرهێنانی لەکەرکووکدا کرد کۆپانیای نەوتی تورکی بوو.

ئەو کۆمپانیایە لە ساڵی ١٩١٤لەئەستەنبوڵ بەپشکداری گەورەی بریتانیا دامەزراو لە پاش کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیش لەکەرکوك دەست بەکاربوو.بەهاتنی کۆتایی ١٩٢٥رووپێوی فراوان ئەنجامدراو رێوشوێنی پێویست گیرایە بەر بۆ دەستپێکردن بە وەبەرهێنان بەشێوەیەکی فراوان. بەهاوکاری هەریەك لە ئیدارەی بریتانیاوحکومەتی عێراقی، کۆمپانیا تورکیەکە زۆر بە خێرایی ژمارەیەکی زۆر کۆچەبەری وەك کرێکار هێنا تا لەو کەرتە نەوتیە دا کاربکەن- عەرەب و ئاشووریەکانیش لەناوچەکانی تری عێراق لەبری دانیشتوانی خۆجێی

نەدەرخران.ناوی کۆمپانیایەکە گۆڕدرا بۆ کۆمپانیای نەوتی عێراق و بارەگاکەشی بۆ کەرکووك گوازرایەوە و لەپاش هەڵمژینی یەکەم بڕی نەوتیش کۆمپنیاکە بەئەنقەست و بەشـێوەیەکی چـڕ دەستیکرد بەوەبەرهێنان لەکەرکووکدا و ئەوەش زیاتر پێویستی بەهێزی کاربوو.

یەکەمین بڕە نەوت لەساڵی ١٩٣٤هەناردە کراو پاش ئەوەش دوو هێڵـی گواسـتنەوەی نەوتی خاوی کەرکووك بۆ بەندەری حەیفا و ساڵی دواتریش بۆ بەندەری تەرابلس کرایەوە و هەرزووش کەرکووك بووە گرنگترین سەنتەری ئابووری لەعێراقدا. لەسـاڵی ١٩٣٥دا بـڕی چوار ملیـۆن تـۆن لەنـەوت هـەناردە کـرا و ئـەوەش عێراقـی خسـتە ریـزی پاڵاوتگـەی گەورەدەوڵەتانی هەناردەکاری نەوتەوە.

هاوکات ئەو پێگە ناوازەیەش کێشەی بۆ حکومەتی عێراقی دروستکرد.

حکومەتی بەغـداد دەیزانـی لـەدوای چـەندان شۆڕشـیش کـورد بـەردەوام دەبێـت لەسـەر هەڵوێستی نەیاری لەبەرامبەر رژێمی دەسەڵاتدار هەربۆیە کـاریکرد بـۆ گـۆڕینی ستراکچـەری کۆمەڵایەتی کەرکووك لەپێناو لاوازکردنی بوونی کورد لەو شارەدا.

دیارە ئەو ئەرکەش زۆر گران نەبوو، چونکە پیشەسازی پەرەسـەندوی نـەوت لەکەرکووکـدا پێویستی بە کادێری کارامەو خاوەن ئەزمووی کاری دامەزراوە نەوتیە نوێیەکان و بەگەڕخستنی تەکنیکی و ئەندازیارانی لێوەشاوە هەبوو. هەروەها ئیدارەی شارو پارێزگاکـەش پێویسـتی بـە کەسانی بیروکراس هەبوو لەسەر ئاستی ئەو خواستانەی کـە دەوڵـەتی هاوچـەرخ دەیـەوێت تـا لەناوچەکەدا سەنگی خۆی هەبێت، ئەوەبوو ژمارەیەکی کەمی کوردیش توانای دەستەبەرکردنی ئەو مەرجانەیان هەبوو، ئەوەش بووە پاساو بۆ حکومەتی عێراقی تا کەسانی تر لەناوچـەکانی دیکەوە بۆ عێراق بهێنێت.

دەرئەنجامەکەش گۆڕانکاری کاتیانەی کۆمەڵایەتی بوو بەشێوەیەکی فراوان لە ناوچەرگـەی کەرکووکـدا، بـەجۆرێك گـەڕەکی نـوێ لەناوچـەکانی بەرهـەمهێنانی نـەوت دروسـتکران، دانیشتوانی ئەو گەڕەکانەش کەسانی هاوردەی نوێ بوون کەبەبـەراورد بـە خـەڵکی کـەرکووك موچەیەکی بەرزیان وەردەگرت.

هەروەها ژمارەیەکی زۆری عەرەبیش لەعەرەبەکانی حەویجـە و دەوروبـەری نیشـتەجێکران، بەتایبەتیش خێڵەکانی عوبەیدو جبور، بەپێی سەرچاوە کوردیەکانیش نزیکەی هەزار خێزانـی عەرەبی لەماوەی نێوان ١٩٣٦- ١٩٥٧گواستراونەتەوە١.

---

١-کەمال مەزهەر، "کركووك وتوابعها-حكم الـتأريخ والچمير"،السليمانيه، دار رينوين ،Renwin Publisher ،

لەبەرئەوە سەیر نییە لەکەرکووکدا دوو هێزی دینامیکی دروست بن و رووکاری پەیوەندی نێوان پێکهاتە جیاوازەکان لەماوەی سەدەیەکدا دیاری بکەن.

دیارە هێزی یەکەمی دینامیکی پارت و رێکخراوە چەپەکان بوون، کە باوەڕیان بە ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیستی هەبوو لەکەرکووکدا، بەتایبەتیش دانیشتوانی کورد، کە ئەویش بۆ ئەوان لە کۆکردنەوەی ئەندام و لایەنگرانیاندا لەباربوو.

هەرچی هێزی دووەمیشە ئەوانەبوون کە پێکهاتەی کوردیان لەرووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە بەبەراورد بە کەسانی هاوردەو ئەو کەرکووکیانەی کە دەرفەتی کاریان لە پیشەسازی نەوت و فەرمانگە حکومیەکاندا دەست کەوتبوو پەراوێزخستبوو.هەڵبەت تورکمان توانیان پارێزگاری لەو پلەو پایەی لێپرساوێتیەی خۆیان بکەن کە لەرۆژگاری عوسمانیدا هەیانبوو. جگە لەوەش چینی بازرگانانی تورکمان سوودیان لەو خۆشگوزەرانیە وەرگرتبوو کە کرێکارانی نێو پیشەسازی نەوت لەکەرکووك تازە بەدەستیان هێنابوو.

ئەوەبوو لەسەرەتادا پەنگخواردنەوە بەهۆی جیاوازی بوو لەدابەشکردنی سامان و توانای گەیشتن بە دەرفەتی کار بەبەرزترین موچە، بەڵام دواتر ئەو پەنگخواردنەوەیە فۆرمێکی ئیتنیکی وەرگرت لە نێوان کورد __ بەکردەوە بێ بەشبوون یان راستر دوورخرابوونەوە__ لەگەڵ هەریەك لە عەرەب و تورکمانەکان.

## کێشمەکێش لەشارەکەدا

لەساڵی ١٩٥٩دا عێراق لەبارودۆخێکی نائۆقرەدا ژیا و رەنگە تێگەیشتنیش لە کێشەکانی کەرکووکیش وەك پێویست تەنیا لەروانگەی سیاسی سیاسەتی فراوانی عێراقەوە بێت.

لەپاش کودەتای ساڵی ١٩٥٨ کە تیایدا سوپا بەفەرماندەیی زەعیم عەبدولکەریم قاسم توانی پادشایەتی و دارودەستەکەی بڕوخێنێت و هەروەها کودەتاکەی سەرکەوتن بەدەستبهێنێت و شەقامەکانی بەغدادیش دیمەنی خوێناوی بەخۆوە ببینێت، سیاسەتی عێراقی بەناسەقامگیری مایەوە و بگرە حکومەتی عێراق لەپێناو کۆنترۆڵکردنی وڵاتدا هەوڵی دەدا.

لەتەقەلایەکی حکومەتیش بۆ پتەوکردنی پێگەی خۆی بووە هاوپەیمانی حزبی شیوعی عێراقی هەنگاوێکی قاسم بوو بەو هیوایەی کە بتوانێت نەتەوەپەرستە تورەکان بەرتەسك بکاتەوە و مومارەسەی نفوزی خۆی بەسەر شیوعیەکاندا بکات کە خاوەنی پێگەیەکی میللی

---

ل ٧٨، ئەی . ئار .ئەمین "هەواری کورد"،ژمارە ٤.چاپخانەی هەولێر.

بەدەسەندوبوون١. لەباکووری عێراق بەتایبەتیش لەکەرکووکدا، حزبی شیوعی عێراق لەریزەکانیدا زۆرێك ئەندامانی کوردی لەخۆگرتبوو- کەئەوەش گوزارشت بوو لە پەیوەندی لەمێژینەی نێوان بزوتنەوەی کوردیەتی و بیروباوەڕی چەپگەرایی.

لە تەقەلایەکی قاسمیشدا بۆ زامنکردنی توانای لەمامەڵەکردنی لەگەڵ هەر ئاریشەیەکی کوردیدا ڕێگەی دا بەگەڕانەوەی سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان مەلا مستەفا بارزانی لەتاراوگە٢.بارزانی کەسایەتیەکی خاوەن راوبۆچوونی بەهێز بوو لەبارەی داهاتووی کەرکووك و هەروەها پەیوەندیەکی بەتینیشی بە حزبی شیوعیەوە هەبوو بەڵام شتێکی ئەوتۆی نەکرد کە ترسی تورکمان بڕەوێنێتەوە سەبارەت بەوەی کە ناخوازێت بەهیچ شێوەیەك هەژموونی کورد بەسەر کەرکووکدا بسەپێنێت.

بەدیدی زۆرێك لە چەپەکان تورکمانەکانی کەرکووك خاوەن دیدوبۆچوونێکی بۆرژوازی بوون و کوردیش بەچاوی دوژمنێکی سەرسەخت لەعێراق لێی دەڕوانین و بە نیگەرانیشەوە تەماشای بارودۆخیانی دەکرد.

هەرچی تورکمانیشە ئەو دەمەی، کە لە تەمووزدا مارف بەرزنجی کرایە موتەسەرفی کەرکووك ترسیان زیادیکرد لەوەی کە کورد باڵادەست بێت.

ئەوەبوو لەپاش ئاهەنگەکان بەبۆنەی ساڵیادی یەکەمی شۆڕشی ١٤ی تەموزەوە پشێویەکان رووی لەهەڵکشان کرد و کەرکووك بەسەر هەردو گروپی ئیتنیکی کوردو تورکماندا دابەشبوو٣، کەئەوەش بەشێوەیەکی لەخۆوە شەڕی نێوان هەردولا وکوژرانی نزیکەی ٢٠ تورکمانی لێکەوتەوە.

ڕووداوەکانی دوو ڕۆژی لەسەر یەك ئاماژە بوون بۆ ئاستی بەرزی پلان و بەرپابوونی کێشمەکێشی ئیتنیکی نێوان کوردو تورکمان لەنێو جەرگەی کەرکووکدا.

لە ١٥ی تەموزدا سەربازانی کورد لەلیوای چواری سوپای عێراق گەڕەکە تورکمان نشینەکانیان بە هاوەن بۆردومان کرد، کاتێکیش لە ١٧ی تەموزدا سەر لەنوێ نیزام لەرێگەی

---

1 -Farouk Sluglett, M.,and Slugett,P.2001.Iraq Since 1958: From Revolution to Dictorship.3rd ed.London:I.B.Tauris:70-72.

٢- دوای بەشداریکردنی بارزانی لەدامەزراندنی کۆماری کوردستان لەمهاباد کە چارەنووسێکی رەشی هەبوو،ناچارکرا لەتاراوگە بژی ئەو دەمەی کۆمار لەسەر دەستی هێزە ئێرانیەکان لەساڵی ١٩٦٤دا شکستی هێنا.ئەوەبوو بارزانی و هەوادارانی لەمهابادەوە بەرەو خاك سۆڤیەت هەڵهاتن و لەوێ مافی بەرێتی پێدرا.

٣- بگاگو،هەمان سەرچاوە،٩١٣.

بلاوكردنەوەی یەکە سەربازیەکانی بەغدادەوە سەپێنرایەوە، ١٢٠ خانوو روو بـەڕووی وێرانـی و تالآنکاری ببوونەوە، هەروەها بـەپێی تۆمـاری حکومـەتی عێـراقیش ژمـارەی قوربانیـەکان لەنێوان ٣١بۆ ٧٩ کوژراوو ١٣٠ پێکراودا بوون١.

دیارە ژمارەکان ئاماژەن بـۆ پێکـدادانی تونـد و وردەکاریـەکانیش ئـەوە دەردەخـەن، کـە پاڵنەری سەرەکی بەدیاریکراوی ئیتنیکی بوەو هەروئەوەشە تورکمـان وەك کوشـتارگەیەك لـەو رووداوە بڕوانێت کە لەلایەن کوردەوە دەرهەقیان کراوە.

حنا بتاتۆ لەتۆماری تێروتەسەلی مێـژووی عێراقـدا نووسـیویەتی کـە بـەرەسمی کـوژرانی ٣١کەس راگەیەنراوە کە جگە لە سیانیان نەبێت ئەوانیتر هەموویان تورکمان بوون و لە نێو ٢٨ کەسی دیکەش کە لەیەن دەسەلآتەوە بەتۆمەتی تێوگلانیان لەو رووداوەدا لەسێدارە دران جگـە لەچوارکەسیان هەموو ئەوانی تر کورد بوون. لەپاش رووداوەکـان ئـەوە بەنـەمری لـەلای کـورد مایەوە، کە بەتەنیا حکومەت نایان چەوسـێنێتەوە بـەڵکو تورکمـانیش لەرێگـەی رێخـراوە نهێنیەکانیەوە کە بۆ غافڵکوژی کەسایەتیە بەرچاوەکانی کورد دروستکراون دەیانچەوسـێننەوە و هەوڵێکی سەرکەوتوویان داوە بۆ راگواستنی خێزانە کوردەکان لەشارەکەدا.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٩ و بەدواوە، کورد کەنەیدەتوانی بەئازادانە جموجۆڵ بکات، هـەوڵی دەدا کەرکووك بەجێبهێڵێت بەجۆرێك تەنانەت لەسەرئاستی شەخسیشـدا بـارودۆخی ئـەمنیان خراپبوو، جگە لەوەش ئەوانەی کە دەیانوویست بـڕۆن و کـەرکووك بـەجێبهێڵن زۆرێکیـان کـە فەرمانبـەری دەوڵـەت بـوون( مامۆسـتا، ئیـداری،...)بـەرەو ناوڕاسـت و باشـووری عێـراق گوازرانەوە.هەروەها رێکخـراوە سیاسـیە کوردیـەکان روو بـەڕووی سـەرکوتکردنێکی دڕندانـە بوونەوە بەتایبەتیش پارتی دیموکراتی کوردستان.

لەدوای کودەتای یەکەمی بەعسیەکان لە ساڵی ١٩٦٣دا کورد روو بـەڕووی چەرمەسـەری زۆر بوەوە چونکە ناسیونالیستە کوردو شیوعیەکان هەردوکیان وەك یەك بەدوژمنی راستەوخۆی رژێمـی عەسـکەرتاری نـوێی بەعسـیەکان دادەنـران، کـە لـەبارێکی تـەواو ناسـەقامگیرو مەترسیداردابوو.

---

١-هەمان سەرچاوە،٩١٨-٩١٩

PDF 4 KURD



بارێکی خراپتر چاوەڕوانی کوردی دەکرد، هێزی پێشمەرگە لەپاش ڕووداوەکانی ئێران کە لەساڵی ١٩٤٦دامەزراندنی کۆماری مهابادی بەخۆوە بینی و تەمەنیشی کورت بوو، لەهەرەتی هەڵکشانیدا بوو.

ئەوەبوو لەترسی ئەوەی نەبا ئاسایشی کەرکووك لەلایەن پێشمەرگەوە کە بەشێوەیەکی باش رێکخرابوو، روو بەڕووی مەترسی ببێتەوە، حکومەتی عێراقی جوڵا بۆ ئەوەی باڵادەستی کورد بەسەر تەواوی پارێزگاکەدا لاوازبکات، بەتایبەتیش بۆ دڵنیابوون لەوناوچانەی کە هێڵی نەوت بەرەو باشووری خۆرئاوای کەرکووك پیایدا گوزەریان دەکرد. ئەوەبوو راگواستنی کورد لەناوچەکانی نزیك بە بۆریە نەوتەکان دەستی پێکردو لەجێگەی ئەوان ئەو عەرەبانە دانران کە جێگەی متمانەی زیاتر بوون.

پاشان ستراتیژگەلێکی تەعریب جێبەجێکران و هەر لەناوەڕاستی سییەکانی سەدەی رابردووشەوە حکومەتی عێراقی دەستیکرد بە دروستکردنی پرۆژەی گەورەی ئاودێری لەدەوروبەری دەشتی حەیجەی باشووری خۆرئاوای کەرکووك- ئەو ناوچانەی کە کورد داوایان دەکاتەوە و بەلەوەڕگەی تەقلیدی دەژمێردرێن و تیایدا هەندێك جار لەگەڵ خێڵە عەرەبە کۆچەریەکاندا بەشداری دەکەن، لەوانەش عوبێد و جبور کە لەباشوورەوە هەڵهاتوون. لەدوای تەواوبوونی پرۆژەکەش پانتاییەکی زۆر زەوی لەبری دانیشتوانەکوردەکەی درایە عەرەبە کۆچەریەکان، ئەمە جگە لە پێدەشتی قەراج لەباشووری پارێزگای هەولێر و پێدەشتی قەرەتەپە لە باشووری قەزای کفری- بەوەش بەکردەوە پردێکی عەرەبی درێژبووەوە بۆ پاراستنی بۆریە نەوتەکان و گۆڕینی هاوسەنگی دیمۆگرافیا لە هەردو پارێزگای دیالەو هەولێرداو لەوەش گرنگتر لەپارێزگای کەرکووك بۆ بەرژەوەندی دانیشتوانی عەرەب١.

ئاماری ساڵی ١٩٥٧ ژمارەی عەرەبی نیشتەجێی ناوچەی حەویجەی بە نزیکەی ٢٧٧٠٥کەس تۆمار کرد لەگەڵ ئەوە بەرەسمی قەزاکە خرایە تەك پارێزگای کەرکووك.

بەدیدی کورد ئەوە بۆخۆی گەمەکردنێکی ئاشکرابوو بە پێکهاتەی دانیشتوانوسنووری ئیداری، هەروەها جەستەیەکی گەورەی دانیشتوان خراوەتە سەر خاکەکەیان کەلەو رۆژەوە بووەتە هەڕەشەیەکی ئەمنی بۆ سەریان. لەراستیدا کورد هەربەتەنیا لەماوەی دوای

---

١-تاڵەبانی، نوری،هەمان سەرچاوە،٢٣

دوورانکاریەکانی ساڵ ۲۰۰۳ەوە وەك دوژمن لە عەرەبی حەیوجە نارِوانن، بەڵکو یاساناس و ئەکادیمیستی ناسراوی کورد نوری تاڵەبانی دەڵێت لەپاش هەڵگیرسانی شۆڕشی کوردی لەساڵی ۱۹٦۱ عەرەبی حەویجە چوونە نێو ریزی میلشیای سەربازی نانیزامییەوە کە ئەرکیان پەلاماردانی ئەو گوندە کوردنشینانە بوو کە پێیان وابوو یارمەتی پێشەرگە کورد دەدەن.

لەیەکێك لەهێرشەکانی ئەو عەرەبانەدا لەساڵی ۱۹٦۳ئەم (ئەهزوجە- گۆرانیە میللی)ەیان دەوتەوە" احنا العرب أهل الغیره نگرد الاکراد من هلدیره- ئێمە عەرەبی بەغیرەتین کورد دەردەکەین لەم ناوچەیە"۱.

ماوەی فەرمانڕەوایی میلیتاری لەعێراق لەنێوان ۱۹٦۳ بۆ ۱۹٦۸ ماوەیەکی دژواربوو بۆ کوردی کەرکووك. لەدوای سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی کە شۆڕشی کوردی لەدژی سوپای عێراقی لە چیای ناوچە بڵندەکان بەدیهێنا، رژێم لەهەرکاتێکی تر زیاتر سووربوو لەسەر مانەوەی دەسەڵاتی بەسەرکەرکووکدا، هەروەها هەوڵیشیدا تۆڵە لەکوردی کەرکووك بکاتەوە لەبری بێتوانابوونی لەبەرەنگاریبوونەوەی راستەوخۆی پارتی دیموکراتی کوردستان.

ئەوەبوو چەند گوندێکی نزیك بەکەرکووك و چەند گەڕەکێکی لەشارەکەدا وێران کرد بەتایبەتیش گەڕەکی کۆماری ۲.

لەدبسیش خێزانە کوردەکان راگوازران و لەبریان لە نزیکەی ۳۵ گوند دا خێڵی عەرەب نیشتەجێکران، لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی هاوشێوە لە گوندەکانی هەردو قەزای سەرگەڕان و کاندیناوا تەعریب کران۳.هاوکات ئەوکوردانەش دەرکران، کە لە پیشەسازی نەوت کاریان دەکرد یاخود بۆ دەرەوەی پارێزگاکە گوازرانەوە.

دیسان عەرەب لە نێو پۆلیسی ناوخۆیدا بەگەڕخران و ناوی زۆرێك لە شەقام و خوێندنگە کوردیەکانیش گۆڕدران و پرۆسەیەکی فراوانی بەسەربازیکردن لەسەرتاسەری پارێزگاکە ئەنجامدرا لەنێویشیاندا دروستکردنی ناوچەی ئەمنی لەدەوروبەری دامەزراوە نەوتییەکان٤.

---

۱هەمان سەرچاوە،۲٤.

۲- هەروەها هەریەك لە سوناغولی و یاروەلی و پەنجاعەلی و وائل پاشاوقزلقایاوچیمەنی گەورەو چیمەنی بچوك وجەوەل پوروهەنجیرەو قوشقایاوشوراووباجوان.

۳- Resool,S.H.1990. Destruction of NATIONM ، هێڵکاریەکی بلاونەکراوە،تەموز ۳۵:۱۹۹۰،هەروەها ئە.مینە.۱۹۹۹ :ئەمنی ستراتیژی عێراق وسێ کوچکەی بەعسیان:تەرحیل و تەعریب وتەبعیس:۲۳۸-۲۳۹.

٤-تاڵەبانی،هەمان سەرچاوە،۲۳۸-۲۳۹.

بەدیدی کورد شەستەکانی سەدەی رابردوو خاڵی وەرچەرخان بوو لەپەیوەندیان بە دەوڵەتی عێراقیەوە، چونکە ئەو دەیەیە بەبەبەراورد بەرووداوگەلی دەیەکانی پێشووتر جیاوازبوو، کە تیایدا کەرکووك بە چڕی تەعریب کراو هاوکاتیش پرۆسەی سڕینەوەی ناسنامەی کوردبوونی شارەکە ئەنجامدرا و بووە ئەو ستراتیژیە روون و ئاشکرایەی کە دەوڵەت پشتی پێدەبەست و بەشێوەیەکی دڕندانەولەناوبەرانە جیبەجێی دەکرد.ناکۆکی ئیتنیکی بووە لۆژیکی ستراتیژێکی دیاریکراو و دیسان دەیەی شەستەکان نائۆقرەیی پەیوەندی نێوان کوردو تورکمانی بەشێوەیەکی بەرچاو لەدوای کوشتارگەی ١٩٥٩ەوە بەخۆوە بینی. بەڵام شەستەکانی سەدەی رابردوو بۆ کورد ترۆپکی نەهامەتیەکانیان نەبوو لەسەر دەستی دەوڵەت بەڵکو خراپتریش روویدا.

## قۆناغی سێیەم لە تەعریب، ١٩٦٨ - ١٩٧٤ : جێگیرکردنی دەسەڵاتی بەعس

ئەوە بەتەنیا هەر کورد نەبوو دەیەی شەستەکانی لێوان لێو بوو بە دەردەسەری، بەڵکو حزبی بەعسیش لەپێناو مانەوەی لە نێو لێشاوی پشێوی سیاسی ژیانی وڵاتدا هەوڵی دەدا.

لەدوای سەرکەوتنی بەعس لە تێکەڵ کردنی هێزەکانی بە سوپا بۆ رووخاندنی زەعیم عەبدولکەریم قاسم لەساڵی ١٩٦٣دا، سەرکردە بەعسیەکان لە پۆستە باڵاکانی دەوڵەتدا دانران.

بۆنموونە ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر سەرۆکایەتی حکومەتی گرتە دەست و عەلی سالح ئەلسەعدی بووە جێگری١. لەکاتێکدا حوکمی بەعس سەلماندی زۆرلێهاتووە لە سەرکوتکردنی لایەنگرانی رژێمی لەناوچوو لەگەڵ پەلامارادنی حزبی شیوعی عێراقی بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە، کەچی کەم توانا بوو لەروو بەڕوو بوونەوەی شۆڕشی کورد کە لە ساڵی ١٩٦١ەوە بەرەو هەڵکشان دەچوو.

لەبەرامبەر ئەو رەخنە زۆرەی لەناوخۆی عێراقدا لەئارادا بوو، کە رەنگە لە دەرەوە گرنگتربووبێت –بەتایبەتیش رەخنەکانی سەرۆکی میسری جەمال عەبدولناسر- هاوپەیمانە سەربازیەکانی بەعس لەبەعس هەڵگەڕانەوەو لەتشرینی دووەمی ١٩٦٣دەسەڵات وەدەرینان.

رووخانی بەعس ئەزموونێکی بەسوێ بوو بۆ ئەو حزبە کە هێشتا حزبێکی گەنج بوو بەڵام ئەزموونەکان بەخێرایی وانە فێر دەکەن، لەبەرچاوترین ئەو وانانەش پێویستی بەڵگەنەویستی بوو بۆ دانانی ستراتیژێك بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ هەڕەشەی بەردەوامی کورد. ئەوەی لە دەیەی

1 -Stansfield ,G.2007.Iraq,People,History,Politics:Politics:93.

PDF 4 KURD

ئەستەکان مابووەوە، بەعس هێزەکانی کۆکردەوەو ریزەکانی خۆی تیادا رێکخستەوە وسەرلەنوێ بە هاوپەیمانی لەگەڵ سوپا لە ١٧ی تەموزی ساڵی ١٩٦٨ گەڕایەوە دەسەڵات.

لەگەڵ ئەوەی بزوتنەوەی تەموزی ١٩٦٨هەولێکی هاوبەشی نێوان بەعس و وئەفسەرە سەربازەکان بوو بەڵام ئەمجارەیان مێزەکە هەڵگەڕایەوەو حزبی بەعسیش سوور بوو لەسەر ئەوەی بۆ خۆی ئاغا بێت نەك سوپا. هەربۆیە زوو سەرۆکی نوێی بەعس ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر لەگەڵ هەڤاڵەکانیدا ساڵ مەهدی عەماش و حەردان تکریتی خۆیان لەو ئەفسەرانە رزگارکرد کە ببوونە هاوپەیمانیان، پاشان پەلاماری حزبی شیوعی و کوردیان دا بۆ بەرەنگاریبوونەوەی مەترسی هەڕەشەکانی سەر رژێم لەمەودایەکی نزیکدا١. بەعس پێیوابوو چارەسەرەی کاتی بۆ ئەو مەترسیانەی کە هەڕەشەن بۆ سەر مانەوەی بەس نییە بۆیە لەبری ئەو چارەسەرە بەرەو چارەسەرێکی تاڵ و ریشەیی هەمیشەیی هەنگاوی نا.

سەبارەت بەکورد حوکمی نوێی بەعس زۆرخراپتربوو لەو رژێمەی کە پێشووتر هەبوو، ئەوەبوو لەبری چارەسەرکردنی لایەنە توندەکانی سیاسەتی تەعریب و وازهێنان لە چەوسانەوەی کورد بەگشتی، رژێم بەردەوام بوو لەسەر ئەو نەهجەو هەولێدا زۆر لەوە دوورتر هەنگاو بنێت لەبەرامبەر بوونی بزوتنەوەی کوردایەتی لە کوردستان بەگشتی و کەرکووکیش بەتایبەتی.

جاپاش ئەوەی دەسەڵاتی خۆی سەپاند، بەعس بوە درێژە پێدەری سیاسەتی رژێمی پێشوو لە تەعریبکردن و سەپاندنی ناوی عەرەبی لەبری ناوە کوردی و تورکمانیەکان و سەرقاڵبوونی بە پەیڕەوکردنی ستراتیژی نوێ. لەماوە مەترسیدارەکانی نەبوونی ئارامی سیاسیدا کورد لەکەرکووك دەکرایە ئامانج، بەڵام دەسەڵاتی بەعس پێویستی بە زامنکردنی پەراوێزێکی سیاسی بۆخۆی بوو، تا لەپێناو جێگیرکردنی پێکانیدا کات بەدەستبهێنێت و لەکۆتاییدا ئیرادەی خۆی بسەپێنێت.

لەساڵی ١٩٧٠دا لەسەروبەرندی لاوازی دەسەڵاتدا دووەم پیاوی رژێم- سەددام حسێن- رووی لەباکوور کردو روو بەڕوو چاوی بە سەرکردەی کورد مستەفا بارزانی کەوت و پەڕەیەك سپی دایە بارزانی بۆ ئەوەی داواکاریەکانی خۆی تێدا بنووسێت٢.بەڵام کەرکووك بەناوچەیەکی کێشە لەسەر مایەوە کە بارزانی داوای کردو حکومەتیش داواکەی رەتکردەوە.هەڵبەت

1 -Mufti, M.1996. Sovereign Creations: Pan –Arabism and Political Order in Syria and Iraq.London: Cornell Unversity Press:198

٢ - ماکدویل، McDowall،هەمان سەرچاوە،٣٢٧

PDF 4 KURD

چارەسەر لە رووی پراکتیکیــەوە دەســتی دەســتی خۆدزینــەوەبوو- بۆئــەوەی دەرفــەتێکی تــر لەبەردەم دەسەڵاتدا بێت تا کەشێکی سیاسی بسازێنێت و توانای سەربازی خۆی بۆ روو بــەڕوو بوونەوەی هەڕەشەی کوردی دروست بکات.

لەبری دیاریکردنی چارەنووسی کەرکووکیش بەرێگەیەك لەرێگەکان لەسەر ئەوە رێککەوتن کە دوا سنووری ناوچەی ئۆتۆنۆمی پشت بە بوونی زۆرینەی کورد دەبەستێت، ئەویش لەرێگەی راپرسی یاخود سەرژمێری دانیشتوانەوە١.

لــەو دەمــەدا بەیاننامــەی ئــازار مــۆرکرا بــەبێ ئــەوەی کــەرکووك بکەوێتــە نێــو رێککەوتننامەکەوە، دیارە بەیاننامەی ئازار پرۆژەیەکی گشتگیر بوو کــە پێشــکەش بــەکورد کرابوو، لەگەڵ دان پێدانان بەناوچەی ئۆتۆنۆمیدا.

بەپێی رێککەوتننامەکە کورد بەزمانی خۆی دەیخوێندو بەرپرسانی کوردیش کــە بــەزمانی کــوردی دەدوان کاروباری خۆیان بەرێوە دەبرد، ئەمە جگە لەدەستەبەرکردنی سەرچاوەیەکی دارایــی دیــاریکراو بۆ پەرەپێدانی ناوچەکە و هەروەها دانپێدانان بەوەی کە کورد یەکێکە لــەو دوو نەتەوەیــەی کــە گــەلی عێراق پێکدەهێنێت، لەگەڵ پێدانی پۆستی جێگری سەرۆك کۆمار لەبەغداد.

بەڵام ئەگەر ئاورێك لە دواوە بدرێتەوە دەبینرێت رژێمی بەعس بەجۆرێك لە فێڵبــازی کــار کردووە.

لەدوای واژۆکردنی رێککەوتننامەکە دەستەبژێری کورد هەستی بە تووڕەبوونێکی زۆر کــرد لەبەرئەوەی جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی نێو رێکەتننامەی ئازار وەك پێویست نەبوون یاخود هەر جێبەجێ نەدەکران.

ئەو تورەییە هەر کوردی نەگرتەوە، بەڵکو حکومەتی عێــراقیش لەبەغــداد نیــازی خــۆی نەشاردەوەوهەوڵیدا مەلا مستەفا بارزانی لەدوو بۆنەدا لەســاڵی ١٩٧٢ بکوژێــت و لەهــەمان کاتیشدا ئیدریســی کوریشــی لەبەغــدا کرایــە ئامــانجێکی غــافڵکوژی، هەرچــی بــارودۆخی کەرکووکیشە هۆکاری تێکچوونی پەیوەندیەکان بوو.

لەدوای بەیاننامەی ئازای ١٩٧٠ و داواکاری بارزانی سەبارەت بەگەڕانەوەی کــەرکووك بــۆ سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی، هەوڵەکان بۆ لاوازکردنی بوونی کورد لەشاری کــەرکووك چــڕکرانەوە، ئەویش وەك پێشبڕکێکردنێك لەگەڵ ئەنجامدانی هەر سەرژمێریەك کە لەداهاتوودا بکرێت.

---

١ -هەمان سەرچاوە.

ئەوەبوو عەرەبە نێردراو(الوافدون) ە نوێکان _ئەوانەی لە پەنجاکانەوە روویان لە کەرکووك کردبوو وا تۆمارکران کە ساڵانێکی زۆرە لەوشارەدا نیشتەجێبوون، هەروەك نوری تاڵەبانی بە و فێڵ و تەڵەکەیە ناوی دەبات کە دەوڵەت مومارەسەی دەکات١.

هاوکات دەست خرایە سەربینەقاقای کورد لە کاروبـژێوی پێویستی ژیانی رۆژانەیاندا و رێگەیان پێنەدرا خانوو و زەوی و زارەکانیان بفرۆشن تەنیا بە کڕیاری عەرەب نەبێت، دیسان قەدەغەبوو بەهەرشێوەیەك خانوو و زەوی و زار بکڕن و تەنانەت مۆڵەتی ئەوەشیان پێنەدەدرا خانوو و موڵکەکانیان نۆژەن بکەنەوە ئەوەش وایکرد زۆرێکیان ژیانی کولەمەرگی بەسەربەرن.

هەروەها لەرووی سیاسیشەوە کورد پەراوێز خرا ئەویش بەگواستنەوەی سەنتەری ئیداری پارێزگاکە لەبەشی کوردی شارەکەوە بۆ بەشە تەعریبکراوەکە٢.

هاتنی خێزانە عەرەبەکان لەسەردەمی دووەمی بەعسدا بەردەوام بوو، لەگەڵ ئەوەی هەرخێزانێکی هاتوو بڕی ١٠ هەزار دیناری بۆ خەرج دەکرا، ئەمە جگە لە ئیمتیازی وەك دەستەبەرکردنی شوێنی نیشتەجێبوون و کار- زۆر جار ئەوانە لە دەزگای ئیداری پارێزگاکە یاخودلەدەزگا ئەمنیەکاندا کە بەخێرایی فراوانتردەبوو بەگەڕدەخران.

سەرباری ئەوەش رژێم هەوڵیدا دەرماڵەی دارایی بۆ دانیشتوانی کورد دەستەبەرکرد بۆ ئەوەی هانیانبدات شاری کەرکووك بەجێبهێڵن و روو لەشارەکانی ناوڕاست و باشووری عێراق بکەن.

لەسەرەتای هەفتاکاندا دروستکردنی خانوو بەرە بۆ عەرەبە هاوردەکان روو لە هەڵکشان بوو، لەبەرامبەر داواکاریەکانی مەلا مستەفا بارزانیش سەبارەت بەوەی کەرکووك بخرێتە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی هەروەك ئەوەی لە رێککەوتننامەی ئازاری ١٩٧٠دا هاتووە، دەسەڵاتدارانی عێراقی بەگوڕ و تینەوە پەرۆش بوون بۆ گۆڕینی دیمۆگرافیای شارەوپارێزگاکە و زۆرکردنی رێژەی عەرەب هەرچەندە راستەوخۆ نەببوونە زۆرینە.

بۆ نموونە نوری تاڵەبانی دەڵێت، دروستکردنی ٦٠٠خانوو لە گەڕەکی ئازادی و ئیسکان لەنزیك شارێی کەرکووك سلێمانی و ناونانی ناوچەکەش بە کەرامەی عەرەبی، ئەمە جگە لە پرۆسەی نیشتەجێکردن و دروستکردنی سەربازگە لەنزیك ناوچەکە بەمەبەستی دەستەبەرکردنی ئاسایش بۆ دانیشتوانی ئەو دەڤەرە.

---

١ – تاڵەبانی، نوری، هەمان سەرچاوە،٣٥.

٢- هەمان سەرچاوە.



PDF 4 KURD

هەڵبەت ئەو پرۆژەیە دەست بەجێ لەگەڵ واژۆ كردنی ڕێككەوتننامەی ئازار لەنێوان ڕژێمی بەعس و مەلامستەفا بارزانی جێبەجێكرا، بەدواشیدا ٥٠٠خانووی دیكە بەتەك ناوچەی كەرامە دروستكران و ناوی لێنرا گەڕەكی موسەننا١.

هەرزووش پەیوەندیەكانی نێوان مەلامستەفا بارزانی و ڕژێم بەرەو بارگرژی چوو، ئەویش پاش ئەوەی ئەو سەركردە كوردە حكومەتی بەغدای بەنیشتەجێكردنی عەرەب لەناوچە كێشە لەسەرەكانی وەك كەركووك و شەنگال تۆمەتبار كرد و بگرە حكومەتیش لەوە ئاگادار كردەوە، كە سازدانی هەر سەرژمێریەك لەوناوچانەدا دەرئەنجامەكەی پەسەند ناكرێت٢.لەدوا هەرەسی دانوستانەكانی نێوان پارتی دیموكراتی كوردستان و حكومەتی عێراقی لە ئازاری ١٩٧٤دا یەك لایەنە لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ كوردستانی عێراق جاڕدرا، بەڵام بەجۆرێكی ئەوتۆ بەرتەسكی كردبوەوە، كە ناوچەی ئۆتۆنۆمی تەنیا ئەو زەویانەی لەخۆگرتبوو كە كورد داوای دەكرد، بێگومان لەگەڵ دورخستنەوەی كەركووكیش لەناوچەی ئۆتۆنۆمی٣.

پارتی دیموكراتی كوردستان یاسای ئۆتۆنۆمی بەتەواوی ڕەتكردەوەو سەرلەنوێ كێشمەكێشی ئاشكرای نێوان هێزی پێشمەرگەو حكومەت دەستیپێكردەوە.

دیارە بەپشت بەستن بە ئەزموونی ساڵانێك لەشەڕی نێو چیاكان و سوودوەرگرتن لە پشتیوانی ئێران، هێزەكانی مەلامستەفا بارزانی سەلماندی كە لەپێكهاتەی سوپای عێراقی كە لەدژی كۆكرابوونەوە بەتواناترن٤. بەڵام سەددام حسێن لەو پێگە لاوازەیدا نەبوو كە جاران تیایدابوو، ئەوەبوو سەركردایەتی عێراقی جەختی لەسەر پێداكوتینی ڕژێمەكەی كردەوەو دەستی بەدانوستان كرد لەگەڵ گەورەترین هاوپەیمانی كورد كە ئێران بوو، بەوەش پەیوەندی

---

١ - پێویستە سەرنجی ئەوەبدرێت كە توركمانیش دەڵێن بەهەمان شێوەی كورد تووشی نەهامەتی هاتوون و زۆرێكیش لەو گوندانەی كە كورد بەموڵكی خۆی دادەنێت گوندی توركمانین. بەدەر لە ناسنامەی گوندو ناوچەكانی كراونەتە ئامانج و گۆڕانكاری لەدانیشتوانەكەیدا كراوە، ئەوا قەبارەی تەعریب لەكەركوكدا زۆر سامناك بووە،هەروەك ئەوەی لەم لیستەدا ئاماژەی پێكراوە.

٢ - ماكویل McDowall ، هەمان سەرچاوە،٣٢٩.

٣ - ڕێكخراوی چاودێری مافەكانی مرۆڤ: Human Rights Watch 2004. Claims in Concflict: Reversing Ethnic Cleansing in Northerm Iraq.16 ,4(E),August:8.

4 - Jawd, S.1982."Recent Developments in the Kurdish Issue". In Niblock, T.(ed), Iraq: The Contemporary State . London: Lynne Reinner Publishers: 56

بەرژەوەندیخوازانەی نێوان مەلامستەفاو تارانی تێکشکاند و لەباشوورەوە نۆکەندی عەرەبی دایە ئێران کە چاوی تێبڕیبوو.

ئەوەکە دواتر بە ڕێککەوتننامەی جەزائیر ناسرا، لەئازاردا لەنێوان ئێران و عێراقدا مۆرکرا و بەوەش گورزێکی کوشندە لەبزوتنەوەی چەکداری کورد لـەعێراق درا کـە ئـەوەش پێویسـتی بەدەیەیەك بوو تا بێتەوە سەرخۆی و چاکبێتەوە.

ئەوەبوو بەراگرتنی پشتیوانی ئێران بۆ کورد، بزوتنەوەکەیان هەرەسی هێناو مەلامستەفاش بەبێ گەڕانەوە عێراقی بەجێهێشت١.

## قۆناغی چوارەم لەتەعریب، ١٩٧٥ - ١٩٨٧: هەڵکەندنی کورد

بۆ دڵنیابوون لەوەی کە جارێکی تر هەرگیز کورد نەتوانێت بڵێت ئەوان زۆرینەن لەپارێزگای کەرکووکدا ڕژێمی بەعس دەستیکرد بە تەعریبکردنی چڕتری ناوچەکە و ڕاگواسـتنی هـەزاران خێزانی کورد لەسەر زێدی خۆیانەوە بەرەو بیابانەکانی باشوور.

هـەروەك ڕێکخـراوی چـاودێری مافـەکانی مـرۆڤ Human Rights Watch یـش ئامـاژەی پێکردوە ئەو جموجۆڵانەی دانیشتوان زۆر سامناك بووە:

"لەکۆتایی هەفتاکاندا حکومەتی عێراقی دەستیکرد بەزۆر ڕاگواسـتنی نزیکـەی چارەکە ملیۆنێك لەپیاوو ژن و منداڵی گوندە هاوسنووریەکانی ئێران و تورکیاو خاپوورکردن دێکانیـان و دامەزراندنی ناوچەیەکی دابڕاو بەدرێژایی ئەو سنوورە هەستیارە.

هەروەها نیشتەجێکردنەوەی ئەو خەڵکە لەو کۆمەڵگانەی کـە بـۆ ئـەو مەبەسـتە لەسـەر شارێی ناوچەکانی کوردستان دروستکران و لەژێر کۆنترۆڵی سوپادا بوون"٢.

هاوشێوەی ڕاگواستنی کورد لەبەرامبەریدا شەپۆلی کۆچی عەرەب بـۆ ناوچـە کوردیـەکان لەئارادابوو.

---

١ - - دوای ماوەیەکی کەم لەتاران، بارزان بۆی دەرکەوت کە شێرپەنجە سی هەیـە. لـەئازاری ١٩٧٩ لەواشـنتۆن دی سـی گیـانی سپارد. Korn, D.1994."The Last Years of Mustafa Barzani". Middle East Quarterly,12

٢ - ڕێکخراوی چاودێری مافـەکانی مـرۆڤ: Human Rights Watch .1995. Iraq's Crime of Genocide : The Anfal Campaign Against the Kurds . New Haven and London:8.

بەوەبوو بەتەنیا لەساڵی ١٩٧٩دا نزیکـەی ١٠٠٠ هـەزار خـانوو لەناوچـەی "کـەرکووکی تازە" دروستراو لەساڵەکانی دواتریشدا ٤ هەزار خانووی دیکە خرانە سەر پرۆژەکە.

لەسەرەتای ساڵانی جەنگی ئێران عێراقیشەوە پرۆژەیەکی دی جێبەجێکراو بەلانی کەمـەوە ٢٠٠ دوو سەد خانووی تر بۆ کەسو کاری شەهیدانی قادسیەی سەددام دروستکران.

لەوبارەیەوە شۆڕش رەسوڵ دەنووسێت:

"لەدوای نسکۆی بزوتنەوەی کـوردی لـە ئـازاری ١٩٧٥دا حکومـەتی عێراقـی سـەرجەم جۆرەکانی تەعریبی پیادە کرد، لەوانەش راگواستن و دوورخستنەوە کوردی شاری کـەرکوك و دروستکردنی گەڕەکی عەرەبی لەناوشارەکەداو نشیتەجێکردنی عەرەب تیایـدا و دامەزرانـدنی گونـدی نـویێ لەدەوروبـەری کـەرکووك و هێنـانی عـەرەب لـە باشـوور و ناوڕاسـتەوە بـۆ نیشتەجێکردنیان، هەروەها ناچار کردنی عەشـیرەتە کوردەکـان بـۆ ئـەوەی نەتـەوەی خۆیـان بگۆڕنو بیکەن بەعـەرەب. گشـت ئـەم شـێوازانەی تـەعریبکردن زۆر بـە دڕندانـەتر لـەجاران جێبەجێکران١. دیارە سیاسەتی تەعریب هەربەتەنیا خۆی لـە بـەکارهێنانی دڕندانـەی هێـزدا نەبینیەوە بەڵکو سەرباری ئەوەش راستی نویێ لەسەر زەوی بەیاسا کاری لەسەر کرا.

بۆنموونە کاتێك کـورد یـاخود تورکمـان رادەگـوازران سـەرجەم بەڵگەنامـەی تایبـەت بـە موڵکداریێتیان بەپێی مەرسومەکان لێزەوت دەکـرا لەوانـەش زەویـە کشـتوکاڵیەکان٢. جگـە لـەوەش فەرمانگـەکانی دەوڵـەت فـۆرمێکی رەوای دەبەخشـیە بـارودۆخی خێزانـە عەرەبـە هاوردەکان و ئەو موڵك و زەویانەش کە پێیان دەدرا. لەئێستاشدا کورد بەچاوی داگیرکـەر لـەو عەرەبـە هاوردانـە دەڕوانێـت و گواستنەوەشـیان لەهـەفتاکان و هەشـتاکاندا بژاردەیـەکی بەڵگەنەویستی بووە.

رێکخراوی هیومان رایتس ووچ لەزاری شێخێکی عەرەبی عەشـیرەتی حەدیدییـەوە بـاس لـەوە دەکات کە چۆن ٤٧ خێزان لەعەشیرەتەکەی لەساڵی ١٩٧٥ روویان لە گوندی خانی سدیق کردووە:

"ساڵی ١٩٧٥ رووومان لە خان سدیق کرد. بەرلەوە ئێمە کۆچەری بووین و لەجێگەیەکـەوە دەچووین بۆ جێگەیەکی تر و زەویمان نەبوو.

---

1 - Resool,S.H.2003

"تعريب كركوك:أدلە علی سیاسە التعریب"، لندن،دارالحکمە،ص٤٦.

٢ - رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ، ،هەمان سەرچاوە،٩-١٠.

حکومەت هات و پێیوتین بەرەو گوندەکانی باکوور دەمانبەن، چونکە حکومەت کوردی دەرکردووەو قەرەبووی کردوونەتەوە و ئێمەیان بۆ ئێرە هێناوە.بێگومان حکومەت ئێمەی ناچار نەرکردووە روو لەباکوور بکەین، هاتن‌و پرسیان پێکردین کە ئایا زەویمان هەیە، ئێمەش وتمان نەخێر. وتیان هەرکەسێك گەرەکی بێت ئەوا دەیبەین بۆ باکوور، ئێمەش فرە خۆشحاڵ بووین بەچوونمان بۆ باکوور چونکە لە باشوور زەوی بەراومان نەبوو.١

پێویستە لەسەر ئەو ئاسەوارانەی پرۆسەی تەعریب هەڵوەستە بکرێت کە بەجێی هێشتوون، ئەویش نەك هەربەتەنیا لە هاوسەنگی دیمۆگرافیای شارەکەدا بەڵکو لەسەر دیدی پێکهاتە جیاوازەکانیش لەسەر یەکتری.

لەپەنجاکانەوە ناسنامەی گرتبوونەوە تەقلیدیەکان توند دەبێتەوەو کوشتارگەی ساڵی ١٩٥٩ ئەو پەڕی دوژمنایەتی نێوان کوردو تورکمان پیشان دەدات.بەڵام لەگۆشەنیگای خەڵکی کەرکووکەوە بەوشێوەیەی کە لەیەکتری تێدەگەن ئەوا کاریگەری هەموو ئەو مومارەسانەی کە لە هەفتاو هەشتاکاندا کراون زەقترن.

ئەو کەسانەی لەوەدەمەدا تەمەنیان لەنێوان ١٠ بۆ ٢٠ ساڵدا بووە ئەوا ئێستا لەنێوان ٣٠ بۆ پەنجا ساڵدان و هەموو ئەوەیان بەبیردێتەوە کە لەکەرکووکدا دیویانەو بە ئەزموونێکی سەردەم نوێی دەزانن.

هەروەها زۆرێك لەو کەسانە چالاکوانی سیاسین و بەهەموو تینیانەوەلەسەر داهاتووی کەرکووك تێکەڵ بە ململانێ بوون.

چیرۆکەکانیان فرەو بڵاون، ئافرەتێکی کورد بەناوی سۆنی خەلیل لەدیدارێك لەگەڵیدا باس لەوە دەکات کە چۆن لەسەرەتای هەشتاکاندا کە ئەو تەنیا منداڵێکی تەمەن ١٠ ساڵان بووە ژیانی گۆڕانی بەسەردا هاتوە ئەو کاتەی مومارەسەی سیاسەتەکانی حکومەت کاریگەری خۆی هەبووە:

"ئەو دەمەی تەمەنم ٥ ساڵان بوو زۆرێك هاوڕێم هەبوو نەك هەر لەکورد بەڵکو لە عەرەب و تورکمان و مەسیحی، ئێمە منداڵ بووین و بیرمان لە ئیتنیك و ئایین نەدەکردەوە.

بەڵام پاش هەڵگیرسانی جەنگی ئێران ئەو شتە گۆڕا و پەیوەندیەکان بەجۆرێکی تر بوون و دەبوو هەموو کات تەنیا زمانی عەرەبی بەکاربهێنرێت. دیارە ئەوەش وایلێکردم هۆشیارترم بەرامبەر بەکوردبوونی خۆم.

---

١-هەمان سەرچاوەی پێشوو



PDF 4 KURD

لەهاتنی ساڵی ١٩٨٦ گشت بە هەڵمەتەکانی ئەنفال و زەبروزەنگی دژ بە کوردیان دەزانی، ئەو دەم هەستم بەمەترسیەکی گەورە کرد.
کاتێکیش کە تەمەنم ١٤ ساڵان بوو، هاوڕێیەکم وێنەی بارزانی پێبوو لەقوتابخانە و یەکێك لەمامۆستاکان ئەو وێنەیەی دۆزیەوە، ئیتر دوای ئەوە ئەو هاوڕێیەمان نەدییەوەو ئەو دەم ئیتر زانیم کە من کوردم کوردبوونیش چ واتایەکی هەیە"١.

## دواقۆناغی تەعریب، ١٩٨٧- ٢٠٠٣:

### چارەسەری کۆتایی بەشێوازی بەعسییانە

بەدامەزراندنی عەلی حەسەن ئەلمەجید (ناسراو بەعەلی کیمیایی لەبەر ئەوەی لەهەشتاکاندا چەکی کیمیایی لەدژ کورد لە هەڵمەتەکانی ئەنفالدا بەکار هێناوە) بەرپرسی نووسینگەی باکوری حزبی بەعس کەساڵی ١٩٨٧ بارەگاکەی لە کەرکووك بوو سیاسەتی تەعریب گوڕێکی نوێی بەخۆوە بینی و تەواوکردنی تەعریب لەپێشەوەی کارنامەی ناوبراودا بوو.
لەنەوەدەکاندا سیاسەتی تەعریب گەیشتە ترۆپك، ئەوەبوو سەددام حسێن لە ئابی ١٩٩٠دا فەرمانیدا هێزەکانی بچنە نێو کوەیتەوە، ئەویش بەحسابی خۆی کەرامەتی نیشتیمانی بگەڕێنێتەوە کە دەرئەنجامی هەشت ساڵە جەنگ لەگەڵ ئێراندا دوچاری خوێن پژان و شکاندن ببووەوە، لەهەمان کاتیشدا زامنکردنی گەیشتن بە یەدەگی نەوتی کوەیتی.
ئەوەبوو لەبەرامبەر داگیرکردنی کوەیت و هەڕەشەکردن لە عەرەبستانی سعودیە، خۆرئاوا بەخێرایی هاوپەیمانیەکی نێو دەوڵەتی کۆکردەوە بۆ پارێزگاریکردن لە سودیەو وەدەرنانی هێزەکانی سەددام لەکوەیت.
لە ١٧ی کانونی یەکەمی ١٩٩١ پرۆسەی "گەردەلولی بیابان" وئازادکردنی کوەیت دەستپێکرد.
ئەو شکستە ئابڕووبەرانەیەی هێزەکانی سەددام دووچاری بوونەوە، رژێمەکەی خستە بەردەم مەترسی ئەگەری کودەتاوە.هەروەها لەرۆژە بێ سەروبەرەکانی دوای شکستی عێراق راپەڕینێکی خۆڕسك لە ١ی ئازار لەباشوور سەریهەڵداو دواتریش هەرزوو لە ٤ی ئازاردا کوردستانیشی گرتەوە.

---

١ - دیدار لەگەڵ سۆنیا خەلیل،هەولێر،٢٧ی نیسانی ٢٠٠٨



PDF 4 KURD

ئەوەبوو بەخێرایی کەرکووك و سەرجەم دامودەزگاکان کەوتنە دەست شۆڕشگێرەکانەوە بەر لەوەی سوپای عێراق و هێزەکانیان لە ٢٩ی ئازاردا کەرکووك بگەڕێننەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

ڕووداوەکانی ١٩٩١ هۆیەك بوون بۆ ئەوەی ڕژێمی فەرمانڕەوا نیگەران بێت چونکە ڕووداوەکان گەورەتر بوون لەو هەڕەشەیەی کە هێزەکانی مەلامستەفا بارزانی لەهەفتاکاندا بۆ سەر کەرکووك هەیانبوو.

هەروەها حکومەتی عێراقی ڕێو شوێنی پێویستی بۆ پارێزگاریکردن لەو باڵادەستیەی بەسەر کەرکووکدا هەیبوو گرتە بەر، دوای ئەوەی هەریەك لە ئەمریکاو بریتانیا پارێزگاریکردنی ناوچەکانی باکووری هێڵی پانی ٣٦یان گرتە ئەستۆ(بەهەولێرو دهۆك)ەوە، ئەوەبوو حکومەتی عێراقی تێگەیشت لەوەی ئەو پارێزگاریکردنە ئاسایشی ناوچە کوردنشینەکانی تری باکووری هێڵی کەسکی جیاکەرەوەی نێوان ناوچەکانی ژێر ڕکێفی بەغداد و ناوچەکانی هەرێمی کوردستان بەو بارودۆخە نوێیەیەوە لەخۆ دەگرێت.

دەرئەنجامی ڕاستەوخۆی دروستبوونی هەرێمی کوردستان، گواستنەوە و جموجۆڵی دانیشتوان بەهەردو ئاراستەدا دەستیپێکرد.

کورد کەئەوەندە نەبوو دەسەڵاتیان پەیداکردبوو، بەئەنقەست دەستیانکرد بە دوورخستنەوەی ئەو خێزانە عەرەبانەی کە لەلایەن ڕژێمەوە ڕەوانەی ناوچەکانی باکووری هێڵی کەسك(سەوز) کرابوون. لەبەرامبەریشدا حکومەت ئەو خێزانانەی لەناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆی لەکەرکووکدا نیشتەجێکرد.

ڕژێمی بەعس زۆر نیگەران بوو بەرامبەر دیفاکتۆی دەوڵەت لەهەرێمی کوردستاندا، هەربۆیە هەڵمەتەکانی تەعریبی لەکەرکووکدا چڕتر کردەوە.

لەناوشاری کەرکووك و لەسەرتاسەری پارێزگاکەدا، دەسەڵات دەستیکرد بە دابەشکردنەوەی فۆرم"ڕاستکردنەوەی ناسنامەی نەتەوەیی – تصحيح الهويه القوميه" بەسەر کوردو تورکمان و ئاشووریدا، بەو مەرجەی خۆیان بەعەرەب بنووسن١. هەرچی ئەو گەرەکە کوردیانەش بوون کە مایەی سەرئێشە بوون زۆر بەئاسانی لەگەڵ زەویدا تەختکران و خەڵکەکەشی بەرەو هەرێمی کوردستان ڕاگوێزران٢.

---

١ -ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ، هەمان سەرچاوە، ١٥

2 -Graham –Brown,S.1999. Sancitioning Saddam: The Politics of Inevention in Iraq . London: I.B.Tauris:40.

هەرچەندە ئەستەمە ژمارەیەکی وردی ئەوکەسانە لەبەردەستدا بن کە بەهۆی ڕێوشوێنەکانی ڕژێمەوە لەدەیەی نەوەدەکاندا زەرەرمەندبوون بەڵام ڕەنگە نزیکەی ١٢٠ هەزار کەس لـەماوەی نێوان ١٩١- ٢٠٠٠ لەکەرکووکەوە ڕاگـوازرابن١، کەزۆربــەیان لـەژێر چـادرگەدا لەهــەرێمی کوردستان ژیانێکی تاڵیــان بەســەر بــرد و تــەنیا پشــتیوانیەکی ســادەی حکومــەتی هــەرێمی کوردستان یان ڕێکخراوەکانی نەتەوەیەکگرتوەکانیان هەبوو.

بەگشتی ئاسەواری تەعریب سامناکە و لەســاڵی ١٩٦٠یــش بــەدواوە گــۆڕانێکی ریشــەی لەدیموگرافیای باکووری عێراقدا روویدا بەتایبەتیش لە کەرکووکدا کەبەبەراورد بەناوچەکانی تر ئەو گۆڕانکارییە زیاترە.

هەڵبەت لەبەر ئەوەی داتای بــاوەڕپێکراو لەبەردەســتدا نییــە ئــەوا داتــای ســەرژمێرەکان بەئاشکرا ئاماژە بەگۆڕانکاریەکانی کەرکووك دەکەن لەماوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا.

## گەمەی ژمارەکان

ئەو سەرژمێرەی کە حکومەتی عێراقی لەساڵی ١٩٥٧دا سازیکردووە، بنکەیــەکی داتــاو زانیاری گونجاوو متانەپێکراوترە لەو مشومڕانەی کە لەئێستادا لەئارادان.

لەو ئامارەدا داوا لەهاوڵاتیان کراوە زمانی دایك تۆمار بکەن، بێگومان ئــەوەش بۆخــۆی دەرئەنجامەکەی مایەی پرسیارکردنە، کەئایا زمان بەتەنیا بەســە یــان گونجــاوە بــۆ ناســنامەی ئیتنیکی، بەڵام بەپێی برۆنسن Bruinessen بەگشتی دەروازەکانی سەرژمێری ئاماژە بوون بــۆ ناسنامەی ئیتنیکی لەبری بژاردەی پەتی زمان_لەم سۆنگەیەشەوە هــەردوو زمــانی "ســریان" و"عبری" لەنێو فۆرمەکەدا هاتبوون٢. ئەنجامەکانی سەرژمێری ١٩٥٧ی دانیشتوانی کەرکووك بەم جۆرە بوو:

---

١ - ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ ٢٠٠٣:

Iraq: Forcible Expulsion Minoriries. 15,3 (E),Washington DC:HRW

٢ - برۆنسن Bruinessen ، هەمان سەرچاوە،١١.

PDF 4 KURD

خشتەی ٢- ٢

ئەنجامی سەرژمێری ١٩٥٧ی دانیشتوان پارێزگای کەرکووك

| ڕێژەی سەدی لەکۆی دانیشتوان | کۆی گشتی | شوێنەکانی تری پارێزگاکە | شاری کەرکووك | زمانی دایك |
|---|---|---|---|---|
| ٢٨.٢ | ١٠٩٦٢٠ | ٨٢٤٩٣ | ٢٧١٢٧ | عەرەبی |
| ٤٨.٢ | ١٨٧٥٩٣ | ١٤٧٥٤٦ | ٤٠٠٤٧ | کوردی |
| ٢١.٤ | ٨٣٣٧١ | ٣٨٠٦٥ | ٤٥٣٠٦ | تورکی |
| ٠.٤ | ١٦٠٥ | ٩٦ | ١٥٠٩ | سریانی |
| | | | | دیانەکان |
| ٠.٠٣ | ١٢٣ | ٢٢ | ١٠١ | عبری |
| ١.٦٨ | ٦٥٤٥ | ٢١٥ | ٦٣٣٠ | ئەوانیتر |
| ١٠٠ | ٣٨٨٨٢٩ | ٢٦٨٤٣٧ | ١٢٠٤٠٢ | کۆی گشتی |

سەرژمێری ١٩٥٧ دانپێدانانی زۆربەی لایەنەکانی لەعێراق بەدەستهێناوە، بەو پێیەی وردترین کۆمەڵە داتاو ئامارە، کە دەکرێت لەسەر ئەو بناغەیە بەلانی کەمەوە دەست بە تاوتوێکردنی داهاتووی کەرکووك بکرێت.

دیارە پرۆسەکانی سەرژمێریکردنی دواتر، سەلماندوویانە کە پڕن لە ئیشکالیەت چونکە ڕەنگدانەوەی ئەو سیاسەتی تەعریبەن کە ڕژێمی بەعس مومارەسەی کردووە نەك ئەنجامی پرۆسەیەکی ئۆرگانی کە دەرهاویشتەی بزاوتی کۆمەڵایەتی و گۆڕینی دیمۆگرافی بێت. بەڵام لەپێناو گەیشتن بە تێگەیشتنی هەلومەرجی ئێستا لە کەرکووکدا ئەوا زانیاری بەنرخ لەبارەی ئەو گۆڕانکاریانەوە دەدەن کە بەتایبەتی لەساڵی ١٩٦٨ و بەدواوە سەپێنراون.

PDF 4 KURD

خشتەی ٢- ٣

بەراوردکاری نێوان سەرژمێری ١٩٥٧، ١٩٧٧، ١٩٩٧

| | سەرژمێری ١٩٥٧ | ڕێژە | سەرژمێری ١٩٧٧ | ڕێژە | سەرژمێری ١٩٩٧ | ڕێژە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کورد | ١٨٧٥٩٣ | ٤٨ | ١٨٤٨٧٥ | ٣٨ | ١٥٥٨٦١ | ٢١ |
| عەرەب١ | ١٠٩٦٢٠ | ٢٨ | ٢١٨٧٥٥ | ٤٥ | ٥٤٤٥٩٦ | ٧٢ |
| تورکمان | ٨٣٣٧١ | ٢١ | ٨٠٣٤٧ | ١٧ | ٥٠٠٩٩ | ٧ |
| کۆ | ٣٨٨٨٢٩ | | ٤٨٣٩٧٧ | | ٢٧٥٢٧٤٥ | |

سەرچاوە: سەرژمێرەکانی ١٩٥٧، ١٩٧٧، ١٩٩٧

ئەو تەرزەی کە داتای ئاماراکان بەدرێـژایی چـل سـاڵ پێشکەشـی دەکـات تـەرزێکی ئاشـکرایە. یەکەم، کەرکوك فراوانبوونێکی گەورەی دانیشتوانی بەخۆوە دیوە- ژمارەی دانیشوانەکەی دوو هێنـدە زیادیکردووە. بەڵام ئەو زیادبوونە لـەژمارەدا لەمیانـەی هـاوردەکردنی عەرەبـە نیشـتەجێکراوەکانەوە بووە، بەجۆرێك قەبارەی پێکهاتەی عەرەبی لەو ماوەیەدا پێنج هێندە زیادی کردووە.

هەروەها ئەوەی جێـی سـەرنجە لـەماوەی ١٩٥٧بـۆ١٩٧٧دا ژمـارەی ڕەهـای کـورد بـەجێگیری ماوەتەوە سەرباری پاشەکشەی ڕێژەیی قەبارەکەیان، لەماوەی نێـوان ١٩٧٧بـۆ ١٩٩٧یشـدا ژمـارەی دانیشتوانی کورد کەمیکردووە، هەرچەندە تاریکترین مـاوەی ئـەزموونی کـوردی لەعێراقـدا مـاوەی هەشتاکانە، ئەمە جگە لەوەی لە دەیەی نەوەدەکانیشدا بەگشتی پرۆسەی تەعریب چڕکرایەوە.

هەرچی بارودۆخی تورکمانەکانیشە لە و پرۆسەی سـەرژمێریکردنەدا، مایـەی بایـەخێکی زۆرە لەبەرئەوەی هیچ کاتێك نەبووە کە خۆیـان بـەخاوەنی سـەنگێکی گـەورەی دانیشـتوانیان نەزانن لەپارێزگای کەرکووکدا، لەگەڵ ئەوەشدا وەك ئەوەی یەکێك بـوون لەپێکهاتـەکان ئـەوا زۆر کاریگەربوون بەپرۆسەی تەعریب بەجۆرێك ڕێژەی قەبارەی دانیشتوانیان لـە٢١٪ لەسـاڵی ١٩٥٧بۆ ٧٪لەساڵی ١٩٩٧ کەمیکردووە.

١ - سەرجەم مەسیحیەکان بەعەرەب تۆمارکراون.

٢ -ئەم ژمارەیە کەمینە بچووکەکانی تریش دەگرێتەوە.

کەوابوو ژمارەکان دوورکەوتنەوەیەکی زۆری پێوە دیارە کاتێك لەئێستادا تورکمان بانگەشەی ئەوە دەکەن بەلانی کەمەوە لەنێو شاری کەرکووکدا خاوەنی سەنگێکی دانیشتوانن یاخود تەنانەت بڕیار لەسەر ئەوە بدرێت زۆربەی تورکمان لە شارەکەدا دەژین.

بێگومان مەحاڵە قورسایی دانیشتوانیان هێندەی ئەوەبێت کە لەساڵی ١٩٥٧دا هەبووە(کاتێك لە ٤٥٪ی دانیشتوانی شاری کەرکوك بە تورکمان تۆمار کراون) ئەویش بەهۆی دابەزینی ڕێژەی ژمارەیان و هاتنی عەرەب بەشێوەیەکی فراوانو پاراستنی قەبارەی گەورەی دانیشتوانی پێکهاتەی کوردیش سەرباری کەمبوونەوەی.

بەدڵنیاییەوە ئەم شێکارییە پشت بە گریمانەی ئەو وەڵامە ڕاست و وردانە دەبەستێت کە هاوڵاتیان لە سەرژمێردا پێشکەشیان کردووە. بەڵام زۆرێك لە کۆمێنتسازەکان گومان دەکەن بۆ نموونە دەوترێت لەبەرامبەر تاکەکاندا بۆ ئەوەی خۆیان بە عەرەب تۆمار بکەن نەك بە کوردو تورکمان مومارەسەی گوشار کراوەو ئەو گوشارانەش زۆربوون، بەتایبەتیش لە دوا پرۆسەکانی سەرژمێریدا- هەڵبەت تاکەکان ملیانداوە بۆ ئەوەی لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان دوور نەخرێنەوە یاخود لەشارەکەیان ڕانەگوازرێن. هەروەها ئەو ژمارانەی کە پێشکەش کراون هیچ پەیوەندیەکیان بە ڕەوشی ئێستای کەرکووکەوە نییە.

لەدوای پرۆسەی ئازادیی عێراق Operation Iraq Freedom زۆرێك لە عەرەبی هاوردە (کە لەچوارچێوەی پرۆسە تەعریبدا هێنرابوونە کەرکووك) زەویەکانیان بەجێهێشت و گەلێك لە کوردیش بۆ سەر موڵك و ماڵی پێشووی خۆیان گەڕانەوە.

بەکورتی پرۆسەی سەرژمێر لەعێراقدا کە داتایەکی گرنگ دەستەبەردەکات گومان لەسەر پێکهاتەی ئیتنیکی بەر لەوەی بەعسیەکان دەسەڵات بگرنە دەست لادەبات بەڵام ئەستەمیشە لەچارەسەری بارودۆخی ئێستادا ئەو سەرژمێرانە سوودیان هەبێت.

تەعریب سیاسەتێکی ستەمکارانە بووە بەئامانجی گۆڕینی دیمۆگرافیای کەرکووك و دوورخستنەوەی هەرهەڕەشەك کە دانیشتوانی غەیرە عەرەب دروستی بکەن، بەڵام دیسان تەعریب جگە لەئامرازێك بۆ بەدیهێنانی ئامانجێکی دیاریکراو کە دەست بەسەراگرتنی نەوتی کەرکووك و نەهێشتنی تەحەددیەکان بووە تا لەداهاتوودا تانە لەخوەنداریێتی شارەکە نەگرێت چیتر نەبووە.هاوکات لەگەڵ ئەوەی هەریەك لەکوردو تورکمان ڕوو بەڕووی ڕاگواستن بوونەتەوە، عەرەب هاندراوە لەبری ئەوان نیشتەجێ بن و حکومەتی عێراقیش شێوازی خۆ لەئیدارەکردنی سامانی نەوتی کەرکووکدا گۆڕیوە.

PDF 4 KURD

هەر لەساڵی ١٩٩١ و بەدواوە، حکومەتی عێراقی کاریکرد بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لە کۆتایی هاتنی هەڕەشەی کورد سەبارەت بە خاوەندرێتی کەرکووك‌و ئیدارەکردنی کێڵگە نەوتییەکانی بەپێی پلانێکی ستراتیژی.

دیارە ئامانجی یەکەم بەچڕکردنەوەی پرۆسەی تەعریب و راگواستنی غەیرە عەرەب –کورد بەپلەی یەکەم- بەرەو هەرێمی کوردستان هاتە دی.

ستراتیژی دووەمیش سەلماندی کە بەواتای ژینگەی و ئابووری زیانی خۆی هەیە.خۆئەگەر کێشەی کەرکووك بوونی نەوت بێت ئەوا شتێکی مەنتیقییە ئەو نەوتە نەهێلرێت. لەبەر ئەوەحکومەت سیاسەتی زیاد دەرهێنانی نەوتی کێڵگەکانی کەرکووکی گرتە بەر –ئەویش لەسەر بنەمای ئەو لۆژیکەی کە دەڵێت باشترە ئیستغلالی ئەو نەوتەی کەرکووك بکرێت کە مایەی هەڕەشەیە بۆ سەر سەقامگیری بەپلەی یەکەم و پاشان پاراستنی جۆرو بڕی یەدەگی نەوت لەکێڵگە زەبەلاحەکانی باشووردا.

لەکەرکووکدا کە یەك بۆ پێنجی یەدەگی نەوتی عێراقی تێدایە پشکداربووە لە بەرهەمهێنانی یەك بۆسێی بەرهەمی نەوتی عێراق و دەرئەنجانیش جۆری نەوتی خاوی کەرکووك خراپبووە بەهۆی دزە کردنی ئاو بۆ عەمبارەکانی نەوت لەژێر زەویدا کە ئەویش پەیوەندی بەزۆر هەڵمژینی نەوتەوە هەیە.

لەدەیەی هەفتاکاندا بەشێوەیەکی سامناك ئیستغلالی نەوتی کەرکووك کراوە و رۆژانە بەرهەمی ئاسایی نەوت ٢٥٠ هەزار بەرمیل بووە و لە پێش جەنگی ٢٠٠٣شدا گەیشتوەتە ترۆپك و رۆژانە راستەوخۆ ٦٨٠ هەزار بەرمیل نەوت بەرهەمهێنراوە١.هەندێك لەشێکارانیش ئەو زیادەڕۆییە لەبەرهەمهێناندا بۆ بەئەنقەست خراپ ئیدارەکردن دەگەڕێنرێتەوە، بەڵام لەراستیدا ئیدارەکردنەکەش پاساوی مەبەستداری خۆی هەبووە لەبەردەوامبوونیدا، بۆنموونە رۆنی سووتەمەنی لەچینە نەوتییەکاندا دەردەهێنرێت٢، ئەویش لەپێناو پاراستنی تێکڕای بەرهەمهێنان.

---

1 - Eneregy Information Administartion ,Iraq: Country Analysis Brief.2007 www.cia.doe.gov/cabs/iraq.html.سایتی ئیدارەی زانیاریەکانی وزە

2 : بڕوانە - Gerth, J.2003."OilExperts See Long-term Risks to Iraq reserves". New York Times,30 November.

هەندێك لەشـێكاران پێیـان وایـە بـەبڕی ١.٥ ملیـار لـە ڕۆنـی سـووتەمەنی لـە كێڵگـە نەوتییەكانی كەركووكدا دەرهێنراوە و دواجاریش ئەوە بووەتە هـۆی خراپبـوونی جـۆری نـەوتی كەركووك و زیادبوونی لینجێتی نەوتی خاو كە لابردنی لە زەویدا تێچوونێكی زۆری گەرەكە.

بەهاتنی سـاڵی ٢٠٠٣ و لـەدوای ئـەو ڕاپۆرتـە تێروتەسـەلەی كـە ڕاوێـژكارانی نەتـەوە یەكگرتوەكان سەبارەت بە پیشەسازی نەوتی عێراق ئامادەیان كردبوو، پێشبینی ئـەوە دەكـرا كێڵگە نەوتییەكانی كەركووك و ژێرخانی نەوتی بەشێوەیەكی مەترسیدار تێكچـووە_بـەجۆرێك چاككردنەوەی ئاستەمە، لەهەمان كاتیشدا لەدوا ڕۆژەكانی ڕژێمی بەعسدا زیانێكی گەورە بە گەنجینەكانی نـەوت لەكەركوكـدا گەیشـتووە، هەربۆیـە پێشـبینیەكان زۆر ڕەشـبینانە بـوو سەبارەت بەكێڵگە نەوتییەكان كە ئەوەش بۆ خۆی زیادەڕۆیی پێوە دیاربوو.

دیارە كەركووك بەیەكێك لەكۆڵەكە بەندە بەنرخ و گرنگەكانی پیشەسازی نەوت لەعێراقـدا دەمێنێتەوەو لەدوای ساڵی ٢٠٠٣ شدا گرنگی بەشێوەیەكی بەرچاو ئاشكرابوو.

دوای ئەوەی بارودۆخی شاری كەركووك و ئەگەری چوونە سەرهەرێمی كوردستانی بووە ئـەو پرسە كڵپەسەندووەی كە لەپاش ڕژێمی بەعس و ڕاوێژكارانی ئـەمریكایی ڕوو بـەڕووی سـەرانی عێراق دەبێتەوە، سەر لەنوێ كەركووك بووەوە جێی بایەخی نـەك هـەر بەتـەنیا عێـراق بـەڵكو كوردیش ئەویش بەو پێیەی لەحاڵەتی ئەگەری سەربەخۆبووندا دەبێتە سەرچاوەیەكی داهات.

دیسان ئەوەی كە هەلومەرجەكەشی ئاڵۆزتركردووە، ئەو دەرفەتەیە كە دەستووری عێراقـی بەخشیویەتیە حكومەتی هەرێمی كوردستان بـۆ ئـەوەی بـرەو بەپیشەسـازی خـۆجێی خـۆی و وەبەرهێنانی یەدەگیەكان بدات لەناوچانەی كە دەكەونـە نێـو هـەرێمی كوردسـتانەوەو پێشـتر دەستیان بۆ نەبراوە یاخود لەسەر ئەو بناغەیە داوایان دەكات.

---

كێشەكانی پەیوەست بە كێڵگە زەبەلاحەكانی عێراق لەوانەش كێڵگەكانی نەوت ، لەوكێشە باوانەیە كە چووەتە دۆخـی پیربوونـەوەو گوشاری گەنجینەكانی نەوت لەنێو جەرگەی زەویدا بەكردەكی لەگەڵ زیاد ئیستغلالكردنیدا بەرەو كەمبوونەوە دەچـێت بۆیـە ئـەوەش وادەكات ڕێگەیەك بدۆزرێتەوە بۆ پاراستنی ئەو گوشارە یان زیادكردنی بەشێوەیەكی دەسـتكرد بـۆ ئـەوەی بەرهـەمهێنان بـەردەوام بێت.ئەوەش لەرێگەی دەركدنی نەوت یان ئـاو لەكێڵگەكانـەوە دەبێت.بـەڵام دیسـان پێویستیشـە بـەئاگاوە ئیـدارەی ئـەو ڕێوشوێنانە بكرێت لەبەرئەوەی گەنجینەكانی نەوت بونیادێكی فشۆڵیان هەیە و خۆئەگەر ئەو بڕەی كە دەردەهێنرێت زیاتر بێت لەئاستی خۆی ئـەوا ئەونەوتـە یاخودئـەو گـاز و ئـاوەی كـە دەردەهێنرێـت بـەرەو بیرەكـان ڕێچـكەیەك دەدۆزێتـەوە و لەوبارەشـدا بەرهەمهێنان لەروی ئابوورییەوە بێ سوود دەبێت.

ئەوراپۆرتەش كە لەنەتەوە یەكگرتوەكانەوە لەساڵی ٢٠٠٠ دەرچووە، باس لەوئیدارە خراپە دەكات لەبارەی چۆنیەتی دەرهێنـانی ئـاو لەكێڵگەكانی كەركوكدا(بڕوانە خوارەوە)

هەر زووش پرسی ناسنامەی ئیداری لەکەرکووکدا بووە بابەتی مشتومڕی توندوئاڵۆز، کە ئەوەش ئیدارەی نەوتی کێڵگە نەوتیە بەرهەمهێنەکان(کێڵگەکانی کەرکوك) و ئەو کێڵگانەش کە هێشتا "چاوەڕوانی وەبەرهێنان و برەوپێدان" دەکەن لەخۆدەگرێت.
هەڵبەت پرسەکەش ئاڵۆزتربووە ئەویش لەبەر ئەو راستیەی کە ژمارەیەکی زۆری کێڵگە "ناوەبەرهێنراوەکان" ( رەنگە بەشێك بن لە ناوچەی کەرکووکی گەورە)، هاوسنووری کەرکووکن بەڵام وەك دەستوور دیاریکردووە و بەر لەوەش هیچ زەویەکی تر بۆ سەر هەرێمەکان بگەڕێنەوە، لەهەرێمی کوردستاندان.

## پیشەسازی نەوتی عێراق لە (٢٠٠٣) وە

بەپێی نوێترین ئامار، کە لەبەردەستدایەو بۆ ساڵی ٢٠٠١ دەگەرێتەوە یەدەگی نەوتی عێراق نزیکەی ١١٥ملیار بەرمیلە. بەڵام زەویناسان و پسپۆڕانی نەوت پێشبینی بوونی ٤٥بۆ١٠٠ملیار بەرمیلی تر دەکەن لەژێر زەمینی بیبانی خۆرئاواو ناچەکانی باشووردا.لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە عێراق توانای زیادکردنی بەرهەمهێنانی هەیە، بەتایبەتیش رێژەی یەدەگی نەوتی بەبەرامبەر بەرهەمهێنان لەنێو سەرجەم وڵاتانی بەرهەمهێنەری نەوتدا ئیجگار کەمە١.
لەو یەدەگە جێگرو نەگۆڕەی عێراق یەك بۆ پێنجی لەکێڵگەکانی کەرکووکدایە ئەمە جگە لەوەی کە بەتەنیا کەرکووك رۆژانە ٢٥٠ هەزار بەرمیل نەوت بەرهەم دێنێت، لەکاتێکدا ئیدارەی زانیاریەکانی وزە (EIA) Energy Information Administration پێیوایە کە دەتوانرێت ئەو بەرهەمە بۆ ٦٠٠ هەزار بەرمیل بەرۆژێکدا زیادبکرێت ئەگەر بێتوو وەبەرهێنانی پێویست بۆ ژێرخانی ئابوری دەستەبەربکرێت.
هەڵبەت نەوتی کەرکووك لەرێگەی هێڵی کەرکووك_جیهانەوە دەردەهێنرێت و نەخشەی ئەو هێڵەش بەو جۆرەیە کە رۆژانە ١.٢ملیۆن بەرمیل رەوانە بکات.
بۆ جاری یەکەم لەدوای جەنگ لە ٢٢ی نیسانی ٢٠٠٣بەرهەمی نەوت لە کێڵگەی رومێلەی باشوورەوە دەرهێنرایەوەو بە هاتنی ئازاری ٢٠٠٤ یش بەرهەمی رۆژانەی ئەو کێلگەیە گەیشتە ٢.٤ملیۆن بەرمیل، کەدیارە ئاستی بەرهەمهێنان زۆر جیاواز بوو، بەتایبەتیش لەکەرکووکدا، ئەوەبوو دیسان لە ١٣ی ئابی ٢٠٠٣وەلە کێلگەکانی کەرکووکەوە و لەرێگەی هێڵی جیهانەوە نەوت رەوانە کرایەوە، بەڵام پاش چەند رۆژێکی کەم و پەلاماردانی

١- ئیدارەی زانیاریەکانی وزە،هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بۆریەکانی نەوت لەلایەن یاخیبوەکانەوە دەرهێنانی نەوت راگیرا و تا ئازاری ٢٠٠٤ نەوت بـەو هێڵەدا رەوانە نەکرایەوە ئەویش بەهۆی ناسـەقامگیرییەوەو ئێستاشـی لەگەڵـدا بێـت ئاسـتی بەرهەمی نەوت لەکەرکووکدا نەگەیشتوەتە ئەو ئاستەی لەهەفتاکانـدا هـەیبووە کـە لەلایـەن رژێمی بەعس و بەدەستی ئەنقەست رۆژانە ٧٠٠ هەزار بەرمیلی بەرهەم هێنـراوەن لەکاتێکـدا بەرهەمهێنان نەوت لە کێڵگەکانی باشووردا بەزنیکـەیی گەیشـتوەتە ئـەو ئاسـتەی کـە بـەر لەجەنگ هەیبووە.

دیارە کەرکووکیش لەهەوڵی ئەوەدابووە بەرهەمی خۆی رۆژانە بۆ ٢٠٠ هەزار بەرمیل زیاد بکـات پـاش ئـەوەی زیـان بـە کیلگـە و ژێرخـانی ئـابووری کـەوت، بێگومـان پـەلامارە چەکداریەکانیش لـەدژ بۆریـە نەتیـەکان بـۆ چـەندان جـار بوونـە هـۆی راگرتنـی تـەواوەتی بەرهەمهێنان. بەڵام ئەوەی کە زیاتر مایەی نیگـەرانی بـوو ئـەو زیانانـە بـوو کـە لـەماوەی ساڵانێکی دوورودرێژی زیاد بەرهەمهێنادا پێیگەیشتووە.

وەك پێشتریش ئاماژەی پێکرا، تیمێکی راوێژکارانی نێو دەوڵەتی بەر لەجەنگ و بـەدیاریکراویش لەساڵی ٢٠٠٠دا راپۆرتێکی لەبارەی رەوشی مەترسیداری هەردو بیرە نەوتی باوەگوڕگوڕو ئـەڤانا (کـە بە گرنگترین بیرە نەوتی کەرکوك دادەنرێن) ئامادەکردبوو، لەگـەڵ ئامـاژەپێکردنێکی دیـاریکراو بـە ستراتیژی هەڵمژینی ئاو و، هۆشداریدانیش بـە ئەگـەری زیـان گەیانـدن بـەو عـەمباری ئـەو کیلگـە زەبەلاحە کە رەنگە چاککردنەوەی مەحاڵ بێت١.وادیارە لێپرسراوان نوێ کە ئیـدارەکردنی کـەرکووکیان گرتە دەست لەدوای رووخانی رژێمی سەددام ئەو ئاگادارکردنەوە راستەوخۆیەیان بەهەند وەرگرتـووە جـا ئەوە ئارەزوومەندانە یاخود لەژێرکاریگەری رەوشی ناچاریدا بوویێت.

ئەوەبوو لە ئایاری ٢٠٠٧دا وەزارەتی نەوتی عێـراق راپـۆرتێکی لـەبارەی خـراپ پێگـەی کەرکووك لە پیشەسـازی نـەوتی عـێراق بەگشـتی پێشکەشـکرد، ئەمـە جگـە لەدابـەزینی بەرهەمهێنان لە کیلگەکانی باکووردا بۆ ٢٠٦ هەزار بەرمیل، کەئەو رێژەیـە هـی ئەوەنـەبوو هەنارده بکرێت بەڵکو تەنیا بۆ بەکاربردنی راسـتەوخۆی نـاوخۆیی تـەرخانکرابوو٢.پێدەچـێت کیلگەکان کەرکووك وەك ئەوەنەمابێت کە جاران هەمووان چاویان لێبڕیبوو.

---

1- United Nation ,Report of the Group of the United Nations Experts Established Pursuant to Paragraph 30 of the Security Council Resolution 1284,2000. Quote at 21. www.un.org.Depts.oip.background/reports/oilexpersreport/pdf

2 -Energy Information Administration (2007) Iraq Energy Data, Statistics and Analysis .
www.ena.doe.gov/emeu/cabs/Iraq/Oil/html



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## سیٚ روانگەی ئیتنیکی – سیاسی

ناکۆکبوون لەسەر خاوەندارێتی بۆ ناوچەکان، لەکێشمەکێشەکانی سەرتاسەری جیهاندا پێگەیەکی تایبەتمەندی هەیە و کەمێکیش لەو ناوچانەنەبێت کە جۆرە سادەییەکانیان پێوەدیارە، ئیتر ئەو ناوچانە کە ئەگەر سەرئەنجامی کارلێکردنی سیاسی و کۆمەلاّیەتی و ئابووری چەند سەدەیەك نەبن ئەوا سەرئەنجامی چەردەیەکن لەو کارلێکردنانە و لەئێستاشدا ئەو ناوچانە وەك حالّەتی گرێ کوێرە دەردەکەن و بەرجەستەی رق و کینەی ئیتنیکی بنچینە داکوتاو دەکەن لە دابەشکردنی هەمیشەیی نێوان ئەو گەلانەی کە سەرکەوتوو نەبوون لە یەکتر قایلکردن و یەکلایی کردنەوەی ناکۆکیەکانیاندا.

لەخۆرهەلاّتی ناڤیندا قودس وەك سیمبولی خرۆشێنەری هەست و سۆز لەکێشمەکێشی نێوان فەلّەستینی و ئیسرائیلیەکان دەردەکەوێت، کە هەردوولا بەچاوی خاوەندارێتی لەقودس دەروانن ئەویش لەبەرهۆکارگەلێکی ئایینی و مێژوویی تێکئالّۆزکاو.

لەئەوروپاشدا بلفاست کە بۆ سالاّنێك گۆرەپانی جەنگی نێوان فیدراسیۆنی پرۆتستانت و کۆماریخوازە کاسۆلیکەکان بوو، لەئێستادا ئاسایی بوەتەوە، بەلاّم شوێنەواری ئەو زامەی درابوو لە کۆمەلّگەی ئێرلەندەی باکوور، بۆ چەردەیەکی تر سوێیەکی دەمێنێتەوە.

مۆستاریش نموونەی شارێکی تری دابەشبووە، کە تیایدا رق و کینەی رابردووی لەفۆرمێکی نوێدا لەخۆگرتووە، بەناونیشانی کێشمەکێشی ئیتنیکی دەمێنێتەوە، کەلەنەوەدەکاندا ناوچەی بەلقانی ئازاردابوو[1].

ئەوە شتێکی باوە، کە گێرانەوە مێژوویە بارگاویەکان فۆرمێکی جەوهەری ببەخشێتە ئەو گروپەی کە هەلّوێستی خۆی پێشنیاز دەکات و دەکەوێتە زەمکردنی ئەو گروپانەی کە روو بەرووی دەوەستنەوە، لەبەر ئەوەی ململانێ شەقلّێکی ناسراوی ئەو کێشمەکێشانەیە –لەگەلّ ئەوەی توندبوونەوەی ئەو ململانیایانەش جیاوازن.جگە لە کێشمەکێشیش دەستەو وەستانی

---

١- بۆ شرۆڤەکردنی دروستبوونی (رق و کینەی نوێ) و سەرهەلّدانی (رق و کینەی کۆن) لەبارودۆخی هاوچەرخدا بروانە:
Kaufman, S.2000. Modern Hatreds: The Symbolic of Politics of Ethinc War .Ithaca, NY:Cornell University Press.

PDF 4 KURD

کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی لەدەستێوەردانی لەو ململانێیانەو هیچ نەبێت هەوڵدانی بۆ سووککردنی بارگرانییان کە شەقڵێکی دیکەی هەمیشەییەتی.

لەبری ئەوە زۆرجار هێزە دەرەکیەکان، گرفتی ناوچە کێشە لەسەرەکان بۆ بەرژەوەندی راستەوخۆی ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان بەگەڕدەخەن و پێشدەچێت کە کارە مرۆییەکان ئەو دەمانە بێنە ئاراوە، کەئیتر پەنگخواردنەوەکان دەگەنە تروپك و ئەوجا دەستێوەردانی دەرەکی جا وەك دەستپێشخەری دەوڵەتێکی دیاریکراو یاخود لەلایەن رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی وەك نەتەوە یەکگرتوەکان یان یەکێتی ئەوروپا یاخود پەیمانی باکوری ئەتلەسی- ناتۆ- ەوە بێت، ئەوا زۆرکات فۆرمێکی بێ لایەن وەردەگرن و لەپێناو گەیشتن بەچارەسەری عادیلانەی کێشمەکێشەکە کاردەکەن.

هەروەها بەبەردەوامیش بەئاراستەی دۆزینەوەی چارەسەرێکی نموونەیین و چاوەڕوانی ئەوەش دەکەن هەموو لایەنە ناکۆکەکان لەسەر ئەوەی کە لەرابردوودا هەرگیز لەسەری رێك نەکەوتوون، پێکبێن- دابەشکردنی دەسەڵات یاخود فۆرمێکی پێکەوەژیانی پێشنیازکراو لەچوارچێوەیەکی ئاڵۆزدا، کە هاندەری تەبایی ئیتنیکی و زامنکەری مافی کەمینەکان بێت، لەگەڵ پرۆسەی "ئاسایی کردنەوە- تگبیع"کەزۆرجار ئاسایی کردنەوەیەکی نادیار دەبێت.

لەبەرامبەر ئەو واقیعەدا و لەهەر پرۆسەیەکی چارەسەریدا گێڕانەوە مێژوویە بابەتییەکان بەرەو سێبەر دەچن و زۆرکاتیش ئیشکال لەوەدایە کە گێڕانەوەیەك پەسەندبکرێت و لەبەرامبەر گێڕانەوەکانی تردا گومانی لەسەر نەبێت، چونکە راقە تایبەتەکان رەوایەتی دەبەخشێتە بانگەشەی لایەنێك لەلایەنە پەیوەندیدارەکان و پاشانیش مافی یاسایی پێدەبەخشێت.

دیسان لەبەرئەوەی هەقیقەتە بابەتیەکان بایەخی خۆیان هەیە و دەکرێت متمانەیان پێبکرێت، ئەوا کۆی گێڕانەوەی لایەنە پەیوەندیدارەکان زۆرجار کاریگەریان زیاتر دەبێت لە چارەسەرکردنی ئەو کێشمەکێشانەدا.

هەڵبەت بایەخی ئەم جۆرە نواندنانە هەرلەوشێوازەدا نییە کە مێژووی گروپێکی پەیوەندیداری پێ پێشکەش دەکرێت بەڵکو لەشێوازەدایە کە هەوڵدەدرێت وێنای "ئەوانیتر"ی لایەنەکانی کێشمەکێشەکەی پێبکرێت (یاخود لەهەندێك لە پێشنیازە زیاتر دوورخەرەوەییەکاندا رەتبکرێنەوە).

ئەم روانگە خودگەراییانە تەوەرەی شێکاری خوارە پێکدەهێنن و مەحاڵیشە هەوڵبدرێت "راستی" لەنێوان گێڕانەوە جیاجیاکانی کەرکووك لەبەرهۆکارگەلێك دیاری بکرێت، لەوانەش

هەمیشە گەیشتن بە "راستی"گرانە بەڵام دیسان لەبەرئەوەی راستیەکان لەچەند روویەکەوە پەیوەندییان بە بابەتەکەوە نییە، ئەوا بۆچوون و مامەڵەکردن هەموو شتێکن.

بەکورتی گرنگ نییە مێژووەکە بەدڵنیایی هی کەرکوك بێت (ئەگەر بتوانرێت ئاماژە بە کارە مێژووییەکان بکریت لەوەی مایەی دڵنیاین) و بەشێوەیەکی تەواو دەریبخات رۆژگارێکی دێرینە خەڵکی رەسەنی تورکمانن یاخود لەراستیدا شارەکە بەر لەچەند سەدەیەك پایتەختی گەشەکردووی هەرێمیی میرنشینی کورد بووە و لەو کاتەوەشەوە بەشێك بووە لە ناوچەیەکی فراوانتری کورد، بەڵکو پرسی یەکلایی کەرەوە لەوەدایە کە چۆن هەرلایەنێك لەبانگەشەی خۆی و لایەنەکانی تری دەوروبەری دەڕوانێت. خۆئەگەر ئەم ئیعتیبارە لەزهندا بێت ئەوا بەشی دووەم هەڵوێستی پەیوەست بە پرسی کەرکووك لەروانگەی هەریەك لەپێکهاتە سەرەکیەکان-کوردوتورکمان وعەرەب دەخاتە روو.

PDF 4 KURD

# فەسڵی یەکەم

## سیاق (کۆنتێکست)ی عیراقی لەپاش ٢٠٠٣

ناوچەیەکی کیشە لەسەر نییە بەدەر بێت لە سیاقی جیۆ- سیاسی فراوانتر، بەڵام پێدەچێت مێژووی کەرکووك و بارودۆخی جیۆ- سیاسی جیابووبێتنەوە بۆ ئەوەی کێشمەکێشی ئیتنیکی بێتە ئاراوە.

کەرکووك دوای ئەوەی شارێکی کۆزمۆپۆلیتی نێو شارەکانی ئیمپراتۆری عوسمانی و خاوەن دەزگایەکی بیرۆکراسی و دەستەبژێرێکی قسەکەری تورکی بوو(بەدەر لەوەی خەڵکانی کەرکووك لەراستیدا تورکمان یان کورد یان عەرەب بووبن)، ئەوا لەپاش دامەزراندنی عێراق لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی پەیوەندییەکانی نێوان پێکهاتەکان و دەوڵەت ئاقارێکی نوێی وەرگرت و بەشێوەیەکی زیاد رۆیوویش پێکهاتەکان بەپێی ناسنامەی ئیتنیکی و مەزهەبیان بەسەر توانادارو بێ دەسەڵاتدا دابەش بوون بەتایبەتیش کاتێك "ناسنامەی نیشتیمانی"باو بەچەمکی ناسیونالیزمی عەرەبی وگرێدراو بەپلەی یەکەم بە دەستەبژێری سوننی پاشماوەی سەردەمی عوسمانییەوە گۆشکرا١.

---

1 بڕوانە: - Tripp.C.2000.A History of Iraq. Cambridge University Press:30-31, Wimmer, A. Nationalist Exclusion and Ethinc Conflict: Shadows of Modernity

جا لەبری ئەوەی کەرکووك ببێتە شارێکی هەرێمیی لەو پارێزگایەی کە بۆ مەسافەیەك لەسەنتەری دەوڵەتەوە دووره، ئەوا لەئێستادا کۆڵەکەبەندی ئابووری عێراقی قوربانی بە سەرچاوەیەکی ستراتیژی گرنگی جیهانی داوە. هەروەها پیشەسازی پەرەسەندوی نەوتیش لەگەڵ خۆیدا کۆچبەرانی ئابوورِیناسی نەهێنا بۆ ئەوەی ئەو ئەرکانەی کە خوازراوە جێبەجێی بکەن و کەرتی نەوتی بەخێرایی برەو پێبدەن بەڵکو دەوڵەت کاری کرد بۆ زامنکردنی ئەو سامانە لەئەگەری هەر هەرِەشەیەکی هەرێمی و ناوخۆی.

زامنکردنی کەرکووك پاساوێك بوو لەپشت سیاسەتی تەعریبی کەرکووکەوە کە سەرجەم حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەشێوەیەکی بەرچاو پەیرِویان لێدەکرد و بەدواشیدا هەڵمەتەکانی راگواستنی بەکۆمەڵ بەفەرمانی رژێمی سەددام لە کۆتایی هەفتاکان و بەدواوە دەستی پێکرد.

تەنیا هەر کورد لەسایەی سیاسەتی تەعریبدا رانەگوازران، بەڵکو ئەو سیاسەتە تورکمان و مەسیحیەکانیشی گرتەوە، بەڵام کورد پێیوایە تەعریبی کەرکووك یەکێکە لەوکارە ئابرِووبەرانەیەی کە دەوڵەت زیاتر دەرهەق بەوان وەك لەوانی تر کردوویەتی، ئەمە جگە لە قرِکردن کە خۆی لە پرِۆسەی ئەنفالدا دەبینێتەوە کە ئامانج لێی چۆڵکردنی گوندەکانی کوردستان بوو لەدانیشتوانەکەی بەشێوەیەکی بەرنامە بۆدارِێژراو، دیسان لەگەڵ ئەوە هەڵمەتەشدا لەهەشتاکاندا چەکی کیمیایی لەدژی گوندە کوردیەکان بەکارهێنراو هەڵەبجەش یەکێکە لەونموونە بەرچاوانەی کە بە درندانەترین شێوە لەساڵی ١٩٨٨دا پەلاماردرا.

دیارە تەعریبکردنی کەرکوك لە ژێیەکی پرِ لە هەست وسۆزو هەستیاری دڵ و ئەقڵی کورد دەدات، هەربۆیە سەرلەنوێ لەنەوەدەکاندا بزوتنەوەی کوردایەتی جۆش و خرۆشی زیاتری بەرامبەر بەکەرکووك بەخۆوە بینی.

---

هەمان سەرچاوە Stansfieldهەروەها ستانسفیلد Cambridge:Cambridge Unviversity Press:156-198.
٢٦-٥٠.

بۆ ئاشنابوون بە چەمکی "ناسیونالیزمی باو" بەهێڵە گشتییەکانییەوە بنۆرِە:
Wimmer, A.2000."Dominant Ethnicity and Dominant Nationhood" In Kaufman, E(ed).
Rethinking Ethnicity:Majority Groups and Dominant Minorities.London:Routledge:40-58.

لەبەرئەوەی حکومەتی عێراقی پارێزگاری لەباڵادەستی خۆی بەسەرکوردا کردبوو یان بەلانی کەمەوە لەدەیەی هەفتاو هەشتاکاندا پەراوێزی کردبوون، ئەوا دامەزراندنی هەرێمی کوردستان لەساڵی ١٩٩١کە خاوەنی ئۆتۆنۆمی خۆی بوو فەزایەکی سیاسی بۆ کوردو سەرکردەکانیان دەستەبەرکرد.لەو فەزایەشدا هەستکردنیان بەو زوڵم وستەمەی کە دوچاری ببوونەوە لەگەڵ درککردنیان بەوەی کە کورد لەدەوربەری جیاوازترە، هەموو ئەوە پێکەوە وایانکرد لەلای هەندێك لەسەرکردە زۆر ناسیونالیستەکان- کە لەنێو سەرکردەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستاندا ژمارەیان کەمبوو- بیر لەدامەزراندانی کوردستانی سەربەخۆ و پێداویستی مانەوەی بکەنەوە. لەوژینگەیەدا کەرکووك لەدوای وێرانکردنی هەڵەبجە بووە سیمبولی نەتەوەیی وچەوسانەوەی کورد لەسەر دەستی حکومەتە عێراقیەکان.

هەروەها زۆرێك لەکورد وەك سیمبولێکی زوڵملێکراولەکەرکووك دەڕوانن و بەو پێیەش کە هێزێکی جۆشدەرە بۆ ناسیونابیزمی کورد، ئەوا زیاتر لە ئەنفالو وێرانکردنی هەڵەبجە جێگەی بایەخیانە، دیسان ئەگەر بەلای گەنجانی کوردەوە هەردو رووداوی ئەنفال و هەڵەبجە ریشەیان لەقوڵایی مێژوودا داکوتاربێت ئەگەرچی ئەو مێژوەش دوور نییەئەوا کەرکووك بەشێوەیەکی بەرچاو دەبینرێت و هێشتا بێ چارەسەرماوەتەوە.

دەرکەوتنی کورد وەك گەمەکەرێکی سیاسی بەهێز لەعێراق و ئاشکراکردنی نیازی لە یەکگرتنەوەی کەرکووك لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا، کاردانەوەی دوژمنکارانەی چاوەڕوانکراوی لەلایەن تورکمان و عەرەب و مەسیحییەکانەوە لێکەتەوە.

ئەوەبوو لە دەیەی نەوەدەکان لەهەرێمی کوردستاندا جاروبار کاری توندوتیژی لەنێوان تورکمان و کورد سەریهەڵدەدا و لەلایەن پارتە کوردیەکانیشەوە، بەرەی تورکمانی کە بەرزترین دەنگی لایەنە تورکمانەکان بوو بە ئامرازی دەستی ئەنقەرە دانرا.لەلایەن خۆشیەوە بەرەی تورکمانی عێراقی پێیوابوو کە سەرکردایەتی کوردی دەیەوێت ریشەکێشی بوونی غەیرە کورد لەناوچەکەدا بکات.

هەرچی مەسیحیەکانیشە هەندێك پەوەندی باشتریان لەگەڵ پارتە کوردیەکانی هەرێمی کوردستاندا هەبوو، هەروەها لەنێو پارتی دیموکراتی کوردستانیشدا کەسانی بەرەچەڵەك مەسیحی هەبوون و ژمارەیەك لەرێکخراوە بەرچاوەکانی مەسیحیش پارەیان لەپارتە کوردیەکانەوە وەردەگرت. بەڵام لەنێو ریزی تایەفەی مەسیحیدا کەسانێك هەبوون هەڵوێستی

PDF 4 KURD

توندو رەخنەگرانەیان هەبوو، لەوەی لەوبڕوایەدابوون کورد نەخشەی ئەوەی هەیە بالآدەست بێت بەسەر ناوچەکەدا.

بزوتنـــەوەی دیموکراســـی ئاشـــووری کـــە زۆربـــەی ئەنـدامانی لەمەسـیحیەکانی تاراوگـــەن- تائێستا یەکێکە لەو رێکخراوەتوندانەی کە رەخنە لـەپارتی دیمـوکراتی کوردســتان و یـەکێتی نیشتیمانی کوردستان و حکومەتی هەرێم دەگرێت.

ئـــەو بزوتنەوەیـــە بەردەوامـــە لەرەخنـــەگرتنی تونـدی لەحکومـــەتی هـــەرێم و پێیوایـــە شکستخواردووبووە لە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی لەبەردەم کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیدا.

لەگـەڵ ئـــەوەی بزوتنـــەوەی دیموکراســـی ئاشـــووری تـــەرکیزی بایـــەخی لەســـەر نەهامـــەتی مەسیحیەکانی سەرتاسەی عێراقە بەتایبەتیش ئەوانـەی بەغـدادو موسـڵ و چـەند ناوچـەیەك لەهەرێمی کوردستان، بەڵام دیسان بایەخیشی بە پرسی کەرکوك داوەو ئەوەش لەو باوەڕەیەوە سەرچـاوەی گرتـوە، کـە کـەرکووك لەبناغـــەدا لەســـەر دەســـتی باوبـــاپیرانی مەســـیحییەکان دروستکراوە.

باگەشـــەکانی هەریـــەك لـــەکوردو تورکمـــان و عـــەرەب ســـەبارەت بـــەبارودۆخی کـــەرکووك لەچوارچێوەی فراوانتری سیاسـیدا پێچـەوانەی یـەکترین و داهـاتووی کـەرکووکیش گرێـدراوە بەئایندەی عێراقەوە، لەبەرئەوەی دەکرێت زۆر بەئاسانی کێشمەکێشی سەر کەرکووك یـەکێتی حکومەتی عێراقی لاواز بکات(کە لەباشترین باردا هەرفشۆڵە).

هەڵبەت دانوستان و چارەسەرە تەوافوقیە میانگیرەکان کلیلی گەرەنتی رێگـری کردنـە لـە تەنینەوەی کێشەی کەرکووك بەرەو سەرتاسەری ناوچەکانی دیکەی عێراق یان رۆڵی یارمەتیدەر ببینێت لە دروستکردنی کێشەی زیاتری نێوان پێکهاتـەکانی کۆمەڵگـە، بـەڵام قسـەکردنیش لەسەر چارەسەرە تەوافوقیەکان ئاسانترە لەجێبەجێکردنی لەواقیعدا.

چارەسەری پرسی کەرکووك بەو جۆرەی کە پارتە بەهێزە کوردیـەکان پەسـەندی ناکـەن زۆر بەسـادەیی ئەگـەری کشـانەوەیان لەدامـەزراوە سیاسـیەکانی بەغـداد لەئارادایە(کشـانەوەیان لەئەنجوومەنی سەرۆکایەتی حکومەت و پەرلەمان) و دوورخستنەوەی کوردیش لـە دامـەزراوە ئەمنیەکانی عێراق (ئەگەر نەبێتە هۆی هەرەسـهێنانی ئـەو دامەزراوانـە ئـەوا دەبێتـە هـۆی لاوازکردنیان بەشێوەیەکی بەرچاو)، دووریـش نییـە کـە دەرئـەنجامی ئـەوە کـورد لەرێگـەی ئامرازەکانی دەرەوەی چوارچێوەی دەسـتوور کـەرکووك بخاتـەوە سـەرهەرێمی کوردسـتان(واتە داگیرکردنی) پاشانیش جیابوونـەوە کـە ئـەوەش بۆخـۆی کاردانـەوەی دەبێـت. بـەڵام دیسـان

PDF 4 KURD

چارەسەری پرسی کەرکووك ئەو جۆرەی کە تورکمان و عەرەب و مەسیحی پێیڕازی نەبن، ئەوا ئەوەش بۆخۆی ئیشکالیەت بۆحکومەتی عێراقی و حکومەتی هەرێمی کوردستان دروست دەکات و دەبێتە هۆی هەرەسی ئەو حکومەتەی کە ئێستا لەئارادایە.سەبارەت بەخۆرهەلاتی ناوڕاستیش ئەوا داهاتووی کەرکووك و بگرە ناوچە کێشەلەسەرەکانی دیکەی عێراقیش جێگەی بایەخێکی زۆرن و تا ئەو کاتەش کە دەگەنە رێککەوتن ئەوا پرۆسەی سیاسی لەعێراقدا لەبارێکی گەڕەلاوژێدا دەبێت.

دیسان لەگەڵ کراوەیی سنوورو دیاری نەکردنی روونی سنووری نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی عیراقی و بەردەوامبوون لەسەر مشتومڕ لەبارەی رەوابوونی ئەو هەنگاوانەی کە حکومەتی کوردستان دەینێت سەبارەت بە واژۆکردنی گرێبەستە نەتیەکان لەگەڵ وەبەرهێنەرانی بیانی، ئەوا ئاسۆی عێراق و حکومەتی هەرێمی کوردستان سەقامگیری یان گەشەکردن بەخۆوە نابینێت.

### کارتیاکەر

ئەوبارودۆخەی کەهەردوولا لەسەر پارچە زەویەك تیایدا ناکۆکن ئەو بارودۆخە باوەیە کە لە سیاقی شارە کێشە لەسەرەکاندا هەیە.

هەڵبەت کەمن ئەوانەی کە نکۆڵی لە گرێی ناکۆکی وچەرمەسەری هەوڵی چارەسەرکردنی کێشمەکێشەکان دەکەن سەبارەت بە قودس و سەراییڤۆو بلفاست. بەڵام وەك ئاشکرایە بەهەمان هێندە تا ژمارەی لایەنە پەیوەندیدارەکان زیادبکات ئەوا کێشمەکێشەکەش ئالۆزتر دەبێت، لەکەرکووکیشدا کە هەرسێ لایەنی کوردو عەرەب و تورکمان کێشمەکێشیانە، ئەوا لایەنی دیکەش هەیە کە بەرژەوەندی هەیە- بەدیاریکراویش تایەفەیەکی بچوکی مەسیحی کە دەڵێت کەرکووك لەسەر شاری ئارافا (عەرەفا)دامەزراوە، کە ئەویش لەلایەن ئاشووریەکانەوە هەزاران ساڵە دروستیان کردووە.

دیارە هەریەکێکیش لەولایەنانە گێڕانەوەیەکی دیاریکراو بەخۆی و رەوایەتی ئەو داواکاریانە هەیە کە هاوسێکانی بەرزی دەکەنەوە.وەك چاوەڕوانیش دەکرێت بەدەگمەن ئەو گێڕانەوانە بەیەکتری دەگەن و ئەوەی زیاتریش وێنەی بەدگومانی ئەم وێنەیە ئالۆزدەکات ئەوەیە کە خودی پێکهاتە پەیوەندیدارەکان لەنێو خۆشیاندا هاوچەشن نین.

هەرچی گێڕانەوەی لایەنی کوردییە سەبارەت بەمێژووی کەرکووك و داهاتووی شارەکە زیاتر تۆکمەترە، لەکاتێکدا هەریەك لە پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی، سەرۆکی هەرێمی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەسەرۆکایەتی جەلال تالەبانی لەجەوهەردا لەسەر چەند پرسێکی پەیوەست بە مەسەلەی کەرکووك کۆکن.

هاوکات پارتی دیموکراتی کوردستان لەبەرامبەر یەکێتی نیشتیمانی کوردستاندا هەڵوێستێکی توندتری هەیە لەبارەی ئەوەی کەرکووك بخرێتە پاڵ هەرێمی کوردستان.

لەهەمان کاتیشدا دینامیکیەکانی بارودۆخی ناوخۆیی، نائارامی نێو خودی پێکهاتەی کوردی ئاشکرا دەکەن. لەوکاتەشدا کە پێویستە سەرانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەهەوڵوێستیاندا رەچاوی هاوسەنگی هێزی سیاسی بکەن لەبەغداد ئەوا بنکەی جەماوەرییان سەلماندویەتی کە زۆر پەرۆشی ئەوەن بەر لەهەرلایەنێکی تر بچنە نێو کەرکووکەوە.

دیارە ئەو فشارە ناوخۆییەشە- لەنێوان سەرکردیەتی و بنکەی جەماوەریدا- کە بوەتە مایەی هەڕەشەیە بۆ سەر سەقامگیری سیستمی سیاسی لەهەرێمی کوردستاندا نەك ئەوەی کەکێبڕکێی تەقلیدی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانیی کوردستان بەجێیهێشتووە.

دیسان هەرچی تورکمانیشە هێشتا دابەشن، بەجۆرێك هەندێکیان بەدیاریکراویش بەرەی تورکمانی عێراقی سوورن لەسەر هەربیرۆکەیەك کە کەرکووك بخاتە سەر هەرێمی کوردستان و هەوڵیش دەدات، راستەوخۆ تورکیا بخاتە کێشمەکێشەکەوە.هەندێکی تریشیان –لەوانەش رابیتەی نیشتیمانیی تورکمانی و بزوتنەوەی چاکسازی تورکمانی –ئامادەی پەسەندکردنن و بگرە پێشوازیش دەکەن لەوەی کەرکووك بخرێتە سەرهەرێمی کوردستان بەو مەرجەی ماف تورکمان لەدەستووردا پارێزراو بێت١.

هەرچی پێکهاتەی عەرەبیشە هێشتا لەرووی سیاسی و سۆسیۆلۆژییەوە ئاژاوە باڵی بەسەر بارودۆخیدا کێشاوە، بەجۆرێك ئەوانیش دابەشبوون بەسەر کەرکووکییە رەسەنەکان کە رەنگە سەر بەیەکێك لە هۆزە دێرینەکانی ناوچەکە بن لەگەڵ ئەو کۆچەریانەی کە حکومەتی عێراقی هێناونی بۆ کارکردن لەپیشەسازی نەوت و ئەوانەش کە لەچوارچێوەی پرۆسەی تەعریب و بەئامانجی گۆڕینی

١ - دیمانەیەك لەگەڵ عەبدولقادر بازرگان سەرۆکی بزوتنەوەی ریفۆرمی تورکمانی،هەولێر ،٢٤ئایاری ٢٠٠٨.

هاوسەنگی دیمۆگرافیای دانیشتوانی شارەکە هێنراون و بارودۆخی ئەوانیش لەدوای ساڵی ٢٠٠٣ وەو لەسەرتاسەری وڵاتدا بەرەو پەنگخواردنەوەی تایەفی نێوان شیعەو سوننە چووە.

سەرباری نەبوونی یەکگرتوویی لەهەڵوێستی عەرەبی یان تورکمانی یان تەنانەت کوردیش لەبەرامبەر داهاتووی کەرکووکدا ئەوا پەرگیری بووەتە بناغەیەکی باوی هەرپێکهاتەیەك لە مونازەرەدا.

هەروەها ئەو هەڵوێستە پەرگیرانەش لەلای هەرلایەنێك بەشدار دەبێت لەوەی پەنا بۆ بەکاربردنی زمانی لاساروبەئیبلیسکردنی مومارەسەی هاوسەرەکانی دەبات بەو پێیەی پەیوەندی بە رژێمی پێشووەوە هەیە یان لەئێستادا پەیوەندی بە رێکخراوی قاعیدەو گروپە سوننە چەکدارەکانەوەهەیە(لەحاڵەتی عەرەب) دا یان بەکرێگیراون و کار بۆ حسابی ئەنقەرە دەکەن لەپێناو درێژەدان بە کێشمەکێشی کەرکوك و بەرپابوونی روو بەڕووبوونەوەی فراوانتری نێوان کوردو تورك(لەحاڵەتی تورکمان)دا.

یاخود داگیرکارانی شۆڤێنی کە خواستی هەرێمییان هەیە لەهەوڵی ئەوەدان کەرکووك بەهەرێمەکەیانەوە بلکێنن وەك زەمینە سازییەك بۆ جیابوونەوە لەدەوڵەت و جاڕدانی سەربەخۆیی (لەحاڵەتی کورد)دا.

شێکاری عێراقیەکان لەپاش ٢٠٠٣وە دەچێتە یەکێك لەو خانانەوەو لەهەوڵی بە ئیبلیسکردنی نەیارەکەیاندان و لەهەمان کاتیشدا پێکهاتەکەی خۆیان بە قوربانی تەماشا دەکات.

بێگومان ئەوەش واتای ئەوە نییە کە شێکاریەکان لەلێوردبوونەوەیان لەسروشتی کێشمەکێشەکە خاڵین لە دیدوبۆچوونی بەسوود یان لەهەندێك رێنوێنی و ئامۆژگاری ژیرانە.

دیارە لەنێو شێکاریەکانیشدا ئەوەی کە هاوسەنگترە ئەوەیە کە لەئیدارەکردنی ململانێکەدا لایەنێك ناکاتە براوەو ئەویتر بکاتە دۆڕاو. بەڵام هەڵوێستە پەرگیرەکانی کورد و عەرەب و تورکمان و تائاستێکی کەمتریش مەسیحیەکان، متمانەی ئەوەیان نییە کە توانای خۆبەدوورگرتنیان هەبێت لەرۆچوون بەرەو کێشمەکێشی سەرتاپاگیری.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## سێ دیدگا

لەلای هەرلایەنێك لەلایەنەكانی كێشمەكێشەكە لەسەر مافی هەرێمیی لەباكووری عێراق دیدگایەك هەیە كە لێوەی دەڕوانێت ودەستبەرداری نابێت.زۆر كاتیش بەوپێیەی وەك"راستی"تەماشای دەكرێت ئەوا زۆرجار دەبێتە ئەفسانەو سەلماندن و لێوردبوونەوەی ئاستەم دەبێت.جگە لەوەش سەرلەبەری پێكهاتەكان ئاماژە بەوە دەكەن كە راستەوخۆ وەچەو نەوەی ئەو نەتەوانەن ئەگەر هەزاران ساڵ نەبێت ئەوا چەندان سەدەیە لەناوچەكەدا ژیاون، هەربۆیە هەوڵی بەشەرعی كردنی بانگەشەكانیان دەكەن لەسەر ئەوەی ئەو بنەچە دێرینەی رۆژگار لەماف پێیان دەبەخشێت. دیارە توانای دەستنیشانكردنی رەچەڵەكێكی دیاریكراوبۆگەیشتن بەساتێك لەقوڵایی مێژوودا، پرۆسەیەكی زۆر ئیشكالییەو لەواقیعدا سوودی ئەوەندە نابێت لەچارەسەركردنی كێشەسیاسیو كۆمەڵایەتیە نوێكاندا. بەڵام لەرەوشێكی وەهادا هەرزوو زوڵملێكراوەهاوچەرخەكان بەسیمبول و ئەفسانەی رۆژگارە دێرینەكان بارگاوی دەكرێن و لەوبارەشدا باشتر وایە ئەوفاكتەرە دروستكەرە نوێیانە بەهەند وەربگیرێن كەبوونەتە هۆی دروستكردنی كێشمەكێش لەسەرناوچەیەكی پەیوەست بەعێراقی سەدەی بیست یەك و چەمكەكانی ئەو ناسنامە جەوهەریەی كە هەڵوێستی سیاسی نوێ بەرەنگی خۆیان بۆیە دەكەن و فۆرمێكی پێدەبەخشن.

PDF 4 KURD

# فەسڵی دووەم

## دیدگای تورکمانی: ئاوابوونی ئەو گروپەی لەرابردوودا ئاغابوون

ڕەنگە ئاسان بێت هەندێك ڕاستی لەبارەی تورکمانی عێراقەوە جێگیربکرێت، کەزۆر بەوردی نازانرێت ژمارەی ئەو تورکمانانە چەندن کە لەعێراقدا دەژین. بەهەمان شێوە ئاستەمیشە بەشێوەیەکی تەواوەتی بزانرێت تورکمان کێن و لەکوێوە هاتووەن.

زۆربوونی ئەم نەزانراوانەش ئاڵۆزی دەبەخشنە بوونی دەستەو گروپە سیاسییە تورکمانیەکان کە نوێنەرایەتی ڕاوبۆچوونی زۆرێك دەکەن. دیارە هەندێك لەو ڕاوبۆچوونانە زۆر نەیارو دژن بە بەکورد(یاخود وردتر بەهەرێمی کوردستان)، هەشیانە خاوەنی هەڵوێستی نیشتیمانپەروەرانەو عێراقیانەن، بەشێکی تریشیان ئیسلامی شیعەی توندڕەون. هاوکات دەکرێت بەشێکی دیکەیان بە لایەنگری کورد ناوببرێن لەهەوڵەکانیان بۆ ئەوەی کەرکووك بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان.

بەدەر لەو هەمەجۆرییە لەهەڵوێستەکاندا، ئەوا ڕەگەزی زەق کە کاریگەری لەسەر جۆشدانی سیاسی نێوان تورکمانەکان هەیە پەیوەندییانە بەکوردەوە، بەتایبەتیش لەوەی کە ئاخۆ دژن یان پشتیوانن لەفراوانکردنی هەرێمی کوردستان و لکاندنی ناوچە کێشەلەسەرەکان پێوەی.

بێگومان ئەو هەڵوێستەی کە نەیاری کوردە ئەوەیان بەگشتی مایەی بایەخە، کەئەویش هۆکاری خۆی هەیە.

دەنگێکی بڵندوکاریگەری تورکمان لەکەرکووك و شارەکانی دیکەی باکووردا هەیە، کەدژەو پێیوایە پلانەکانی کورد تەنیا هەربۆ پتەوکردن هەرێمی کوردستان نییە لەسنوورەکانی دوای

PDF 4 KURD

١٩٦١بەڵكو بۆخستنە سەری ئەوەشە كە توركمان بە"توركمان ئيلی" ناوی دەبات –ئەو زەويە فراوانەی كە لەسنووری عێراق لەگەڵ توركيـاو سـوريادرێژدەبێتەوە بـەرەو سـنوور لای ئێـران. بەپێی سەرچاوە توركمانيەكانيش "توركمانيا" Turcomania- ناولێنانـە ئينگليزيەكـەی كـە بە"توركمان ئيلی"دەوترێت –لەسەرنەخشەی ناوچەكە دەردەكەوێت كە لەلايـەن وليـام گسـری William Guthrie لەساڵی ١٧٨٥بڵاوكراوەتەوە، بەڵام ئاماژەيەكی روون نييە بـۆ "توركمـان ئيلی" تا كۆتايی سەدەی بيستەم١.

لەراسـتيدا ماددەيـەكی چـاپكراو نييـە دەريبخـات كـە توركمـان ئيلـی لـەرووی هەرێميەوەگرێدراوە بەسورياوتوركياو ئێرانەوە، بـەڵكو زێـدی ئـەو پێشـنيازە –دامەزرانـدنی بەرەی توركمانی عێراقييە لەساڵی ١٩٩٤دا، كە لەئەنجامی مشتومڕی نێو كـۆنگرەی حزبـی نيشتيمانی توركمانی عێراقی بەر لەساڵێك هاتبووە ئاراوە٢.

توركمـان ئيلـی (بڕوانـە نەخشـەی ٦) لـەنێو سـنووريدا تەلەعفـەرو موسـڵ و هـەولێرو دوزخورماتوو و كەركووكيش لەخۆ دەگرێت، لەهەندێك نەخشەی كورديشدا هەموو ئـەوەی كـە توركمان ئيلی لەخۆی دەگرێت دەكەونە نێـو داواكاريـەكانی كـوردەوەو ئـەوەش دەبێتـە هـۆی هەڵكشانی دوژمنايەتی ئەو توركمانانەی كە نەياری كوردستان و كوردن.

هەلومەرجەكە دژوارتر دەبێت كاتێـك ناتوانرێـت هـەژماری وردی ژمـارەی توركمانـەكان بكرێت، هەڵبەت دوا سەرژمێری باوەڕپێكراويش ئەوەيە كە بەر لە زياتر لەنيو سـەدە لەسـاڵی ١٩٥٧دا ئەنجامدراوە، هەرچەندە ئەو ئامارەش مايەی ناكۆكبوونە.

لەهەولێكيشدا بۆ تێپەڕاندنی ئەو كێشانە، هەندێك لەشێكاران تەقەلايان داوە بـەپێی ئـەو داتايانـەی سـەرژمێری ١٩٥٧دەسـتەبەری كـردووە، بگەنـە مامناوەنـدی تێكـڕای گەشـەی دانيشتوان، هەروەك ئـەوەی لەئـەدەبياتی توركمانيـدا هەيـەو خـەملێنراوە بـە ١٣- ١٦٪ی كۆمەڵگەی عێراقی ياخود

---

١ -كەركوكلو Kerkuklu ، هەمان سەرچاوە، ٢٠.

2 - Private Communication by e-mail with Sheth Jerjis of the Stichtung Onderzekcentrum Iraaks Turkemense Mensenrechten, 5 August 2008.

١ ملیۆن تورکمان١. بەپێچەوانەی ئەوەشەوە نووسەرانی ناتورکمان لەهەوڵی کەمکردنەوەی ئەو ژمارەیەدان و بەپێی سەرچاوە عێراقی و خۆرئاواییەکانیش ژمارەکە زۆر کەمترە لە رێژەی ٥٪ .٢

ژمارەی دانیشتوان لەپاش سەددام بووتەجێی بایەخ، بەتایبەتیش سیستمی سیاسی، کە سیستمێکە قەبارەی ئەم پێکهاتە یان ئەویان دەبێتە فاکتەرێکی بالادەست لەدیاریکردنی هاوسەنگی هێز لەنێوان پێکهاتەکاندا. بەلام گەمەی ژمارەکان لەروانگەی تورکمانەوە گەمەیەکی زۆر ئاوەژووکراوە لەدژیان.هاوکات تورکمان پێیان وایە ژمارەیان زۆر زیاترە لەوەی کە ئەوانیتر لەعێراقیەکان و چاودێرانی نێودەوڵەتی پەسەندیان کردووە.

بەلام ئەو بەڵگانەی کە لەپرۆسەکانی سەرژمێریکردنی دانیشتوانی عێراق و تێبینی گەرێدە و ئەکادیمیستەکان بەدرێژایی سەدەی بیستەم پێشکەشکراون باس لەچیرۆکێکی تر دەکەن.

بەپشت بەستنیش بە ئاماری رەسمی کە حکومەتی عێراقی کۆیکردوەتەوە بەتایبەتیش ئاماری ١٩٥٧(ئەو ئامارە رەنگدانەوەی بارودۆخی کەرکووکە بەر لەجموجۆڵپێکردنی فراوانی دانیشتوان کە پرۆسەی تەعریب بەخۆیەوە دیوە)، کورد رێژەی لە ٤٨٥ی دانیشتوان پێکدەهێنن و تورکمانیش لە٢١٪ و عەرەبیش لە ٢٧٪ پێکدەهێنن.

بەشێکی زۆریش لە رای گشتی تورکمان پێیان وایە ئەورێژانە ژمارەی تورکمانی زۆر کەمکردوەتەوە چونکە لەلایەن حکومەتەوە زۆرێکیان بە عەرەبو تورکمان تۆمارکراون.

کەوابوو تورکمان هەست بەزوڵمێك دەکەن کە بەرامبەریان کراوە دەرئەنجامی ئەو شێوازەی کە ئەکادیمیست و چاودێرانی دیمۆگرافیای عێراق باسی لێوەدەکەن، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە رێژەی دانیشتوانی عەرەب و کوردو تورکمان.

چاوخشاندنێکی خێرا بەو ئەدەبیاتەی کە لەبارەی عێراقەوە لەبەردەستدایە ئەوا بیرۆکەیەك سەبارەت بەسروشتی کێشەکە لەدیدگای تورکمانەوە دەدات بەدەستەوە.

زۆربەی ئەوکارە ئەکادیمیانەی لەناوەڕاستی سەدەی بیستەم و دواترا ئەنجام دراون، بەئاراستەی تەرکیزکردنە سەر سیاسەتی عێراقییە لەسەر ئاستی دەستەبژێر لەگەڵ بایەخدانی تایبەت بە مێژووی سیاسی وئەوگۆڕانکاریە وەزاریانەیە کە لەبەشێوەیەکی رێکوپێك

---

1 - Turkmenoglu , K.. The Iraqi Turkmen's Struggle to Sacrifice and Suffering. Ontario: Esprit de Corps BOOKS: 15.

2- Oguzlu, H." Turkmens as Facttor in Turkish Foreign Policy." Turkish Studies, 3,2: 139-148, quore143.

رووپانداوه.دووەم، ئەم برە لەئەدەبیات کە کۆمەڵێکی کەمە، بەڵام بەشێکی گرنگە لەکۆی ئەو سەرچاوانەی کە بەپلەی یەکەم تیشك دەخەنە سەر کورد.خۆ ئەگەر ئەو کارانە لەنووسینی ئەو چاودێرانە بێت کە پەیوەندیەکی پتەویان لەگەڵ گەلێکی جوامێری شاخاویدا دروست کردبێت وبەدیدێکی رۆمانسیانە لێیان روانیبێت، ئەوا زۆرکات هەڵوێستی پشتیوانیان بۆ کورد پیشانداوە بەبەراورد بەوکارانەی کە تەرکیزی خستوەتە سەرتەواوی عێراق.

نموونەی ئەو کتێبانەی مایەی نیگەرانییە بەلایەتیش لای تورکمان، کتێبی "کوردو تورك و عەرەب"ە، Kurds, Turks,and Arabs، کە لەلایەن سی.جەی.ئدمۆندز C.J.Edmonds لەساڵی ١٩٥٧نووسراوە.

نووسینەکانی ئدمۆندز پشت بە ئەزموونەکانی دەبەستێت ئەو دەمەی لەماوەی بیست و سییەکاندا فەرمانبەرێکی سیاسی بووە لەکوردستان و عێراق.لەگرنگترین کارەکانی کە تیایدا وێنای بارودۆخی کەرکووکی کردوە، پەنای بۆ سەرژمێری ١٩٤٧بردووە، کە کورد لە٥٤٪ی دانیشتوانی پارێزگاکەو لە٢٥٪ی شاری کەرکووکی پێکهێناوە١. بەپێچەوانەی ئەوەش زۆر جار تورکمانەکان ئاماژە بە نووسینەکانی حەنا بەتاتۆو دیڤید ماکدواڵ دەکەن.

یەکەمیان بۆنموونە دەڵێت:"کەرکووك..لەرابردوویەکی نزیکدا بەتەواوی تورکمان بووە"و کوردیش کە لەسەدەی بیستەمدا روویان لەشارەکەکردوە هۆکاری ئابووری لەپشتەوە بووە بۆ گەڕان بەدوای دەرفەتی کار لەپیشەسازی نەوتیدا.حەنا بەتاتۆ نووسیوویەتی کە کورد لەساڵی ١٩٥٩وە ژمارەیان بەرزبووەتەوە بۆ سێیەکی دانیشتوان و ژمارەی تورکمانیش بەنزیکەیی دابەزیوە بۆ دانیشتوان.هەروەها شارەکانی تری وەك هەولێریش هەمان پرۆسەی بەخۆوە دیووە٢.

هەرچی ماکدواڵیشە تەنیا ئاماژە بە سەرژمێری ١٩٤٧ دەکات کەتیایدا کورد لە٢٥٪ی دانیشتوانی شارەکەو لە٥٣٪ی پارێزگاکەیان پێکهێناوە. بەڵام ئەو کارەی وەك سەرچاوەیەك لەبەردەستی ئەو تورکمانانەدایە تا بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو رایەی کە باس لەزۆرینەی کورد دەکات لەسەدەی بیستەمدا بەکاریبهێنن٣، هەروەها نووسەران تورکیش توانایەکی تایبەتیان هەیە لە کۆکردنەوەی ئەو سەرچاوانەی کە بۆ پشتیوانیکردن لەبانگەشەکەیان بەتوندی پشتی پێدەبەستن.

---

1 - Edmonds, C.J. 1957. Kurds, Turds and Arabs. London: Oxford University Press: 438-439.

٢ - بگاگو ، هەمان سەرچاوە، ٩١٣.

٣- ماکدویل ، هەمان سەرچاوە،٣١٤.

بۆ نموونه ئەرشەد هورموزلو Ershat Hurmuzlu لێشاوێك له بابەت سـەبارەت بـە تورکیبـوونی کەرکووك دەخاته روو، ئەویش هەر لەو بەڵگەنامانەی که سەرچاوەکەی حکومەتی بریتانییە و باس له بەکارهێنانی زمانی تورکی دەکات لەکەرکووکدا بەشێوەیەکی بەربڵاو تـا دەگاتـە ئـەو نووسـەرە عێراقییانەی که باس له زۆرینەی تورکمان دەکەن لەکەرکووکدا و دواجـاریش ئـەو رۆژنامـەنووس و ئەکادیمیستانەی ئاماژە بە مێژووی تورکمانبوونی کەرکووك دەکەن١.

بەڵام سروشتی نائـارامی بـاوی پەیوەنـدی نێـوان تورکمـان و کـورد بەتـەنیا لەرەهەنـدی ململانێی هەرێمی و جیاوازی دیمۆگرافیاییەوە بەتەواوی راڤەناکرێت، هەرچەندە له رووکەشـدا ململانێکه لەسەر مـافی دیـاریکردنی داهـاتووە، ئـەویش لەرێگـەی رەواجـدان بـەرابردووی خودگەرایی و زوومی تایبەتمەندێتی ئیتنیکی، بەڵام نائارامیەکه لەبناغـەدا خـۆی لـە چـەند دینـامیکێتێکی دیکـەدا دەبینێتـەوە، کـە کاریگـەری لەسـەر دیـدی تورکمـان بـۆ کـورد و بەپێچەوانەشەوە هەیە.

چەمکی جیاکـاری ئیتنیکـی، کـە بـەپێی زۆربـەی لێکۆڵینـەوەکان دیاردەیـەکی نوێیـە، بەپاشماوەی جیاوازی چینایەتی رەنگ دەکرێـت، تورکمـانیش بـەو پێیـەی باووباپیرانیـان کـە عوسمانیەکان بوون، پێگەیەکی بەرچاویان هەبووە، که ئەگەر نایابیش نەبووبێت. هەربۆیـە ئـەو پێگەیە لەدوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقیش بەردەوام بووە، بەڵام دواترو لـەپاش هەرەسـی پادشایەتی پاشەکشەی کردووەو پاشانیش حزبی بەعس هەڵکشاوە.

لەو روانگە چینایەتیەشەوە، کـورد کۆچـەری و لادێـی بـوون و لەچـیاکانی هەڵکـەوتووی باکوور و خۆرهەڵاتەوە دابەزیوون و له لەپێناو باشکردنی گوزەرانی ئابووی و کۆمەڵایەتیان لـە کەرکووکدا سەقامگیربوون بەڵام بەشێوەیەکی تەقلیدی ماونەتەوەو لـە ئاسـتی فـەرمانڕەوای و چالاکیە بازرگانیەکانی شاردا ئامادەییان کەمبووە.

پاشـــان ژمارەیـــان زیـــادیکردووەو لەسەرئاســـتی پارێزگـــای کەرکووکـــدا بوونەتـــە زۆرینه.لەئێستاشدا بەدیدی تورکمان ژمارەی ئەو کوردانەی که لـەرووی مێژووییـەوە دەتـوانن بانگەشەی بەشاری بوونی خۆیان بکەن زۆر کەمترن لەوەی که لەمرۆدا بانگەشەی بۆ دەکەن.

---

١ - ئەو توێژینەوەیەی لێردەدا ئاماژەی پێکراوە( واقیعی ئیتنیکی ناوچەی کورکـووك The Ethnic of the Kirku Area) لە سایتەوە وەرگیراوە: www.turmen.nl/ERK/pdf

دیسان ئیشکالیەتی پەیوەندیەکان بە فاکتەرە دەرەکیەکان ئـالۆزتر دەبێـت —بایەخپێـدانی تورکیا بەهەلومەرجی تورکمان لەعێراقدا و پێداگری ئەنقەرە لەسەر مافی تورکمان لەعێراقـدا مێژوویەکی نوێی هەیە- ئەویش لەبناغەدا بەرپەرچدانەوەی دروستبوونی هەرێمی کوردستانە- بەلاَم غیابی ئەو رۆڵە مێژووییە لەکاریگەری ئەنقەرە لەمامەڵەکردنی تورکمان وکـورد لەگـەڵ یەکتری لەکەرکووك و شارۆچەکەو شارەکانی تری باکووری عێراق کەم ناکاتەوە.

دەکرێت بانگەشەی تورکمان سەبارەت بەکەرکووك بۆ چوار رەگەز لێکترهەڵبوەشـێنرێنەوە. هەروەك حاڵەتی کوردو عەرەب و مەسیحی "گێرانەوەی تورکمان"یش هەوڵـدەدات سـەردەمی نوێی تورکمان بە رابردووی شکۆدار و ئامادەبوونی رەچەڵەکیان لەناوچەکەدا بەدرێژایی چـەندان سەدە ببەستێتەوە، کە لەوماوەیەشدا پێگەی سەرکردایەتیکردنیان هـەبووە لـە سـاتەوەختێکی یەکلایی کەرەوەی مێژووی عێراقدا. دیارە ئەو بۆچوونەش لە برگەکانی پێشـووتردا باسـکراون. رەگەزی دووەمیش دیدی تورکمانە بۆ مێژوویان، کە هەرلەو سۆنگەیەشەوە پشت بەهەڵوێستی خۆیان دەبەستن لەو ململانێیەی کە ئیستا هەیە، ئـەویش پێگـەیان بـووە لـە ئیمپراتۆریـەتی عوسمانیدا. جا بەو پێیەی گروپێکی خاوەن پلەو پایە بوون لەسیستمی ئیداری ئەو کاتەدا، ئەوا لەبانگەشەی تورکمانەکاندا سەبارەت بە کەرکووك، تەرکیز دەخرێتە سەر بۆن و بەرامی تورکی یاخود عوسمانی لە ئاوەدانکردنەوە و کلتووری شارەکەدا، لەگەڵ ئاماژە کردن بە تـەلارو نـاوی ئەو شوێنانەی کە لەسەرچاوە عوسمانیانەدا هاتوون و باس لە زۆرینەی تورك یان تورکمان دەکەن لەشارەکەدا، ئەگەر لەپارێزگاکەشدا نەبێت.

رەگەزی سێیەم، کـە تورکمـان پشـتی پێدەبەسـتێت لەسـەربناغەی ئـەو نەهامەتیانەیـە (خەڵکانی تری ناعەرەبیش لەو نەهامەتیانەدا بەشداربوون) کە نەك هەربەتەنیا لەسەر دەسـتی دەوڵەت دووچاری بوونەتەوە، بەڵکو ئەوەش کە لەسەر دەستی کـورد روو بـەرووی بوونەتـەوە، ئەویش لەرێگەی خۆسەپاندن بەسەر سیاسەتی کـەرکووك وفۆرمەکـەی لەقۆسـتنەوەی راسـتیە سیاسیەکانی رۆژانەی شارەکەدا.

رووداوەکانی وەك کوشتارگەی ساڵی ١٩٥٩ی کەرکووکیش پاساوێکی بەهێز و پڕ لەهەست وسۆزە بەدەست ئەو تورکمانانەی کە لەئاسایش و سەلامەتی خۆیان دەترسـن لەناوچـانەی کـە بەدەست کوردەوەیە.

مێژووی نەهامەتی تورکمان ڕاستەوخۆ گرێدراوە بەو هەست بەزوڵمکردنەی کە باڵی بەسەر ناوەندی تورکمانیدا کێشاوە و بەدیدی ئەوانیش زیاتر بایەخی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی بەئاراستەی کوردە وەك ئەوەی تەنیا کورد لەسەر دەستی ڕژێمی بەعس تووشی نەهامەتی هاتبن.

هەروەها تورکمان لەوبڕوایەدایە، کە کورد توانیویەتی سەرنجی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی بۆ لای خۆی رابکێشێت بەوەی کە ئەوان قوربانی هەمیشەیی پرۆژەی ناسیۆنالیزمی عەرەبی بوون لەدوورخستنەوەیان لەعێراقدا، لەنێویشیاندا ستراتیژی تەعریبکردنی کەرکووك، بەشارو پارێزگاکەیەوە.

تورکمان لەهەوڵی بەدەستهێنانی ئەوەدان کە ئەوانیش وەك لایەنێکی زوڵملێکراوی سەر دەستی بەعس ئیعترافیان پێبکرێت- رەنگە زیاتر لەکوردیش بەپێی پێوەرە رێژەییەکان- هەروەها ناوچەیەکی فراوانیش کە لەسەردەستی بەعس تەعریبکراوەو لەبناغەدا ناوچەی کوردی نین بەڵکو نیشتیمانی دێرینی تورکمانن.

ئەو هەستکردنەش بەزوڵملێکراویان زیاتر دەبێت کاتێك هەست بەنائومێدبوون دەکەن لەوەی کە بە" بەکوردکردن- تکرید"ی کەرکووك ناوی دەبەن، لەپاش گەڕانەوەی هەردو پارتی سەرەکی کوردی و پێشمەرگەکانیان لەساڵی ٢٠٠٣دا.

دیسان تورکمانەکان پێیان وایە کەتوونەتە نێوان ئەوەی بە پرۆسەی زەوتکردنی زەوی و زارەکانیان لە هەشتاو نەوەدەکاندا ناوی دەبەن و ئەوەش کە دواتر بەهەمان شێوە کورد لەبەرایی هەزارەی سێیەمدا ئەنجامیداوە، هەروەها وایدەبینن کە بەرژەوەندی کورد و عەرەب بەیەکتری گەیشتوە چونکە لەراستیدا ئەوان نایانەوێت کەرکووك بۆ ئەو بارودۆخە بگەڕێتەوەکە جاری جاران لەئارادابووە، هەروەك ئەوەی تورکمانەکان بانگەشەی بۆدەکەن، رۆژگارێك بووە ئەوان ئاغای شارەکە بوون.

### تورکمان لەعێراقی نوێدا

هەرەسی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی گرێدراوە بە کۆمەڵێك گۆڕانکاری قووڵەوە کە تورکمانەکانی ولایەتی موسڵیشی گرتوەتەوە.

تورکمان بەو پێگە پێشکەوتووەکۆمەڵایەتی و ئابوورییە نایابەی کە لەسایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا لەشارەکانی ناوچەکەدا هەیانبوو، دەستەیەکی خۆش گوزەرانی بەرچاویان پێکهێنابوو، لەکاتێکدا کورد سەربە توێژێکی پلیشاوە بوون.

بۆیە ئەو جیاوازییە ببـووە هـۆی سـەرهەڵدانی ناوەبـەناوەی کـاری توندوتیـژی ئیتنیکـی وکاریگەری هەبوو لەسەر پەیوەندی نێوان کوردو تورکمان بەدرێژایی ئەوماوەیەی کە لەسـەدەی بیستەم مابووەوە.

بەدڵنیایشەوە دیدگای تورکمانی لەبەراییەکانی سەدەی بیستەمدا بەوجۆرە بوو، کە ولایەتی موسڵ بەشێکە لەهەرێمە فراوانەکانی عوسمانی، بۆیە بەو پێیەش لەرووی مێژوویی و ئابووری و کلتووری و کۆمەلایەتییەوە فۆرمێکی تورکی بەبـەرداکرابوو، کـە هەرئـەوەش بـوو بـۆ چـەند سەدەیەك ناسنامەکەی دیاری کردبوو.

دیارە بەهەمان شێوەش ئەو حاڵی شـارەکانی کـەرکووك و موسـڵ و هـەولێربوو، لەگـەڵ ئیعترافکردن بەوەی شارە دوورەدەستەکانی ناوچە شـاخاویەکان بەتایبـەتیش سـلێمانی ببوونـە شاری کوردی تەنانەت ئەگەر بەرەچەڵەکیش تورکییەکی سەردەمی نـوێ بـن[1].ئـەو هەسـت و سۆزەی تورکمانەکان لەبیستەکاندا وایکردبوو کە ئاواتـە خـوازبن تورکیـا ولایـەتی موسـڵیش بگرێتەوە تا ببێتە بەشێك لەو دەوڵەتە گەوەرەیەی کە تورکی زمانبوون.

بەدیدی تورکمان مێژووی عێراق لەبەشی دووەمی سـەدەی بیسـتەم لەبناغـەدا ململانێیـە لەپێناو پاراستنی پێگەیان لەبەرەنگاریبوونەوەی فراوانبوونی دانیشـتوانی کـورد. بـەو دیـدەی تورکمان، کـورد لەهـەوڵی کـۆنترۆڵکردنی سیاسـیانەی کـەرکووك و بەربـەرەکانی ریزبەنـدی کۆمەلایەتی- ئابووری پێشوودا بوون.

ئەو ململانێ بەهێزەش گرێدرا بوو بەژیانی سیاسی فراوانتری عێراقەوە، بەجۆرێك پێویست بوو لەسەر فەرمانڕەوایی دەوڵەت زیاترو زیاتر رژێمی تۆتالیتاری بێت، بەڵام واخۆی دەربخـات حکومەتی نیشتیمانیی مەدەنیە، هەرچەندە بەچاوی زۆری گومانی لە پێکهاتە ناعەرەبیەکانی دەڕوانیوەك هەڕەشەیەك دایدەنا کە دەبوو بەتوندی گەمارۆ بدرێت.

جیـاوازی چـینایەتی لـەنێوان کوردوتورکمانـدا رەگـەزێکی گرنگـە بـەڵام زۆرجـاریش لەدیاریکردنی دیدی هەرلایەك بـۆ یـەکتر پشـتگوێ دەخرێـت. بەگشـتی تورکمـان وا لـەخۆی دەڕوانێت کە لەناوچەکەدا گەلێکی کۆڵنەدەرن و سەرکەتووش بوون لـەوەی شـارەکان بـاکووری

[1] - کۆمەڵەی تەگژە نێودەوڵەتیەکان ICG

International Crisis group, 2006. Iraq and the kurd: The Brewing battle Over Kirkuk. Middle East Report No.56, 18July:4.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

عیراق بگۆڕن بۆ ناوەندی ئیداری و بازرگانی لەسایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا- بەتایبەتیش لەکاتی بەراوردکردنی بەچالاکی کوردانی کۆچەری.

دیسان بەدیدی تورکمان، کۆچەرانی کورد لەشارەکێشە لەسەرەکانی ئێستادا تازەن و لەبناغەشدا کۆچەریی گوندنشینن و خراپی بژێوی ژیانیان لەناوچە گوندنشینەکان کە گیرۆدەی یاخیبوونی عەشایری بوو لەبیستەکاندا وایکرد لەدوای ساڵی ١٩٢٧ روولەو شارانە بکەن، کەنەوتی تیادا دۆزرابووەوە.

لەزۆر رووشەوە ئەو بەیەکداچوونەی رەهەندی ئیتنیکی و رەهەندی چینایەتی، رەگەزی یەکلایی کەرەوە بوو لەدروستبوونی دوژمنایەتی نێوان تورکمان و کورد.حنا بتاتۆش سەرنجی ئەوەی داوە" قەرزدەرەکان تورکمان بوون و قەرز وەرگرەکانیش کورد بوون، گەورە بازرگان و خاوەن کۆگاو پیشەوەرەکان تورکمان بوون و کرێکارانی نەوت و رەنجدەرو فرۆشیارە بچووکەکانیش کورد بوون". بەڵام ئاماژە بەبوونی زۆرێك لەتورکمانی هەژاریش دەکات"ئەو ژمارەیەی کوردیش کەم نەبوون کە گوزەرانیان باشبووە".

لەو ژینگەیەی کە لە سەدە بیستەمدا بارودۆخی عێراقی تێدابووە و یادەوەری جەنگی یەکەمی جیهانیش هێشتا لەلای خەڵکی بەزیندوێتی ماوەتەوەو دەوڵەتیش لەهەوڵی گێڕانەوەی دیاریکراو و راڤەکردنی تایبەتی یادەوەریی مێژوویی بووە تابەسەر هاوڵاتیانیدا بیسەپێنێت، ئەمە جگە لە بیروباوەڕی کۆمۆنیستی و سۆسیالیزم کە لەنێو چینە هەژارەکانی عێراقدا گەشەی کردووە، ئەودەم نائۆقرەیی نێوان کوردو تورکمان حەتمی بووەو ئەگەری توندوتیژیش بەبەردەوامی لەئارادا بوو.

## گێڕانەوەی چەوسانەوە لای تورکمان

بەدیدی تورکمان سەدەی بیستەم، ئەو ماوەیەیە کە تیایدا کاری تیرۆریستی لەلایەن دەوڵەت و ئەو هێزانەی کە دەوڵەت هانیداون لەدژیان ئەنجامدراوە، هەروەها کوردیش گەرەکێتی بەزۆر لەسەر زێدی خۆیان وەدەریان بنێن.

لەگێڕانەوەی ئەو رووداوانەدا تورکمان تەرکیز دەکاتە سەر سێ پرسی سەرەکی: کوشتارگە، تەعریب، بەکوردکردن(تەکرید).

## کوشتارگە

لەسەدەی بیستەمدا تورکمانەکان بەدەست ئەو پەلامارە ڕێکخراوانەوە ئازاریان چەشتووە، کە ڕوو بەڕووی بوونەتەوە هەرچەندە ئەو دەستدرێژی و پەلامارانە لەبناغەدا ڕووداوی دابڕاو بوون، بەڵام هەندێکیشیان خوێناوی بوونو ئەوەش وایکردووە ڕەهەندێکی ڕەمزی بەهێز وەربگرن و ئەوەش نەك هەر لە سووربوون لەسەر نەهامەتیەکانی تورکمان لەسەدەی بیستەمدا بەکاربراوە، بەڵکو بۆ تیشك خستنە سەر ئەو مەترسیانەش بەکاربراوە کە هێشتا مایەی هەڕەشەن بۆ سەریان.

دیارە ئەو ڕووداوانەش کە لەکەرکووکدا لەبیستەکانی سەدەی بیستەم و دواتر ڕوویانداوە بوونەتە هۆی جۆشدانی هەست و سۆزی تورکمان، چونکە ئەوان لەیەکێك لەبەرچاوترین ئەو شارانەی عێراقدا ژیاون کە چاوی لەسەربووە و کراوەتە ئامانج، ئەمە جگە لەوەی بەشێوەیەکی بەدەر لەبەرگریکرن لەجیهانی سیاسەتی پڕ لەمەترسی تێوەگلاون، بەجۆرێك هاوپەیمانیەکان سەرباری ستەمکاری، ناکۆکیەکانیان قۆستۆتەوە و توندوتیژییان بەشێوەیەکی لەناکاوو توندو وێرانکارانە وەك ئامرازێك بۆ سەرلەنوێ داڕشتنەوەی نەخشەی سیاسی بەکارهێناوە.

کاتێکیش لەسەدەی بیستەمدا چەند دینامیکێکی سیاسی لەعێراقدا لەبۆچوونی چینایەتی و نەتەوایەتی و کۆمۆنیستیدا ئاوێزان بوون بە سیمبول و ئەو هەست و سۆزەی کە ڕیشەکەی ناکۆکی ئیتنیکی بووە بە بۆچوونی خاوەنەکانیان، ئەوا ئەرکی دەوڵەت بەرێژەیی ئاسان بووە بۆ دۆزینەوەی زەمینەیەك کە تیایدا کوردو تورکمان لەدژی یەکتری پەنا بۆ چەك بەرن لەژێر دروشمی جۆراو جۆرادا، کە دواجار هەوویان ئەنگێزەی ئیتنیکییان لەدواوە بووە.

زیاد پەنگخواردنەوەی نێوان کوردو تورکمان بەتایبەتیش لەدوای ڕووداوەکانی ١٩٥٩ی کەرکووکدا، لە یادەوەری زۆرێك لە تورکمانەکاندا تائێستاش ماوەتەوەو وەك بەڵگەیەك لەبەرامبەر دلڕەقی کوردو مەترسیەکی چاوەڕوانکراو لەو ناوچەیەی کە کورد تیایدا باڵادەستە بەبیر دەهێنرێتەوە.

گێڕانەوەی تورکمانی بۆ مێژووی کەرکووك بەڕوونی ئەوە دەردەخات، کە ئەوان وەك ستراتیژێکی بەرنامەبۆدارێژراو و هەندێك جاریش وەك ستراتیژێکی ئامادەکراوی پێشوەخت لەو توندوتیژییە دەڕوانن کە تورکمانی کردوەتە ئامانج تا لەنیشتیمانی خۆیاندا وەدەریان بنێن.

ئەو هەستکردنەش بە بوونی پیلانێك هەستێکی ڕۆچووە لەقوڵاییدا و ئەوەش هۆکاری خۆی هەیە.یەکەمین ڕووداویش کە چاودێرانی تورکمان لەکاتی هەڵوەستەکردنیان لەمامەڵەکردن لەسایەی دەوڵەتی نوێی عێراق ئاماژەی بۆ دەکەن کوشتارگەی ٤ی ئایاری ١٩٢٤ی کەرکووکە.

دیدی تورکمانیش لەبەرامبەر ئەو رووداوەدا، بەیەکەمین دەرفەت دادەنرێت کە بەپشتیوانیکردنی سیستمی نوێی پادشایەتی، ئیمپراتۆریەتی بریتانیایی قۆستیۆتیەوە بۆ لاوازکردنی ئەوان، چونکە تورکمان وەك پاشماوەی عوسمانیەکان تەماشاکراون بەوەی کە هیچ وەلائێکیان بۆ عێراق نییە و پەیوەندیەکی سروشتی بەئایدیۆلۆژیای ناسیونالیزمی بزۆزی ئەنادۆڵەوە دەیانبەستێتەوە.

بەپێی ئەو بۆچوونەش مایەی هەڕەشەن بۆ سەر سەقامگیری عێراق – بەتایبەتیش کە ئەوان پشتیوانیان لەدەستبەکاربوونی مەلیك فەیسەڵی یەکەم لەسەر تەختی پادشایەتی نەکرد.لەبەرئەوە شانۆیەك لەلایەن بەریتانیەکانەوە بەهاوکاری لایەنە عێراقیەکانی تر بۆ تورکمان ئامادەکرا و کرانە ئامانج.

ئەو لایەنە عێراقیانەش کە تەواو ئامادەییان هەبوو تورکمان ملکەچ بکەن، هێزی لیڤی Levies- بوو کە ئەندامە بەسەربازگیراوەکانی لەو ئاشووریانە بوون کە لەهەرێمی هەکاری تورکیاوە هەڵهاتبوون.

پێدەچێت ئەو پریشکەی کە بووە هۆی هەڵگیرسانی ئاگری ململانێکە بەتەنیا دەمەقاڵەی نێوان سەربازێکی سەر بەهێزەکانی لیڤی و شوانکارەیەکی تورکمانی نەبووبێت، کە وای لە بەریتانیەکان کرد رێگە بەهێزی لیڤی بدەن پەلاماری تورکمانی کەرکووك بدەن و نزیکەی ۲۰۰کەسیان لێبکوژن هەروەك سەرچاوە تورکمانیەکان ئاماژەیان پێکردووە۱. رەنگە ئەوەش وەك بەشێك بێت لەو بەرپرسیارێتیەی کە هێزی لیڤی لەئەستۆی دەگرێت لەوەی کەروویدا.

بڕوانە سەرهەنگ ئار.ئێس.ستافۆردR.S.Stafford" ئەو ئاژاوەیەی کە لەسەردەستی ئەو سەربازە رێکخراوانە روویدا بەدەر لە قەبارەی ئیستفزازەکە، لەکەیەکی مەترسیدارە بەناوناوبانگی باشی ئاشووریەکانەوە۲.

رووداوێکی دی لەرووداوەکانی کێشمەکێشی نێوان تورکمان و سیستم پادشایەتی لە۱۲ی تەموزی ساڵی ۱۹٤٦روویدا، کە شانۆکەشی ناوچەی گاورباغی بوو لەکەرکووك.ئەوەبوو کرێکارانی نەوت کە تورکمان بانگەشەی ئەوەدەکات زۆربەیان تورکمان بوون، مانگرتنێکیان

---

۱ -کۆبەرلو ، هەمان سەرچاوە. دیسان بڕوانە ئەلهرمزی Al-Hirmizi هەمان سەرچاوە: ۷۹-۸۹.

2 - Stafford, R.1934." Iraq and the Problem of the Assyrians." International Affairs , 13, 2, March –April: 158-184,quote at 163.

ڕاگەیاندووە لەپێناو باشكردنی هەلومەرجی كار كردنیان بەڵام یەكە سەربازیەكان بەپشتیوانی پۆلیش تەقەیان لە مانگرتوەكان كردووە.

ڕووداووی گاوربــاغی، ئەگــەر لەگۆشــەنیگای ئیتنیكــی لێبیڕوانرێــت كــەزیاتر لــە كوشتارگەكەی ساڵی ١٩٢٤ئاوەژوو كراوە ئەوا وەك فاكتەرێك لەپشــت مانگرتنەكــەوە یــاخود لەپشت بەپەرچدانەوەی حكومەتەوە دەردەكەوێت.

هەرچی نووسەرانی چەپڕەویشە كوشتارگەكە وەك بەڵگەیەك بۆ "پەرەسەندنی ڕۆحی خــەباتگێڕی لەبزوتنەوەی سەندیكاییدا " باس دەكەن١. بەڵام نووسەرانی ناسیۆنالیستی توركمــانیش ڕووداوەكــە وەك "نموونەیەكی ئاشكرای سیاسەتی چەوسانەوەی نەتەوەیی"چاو لێدەكەن٢.

لێكدانەوەی ڕاستی ڕووداوی گاورباغی هەرچییەك بێت، ئەوا بێگومان لەبیرەوەری توركمان و لەبەراوردكردنیدا بەڕووداوەكانی ساڵی ١٩٥٩ كاڵتر دیارە.

هەرچی كوشتارگەی ساڵی ١٩٥٩ی كەركووكیشە لەسایەی ئــەو كەشــە سیاســیەدابوو كــە سەرتاپای عێراقی گرتبووەوەو پریشكەكەشــی لەئاســتی ناوخۆییــدا لــەو بارودۆخــەدابوو، كــە بەدابەشبوونی ئیتنیكی و كۆمەڵایەتی —ئابووری نێوان توركمانو كورد بارگاوی ببوو. ئــەوەی جێگەی گومانكردنیش نییە ئەوەبوو كە لەژێر ئاڵای شیوعیەكاندا ئەوانەی جــەنگان زۆربــەیان كورد بوون و ئەوانەش كە كرابوونە ئامانج زۆربەیان توركمان بوون.

ڕەنگەئەو كوشتارگەیەی كەركوك لەهەر ڕووداوێكی تر كاریگەری زیــاتری هــەبووبێت لــە ڕەواندنەوەی ئەو وێنە پەمبەیەی كەعێراق لە كۆتایی پەنجاكاندا هەیبوو، بەو پێیــەی وڵاتێــك بوو تیایدا هۆشیاری نیشتیمانیی عێراقی گەڵاڵە ببوو.

بەلای توركمانیشەوە تەمووزی ساڵی ١٩٥٩ئــەو ســەردەمەیە كــە تیایــدا پەیوەنــدییان لەگــەڵ كــورددا بــەجۆرێك گــۆڕانی بەســەردا هــات، كــە چــاككردنەوەی ئاســان نــەبێت، بــەوجۆرەی كــە لەپەیوەندیەكی پێكەوژیانەوە بۆ پەیوەندی كێبڕكێ لەسەر بناغەی ئیتنیكی گۆڕانی بەسەردا هات.

لەرۆژگاری رژێمی بەعسیشدا هەڵاوێردكردن لەدژی توركمان زۆربــوو، ئــەوەبوو زۆرێــك لــە سەركردەكانیان لەماوەی نێوان ١٩٧٩- ١٩٨٠ ئیعدام كران، كاتێك سەددام ریزەكانی حــزب و

١ - بۆ نموونە بڕوانە :
Anne, A.2003."Daring for Victory : Iraq in Revolution 1946-1959." International Socialism Journal, issue 99, Summer, published on line at http://pubs.socialistreviewindex.org.uk/isj99/alexander.htm
2 - Al-Hirmizi, A2005.The Turkmen Reality of Iraq. Istanbul: Kerkuk vakfi:91.



PDF 4 KURD

سوپای لەهەر هەڕەشەیەکی چاوەڕوانکراو پاکتاو کرد، هەروەها زۆرێك لەتورکمانی شیعە بەهۆی ئینتیمایان بۆ حزبی دەعوەی قەدەغەکراو لەناوبران.

بەڵام کوشتارگەی **١٩٥٩** لەکۆبیرەوەری تورکماندا ماوەتەوە و چەسپاوە، ئەویش بەو پێیەی هۆشدارییەکە نەك هەر لەبەرامبەر ئەو مەترسیانەی لکاون بەسیاسەتەوە لەعێراقدا بەڵکو هۆشدارییە لەبەرامبەر رق و کینەی قوڵ و نەبوونی متمانە کە پێشتر بەبەردەوام لەنێوان کوردو تورکماندا لەئارادابوو.

بۆیە لەساڵی **١٩٥٩** و بەدواوە ئەو بۆچوونەی کە باس لەپێکەوەژیانی نێوان کوردو تورکمان دەکات لەکەرکووکی فرە ئیتنیکدا بیرۆکەیەکی تەواو دوورە.

## تەعریب

تەعریب- کەبەگشتی پەیوەست بوو بە سیاسەتی راگواستنی کورد لەکەرکووك و دەوروبەری فراوانی- کاریگەری ترسناکی لەسەر تورکمانیش هەبوو.

لەراستیدا تورکمانەکان زۆرجار دەڵێن و بگرە باوەڕیشیان بەوەیە، کە ئاستی کاریگەربوونیان بە سیاسەتی تەعریب زۆر زیاترە لەکاریگەری ئەو سیاسەتە بۆ سەر گروپە ئیتنیکیەکانی تر، بەتایبەتیش کە رژێمی بەعس دەیزانی کەرکووك لەبری ئەوەی شارێکی زۆرینە کورد بێت، ئەوا بەپێی مێژوو شارێکی تورکمانیەو لەرووی کلتووریشەوە بەتورکمانی دەمێنێتەوە.

بۆیە هەرخوێندنەوەیەکی ئەدەبیاتی تورکمانیش یەکسەر ئەوە دەردەخات، کەچۆن تورکمان لەمێژووی کەرکووك دەنۆرێت لەسەدەی بیستەمدا ئەویش بەو پێیەی لەمێژوودا قوربانیەکی سەرەکی سیاسەتەکانی رژێمی بەعسی بوون و دیسان کەچۆن لەئێستاشدا بەدەست کوردەوە بەهەمان شێوە دەناڵێنن، ئەگەر چی رەنگە ئازارەکەی کەمتر بێت١.

هەڵبەت تۆمەتبارکردنی کورد بەبوونی هەڵمەتی "تەکرید"لەدواتردا چارەسەری دەکەین، بەڵام رەگەزێکی تر هەیە کە رەهەندێکی کوردی هەیە لەپرسی تەعریبکردندا کە بەتوندی تەرکیز دەکاتە سەرتورکمان.

---

١ -بۆنموونە بڕوانە

Jerjis,S.2006.The Turkmen of Iraq:Underestimated, Marginalized and Exposed to Assimialtion. Nijmgan: Benda Print House.

دیاره تورکمان زۆر هەستیارن بەوەی کە دەوترێت نەهامەتی کورد لە نەهامەتی تورکمان زیاترە و پێیان وایە ئەوان نەیانتوانیوە لەبەردەم کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا وەك قوربانی ئەو بەپەندبردنەی کە دەزگاکانی دەوڵەت لەبەرامبەریاندا مومارەسەی کردوە وێنای خۆیان بکەن. هەروەها ئەوباوەڕەش لەئارادایە کە کورد توانیویەتی میراتی تەعریب لەخزمەت پرۆژەی ئیتنیکی خۆیاندا تەوزیف بکەن.

لەلایەك مەیلی ئەوەی کە کورد هاوبەشی نەهامەتیەکانی ماوەی حوکمڕانی بەعسن و لەلایەکی تریشەوە بەو پێیەی کورد رکابەرن لە بەگەڕخستن و تەوزیفکردنی ئەو جێکەوتەی تەعریب لەموزایەدە ئیتنیکیەکانیاندا، یەکێکە لەشەقڵە باوەکانی نێو گێڕانەوەی تورکمانی.

لەروانگەی تورکمانەوە، تەعریب پرۆسەیەك بوو کەریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی دروستبوونی دەوڵەتی عێراقی. بەجۆرێك تەعریب پەیوەندیەکی تۆکمەی هەیە بەزەرورەتی دڵنیابوون لە کۆنترۆڵکردنی تەواوی حکومەتی ناوەندی- کە حکومەت گەرەکی بوو کۆپی خۆی لەوەی فۆرمێکی ناسیونالیستی عەرەبی سوننی هەبوو بسەپێنێت- بۆ کێڵگە نەوتییەکانی کەرکووك.

یەکەم شەپۆلی تەعریبیش لەگواستنەوە خێزانەکانی باشوورو ناوڕاستی عێراقەوە بۆ کەرکووك دەستی پێکرد تا لە پیشەسازی پەرەسەندوی خێرایی نەوتیدا کاربکەن، ئەمە جگە لەوەی لەتەواوی کەرتەکانی دەوڵەتدا پۆستیان پێدرا.

هەروەها لەشارەکەدا گەڕەکی نوێ دروستکرا، بەڵام تورکمان روو بەرووی پرۆسەی راگواستنی بەزۆر نەبوونەوە. دیسان جارێکی تر تورکمان لەچیرۆکێکی تردا لەگەڵ کورددا بەشداربوون لەتێڕوانینان بۆ دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات لەلایەن حزبی بەعسەوە لەساڵی ١٩٦٨دا، ئەویش بەو پێیەی دەرفەتێکی تر بوو بۆ قۆناغێکی نوێی وێرانکاری تەعریب. بەڵام تورکمان لەوەدا لەگەڵ کورد ناکۆکن کە پێیان وایە ئەوان ئامانجی سەرەکی پرۆسەی راگواستن بوون، چونکە رژێمی فەرمانڕەوا دەیزانی تورکمان لەکەرکووکدا "زۆرینە" پێکدەهێنێت١.

بەڵام بەپێی ژمارە رەهاکان و ئامارەکانی دانیشتوان بە روونی دەردەکەوێت، ژمارەی ئەو کوردانەی بەپرۆسەی تەعریب کاریگەربوون زۆر زیاترە لەژمارەی تورکمان.

---

١ - ن.أحمد ،التغيير الديموغرافي القسري لسكان كركوك. لندن ، مركز كربلاو للابحاپ ولدراسات، ل ٤٤٦.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دیسان وەك ئاشكراشە توركمانیش بەر پرۆژەی فراوانتری راگواستن كەوتوونو زۆرێكیش لـە مەرسومە كۆماریەكان و رێنماییەكانی دەزگا ئەمنی و موخابەراتیەكان بەئاشـكرا ئاماژەیـان بەوەداوە كە توركمانیش جێی بایەخی تایبەتن.

بۆ نموونە لە بەرواری ٦ی ئایاری ١٩٨٠دا، بەرێوەبەرایـەتی هـەواڵگری سـەربازی بـەپێی گشتاندنی ژمارە ١٥٥٩، فەرمان دەدات بە گواستنەوەی بەرپرسـانی توركمـان لەكـەركووك و یەكێیش لەبڕگە سەرەكیەكانی ئەو گشتاندنە ئەم رێنماییانەی لەخۆگرتووە:

"دیاریكردنی شوێنی كاری فەرمانبەرانی توركمـان لـە فەرمانگـە رەسمیـەكان، بۆئـەوەی بەرەو پارێزگاكانی تر دووربخرێنـەوەو دابەشـبكرێن و رێگریـان لێبكرێـت لـەوەی لـەپارێزگای كەركووكدا چڕ نەبنەوە......"

لە ٣٠ی تشرینی یەكەمی ١٩٨١ ئەنجوومەنی سەركردایەتی شۆڕش- مجلس قیادە الپـورە( باڵاترین دەسەڵات لەنێو رژێم و لەدەرەوەی بازنەی تەسكی سەرۆك) مەرسومی ژمارە ١٣٩١ی دەركردوە و بەو پێیەش رێگە بەدوورخستنەوەی توركمان لەكەركووك دەدات.

هەروەها بڕگەی ١٣ی مەرسومەكەش ئاماژەی بەوەكردووە"ئەو رێنماییانـە بـەدیاریكراوی فەرمانبەران و كرێكارانی توركمان و كوردی نیشتەجێی كەركووك دەگرێتەوە"١.

هاوكات ئەندامانی حزبی بەعس بەتایبەتیش پلە بەرزەكان هاندەدران بەرەو كەركووك بچن و لەوەشدا جگە لەچوون هیچ بژاردەیەكی تریان نەبوو٢.

پاكتـاوكردنی نـەژادی لەسیاسـەتی بەعسـدا تـەنیا یـەك رەگـەزی لـەخۆگرتبوو ئـەویش سنووردارکردنی نفوزی توركمان بوو لەكەركووكدا. ئەو توركمانانەی لە كەركووكـدا مابوونـەوە روو بەرووی سیاسـەتی توانـەوەی تـەواو بوونـەوەو بـەوەش رژێـم لەمەرسـومی ژمـارە ٨٩ی سەركردایەتی شۆڕش كە لە ٢٤ی كـانوونی دووەمـی سـاڵی ١٩٧٠ پاشـگەزببوەوەو هەوڵێـدا سیاسەتێكی بەرنامە بۆدارشێژراو بۆ تەعریبكردنی كەركووك و خەڵكە ناعەرەبەكەی جێبـەجێ بكات.

بەپێی مەرسومی ژمارە ٨٩ مافە كلتووریەكانی توركمـان دەسـتبەر دەكرێـت- لەوانـەش مافی فێربوون بەزمانی توركمانی لە قوتابخانەكانیاندا. بەڵام دوای چەند ساڵێكی كەم رژێم لەو

---

١ - هەمان سەرچاوە، ل ٤٤٨.

٢-جەرجیس Jerjis ، هەمان سەرچاوە، ٧.

بەلێنەی پاشەکشەی کردو بەتەواوی وازی لە فێربوون بەزمانی تورکمانی بۆ بەرژەوەندی سیستمی فێربوونی عەرەبی هێنا.

جگە لەوەش ناوی خوێندنگە بەرەچەڵەك تورکیەکانیشی گۆڕی و لەبری ئەوە پەنای بۆ ناوی بەعسی و ناودارانی مێژووی عەرەبی برد.

بۆنموونە لەبری ناوی"یەڵدز لەر" پەنای بۆ "الفجر الجديد" برد ولەبری "یدی قەرداش "یش ناوی "بەعس " و پاشان قادسیەی داناو دیسان ناوی "دۆغرولوق" ی بە ناوی"عومەر بن عەبدولعەزیز" گۆڕی.

بەهەمان شێوە سەرلەنوێ ناوی تورکی گەڕەکەکانی ناونایەوە، ئەوەبوو گەڕەکی "یەنی تیسا"ی کرد بە"بەعس" وناوی بازاڕی "قۆریە"ی گۆڕی. هەروەها گەڕەکی "جیقۆر" بەگەڕەکی "عەرەبی " ناونا و تیپی تۆپی پێی "قەرداش" بووە "شباب التأميم".

هەڵبەت ناوچە تورکمانیەکانی نێو قوڵایی کەرکووکیش لەبارێکی باشتردا نەبوون بەبەراورد بەناوی گوندەکان کە لەماوەی شەو رۆژێکدا ناوەکانیان گۆڕدران.

ئەوەبوو خەڵکی گوندی "شیرینجا بولاق" تووشی شۆك بوون کاتێك بینیان ناوی گوندەکەیان کراوە بە"یەرموك"(ناوی ئەو شەڕەیە کە تیایدا سوپای موسڵمانان بەسەر ئیمپراتۆریەتی بەیزەنتیدا سەرکەوتن)، و ئەوەش هیچی کەمتر نەبوو لەو دۆشدامانەی خەڵکی "زندانە" کە لەپڕێکدا خۆیان بینییەوە لەنێو میسردا دەژین١. خۆ هیچ نەبێت ئەوانە گوندێکی بەعەرەبکراویان هەبوو کە تیایدا بێداربېنەوە، بەڵام زۆرێك لە گوندو گەڕە تورکمانیەکانی کەرکووك زۆر بەئاسانی خاپوور کران، بەتایبەتیش لەدەیەی نەوەدەکاندا. لەقەڵای دێرینی کەرکووکدا کە بەپێی سەرچاوە تورکمانیەکان ٩ گەڕەك هەبووە، هەرهەموویان لەگەڵ زەویدا تەختکران٢.

دیسان تورکمان ئاماژە بە خراپبوونی بژێوی ئابوورییان دەدەن، کاتێك رژێمی بەعس کار ی لەسەر تەنگەتاوکردنی ژیانیان کردووە لە کەرکووکدا.یەکێك لەو رەگەزانەی کە لەو سیاسەتەدا

---

١ -کۆبرلو ، هەمان سەرچاوە،٣٩٧-٩٨. بەڵان لەسیاقی عیراقیدا دەکرێت ئاماژە بەوشەی"مصر" و"کۆکەشی أمصار"ە بکرێت، کە بەواتای ئەو شارەی هێزی چەکدار تێیدا مۆڵیخواردووە و ئەوەش لەکاتی فتوحاتەکاندا باو بووە.

٢ -ئەغالیك و مەیدان ویدی کزلەرو ویوکاری محلە کارا تەپە لیر و تنکچلەر ونووسینگەی کوبەیسی و هەمام وزێدان (لەلای جەریس تۆمارکراوە، هەمان سەرچاوە، ل ١١).

ئەوانەی بۆ بردووە بەتایبەتی دانەمەزراندنی دەرچووی زانکۆکان بووە، کە زۆرێکیان پزیشك و ئەندازیارو زانا بوون و هەروەها رێگەشی پێنەداون لە شوێنە ناحکومیەکانیشدا کاربکەن. لەکاتێکدا وەزارەتە پەیوەندیدارەکان وەزیفەی بەپێی بڕوانامەی زانکۆیی دیاری کردووە، ئەوا لیژنەی کاروباری باکووری سەر بەحزبی بەعس خاوەنی دوا قسەی خۆی بووە لە رازاییبوون لەسەر دامەزراندن.

دەرئەنجام "هەموو ئەو تورکمانانەی کە بەشێوەی مەرکەزی لەلایەن وەزارەتەوە لەناوچە تورکمانیەکان دامەزرێنرابوون، دواتر دامەزراندنیان رەتکرایەوە"١.لەبری ئەوەش وەزیفە لەناوراست و باشووری عێراق خرایە بەردەم تورکمان و بەوەش ژمارەیان لە کەرکووك کەمکرایەوە.٢

لەبەرئەوەی تورکمان پێیوایە سیاسەتی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق فۆرمێکی سۆزدارانە دەبەخشنە رووی بوونیان لەکەرکووکداو ئەو لایەنەش بۆ بەشەرعیکردنی مافەکانیان لەداهاتوودا بەکار دەهێنن، ئەوا گرنگی ئەوە لەچیرۆکی تێکۆشانی تورکمان لە کەرکووکدا بەگشتی بەپلەی دووەم دێت، ئەویش پاش ئەو پەیوەندییە نائۆقرەو مێژووە قورسەی لەنێوان تورکمان و کورددا هەیە.

دیارە ئەو مەسەلەیەش مایەی سەرنجە ئەگەر بێتوو قەبارەی ئەو نەهامەتیانە بەهەند وەربگرین کە تورکمان لەسەر دەستی رژێمی بەعس بەتایبەتی چەشتوویانە، بەڵام سەرباری ئەوە پرسی سەرەکی لەوتاری سیاسی هاوچەرخی تورکماندا بریتییە لە پەیوەندیان بەکوردەوە.

بەکوردکردن(تەکرید)

دوا رەگەز لەدیدگای تورکمانیەوە بەتایبەتی تەرکیز دەکاتە سەر ئەو مومارەسانەی کە کورد لەساڵی ١٩٩١ەوە لەدژیان دەیکات.لەلای هەندێك تورکمانیش هەستێکی بەهێز لەدژی کورد هەیە، کە پەیوەندی بەو ماوە زۆر دیاریکراوەوە هەیە.

---

١ -جەرجس Jerjis هەمان سەرچاوە، ل١٢.

٢ -دیارە ئەم ستراتیژەش دەرهەق بەکوردو ئاشووریەکانیش جێبەجێکراوە. بەڵام بەهەمان شێوە لەگەڵ زۆربەی ئەو نووسینانەی بەم دواییانە بەپێنووسی ئەوخەڵکەی بەرەچەڵەك ئینتیمایان بۆ ناوچەکە هەیە لەبارەی کەرکوکەوە نووسراون ، ئەوا توانای هاوسۆزی لەگەڵ بارودۆخی پێکهاتەکانی تریش توانایەکی تەواو سنووردارە.



PDF 4 KURD

بەشێوەیەکی تایبەتیش زۆرێك لەتورکمان لەبڕوایەدان کە کوردانی هاوردەی نوێ لەگۆڕەپانەکەدا نەك هەر سیاسەتی دەوڵەتیان بەگەڕخستووە بۆ پتەوکردنی پێگەیان، بەڵکو دەستیشیان کردووە بە جێبەجێکردنی کۆپیەکی کوردی لە سیاسەتی تەعریب- کە بەکوردی کردنە.

لەراستیشدا تورکمان دوودڵ نین لەئاماژە کردنیان بەو نەهامەتیانەیان کەهەرگیز هیچی لەنەهامەتی کورد لەدەست سیاسەتی تەعریب کەمتر نەبووە بگرە دەبێت بەرگەی کاریگەری بەکوردکردنیش بگرن.

ئەو کێشەیە لەپەیوەندی نێوان تورکمان و کورد لۆژیکی خۆی بەدەستهێنا پاش ئەوەی هەرێمی کوردستان لەساڵی ١٩٩١ دامەزرا. زۆرێك لەتورکمان وابەستەبوون بە ناسنامەی میراتگری شەرعی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە دواتر چەندان کوشتارگەی دووبارە لەسەر دەستی کورد دەرهەقی ئەنجامدرا و پێشیان وایە هەرێمی کوردستان هەڕەشەبۆ سەر مانەوەیان دروست دەکات لەرێگەی ئەو ستراتیژانەی کە ئامانج لێی ریشەکێشکردنی تورکمان یاخود توانەوەو ملکەچکردنیانە. لەبەر ئەو هۆیە زۆرێك لەسەرکردە کوردەکان خۆیان لە تەڵزگەدا دەبیننەوە و کاتێکیش کە جموجۆڵ دەکەن "هەروەك لێیان چاوەڕوان دەکرێت" بەئاراستەی خزمەتکردن بە ئەجندەی ناسیونالیزمی کوردی ئەوا دواجار دەرفەتێکی سیاسی واتادار لەبەردەم تورکمان لەهەرێمی کوردستاندا نامێنێتەوە یاخود کاتێك لایەنە کوردیەکان جاروبار لەگەڵ بەرەی تورکمانی عێراقیدا پێکدادەدەن ئەوا مەترسیەکانی تورکمان لەترسی ریشەکێشکردن زیاد دەکات.

دەمێکیش سەرانی کورد هەوڵ دەدەن بەفەرمی ئیعتراف بە تورکمان بکەن لەرێگەی بەشداریکردنیان لە دامەزراوە خۆجێیەکانی فەرمانڕەوایدا ئەوا تۆمەتبار دەکرێن بەوەی کاردەکەن بۆ درزخستنە نێو یەکێتی تورکمان و دڵدانەوە ولایەنگریکرتنی گروپێك لەسەر حسابی گروپێکی تر.

دیارە ئەودوژمنایەتیەش خراپتربوو کە تورکیا دەستی وەردایە نێو کاروباری هەرێمی کوردستانەوە. هەرچەندە تورکیا بەدوای هۆکارێکی "رەوا"دا بۆ دەستێوەردانی لەکاروباری باکووری عێراقدا دەگەڕێت، بەڵام جگە لەهۆکارەکانی پشت ئاسایشی نەتەوەییەوە ئەوا نەهامەتی تورکمان پاساوێکی گونجاو بۆ ئەو دەستێوەردانەی دەستەبەردەکات.

### تورکمان لەهەرێمی کوردستاندا

PDF 4 KURD

هەستی دوژمنایەتی نێوان کوردو تورکمان لەدەیەی نەوەدەکاندا گەیشتە ترۆپکێکی نوێ و مەترسیدار و مەترسیەکانی تورکمان بەدامەزراندنی هەرێمی کوردستان لەدوای کشانەوەی دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراقی لەباکووری عێراق لەساڵی ١٩٩١ بەدیهات.

وەك گۆڕانکاریەکی نوێش کە لەماوەی شەوو رۆژێکدا روویدا، کورد مومارەسەی بالأدەستی خۆی لەسەر ئەو خاکەدا کرد، کە هێشتا تورکمان خۆیان بەخاوەنی شەرعی دەزانن.

بەنیگەرانیەوە تەماشاکردنی تورکمان لە ئەگەری وەرچەرخانی هەرێمی کوردستان لەقەوارەیەکی وەك دیفاکتۆوە بۆ قەوارەیەك لەسەر بناغەی یاسایی، بەبۆچوونی ئەوان کاردەکات بۆ ئەوەی شارەکانی "تورکمان ئیلی" بخاتە نێو سنوورەکانیەوە.

جوگرافیای سیاسی هەرێمی کوردستان تا ئاستێك تەرزی ئەو کێشانەی راشەدەکرد کە بەدرێژای دەیەی نەوەدەکان روویدابوو.گەورەترین گردبوونەوەی تورکمان لەهەولێردا بوو، کە لەواقیعدا پایتەختی هەرێمە- ئەو شارەی کە زۆرجار تورکمان ئاماژە بەوە دەکات کە پێگە ئیداری و ئابووریە بالأکان لەوشارەدا لەدەستیاندابووە، ئەگەر چی ئەوان دامەزرێنەری راستەقینەی نەبوون(ئاشووریەکان دامەزرێنەری شارەکەن).

لەوسۆنگەیەشەوە تورکمان بەشێوەیەکی بەرچاو دەچنە نێو ناکۆکییەوە، زۆرجاریش دەچنە کێشمەکێشەوە لەگەڵ هێزە دەسەلأتدارەکانی شارەکەدا- لەپاش ساڵی ١٩٩٦ لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرۆکایەتی مەسعود بارزانی. بەدرێژایی ئەو ماوەیەش کە لەدەیەی نەوەدەکان مابوەوە، تورکمانی هەولێر کەتبوونە نێو تەنگوچەڵەمی پەیوەندی گرانی سێکۆچکەیی- نێوان خۆیان و پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەنقەرەوە.

پەنگخواردنەوەی نێوان کورد و تورکمان بەدرێژایی دەیەی نەوەدەکان زیاتر بوو، کاتێك هەریەك لەپارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستان بەو پێیەی دوو هێزن و هەژموونی سیاسی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا سەپاندووە، هەربۆیە لەدیدی تورکمانەوە هەوڵی پەراوێزخستنیان دەدەن و کلتووریان لە ناسنامەی باوی کوردستاندا لووش دەدەن.

لەروو بەڕوو بوونەوەی ئەو بارودۆخە نوێیەشدا، لە٢٤ی نیسانی ساڵی ١٩٩٥بەرەیەکی سیاسی نوێ دامەزرا، کە پارتە تورکمانیەکانی لەخۆگرتبووە- بەرەی تورکمانی عێراقی- بە پشتیوانی لەئەنقەرەوە کە لەتەقەلای ئەوەدابوو بەپێی توانا گوشاری توند بخاتە سەر هەرێمی کوردستان.

لەنێو بەرەی تورکمانیدا هەشت ڕێکخراوی عێراقی هەن، ئەمە جگە لەوەی نوێنەرانی کۆمەڵە تورکمانیەکانی دەرەوەش بەئەندام قبوڵکراون١.

پەیوەندی نێوان بەرەی تورکمانی و پارتی دیموکراتی کوردستان پەیوەندیەکی نائۆقرە بوو، ئەو نائۆقرەییەش بەتێپەڕبوونی ساڵانی نەوەدەکان زیادیکرد.ئەو تورکمانانەی پەیوەندیان بە بەرەکەوە هەبوو گلەییان لەو گیچەڵ پێکردنانە دەکرد کە لەلایەن دەزگا ئەمنیە کوردیەکانەوە دووچاری دەبوونەوە و زۆرجاریش ئەو پەنگخواردنەوانە شێوەیەی توندی وەردەگرت.

بۆنموونە لەئازاری ساڵی ٢٠٠٠دا ڕاپۆرتی ڕێکخراوی چاودێریکردنی مافەکانی مرۆڤ دەڵێت، دەزگا ئەمنیەکانی سەر بەپارتی دیموکراتی کوردستان پەلاماری بارەگای بەرەی تورکمانی داوە لەهەولێر و ئەوەش بووەتە هۆی کوژرانی دوو کەس لەپاسەوانەکانی.

دوای ماوەیەکی درێژخایان لە ململانێی نێوان هەردولا و لەچوارچێوەیەکی فراوانتر لەپەیوەندی ئالۆزی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەنقەرە و وەك بەرپەرچدانەوەی ئەو هەڕەشەیەی کە بەرەی تورکمانی دروستی کردبوو، پارتی دیموکراتی کوردستان دەستپێشخەریکرد لە دروستکردنی ڕێکخراوی سیاسی تورکمانی پشتیوانکار لە دامەزراندنی هەرێمی کوردستان و دروستکردنی دامەزراوەکانی.

هەڵبەت زۆرێکیش لەلایەنگرانی بەرەی تورکمانی لەسەر هەقبوون کە پێیان وابوو ئەو هەنگاوە هەوڵدانێکە بۆ کڕینی بێدەنگی بەرهەڵستی تورکمان و لێکترترازاندنی پەیوەندیەکانی بەئەنقەرەوە.

لەتشرینی دووەمدا ڕابیتەی نیشتیمانی تورکمان دامەزرێنرا کە لە چوار پارت لەهەولێرو ناوچەکانی دەوروبەریدا چالاکیان هەبوو، پێکهێنرا و ڕابیتەکەش هەڵوێستی پشتیوانکردنی خۆی بۆ هەرێمی کوردستان لەزاری جەودەت نەجار- ئەندامی کۆمەڵەی ڕۆشنبیری

---

١ - ڕێکخراوی بەرەی تورکمانی عێراقی حزبی نیشتمانی تورکمانی و بزوتنەوەی سەربەخۆخوازانی تورکمان و بزوتنەوەی تورکمانی عێراقی ودامەزراوەی تورکمان ئیلی بۆ هاریکاریو ڕۆشنبیری وحزبی دادوەری تورکمانی و کۆمەڵەی برایەتی تورکمانی و یەکێتی نیشتمانی تورکمان ئیلی و کۆمەڵەی ڕۆشنبیرانی تورکمان ئیلی لەخۆگرتووە(ترکمن ئۆغلۆ Turkmenoglu هەمان سەرچاوە،١٧).

PDF 4 KURD

تورکمانیەوە راگەیاند- " یەکێتی ریزەکانی تورکمان بووەتە واقیع دەرئەنجامی ئەو دەستکەوتانەی کە حکومەتی هەرێمی کوردستان بەدەستی هێناون"١.

پارتی دیموکراتی کوردستان کە پشتیوانی لەرابیتەی نیشتیمانی تورکمانی دەکات بەو پێیەی دەنگی راستەقینەی تورکمانە، ئەوا لەبەرامبەردا بەرەی تورکمانی عێراقی وەك بوکەڵەیەکی دروستکراوی دەستی سەرانی کورد تەماشای دەکات و پێیوایە ئەو رابیتەیە بۆ یاریزانێکی سیاسی گرنگ گۆڕاوەو بوونیشی هەرچەندە لەهەولێردایەو ئەوەش بۆخۆی مایەی ناکۆکبوونە، بەڵام لەرووی کردەییەوە بووەتە هۆی لاوازکردنی بانگەشەی بەرەی تورکمانی بەوەی کە تەنیا نوێنەری دەنگی تورکمان بێت.

## پوختە

گرفتی تورکمان لە خستنە رووی پرسەکەیاندایە، کەخۆی لەبارودۆخیان لەعێراقدا دەبینێتەوە، بەهەلومەرجی ئێستاشەوە بەدەر لەوواقیعانەی لە پێشتردا هەبوون، بارودۆخێکە پەیوەستە بە بوونی گروپێك لەدانیشتوان لەسەر پانتاییەکی زەوی، بەڵام تاکەکانی ئەو گروپە لەسەرجەم سەنتەرە شارنشینە گەورەکاندا کەمینە پێکدەهێنن. تەنانەت ئەگەر ژمارەشیان بگاتە نزیکە سێ ملیۆن کەس(کەئەوەش زۆر دوورە)، ئەوا دابەشبوونی جوگرافیایان وایکردوە ئاستەم بێت بەچەشنی کورد بەشێوەیەکی عەمەلی سەرچاوەی مرۆیی خۆیان ئامادەو گرد بکەنەوە. دەرئەنجامی ئەوەش تورکمان شکستی هێناوە لەوەی کە بتوانێت بەشێوەیەکی رێکوپێك تیغی هەر هەڵبژاردنێك بکات کە ئەنجامدراون.

بێگومان تورکمان(بەتایبەتیش ئەوانەی پەیوەستن بە بەرەی تورکمانییەوە) هۆکارگەلێك بۆ ئەوە پێشکەش دەکەن، لەوانەش مانۆڕە کوردیەکان، کە ئەگەر تۆقاندنی راستەوخۆش نەبێت، بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە ئەوەیە دەنگی بەهێزی تورکمان لەهەندێك ناوەند و لەساتەوەختە یەکلاکەرەوەکاندا بەڕوونی بەخامۆشی دەمێنێتەوە.

تێگەیشتن لە کێشمەکێش لەگەڵ کورد دا تەنیا لەمیانەی ئیعترافکردنی فەرمی دەبێت بە پێگەی تورکمان لەنێو پێکهاتەکانی عێراقدا.

---

1 -Quoted in Radio Free Europe/ Radio Liberty."Iraq :Iraqi Turkmen From Coalition Organization."

ئەوەی مایەی تێبینیکردنیشە لەهەڵویستی تورکمان بەگشتی تەرکیزکردنیانە لەسەر ئەو بارودۆخەی کە لەسەردەمی عوسمانیدا تیایدا بوون، تەنانەت لەمێژووی عێراقی نوێی سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیشدا.

لەکاتی گەڕانیش بەدوای هۆکاری دوژمنایەتی نێوان توێژیەکانی تورکمان و کورددا ڕەنگە جیاوازی چینایەتی لەپشت هۆکارەکانەوە بێت.

لەراستیدا لەدەستدانی پێگەی نایاب و بەرتەسکبوونەوەی نفوز لەلایەك و رق و کینەی چینایەتیش لەبەرامبەر دەوڵەمەندێتی پەیوەست بەوپێگەیەوە، لەلایەکی ترەوە پەیوەندی نێوان کوردو تورکمانی تا ئاستێك لەباربردووە کە ڕەنگە زۆرێك لەشێکاران وەك خۆی مافیان پێنەدابێت. جگە لەوەش ناکرێت کاریگەری کوشتارگەی ١٩٥٩ لەزۆر هەڵوێستی تورکمان بەرامبەر بە کورد بەهەند وەرنەگیرێت.

کوردیش لەلای خۆیەوە متمانە بەتەواوەتی متمانە بەو تاك و رێکخراوە تورکمانیانە ناکەن، کە داوای پشتیوانی یان دەستێوەردان لەکاروباری هەرێمی کوردستان لەتورکیا دەکەن.

لەگەڵ دژواری لە قبوڵکردنی هەندێك تێزی پەرگیرانە لەدیدگای تورکمانەوە(لەوانەش ژمارەی دانیشتوان)و ئیشکالیەتی قبوڵکردن بەوەی کە ژمارەیان ئەوەندە زۆرە، تا لەتوانایاندا هەبێت تەحەددای کۆنترۆلی کورد بکەن لەهەر ناوچەیەك لەناوچەکانی هەرێمی کوردستاندا یان لەناوچە کێشە لەسەرەکاندا بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا واقیعی حاڵ ئەوەیە، کە تورکمان پێکهاتەیەکی خاوەن دەنگی بەرزەو لەتوانایدا هەیە پاڵ بەتورکیاوە بنێت بۆ ئەوەی دەست لەکاروباری عێراق و کوردستان وەربدات.

ڕەنگە لەوەش گرنگتر ئەوەبێت ئەو پێکهاتەیە لەگەڵ مەسیحیەکاندا **محەك** بێت بۆ هەڵوێستی حکومەتی هەرێمی کوردستانی دەسەلاّت رۆیشتوو لەماوەی ساڵانی داهاتوودا، ئەویش وەك هێزێك بۆ مامەڵە کردنی لەگەڵ کەمینەکانی نێو سنووریدا - جا لەکەرکووك یان لەدەرەوەیدا بێت.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# فەسڵی سێیەم

## ڕوانگەی کوردی، گەڕاندنەوەی "قودس"

ڕەنگە داواکردنەوەی کەرکووك لەلایەن کوردەوە هاوشێوەی دۆزی فەڵەستینی بێت لەتوانای بەرهەمهێنانی وتاری سیاسی گرنگ لەسەرتاپای ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوڕاستدا.بگرە کاتێك تێکئاڵۆزکاوی جیۆ- سیاسی هەردو پرسەکە بەتەك یەکەوە دادەنرێن، ئەوا ڕەنگە گۆڕانکاریەکانی پەیوەست بە هەرێمی کوردستان و داهاتووی کەرکووك لەسەرو کاریگەری ئەگەری ئەو وەرچەرخانەوە بێت کە بەئەرێنی و نەرێنی لەخاکی فەڵەستینیدا ڕوودەدات.

ئەو بەهانەگرتنەی کەئەو داواکاریە پشتی پێدەبەستێت، بەهانەگرتنێکی ڕاستەوخۆیە و لەشێوەی ئاگادارکردنەوەیەکدایە بۆ ئەوانەی کەلەداهاتوودا بیر لەسیناریۆ ئەمنیەکان دەکەوەو چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە کورد واز لەداواکردنەوەی شارەکە دەهێنێت. یەکەم، ئەو بارودۆخە ژمارەیەکی زۆرو زەوەندی مرۆڤ دەگرێتەوە، چونکە ئایندەی هەرێمی کوردستان مایەی بایەخپێدانی نزیکەی پێنج ملیۆن مرۆڤ و دانیشتوانی گشتی عێراقە کە ژمارەیان لەنێوان ٢٤-٢٨ملیۆن کەسدایە.

هەروەها ئەوەی لەهەرێمی کوردستان ڕوودەدات بەو دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی یاخود سەربەخۆییەی کە هەیەتی- کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر تەواوی دانیشتوانی کورد دەبێت،

جا لەتورکیا یان لەئێران و سوریاو قەوقازدابن یاخود تەنانەت لەشوێنەکانی دیکەی عێراقیشدا بن. خۆ ئەگەر ئەو گروپانەی دانیشتوان بەدیدەبگیرێت، ئەوا ئەو ژمارەیەی کە دەکرێت کاریگەربن دەگاتە ٢٥ ملیۆن کەسی تر.

جگە لەوەش سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی سیستمی سیاسی لەعێراقدا بەهەرشێوەیەك بێت بۆ جێکردنەوەی هەرێمی کوردستانێکی فراوانتر یاخود ئەوەی پەیوەندی پتەوتری بەبارودۆخەکەوە هەیە، ئەوا سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی سیستمی دەوڵەتانی خۆرهەڵاتی ناوڕاست تا نیشتیمانی سەربەخۆی کوردییش بچێتە ریزیانەوە، کاریگەری ڕاستەوخۆی بۆ سەر تەواوی ناوچەکە دەبێت.

ئەمانە تەنیا ئەگەر نین، بەڵکو مەسەلەکە پەیوەندی بە بارودۆخی کوردەوە هەیە کە لەئێستادا لەتورکیاو سوریاو عێراق و ئێراندا بووەتە مەسەلەیەکی زۆر گرنگ.

لەئاهەنگەکانی نەورۆزی ساڵی ٢٠٠٨ لەدیاربەکرو لە ماردین لە تورکیا بەبەشداری زیاتر لەیەك ملیۆن کەس بوو، کە ئەوەش ڕەوانەکردنی هێمایەك بوو بۆ ئەنقەرە بەوەی هەوڵەکان بەمەبەستی قەدەغەکردنی ڕێکخراوە کوردیەکان بە (پارتی کرێکارانی کوردستان)یشەوە دووچاری شکستێکی گەورە بووەتەوە.

خۆ ئەگەر ئەو ژمارەیە کاریگەری بۆ سەر هەڵوێستی دەزگا ئەمنیەکان نەبێت، ئەوا ڕاستیەك خۆی لەوەدا دەبینییەوە، کەزۆرێك لەخۆپیشاندەرەکان ڕەنگەکانی پارتی کرێکارانی کوردستانی قەدەغەکراویان پۆشیبوو، کە بەدڵنیاییەوە ئەوەش پشتگوێ ناخرێت.

لەئێرانیش هێشتا پەنگخواردنەوەی ئیتنۆ_سیاسی لەشارو شارۆچکە کوردنشینەکانی کە ڕابوونی بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی بەخۆوە دەبینێت توندە لەبەرەنگاریبوونەوەی دامەزراوەئایینیەکان و هەژموونی فارسو ئازەرەکانی سەربەوان.

لەسوریاش ڕۆژگارێکی زۆرە هەریەك لەشارەکانی قامیشلۆو ئافرین سەنتەری چالاکی نەتەوەیی کوردە- بۆیە هەردو شارەکەش جێی بایەخی دەزگا ئەمنیەکانی سوریان لەکاتێکدا شارو شارۆچکەکانی دی لەنێویشیاندا حەلەب و دیمەشق کەوتوونەتە ژێر کاریگەری داواکاری زۆری دانپێدانان بەو ژمارە گەورەیەی کورد کە لەو شارانەدا نیشتەجێ بوون١.

---

1 بڕوانە
Lowe, R.2006. The Syrian Kurds: A People Discovered . Chatham House Briefing Paper (January): London: Chatham House.



PDF 4 KURD

پاسان بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی بووەتە خاوەنی رەهەندێکی نێو دەوڵەتی و لەنێو کوردیشدا بزوتنەوەکە لەهەرەتی نوێبوونەوەدایە، ئەمە جگە لە ئاسانی لەپەیوەنیگرتنی نێوانیان و برەودان بەو پەیوەندییانە لەرێگەی هێزی جیهانگیرییەوە.دیسان لەئێستادا کورد لەدیدو ئیماندا یەکانگیرن لەوەی قوربانی ئەو زوڵمانەن کە لەسەدەی بیستەمدا دەرهەقیان کراوە.

هەرلەوسۆنگەیەشەوە لەهەنووکەدا بەبایەخەوە لەوگۆرانکاریانە دەروانن کە گەورەترین سیمبولی پرۆژەی نەتەوەیی کوردە- هەرێمی کوردستان و خەباتی بەردەوامی، ئەویش نەك هەر لەپێناو مانەوەدا بەڵکو لەپێناو پتەوکردنی پێگەی خۆی و تەحەددیکردنی عێراق و تورکیاو ئێران و سوریا و زۆرێکیش لەکورد پێیان وایە ئەوە ململانێی بوونە.

لەبەرئەوە هەرێمی کوردستان بووەتە سەنتەری کورد لەجیهاندا.سەبارەت بەم گەلە کە بەرۆژو سەعات، هەستی نەتەوایەتی لەبرەودانداپە- پرسی گرنگی ئەوەیە کە چۆن هەرێمی کوردستان لەشەری دامەزراندنی نیشتیمانی کورد دەرباز دەکات تا هێزە دراوسێکان نەیپلیشێننەوە یان کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی وازیلێبێنێت سیس بێت و بپوکێتەوە، لەکاتێکدا هێشتاچارەنووسی کۆماری مهاباد کە زیاتر لەنێو سەدەیە لەیادەری میللی کورددا بەزیندوێتی ماوەتەوەو بەچەشنی ئاگادارکردنەوەی سەرانی کوردە لەدوژمنایەتی هاوسێکان لەدروستکردنی نیشتیمانی کوردی و ئالوگۆری بەرژەوەندیە نێودەوڵەتیەکان، ئەمە جگە لەو غەدرەی لەسەردەمێکی نوێتردا لێیکراوە.١

دیدی لۆژیك بۆ بارودۆخەکە، لەگەڵ تێگەیشتنی روون لە مێژووی سیاسی نزیك، دەردەکەوێت کە گەڕاندنەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێم پێویست نییە بۆ مانەوەی هەرێمی کوردستان، بەتایبەتیش کە هەرێم بەبەشێك لەعێراقی فیدراڵی بمێنێتەوە.

دیارە کەرکوك تەنیا بۆ چەند رۆژێك نەبێت، کە لەساڵی ١٩٩١دا هێزی پێشمەرگە کۆنترۆڵی کرد، بەرەسمی بەشێك نەبووە لەهەرێمی کوردستان. بەڵام هەستی نەتەوایەتی (لەم بارەدا هەستی کوردو هەروەها نەیارانی کوردستان)یش دینامیکی ئەوە پێکدەهێنێت، کە لەتوانایدا هەبێت سەرجەم لۆژیکەکان ئاوەژوو بکات.

---

١ - بڕوانە

Eagleton, W .1963. The Kurdish Republic of Mahabad.London: Oxford University Press.

زۆر بەسادەیی کەرکووك و هەموو ئەوانەش کەلەکەرکووکدا بەچەشنی سیمبولن، لەروانگەی کوردەوە و لەپێگەی ئەو کەسانەشەوە کە پێویستە کورد لەئێستاو داهاتوودا مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، گرنگ و یەکلاکەرەوەن لەم سیناریۆیانەدا. داهاتووی کەرکووك بەو پێیەی سەنتەری ئابوورییەو لەوەشگرنگتر کە رەمزی سەروەری کوردە لەناوچەکەدا، ئەوا لەپرۆژەی ناسیونالیزمی کوردیدا کە هەوڵی زامکردنی بوونی"کوردستان" وەك واقیعێکی سیاسی و گوزراشتێکی جوگرافیایی دەدات، کەرکووك ترۆپکە.

پرسی ئایندەی کوردو بوونی کوردستان یەکێکە لەو پرسەچارەنووسسازە نەتەوەییانەی، کە لەسەدە بیست و یەکدا پێویستی بەچارەسەر هەیە.

## هەڵکشانی ناسیونالیزمی کوردی

زۆرێك لەبارەی رەچەڵەکی کوردەوە نووسراوە، بەڵام ئەوانەی نووسراون پارادۆکسن، چونکە لەلایەك شێکاری گەلێك هەن کە بەدوای بنەچەی دێرینی کورددا دەگەڕێن کە بۆ ئیمپراتۆریەتی میدەکان و بگرە بەر لە حسی و خۆرییەکان دەگەڕێتەوە. لەلایەکی تریشەوە کەسانێك هەن بەوجۆرە لێکۆڵینەوە لەسەر کورد دەکەن کە بریتین لە گردبوونەوەیەکی مرۆیی ناهاوچەشنی لەدانیشتوانی چیاکان و بەتێپەڕبوونی رۆژگارو سەدەکان بوونەتە خاوەنی یەك مومارەسەو کەلتوورو رۆشنبیری یاخود وەك یەکیان لێهاتووەو بەچەند شێوەزارێك یان زمانێك دەدوێن، کە لەچوارچێوەی گروپەلاوەکییە دیاریکراوەکانی سەر بە خێزانی هیندوئەوروپایی پۆلێن دەکرێن.

پاشان ئەوەی کە هاوبەشە لەنێوانیاندا جگە لە پەراوێزێك لەوەی کە لەگەڵ گەلانی دەوروبەریاندا کۆیان دەکاتەوە چیتر نییە.

دیارە بۆچوونی دووەمیان زیاتر لەنێوئەکادیمیستە خۆرئاواییەکاندا بڵاوە، بەجۆرێك چەمکی ناسنامە دارێژراوەکان لەپێشترو پەسەندکراوترە لەنێوەندی سۆسیۆلۆجستەکاندا.

هەرچی پەیوەستیشە بەکورد و گەشەی درەنگ وەختی نەتەوەیی و فرە شێوەزار (یان تەنانەت زمانەکانیشیان کە بەبۆچوونی ئەوانەی لەمشتومڕدان، دژی یەکانگیری پرۆژەی ناسیونالیزمی کوردییە) و دینامیکی سیاسەتی دابەشبووی نوێیان، ئەوا زۆر جار ئەو بیرۆکەیەی کە باس لەبوونی کورد دەکات وەك گەل و نەتەوەیەکی تایبەت- ئەمە سەرباری ئەوەی سەر بەو گەلانەن کە بەر لەهەزاران ساڵ لەناوچەکەدا ژیاون- رەتدەکرێتەوە ئەویش بەو پێیەی تێڕامانێکە لەلای ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەسەرەتاکان هەیە.

چەمکە نوێیەکان، کە لەپێکهێنانی ناسنامەدا لە ئیعتیبارە ئیتنیکیەکان دوور دەکەونەوەو باس لەتوانای پەیوەندیەکانی بەر لە پیشەسازی دەکەن لە سەرهەڵدانی بزوتنەوەی ناسیونالیستیەکانی سەدەی بیستەمدا، کەرەنگە ئەمە لەچەند روویەکەوە باوەڕپێهێنەر بێت بەڵام ناتوانێت راڤەیەکی تەواو بۆ ئەو جیاوازیانەی، کەهەیە لەنێوان کوردو هاوسێکانیدا پێشکەش بکات.

چونکە کۆمەڵگەوکەلتووری کوردی- بگرە تەنانەت دینامیکە سیاسیەکانیشیان دەرهاویشتەی ژینگەی شاخاوی کوردە، بەو تەحەددییانەش کە بەرزی و نزمی زەوی سەپاندوونی و ئەو ریتمەی ژیانیش کە لەناوچە بەرزەکان هەیەو کاریگەری لەسەر گەشەو کارلێکردنە ناوخۆیەکان کردووە.

هەڵبەت بەحوکمی ئەوەی ژیانیش لە سروشتێکی دژواردا هەربەتەنیا گران نییە، بەڵکو سروشتیش ئاستەنگ دروست دەکات لەبەردەم بەیەکگەیشتن و مامەڵەکردنی خەڵکەکەدا.

هاوکات ستراکچەری سروشتیی رێکخراوی سیاسی و کۆمەڵایەتی کوردی ستراکچەرێکی خۆماڵی و هۆزگەرایی ریشەداکوتراوە و بەپێی چەمکە سنووریە هەرێمایەتیەکان و ئەو وابەستەییەی کە پەیوەندی خزمایەتی دیاری دەکات دروستبووە١.

دیسان ئەو لایەنانەش لەژێر حەتمیەتی جوگرافیایدا کاریگەرییان بۆ سەر چالاکی ئابووری و ئینتیمای ئاینی و گەشەی سیاسی هەبووە، بەڵام کورد بە گۆشەگیری مایەوە، ئەویش نەك هەربەتەنیا لەگەڵ گەلانی تردا بەڵکو تەنانەت لە نێوان خۆشیاندا، ئەمە سەرباری بەردەوامبوونی زمانی کوردی بەشێوەزارە جۆربەجۆرە ناوخۆییەکان و دیسان کەمێك درەنگ کەوتن لە دروستبوونی هۆشیاریەکی نەتەوایەتی یەکانگیر لەنێوانیاندا.

گێڕانەوەی مێژوویی کورد لەبارەی کەرکووکەوە وردبینیەکەی چەندە بێت یاخود لەبەرامبەریشدا وێناکردنی تورکمان و عەرەبیش جۆراو جۆربێت- ئەوا ئاشکرایە کە لەنێو نێوەندی دەستەبژێری رۆشنبیری کورد و سەرکردە سیاسیەکان و جەماوەریشیان بەگشتی کە تینووی مەعریفەن، باوەڕوایە کە کەرکووك لەدێر زەمانەوە شارێکی کوردی بووەو ناسنامەی کوردبوونیش لەبەرامبەر ئەو نەهامەتی و تەنگوچەڵەمانەی رووداوەکان بەسەریاندا سەپاندووە خۆراگربووە، لەوانەش ململانێی عوسمانی و سەفەویەکان، کۆچی تورکمان و پەلاماری مەغۆل

1 -Bruinessen,M. van.1992.Agha,Shaikh and State:The Social and Politial Organization of Kurdstan London: ZedBooks:51



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

و سەرهەڵدانی ئیسلام یان ئەو ڕووداوانەی کە تیایدا میرنشینە کوردیەکان بەسەر ستەمی ژیارو ئیمپراتۆریەتەکاندا سەرکەوتوون.

خۆ ئەگەر ئەو ڕووداوانە وەك ئەوەی باسی لێوە دەکرێن ڕوویان دابێت یان ڕوویان نەدابێت، ئەوا هێندەی ئەوراستەیە گرنگ نییە کە ملیۆنان مرۆڤ باوەڕیان بەوەیە کە بەڵی بە کردەکی ڕوویانداوە.

کەوابوو مەسەلەکە لەوەدانییە کە تیۆرەسازە هاوچەرخەکان دەیڵێن لەبارەی دروستبوونی نەتەوەو ناسنامە لەغیابی هاوچەشنی کورد یاخود بێ بنەمابوونی فیکری بۆ چەمکەکانی ڕەچەڵەکی بەرایی و تایبەتمەندی نەتەوەیی، کەرەنگە ئەوەی ئەوان بۆی دەچن دروست بێت بەڵام بیروڕای ئەوان لەمومارەسەکرنی لەسەر ئەو بارودۆخەی کە لەکوردستان و کەرکووکی ئەمڕۆدا هەیە بێ واتایە، گرنگ ئەوەیە خودی کورد چۆن لەخۆیان و مێژوو و نەتەوەو داهاتوویان دەنۆڕن.

### هەرێمی کوردستان

پێویستە لەڕوانگەی مێژووی و جوگرافیایی فراوانترەوە لە داهاتووی کەرکووك‌و هەڵوێستی کورد لەبارەیەوە بڕوانین. ئەوەی لەعێراقی ئەمڕۆدا ڕوودەدات لەلای کورد زیاتر نییە لەوەی کەدەبوو لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا ڕووبدات- کاتێك عێراق لەسەروبەندی دروستکردندا بوو کوردی خستە نێو سنووری خۆیە.

سەبارەت بەکوردی عێراق، تراژیدیایان لەدەمجکردنیاندایە بەدەوڵەتێك کە وتارێکی ناسیونالیزمی حوکمی دەکات و خاوەنەکەشی گەلێکی ترە کە ئەویش عەرەبە، لەکاتێکدا کورد لەناوچەیەکدان کە گرنگ و یەکلاکەرەوەیە لە برەودان بەدەوڵەت لەرێگەی ئەو سامانە سروشتیەی کە هەیەتی جا بوونی ئاو یان نەوت بێت.

کورد پێیوایە کە دەبوو سەربەخۆیی بەدەست بهێنن تا لەگەڵ بارودۆخیان وەك نەتەوەیەك کە لەهەرێمێکی دیاریکراودا دەژین بگونجێت[1].هەروەها کورد ناڕازییە لەوەی بەزۆرو زاڵمانە بەعێراقەوە دەمجکراون.

---

١ - لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی بەشێوەیەکی خراپ یەکێتیی کورد لەبەریەکهەڵوەشایەوە و بزوتنەوەی ناسیونالیستی کوردیش لەو ئاستەدا نەبووکە بتوانێت پرسی نەتەوەیی بەشێوازێك پێشنیاز بکات کە ببێتە هۆی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی. جگە لەوەش تا ئیستا ئاستەمە بتوانرێت سنووری جوگرافیای کوردستان دیاری بکرێت .

سەرباری ئەوەی کورد لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقی و لەوەتەی دامەزراوە گوزارشتیان لەناڕازیی خۆیان کردووە، بەڵام ئەو هەمووارکردن وگۆڕانکارییەی لەئێستادا بەسەر سنووری ناوخۆیدا دێت چالاکیەکی کەمێك نوێیە و لەبنەڕەتدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرکەوتنانەی کە کورد لەکاتی هەڵگرتنی چەك لەدژی حکومەتەکانی عێراق لەشەستەکانی سەدەی رابردووەوە بەدەستی هێناون.

پاش ئەوەی سەرچاوەی بێزاری بوون بۆ دەوڵەت و بەر لەشەستەکانیش لە پانتاییەکی خۆجێیدا قەتیس ببوون، بەڵام لەساڵی ١٩٦١دا پەرەسەندنی بزوتنەوەی کوردایەتی بووە هۆی جاڕدانی شۆڕشی ئاشکرا و ساڵانی دواتریش لەودەیەیدا هێزی پێشمەرگەکۆنترۆڵی پانتایەکی فراوانی خاکی کرد.

بۆیەکەم جاریش لەساڵی ١٩٧٠دا لەوتاری رەسمی دەوڵەتی عێراقدا ناوی هەرێمی کوردستان هێنرا، کاتێك حکومەتی عێراقی هەوڵیدا ئاشتی لەگەڵ مەلامستەفای بارزانی و پارتی دیموکراتی کوردستان فەراهەم بکات و پاشان لەهەمان ساڵدا بەیاننامەی ئازای واژۆ کرد، کە تیایدا بەرەسمی ئیعتراف بە بوونی ناوچەی کوردی و خاوەن مافی ئۆتۆنۆمی کراوە.

ئەوەبوو ئەو ناوچەیە لە ساڵی ١٩٧٥ بە عەمەلی هەرەسیهێنا، دوای ئەوەی ئێران پشتیوانیکردنی بۆ کورد راگرت، بەڵام سەرلەنوێ لەنێو ئەو پشێویەی بەهۆی شکستی عێراق لە کوەیت سەریهەڵدابوو، ناوچەکە زیندوو بووەوە پاشانیش راپەڕینەکان بوونە مایەی هەڕەشە بۆ سەر رژێمی بەعس.

ئەو راپەڕینەی کە لەباشووری عێراق سەریهەڵدا، باکووریشی گرتەوە- راپەڕینەکە لەسەرەتادا رەمەکی بوو بەڵام دواجار لەماوەی دەیەی نەوەدەکان لە باکووردا جیابوونەوەی (هەرێمی کوردستان)ی وەك دیفاکتۆیەك لێکەوتەوە.

بە دەربڕینێکی وردتر، خودی سەددام سنووری هەرێمی کوردستانی دیاری کرد، کاتێك فەرمانیدا بەکشانەوەی فەرمانبەرانی دەوڵەت لەناوچەکەدا بەر لەوەی گەمارۆی ئابووری بەسەردا بسەپێنێت.

لەقۆناغی یەکەمدا کە لەبنەڕەتدا مەلا مستەفا بارزانی رابەرایەتی لایەنی کوردی دەکرد- بەڵێنیدا دەستکەوتێکی زۆر بەدەستبهێنێت بەڵام دواجار لەسەر پەیڤەی کەرکوك گیریخوارد، پاش ئەوەی روون بووەوە، کەرژێمی بەعس بەڵێنی خۆی جێبەجێ ناکات سەبارەت بە وتووێژکردن لەسەر ناوچە کێشە لەسەرەکان.

بەلاّم قۆناغی دووەم لەبەدیهێنانی بڕێکی گەورەتر لە مافی ئۆتۆنۆمی، کە پێشتر کورد ئەوەی بەخۆوە نەدیبوو، سەرکەتوو بوو، بەلاّم کەرکووك وەك خەونێکی بەدینەهاتوو مایەوە- نەخراوەتە سەرناوچەکەو لەگەلّ بەردەوامی لەبەکارهێنانیدا بەلّگەیە لەسەر تراژیدیای کوردو وروژاندنی هەستی هاوکاری نەتەوایەتی.

لەسالّی ١٩٩١ بەدامەزراندنی هەرێمی کوردستانی عێراق، سەرلەنوێ نەخشەی خۆرهەلاّتی ناوڕاست بەپراکتیکی کێشرایەوە، لەکاتێکدا هەرێم وەك قەرەیەکی دیفاکتۆ لەئارادا بوو، کەبگرە لە دەیەی یەکەمی ژیانیدا قەوارەیەکی ناياساي‌و نیمچە سەربەخۆش بوو، بەدەست ململانێی ناوخۆییەوە گیریخواردبوو. لەکاتێکدا دەستەبژێری سیاسی لەپێناو گەیشتن بە ئاستی راستییە ناوخۆی و هەرێمایەتیەکان لەهەولّداندابوون، هەرێمی کوردستان لەبەراییەکانیدا بەنائۆقرەیی بەئاراستەی هەلّوەشانەوەو گەڕانەوەی بۆ نێو بازنەی دەسەلاّتی ناوەندی عێراقی دەچوو١.

هەروەها لەسایەی سزا نێو دەولّەتیەکان و گەمارۆی ناوخۆیی کە رژێمی بەعس سەپاندبوونی، هەلومەرجی ئابووری لە یەکەمی دەیەی نەوەدەکاندا زۆر خراپبوو، بەلاّم پێگەو ئاستی هەرێمی کوردستان لەسالّی ١٩٩٦ گۆرانکاری بەسەردا هات.

ئەوەبوو لەگەلّ دەستپێکردنی پرۆگرامی نەوت بەخۆراکی سەر بەنەتەوە یەکگرتوەکان، کۆبۆنی خۆراك و یارمەتی پزیشکی گران بەهابەچەشنی ناوچەکانی تری عێراق روویان لەهەرێمی کوردستان کرد.بەلاّم ئەو پرۆگرامە بەواتای سیاسی پڕ بایەختر بوو چونکە کۆمەلّگەی نێودەولّەتی و رێکخراوەکانی سەر بەنەتەوە یەکگرتوەکانی ناچار کرد بەلانی کەمەوە دان بەو واقیعەدا بنێن کە لەباکووری عێراق روودەدات.

ئەوەش لەکاتێکدابوو هەریەك لە نەتەوە یەکگرووەکان و کۆمەلّگەی نێو دەولّەتی لەرووی یاساییەوە نەیانتوانی مامەلّەی راستەوخۆ لەگەلّ دەسەلاّتدارانی دیفاکتۆی کوردیدا بکەن(هێشتا بەغداد بەرپرسیاری فەرمی بوو)، بەلاّم نوێنەرانیان لەسەر زەوی جگە لە کارکردن لەگەلّ هاوشانەکانێن لەهەرێم رێگەیەکی تریان لەبەردەمدا نەبوو.

---

١ - بڕوانە

Stansfield, G. Iraqi Kurdistan: Political Development and Emergent Democracy London:Routled Cuzon.

بەوبوو ئۆفیسی حکومەتی هەرێمی کوردستان زۆر بـەخێرایی و چـالاکانە بوونـە خـاوەنی فۆرمێکی دامەزراوەیی و گەلی ناوچەکەش بەپەرۆشەوە بیریان لە داهاتوو دەکردەوە، کە رەنگە تیایدا بڕیار لەچارەنووسیان بدرێت.

لەسەرەتای ساڵی ١٩٩٧ و بەدواشـەوە، سـەرانی کـورد بەمتمانەیـەکی زۆرەوە لەهـەوڵی رێکخستنی کاروباری هەرێمی کوردستاندا بوون و هەوڵەکانیشیان بووە مایـەی ئیعترافکردنـی رەسمی بەهەرێمی کوردستان لەدەستووری عێراقدا، کە لەساڵی ٢٠٠٥ بڕیاری لەسەردرا.

بەڵام بەپێی ئەو دەستوورە تەنیا چوار بۆ پێنجی کورد لەنێو چوارچێوەی سنووری هـەرێمی کوردستاندایە، بۆیە ئـەوەش زەمینـە سـازی بـۆ کێشـەکێش خۆشـکرد، کاتێـك ئـارەزووی سەربەخۆبوونی کوردی(هەرچەندە بەشێوەیەکی رێژەیی سەربەخۆیە لەنێو سنووری عێراقدا) بەر ئارەزووی ناسیونالیزمی عەرەبی کەوت، کە ترسی لەئەگەری خواستی سەربەخۆبوونی کوردیو مەترسی بۆ سەر یەدەگی نەوتی هەیـە لەهـەر ململانێیـەکی هەرێمیـدا.لەبـەر ئـەوە زۆرێـك لەشێکاران پێیان وایە بارودۆخی عێراق لەپاش سـاڵی ٢٠٠٣، (بـەرمیلێکی تەقەمـەنی) یـە ئـــەویش بـــەهۆی فراوانبـــوونی کێشمەکێشـــی ناســـیونالیزمی و فشـــار خســـتنە ســـەر سەرچاوەکان(الموارد) و دەستێوەردانی هەرێمی لەو کەشە بارگاویـەی شـاری کـەرکووك تیایـدا دەژی١. بەڵام راستیەکیش هەیە کە ئەوەیە_ ئەو بارودۆخـەی کـە پەنگخواردنەوەیـەکی تونـد باڵی بەسەردا کێشاوە- دانەچووە بەرەو دیمەنی کارەساتبار وەك ئەوەی وێنای بۆ دەکرێت.

لەراستیشدا ئەوە پێویستی بە هەڵوەستەکردن و تەرکیز خستنە سەر ئەو بڕیارانە هەیە کـە سەرکردایەتی کوردی دەیدات، جا لەهەوڵی چارەسەریدا بێت لەرێگەی دروسـتکردنی دیفـاکتۆ لەکەرکووك و داگیرکردنی لەدەرەوەی دەستوو یاخود دۆزینەوەی چارەسـەری یاسـایی لەرێگـەی گەیشتن بەتەوافوق لەبەغدادو پاشان کـارکردن بـۆ بەشـداریکردنی کۆمەڵگـەی نێـو دەوڵـەتی بەنوێنەرایەتی نەتەوەیەکگرتووەکان.

لەدیدگای کوردەوە هیواو پێشبینیی واقیعییـان لەوەدایـە، کـەرکووك و ناوچـەکانی تـری کێشە لەسەر لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا یەکبگرێتەوە، پاشان شەرعیەتدان بە سنووری نـوێی لەچوارچێوەی دەستوورو یاساکانی دەوڵەتی عێراقی.

---

١ - بۆ ئاشنا بوون بەو شیکارییەی باس لەوە دەکات کە کەرکوك بەرمیلێك تەقەمەنییە یان نا بڕوانە:
O'leary, B.2005." Nationalities, Oil and Lank: Kirkuk and the Kirkuk and the Disputed territories." In Stansfield , G.,and Lowe,R.,(eds)The Kurdish Policy Imperative. London Chamtham House.

هەروەها کورد وایدەبینن ئەوە مافی خۆیانە پاش ئەو میراتە مێژووییەی بەهۆی داگیرکاری و سوکایەتیپێکردنەوە لەسەر دەستی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی سەدەی بیستەم گیرۆدەی ببوون١.دیارە هیچ شتێك لەو خواستەدا نویٚ نییە لەراستیدا زۆرینەی ناسیونالیتی کوردیش پێیان وایە هەلۆێستی کوردی بەوجۆرەیە کە خەباتیان لەو پێناو ئەو مافەدا لەدوای هەرەسی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییەوە بەردەوام بووە و ئەوەش لەوودوور و نزیك پەیوەندی راستەوخۆی بە سامانی نەوتی پارێزگای کەرکووکەوە نەبووە.

بگرە کەرکوك ناوچە کێشە لەسەرەکانی دیکەش، لەوانە شەنگال، مەخمور، حەمدانیە، خانەقین و بەلەدروز- کە گردبوونەوەی گەورەی دانیشتوانی کوردی تێدایە بەشێکی جیا نەکراوەن لەپرسی گەورەی کورد لەعێراقدا. بەلاّم کەرکووك بەسروشتی حالّ لەزۆر رووەوە جیاوازترە لەناوچە کێشە لەسەرەکانی تری نێوان حکومەتی هەریمی کوردستان و حکومەتی عێراقی و بەداخیشەوە زۆر بەسادەیی ئەو کاریگەرییەی کە بوونی نەوت لەپشت ئەنگێزەکانی لایەنە ناکۆکەکانەوە مومارەسەی دەکات فەرامۆشکراوە.

لەکاتێکدا شەنگال_کە هەلّکەتووی نێو پارێزگای نەینەوایە- و لەرووی جوگرافیاشەوە دوورە لە سەنتەرەگەورەکانی دانیشتوانی کوردەوە، بەلاّم رەنگە دەڤەرێکی خاوەن رەهەندی سۆزدارانە بێت لەداواکاری کوردا، لەوەش گرنگتر لەرابردوودا نەببوە جێی کێشەکەکێشی گەورە( لەبەر ئەوەی کورد لە بارێکی وەهادا نەبوو بیپەرژێتە سەر ئەوەی لەسەر ئەو ناوچە دوورەی هەلّکەوتووی خۆرئاوا، بکەوێتە ململانێوە)، کە خاوەنی سەرچاوەی سروشتیش نییە.

دیارە حەمدانیەش بەهەمان شێوەیە- کە ناوچەیەکی ترەو دەکەوێتە پارێزگای نەینەواوە- کە زۆربەری دانیشتوانەکەی کلد و ئاشوورین ئەو ناوچەیەش لە هەرسەرچاوەیەکی سروشتی بێبەشە.

لەلایەکی ترەوە، ناکرێت کەرکووك بەهەمان شێوە باسی لێوە بکرێت، چونکە شارەکەو پارێزگاکە لەسەر یەکێك لەکێلّگە زەبەلاحەکانی نەوت لەعێراقدا دانیشتووە ئەوەش جێی بایەخی ئەوانەیە کە دەیانەوێت لەچنگی کورد بەدوور بیگرن، جا هەر لەو ژمارە زۆرەی

---

١ - یەکێك لە شەقلّە باوەکانی نێو نووسینە سیاسییە کوردییەکان ئەوەیە ،کوردستان لە کۆتایی جەنگی یەکەی جیهانییەوە بەداگیرکراو دادەنرێت.

دانیشتوانی غەیرە کورد تا ئەو لایەنانەی کە حکومەتی عێراقیان پێکهێناوەو تا دەگاتە هێزە هەرێمایەتیەکان لەپێش هەمووشیانەوە تورکیا.

دیارە کورد نکۆڵی لەوە ناکات نەوت لەو هۆکارانەیە کە لەپشت پەیوەستبوونی دەستەبژێرە جیاجیاکانە بەکەرکووکەوە.هەروەها کورد دەڵێت دەیانەوێت دڵنیا بن لەوەی سامانی نەوتی بەفیڕۆ ناچێت و ئەوەی بەکاریشی دەهێنێت دەبێت بەکارهێنانەکەی لەبەرژەوەندی گشتی عێراقیەکاندا بێت. بەڵام ئەوانەی گومانیان هەیە ناتوانن ئەو توانایەی کە کورد لە دەست بەسەراگرتنی پیشەسازی نەوت بەدەستی دەهێنن فەرامۆش بکەن لەوەی کاریگەری بکەنە سەر رەوتی رووداوەکانی ئێستا و بەرزکردنەوەی داواکاریەکانی تریان لەداهاتوودا.

لەدیدی کوردەوە بارودۆخەکە تەنیا لەبوونی هایدرۆکاربۆندا خۆی نابینێتەوە، بەڵکو لەوە زیاترە و پێویستە مرۆڤ دوورتر لەپرسی نەوت بڕوانێت.چونکە کەرکووك لە زهنی گشتی کوردا رەمزێکی مەزنە.

هەروەها کەرکووك بەدرێژایی نیوسەدە زیاتر ئەگەر کەمتر نەبێت کۆڵەکەی خواستی ناسیونالیزمی کوردی بووە لەعێراقدا و لەلای کورد مەغزای خۆی هەیەو بەلایانەوە بەچەشنی "قودس" ەیان لەزۆرکاتدا "دڵ"ی کوردستانە.

بەڵام داخۆ بۆچی کەرکووك ئەو پێگەیەی لە زهنی کورددا هەیە ئەوا ئەو پرسیارە لەجێگەی خۆیدایە. ئایا هۆکارەکە نەوتە؟ زۆرێکی کورد لەشەقام و لەسەر ئاستی سەرکردایەت سیاسیشدا چاویان لە سامانی نەوتی کەرکووك بڕیوە، بەڵام مەسەلەکە پێویستی بە ئاستێکی بەرزی رۆشنبیری جیۆ- سیاسی نییە بۆ ئەوەی کە روون بێت، نەوتی کەرکووك هیچ بەهایەکی نابێت گەر توانای گەیاندنی بەبازاڕ نەبێت، کوردستانیش بەو پێیەی ناوچەیەکەو دەرچەی ئاویی نییە ئەوا هەمیشە بارمتەی دەست و ویستی هێزەکانی دەوروبەریەتی.

پاڵنەری سەرەکی پشت داواکردنی کەرکووك لەلایەن کوردەوە، دەلالەتی رەمزی قوڵی لەلای بزوتنەوەی ناسیونالیزمی کوردی لەعێراق هەیە.

جا لەبەرئەوەی کەرکووك یەکێکە لەسەنتەرەگەورەکانی دانیشتوانی کوردو بۆجارێکیش لەلایەن کوردەوە نەکەوتوەتە دەستیەوە (جگە لەو چەند رۆژە نەبێت کە پشێوی و ئاژاوە سەرتاسەری عێراقی گرتبووەوە) ئەوا پێگەی کەرکووك خەریکە لەلای کورد دەبێتە ئەفسانەو هەروەها دەشبێتە بەڵگەی کۆتایی سەرکەتنی هەوڵەکانیان لەپێناو مافی ئۆتۆنۆمی راستەقینە لەچوارچێوەی دەوڵەتی عێراقدا.

## پوختە

تێگەیشتن لە هەڵوێستی کوردی لەبەرامبەر کەرکوك ئاسانەو رووبەروو بوونەوەشی گرانە. بەجۆرێك کورد باوەڕی بە مافی مێژوویی نەگۆڕی خۆی هەیـە و پێشـیانوایە ئـەو داوکاریـەی سەبارەت بەکـەرکوك و پارێزگاکـە بـەرزی دەکەنـەوە داوایـەکی رەواو عادیلانەیـە و بـوونی تورکمان و عەرەب و ئاشووریش لـە کەرکووکـدا بـوونێکی رەوایـە بـەڵام تۆمـاری مێـژوویی دەریدەخات کە گومان لە ئەوە ناکرێت کەرکووك بەکوردی دەمێنێتەوە.

خـۆ ئەگـەر دەفتـەری تۆمارەکـانیش ئـەوە دەرنەخـەن ئـەوا هۆکـارێکی زۆرهـەن، کـە بەشێوەیەکی شێلگیرانە وەرنەگیراون، لەوانەش هەوڵی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بۆ گۆڕینی دەفتەری تۆمارەکان(سجل) یاخود گوشارێکی بەرنامەبۆ دارێژراو لەسەر دانیشتوانی کەرکووك بۆ ئەوەی خۆیان بەعەرەب تۆمار بکەن نەك بە کورد.

رەگـەزی دووەم، کەرەنگـە پەیوەندیـەکی زیـاتری بەبابەتەکەوەهـەبێت، ئـەو زوڵمـە ئابرووبەرانەیەیە کە حکومەتەکانی عێـراق ئـەنجامیان داوەو هـەروەها ئـەو بێدەنگیـەش کـە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی لەبەرامبەر دیدی کورد لە داواکردنەوەی کەرکووکـدا هـەیبووە.بۆیـە کورد لەوبڕوایەدایە گەڕانەوەیان بۆ کەرکووك و خستنەوەی شارەکەو پارێزگاکە بۆ سەر هەرێمی کوردستان هەر بەتەنیا لەگەڵ مێژووی ناوچەکەدا هارمۆنیا نابێت بـەڵکو تـەنیا رێگـەی رەواو ئەخلاقیشە.

PDF 4 KURD

# فەسڵی چوارەم

## جێبەجێکردنی ڕێسا کلاسیکییەکان

ڕوانگەی عەرەب سەبارەت بەبارودۆخی کەرکووك لە چەند ڕوویەکەوە زۆر بەتوندی ڕوو بەڕووی زەمکردن بوەتەوە، بەجۆرێك لەئێستادا هەر بەتەنیا لەعەرەب ناڕوانرێت وەك ئەوەی هێزێکی بەرپرسن لە تەعریبکردن، بەڵکو هێشتا لەزۆرکاتدا بەبۆچوونی لایەنە ناکۆکوکان لەسەر داهاتووی شارەکە، عەرەب بەسوودمەندی سیاسەتی تەعریب دادەنرێن بەوەی زەوی و کار و دەرفەتی دیکەیان لەسەر حسابی خەڵکی ڕەسەنی کەرکووك فەراهەکردووە.

هەروەها ئەرکی دەستنیشانکردنی ئەوەی کە کێ دانیشتوانی ڕەسەنی کەرکووکە دووچاری کۆمەڵێك تەنگو چەڵەمە دەبێتەوە لەگەڵ هەردوو پێکهاتەی کوردی و تورکمانی وەك یەك و ئەرکەکەش لەگەڵ پێکهاتەی عەرەبیدا دژوارتر دەبێت. بەڵام ئەو ئەرکە جگە لە تەنیا لایەنێکی "کێشەی عەرەبی" لەکەرکووکدا چیتر نییە. بۆیە پێویستە پرسێکی تر ی زۆر ئاڵۆزتر بەدیدە بگیرێت کە ئەویش هەر بەتەنیا دیاریکردنی مێژووی نیشتەجێبوونی عەرەب نییە لەناوچەکەدا و زۆرینەی عەرەبیش جا لەدانیشتوانی ڕەسەنی ناوچەکە یاخود هاوردەکان بن وایدەبینن کە لەبنەڕەتدا نابێت داهاتووی کەرکووك جێگەی بەرباسخستن بێت.

چونکە کەرکووك- وەك ئەوەی پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە- خاوەن مێژوویەکی دوورو درێژەو بەو پێیەش کە شارێکی عێراقییە ئەوا تەماهی - گۆڕینەوەی شوناس- لەگەڵ ئەم گروپی ئیتنیکی یان ئەویتریان ناکات بەڵکو موڵکی سەرجەم عێراقییەکانە.

خۆ ئەگەر حکومەتەکانی پێشووی عێراق بەدەستی ئەنقەست خەڵکانی عێراقییان لەو شارەدا نیشتەجێکردووە، ئەوا بەپێی ئەو لۆژیکە نیشتەجێبوونیان نابێتە گرفت.

بەڵام تەحەددی راستەقینە، کە پێویستە بەری پێبگیرێت هەوڵەکانی کوردە لەوێناکردنی کەرکووك بەو پێیەی لەرووی مێژووییەوە موڵکی ئەوانەو هەروەها گەڕانەوەشی بۆ سەر هەرێمە نەتەوەییەکەیان کە رۆژێك لەرۆژان ناوچەیەکی عێراقی کۆزمۆپۆلیتی بوو.

وەك ئەوەی ئاشکراشە، لەشەستەکان و دواتریشدا عەرەب وەك ئامرازێت بۆ گۆڕینی تایبەتمەندییەکانی کەرکووك وەك شارو پارێزگا گوازراونەتەوە بۆ ئەوەی لەو شارەدا نیشتەجێبکرێن و ئەوەش ببێتە هۆی سەقامگیری، هەرچەندە بۆ خۆی لەسنووری کەرکووکدا ژمارەیەك هۆزی عەرەبی بوونیان هەبووە.

لەباشووری خۆرئاواو باشووری خۆرهەڵاتی پارێزگاکەدا بنەماڵەو عەشیرەتی عەرەبی سوننی ناودار و ناسراو هەن، کە پەیوەندی بەربڵاوی خێزانییان هەیە و دەشڵێن ئەوان هاوردە نەکراون و بەتەبایی لەگەڵ هاوڵاتیانی دیکەی غەیرە عەرەبدا دەژین.

دەکرێت پاساوی لایەنی عەرەبی بۆ سێ تەوەری ناوازە شیتەڵ بکرێن، تەوەری یەکەم، خۆی لەرەوایەتی بوونی عەرەب لەکەرکووکدا دەبینێت، بەتایبەتیش عەشیرەتەکانی عوبێد و جبورو حەدید کەبوونیان عەشیرەتانەش لەپارێزگاکەداو هەروەها و رۆڵیشیان لەکاروباری شارەکەدا مێژوویەکی درێژی هەیە. هەروەها عەرەب دەڵێت گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستانی زۆرینە کورد، ئیشکالێکە لەبەرامبەر ئەو مێژووەدا.

هەرچی تەوەری دووەمیشە لەپاساوەکەیاندا خۆی لەو بڕوایەی عەرەبدا دەبینێتەوە، بەوەی کە کورد زیادەڕۆیی لە وێناکردنی نەهامەتیەکانی سەر دەستی حکومەتە عێراقییەکان دەکەن و ژمارەی راگوازراوانی کورد، کە پێویستە سەر لەنوێ نیشتەجێ بکرێنەوە گەورە دەکرێن.

پاساوی نێو تەوەری سێیەمیشیان پاساوی "نیشتمانپەروەری عیراقی"یە، بەجۆرێك کی عەرەبی کەرکووك ناڕازین لەبەرامبەر هەڕەشەکانی سەر سەلامەتی عیراق کە لەمومارەسەی "زیادەڕۆیی" سەرانی هەرێمی کوردستانەوە سەرچاوەی گرتووە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دیسان عەرەبی کەرکووك لەو بڕوایەدان پاڵنەری سەرانی کورد نەوتەو پێیان وایە کورد لەپێناو بەرژەوەندی عیراقدا کار ناکەن، بەڵکو لەپێناو بەرژەوەندی خۆیاندا کاردەکەن.

هەروەها لەبری چوونە پاڵ کوردستان، (زۆر جار عەرەب بەتەوافوق لەگەڵ تورکمان) کۆمەڵێك ئەڵتەرناتیڤی دیکە دەخەنە روو، لەوانەش مانەوەی کەرکووك وەك پارێزگایەکی عیراقی یاخود بەخشینی تایبەتمەندییەك بەکەرکووك.

بەر لەچوونە نێو شیکاری ئەو سێ بڕوبیانووەوە، پێویستە یەکەمجار روونبکرێتەوە کە عەرەبەکانی کەرکووك کێن.

دیارە ئەوانیش بەشێوەی حاڵەتی تورکمان و کورد کوتلەیەکی هاوچەشن نین‌ولەتەك عەرەبی سوننەدا ژمارەیەکی زۆری شیعە هەیە.

ئەو عەرەبانەش کە لەماوەجیاوازەکاندا نیشتەجێبوون هەڵوێست و دیدی جۆراوجۆریان هەیە لەسەر چۆنیەتی نیشتەجێبوون و کاتی نیشتەجێبوونیان لەکەرکووکدا.

دیسان هەندێك عەرەبیش لەدەرەوەی شارەکەو دەوربەری پارێزگاکەدا دەژین، کە بەزۆریش لە (ناوچەی حەویجە بەتایبەتی )چڕبوونەتەوە، کە ئەویش وەك هەوڵێك بۆ زیادکردنی رێژەی عەرەبە ناونووسکراوەکانی فەرمانگەی نفوسی کەرکووك لکێنراوە بە پارێزگاکەوە.

## عەرەبی کەرکووك

لەرۆژگارێکی دووردا کەرکووك پێنتی کۆبوونەوەو بەیەکگەیشتنی عەشایرە عەرەبە کۆچەریەکانی خۆرئاواوباشوور بووە کەلەگەڵ کوردو تورکماندا لەناوچەکەدا ژیاون.

بەر لەوەی کەرکووکیش ببێتە ناونیشانی کێشمەکێشی ئیتنیکی، پێویستە بەویژدانەوە بوترێت، کە پەیوەندی نێوان عەرەب و ئەوانیتر پەیوەندیەکی ئیشکالی نەبووە، بەڵکو لەیەك خاکدا لەگەڵ گروپەکانی تردا بۆ چەند سەدەیەك هەڵیانکردووە.

دیسان زۆربەی بەڵگەکانیش ئاماژە بەوە دەکەن، پێکهاتە ئیتنیکیەکانی کەرکووك لەگەڵ یەکتریدا بە تەبایی ژیاون بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقی‌ودۆزینەوەی نەوت لەناوچەکەدا.

بەشێکی لاوەکی لەعەرەبی کەرکووك لەچوارچێوەی پێکهاتە سیاسی- کۆمەلایەتیە تەقلیدیەکەیدا ئینتیمایان بۆ سوننی هەیە و ئەوانیش لە سێ عەشیرەتی سەرەکی پێکهاتوون،

بە هەریەك لە عوبێدوجبورو حەدیدە، ١كە تا سەردەمانێكی نزیك دێرینترین بنەماڵە عەرەبییە تكریتیەكانی كەركوك بوون، كە لەسەدەی هەڤدەیەمەوە لە ناوچەكەدا دەژین.

دیارە عەشیرەتەكانی دیكەش لەكۆتاییەكانی ماوەی دەسەڵاتی عوسمانیەكاندا روویان لەكەركوك كردووە و تا ئیمڕۆش لەحەویجەدا عەرەب بەتایبەتیش ئەندامانی عەشیرەتی عوبێد زۆرینەیان پێكهێناوە، ئەویش دوای ئەوەی لەماوەی سییەكاندا حكومەتی عیراقی نیشتەجێیكردن٢.

ئەو عەشیرەتانەو تیرەكانیان بەشی خۆرهەڵاتی تۆڕێكی فراوانی هۆزە عەرەبییە سوننەكانیان پێكهێناوە، كە لەخۆرئاوای پارێزگای نەینەواوە درێژبوووەتەوە و بە باشووری پارێزگای هەولێردا تێدەپەڕێت تا لەباشوورەوە دەگاتە كەركوك و دیالە.

بەهەمان حاڵەی كورد بەشێك لەو عەشیرەتە كۆچەریانە لەشاری كەركووكدا نیشتەجێبوون، بەتایبەتیش پاش گەشەی شارەكە لە سییەكان و بەدواوە و هەروەها سەرهەڵدانی ژمارەیەك گەڕەك لەلای خۆرئاوای شارەكەوە.

لەكاتیكدا عەرەبی رەسەنی كەركووك(ژمارەیەكی كەمبوون، كە ئەو دەم نەدەچوونە ئەو خانە فراوانەوە) بانگەشەی ئەوەیان نەدەكرد، هاوشێوەی ژمارەی كورد بن نە لەشارەكەو لە پارێزگاكەدا- بەڵكو ژمارەیان بەپێی ئاماری ١٩٥٧ نزیكەی ٤٣ هەزار عەرەب بوون بەبەراورد لەگەڵ ٤٦ هەزار توركمان و ١٧٨ هەزار كوردی.

بەشێكی تری عەرەبەكان بە (الوافدین- هاوردەكان) ناودەبرێن و ئەوانەش عەشیرەت وبنەماڵەعەرەببە سوننەكان ناگرێتەوە، كە بەشێوەیەكی ئۆرگانی بەرەو ناوچەكە كۆچیان كردووە و تیایدا جێگیر بوون و لەلایەن پێكهاتەكانی تریشەوە ئیعتراف بە شەرعیەتیان دەكرێت.

عەرەبە هاوردەكان كە حكومەتی عیراقی بەئەنقەست نیشتەجێیكردون و پاشان بوونیان (جا دركیان بەوە كردبێت یان نا) ی لەسیاسەتێكدا بەكاربردووە، كە ئامانج لێی گۆڕینی بونیادی كۆمەڵایەتی بووە تا دەسەڵاتی رژێمی بەعس لەشارەكەدا تۆكمەتر بێت.

ئەم بەشەی دانیشتوان لەبنەڕەتدا سەر بەناوچەیەكی دیاریكراوی عێراق نین، هەرچەندە زۆربەی تاكەكانی سەر بەبنەماڵە هەژارە شیعەكانی باشووری عێراقن و زۆركات لەهەشتاكاندا بەهۆی جەنگی ئێران- عێراقەوە كۆچیان پێكراوە یاخود رژێم لەناوچە گرنگەكانی باشوورەوە

---

١ - كۆمەڵەی تەنگەژە نێودەوڵەتییەكان JCG هەمان سەرچاوە، ٥.

٢ - نوری تاڵەبانی ، هەمان سەرچاوە،٣٣.

بەرەو کەرکووك رایگواستون تا نەبنە مایــەی هەڕەشــە لــە ناوچــە ئەســڵیەکانی نیشــتەجێبوونی خۆیان.

هاوکات زۆرێك لەو عەرەبە هاوردانە بەچەشنی کوردو تورکمان خۆیان بەقوربانی دادەنێن و بگرە هەندێکیشیان پێیان وایە لەبارودۆخێکی خراپتردان، چونکە کۆچکردن تەنیا رێگە چارەی بەردەمیان بووە و لەئێستاشدا تۆمەتبار دەکرێن بەوەی بەکرێگیراوی بەعس بوون.

هەڵبەت ئەوەی پەیوەستە بەسیاسەتەکانی رژێمی بەعسەوە لەدوای رووخانی رژێمی سەددام حسێن لەساڵی ٢٠٠٣دا کاردانەوەی خراپو چاوەڕوانکراوی هەبوو بۆ عەرەبە هاوردەکان.

ئەوەبوو کاتێك تورکیا ئامادە نەبوو لەباکووری عێراقــەوە پشــتیوانی لەئــەمریکا بکــات، هێزی پێشمەرگەی سەر بــەپارتی دیمــوکراتی کوردســتان و یــەکێتیی نیشــتیمانیی کوردســتان راستەوخۆ خۆیان لەهێڵەکانی پێشەوەی پرۆســەی وەدەرنــانی هێــزە عێراقیــەکان لەناوچــەکانی باشووری هێڵی کەسك و کەرکووك بینییەوە.

بەجۆرێك تەنانەت زۆرێــك لەعــەرەبــە نیشــتەجێبووەکانی پارێزگــاو شــاری کــەرکووك بــەر لەچوونی هێزی پێشمــەرگە هەڵهاتن، ئەویش لەترسی تۆڵە ســەندنەوەی کــورد کــە لەئێســتادا بەهێز بوون.

ئەوان لەوبڕوایەدا بوون، کە هێزی پێشمەرگە دەیــەوێت دەســت بەســەر هــەموو شــتێکی پارێزگای کەرکووکدا بگرێت و ئــەوەی کــە سەیریشــە هەنــدێك لــە عەرەبــە هاوردەکــان لــەو قەناعەتەدا بوون، گرێبەستی ئەو زەویانەی کە ساڵانێکی زۆرە کشتوکاڵیان تێدا کردووەو لێیدا ژیاون، لەباشترین باردا مایەی گومانن. ئەوەی جێی سەرنجە لەکەشێکیدا، کە لەرووی سیاسی و ئتینکییەوە بارگاوی بوو، هیچ بەڵگەیەك دەری ناخات، عەرەبــە هاوردەکــان لەسەردەســتی پێشمەرگە گەڕاوەکان کوشتارگەیان دەرهەق کرابێت١.

لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك شەڕ کۆتایی هات، روون بووەوە کە گەڕانەوەی عەرەبە هەڵهاتووەکان ئاستەمە چونکە خانووبەرەکانیان کورد تیایدا نیشتەجێبوون یاخود لەلایەن پێشمەرگەوە پاسەوانی دەکران.

روانگەی عەرەبی هەڵوێستی جۆراو جۆر لەبارەی داهاتووی کەرکووکەوە دەخاتە روو، کــە ئەوەش بەگشتی بەڵام بەشێوەیەکی هەمیشەیی نا، رەنگدانەوەی دابەشــبوونی نێــوان عەرەبــە

١ - رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ HRW، هەمان سەرچاوە، ٢٨.

ڕەسەنەکان و هاوردەکانیانە، هەروەها هەڵوێستە جۆراوجۆرەکان لەدوای ساڵی ٢٠٠٣وە، کەوتنە ژێر کاریگەری بەهێزی گۆڕانکاریەکانەوە.

بۆنموونە لەلای عەرەبە سوننیە دێرینەکانی کەرکوك کە خاوەنی ئەزموونی دوورو درێژن لەمامەڵەکردنیان لەگەڵ عەشیرەتە کوردیەکان و سەرۆکەکانیاندا، جۆرە پەیوەندیەکی بەرچاو لەنێوان ئەوان و سەرانی هەرێمی کوردستاندا دروستبوو، بەتایبەتیش کە هێزی سوننی هێزێکی گەورەیە کاتێك لەگەڵ عەشیرەتە سوننیەکانی باکووری عێراق بەگشتی و ئەوانەی پارێزگای نەینەواو موسڵ بەتایبەتی دەنگیان دەکەن بەیەك.

هەروەها لەنێو ریزەکانی ئەو پێکهاتەیەدا بەدیاریکراویش عەرەبەکانی باکوور کە داوای چارەسەرێکی تایبەت دەکەن لەسەر بنەمای "یەکەمجار کەرکووك".

ئەو کەسانە بەو پێیەی خەڵکی کەرکووکن لەبری ئەوەی دوای پرۆژە گەورەکانی وەك ئۆتۆنۆمی کورد یان سیستمی ناوەندی دەوڵەتی عیراقی بکەون، دیدێکی سیاسییان هەیەو کاری لەسەردەکەن.

دیارە لەنێو عەرەبە هاوردەکانیشدا دیدوبۆچوونی جۆراوجۆر هەیە، هەندێکیان دان بەوەدا دەنێن بوونیان لەشارو پارێزگاکەدا ناشەرعییە، کە رەنگە ئەوە هاندانی رێکخراوە کوردیەکانی لەپشتەوە بێت و پێیان قبوڵ بێت بەرەو زێدی ئەسڵی خۆیان بگەڕێنەوە لەبەرامبەر قەرەبووکردنەوەیەکی گونجاودا.

بەڵام ئەوانیتر هەڵوێستێکی توندیان گرتووەتە بەر و لەژێر ئالای موقتەدا سەدردا- کە دژ بە فراوانبوونی هەرێمی کوردستانە، هێزی خۆیان کۆکردووەتەوە.

ئەو هەڵوێستانەی، کە هێزەکانی پێکهاتەی عەرەبی لە کەرکووك دا وەریدەگرێت لەلاپەڕەکانی دواتردا بەرباس دەخرێن.

## کەرکووك عێراقییەو بۆ عێراقییەکانە

لەدیدگای پێکهاتەی عەرەبی کەرکووکەوە ئەوەی کە زیاتر مایەی نیگەرانییانە داواکردنەوەی شارەکەیە لەلایەن کوردەوە.بەپێی ئەم روانگەیەش کورد بەردەوام بەدرێژایی ماوەی سەدەی بیستەم لەزیادکردنی ژمارەی خۆیاندابوونو کێشمەکێشیان لەگەڵ بەغداد لەدروستکردنی ئامرازی پروپاگەندە کردندا بەکارهێناوە، کەدواجار بەو جۆرە کاریکردووە

کورد لانەوازو بێ نیشتیمانن و بوونەتە ئامانجی سیاسەتەکانی بەعس لە مومارەسەکردنی پاکتاوی نەژادیدا.

بەدیدی زۆرێك لەعەرەبی کەرکووك بەتایبەتیش عەشیرەتە سوننەیەکان، کە پێشتر پشتیوانی رژێمی پێشوو بوون، ناکرێت بوترێت کوردو بگرە تورکمانیش ئازاریان چەشتووە، لەکاتێکدا ئەو عەشیرەتانە لەئێستادا تەنگەتاووبێ بەشن‌و داوای چارەسەردەکەن.

لەکاتی هەڵوەستە کردنیش بەتایبەتی لەدەیەی نەوەدەکاندا، عەرەبی کەرکووك پێیوایە ژمارەی ئەو کوردانەی، کە راگوازراون زۆر کەمترن لەو بەدەیان هەزار کەسەی کە پارتە کوردییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن.

لەراپۆرتی ساڵی ٢٠٠٦، گروپی تەنگژە نێو دەوڵەتیەکان International Crisis Group ئاماژەی بە وتەی "عەبدولرەحمان ئەلعیسا" یەکێك لەسەرۆکانی پێکهاتەی عەرەبی کەرکووك کردووە، کە"رژێم لەماوەی ١٩٩١- ٢٠٠٣، ١١٨٥٦کوردی لە پارێزگای کەرکووك اگواستووە"، کە ئەو ژمارەیەش زۆر کەمترە لەو ژمارانەی کە زۆرجار حکومەتی هەرێمی کوردستان باس لێوەدەکات.

سەرباری ئەوەش پاساوی عەرەبی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی بە بانگەشەکردنی کورد دادەنرێت لەوەی کە قوربانین، بێئەوەی ئیعتراف بە نەهامەتی عیراقییەکانی تر بکرێت (لەنێویشیاندا عەرەب بەتایبەتیش هاوردەکان) لەسەر دەستی رژێمی بەعس.

زۆرێك لەو عەرەبانەی لەهەشتاکاندا روویان لەکەرکووك کردووە، بەویستی خۆیان نەبووە و زۆر بەسادەییش زۆرێك لە خێزانەکان جگە لەگواستنەوەیان بۆ کەرکووك رێگەیەکی تر لەبەردەمیاندا نەبووە، ب ۆیە نە مەنتقی و نە ئەخلاقییشە وەك ئەوەی ئەوان قسەی لەسەر دەکەن گرفت و دەرهاویشتەی پرۆسەی تەعریبی هەشتاکان و نەوەدەکان لە دەیەی یەکەمی هەزارەی سێیەمدا بەپرۆسەی بەکوردکردن پاداشت بدرێتەوە.

هەرلەو سۆنگەیەشەوە لەوبڕوایەدان پێیان خۆش بوو بێت لەگواستنەوەیان یاخود نا ئەوا بەپێی ئەو یاسایانەی لەو دەمەدا کاری پێکراوە مافی خۆیان بووە بگوازنەوە.

لەو روانگەیەشەوە یاسای ریفۆرمی کشتوکاڵی ساڵی ١٩٧٠، کە سنوورێك بۆ موڵکداری زەوی و زار دیاری دەکات و دەست بەسەر زۆرێك لەزەوی و زاری گەورە مەلاکەکاندا دەگرێت و یاساکانی دواتریش، کە پەیوەستبوون بەدەست بەسەراگرتنی ئەو زەویانەی کە خاوەنە ناعەرەبەکانی لەلایەن حکومەتەوە راگوازراون وزەویەکانیان چۆڵ کردووە، ئەگەر چی یاسای زاڵمانەبوون بەلاَم رێوشوێنی

باسایی بوون و زەویەکانیان لەبەرامبەر پارەیەکی رەمزیدا بەکرێداوەتەوەو بەوەش کەلێنێکیان لەئابووری کەرکووك پێ پڕکردوەتەوە و دیسان وەك هاولاتیانی عیراقییش ئەو مافەیان هەبووە١.

لەبەر ئەوە بەدیدی زۆرێك لەعەرەبی کەرکووك گەشەی کۆمەلایەتی - ئابووری لەو پارێزگایەدا روویداوە، بەوپێیەی بەشێکی جیانەبووەوەیە لەئابووری نیشتیمانی و عیراقی و دیسان بەهەمان شێوە کەرکووکیش بەشێکی جیانەکراوەیە لەعیراق.

هەربۆیە وەك عیراقی مافی ئەوەیان هەیە وەزیفە لەهەرشوێنێکی عیراقدا قبول بکەن، بەکەرکووکیشەوە.

لەسەر ئەو بناغەیەش بوونیان لەکەرکووکدا ماوە ٣٠ سال دەبێت و بەشێك لەخێزانە عەرەبە سوننیەکانیش بوونیان لەو ماوەیە زیاترو بوونێکی تەواو رەواشە.

خۆ ئەگەر عەرەب بۆ ماوەی چەند دەیەیەکدا لەناوچەکەدا دەژین ئەوا تەواو ئاوێزانی ژیانی کۆمەلایەتی و کەلتووری و سیاسی کەرکووك بوون و هیچ شتێك نییە بە ناوچە ئەسلیەکانی خۆیانەوە بیانبەستێتەوە.

لەبەرئەوە سەیر نییە کە پێکهاتەی عەرەبی لەکەرکووك بەچاوێکی دوژمنانە لەو بیرۆکەیە بڕوانن کە دەلێت کەرکووك"کوردی"یە یاخود کورد مافی ئەوەی هەیە خاوەنی شارەکە بێت لەسەر بناغەی تایبەتمەندی ئەو نەهامەتیەی لەسەر دەستی رژێمی پێشوو چەشتوویانەو هەروەها ئەو دەستکەوتانەش کە "هاوردە" یاخود عەشیرەتە عەرەبە سوننیەنیشتەجێبووەکان بەدەستیان هێناوە.

لەبەر ئەو هۆیەش زۆرێك پێیان وایە نابێت کەرکووك بخرێتە سەرهەرێمی کوردستان و ئەو پەیوەندیەی کە ئێستا لەگەل بەغداد هەیەتی پارێزگاری لێبکرێت، ستراتیژی یەکخستنی عەرەب، سوننەو شیعە، بەبەشداریکرنی تورکمان لەپرسەکەیاندا.

دیسان هەندێکی دیکەش دەیانەوێت کەرکووك لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بمێنێتەوە، ئەویش بە گۆرینی بۆ هەرێمێك.

## پێداگری عەرەب لە سەر جیاوازبوونی کەرکووك

بنەمالە عەرەبە سوننە دێرینەکانی نیشتەجێی کەرکووك و دەوروبەری پێیان وایە سەردەمانێکی زۆرە ئیعتراف بەوە کراوە کە کەرکووك بەشێکە لە عیراقی فرە ئیتنیکی،

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ١٧-١٨.

PDF 4 KURD

زۆرجاریش لەگەڵ ئاماژە کردن بەبوونی زۆرینەی تورکمان لەشارەکەدا، بەڵام بەناسنامەیەکی تەواو"عیراقی"یەوە.

خۆئەگەر زۆرێك لەو بنەماڵانە پەیوەندی تۆکمەیان بەرژێمی پێشووی عیراقەوە هەبوبێت ئەوا سەیریش نییە، کە تێڕوانینیان بۆ شارەکە لەرووی پراکتیکییەوە بەرجەستەی هەمان هەڵوێستی حکومەتی عیراقی بکات بەر لە ساڵی ٢٠٠٣.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو تێڕوانینە سەنگی خۆی هەیە نەك هەر لەنێو عەرەبی سوننەی دەرەوەی کەرکووك بەڵکو لەنێو زۆرێك لەخەڵکی کەرکووکدا.

ئەم جۆرە بیرکردنەوە باوەی نێو عەرەبی سوننە لەسەر سێ ئاست کاردەکات، کاتێك پەیوەست دەبێت بە مەسەلەی پێشنیاری چارەسەری"کەرکووکیانە" بۆ پرسی داهاتووی کەرکووك.

ئاستی یەکەم بەدیدێکی ئاستەم و مەحاڵ لەئەگەری ژیان لەسایەی دەسەڵاتی هەرێمی کوردستاندا دەڕوانێت.ئەو رەگەزە سایکۆلۆژیایە بەتەنیا کاردانەوەیەکی گرژبوو نییە لەلایەن دەستەیەك، کە بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ رووخانی رژێمی بەعسدا زیانی بەرکەوتووە، بەڵکو قەناعەتێکی چەسپیوە، کە لەسەر ئیمانێکی قوڵ بە پیرۆزیی دەوڵەتی عیراقی کاردەکات.

ئەم لایەنەش لەسەر ئاستی پراکتیکی پەیوەستە بەئاستی دووەمەوە، کە خۆی لەو قەناعەتەی عەرەبی سوننەدا دەبینێتەوە کە پاڵنەریانە بەبیرکردنەوە لەپێشنیازکردنی پرۆژەی "یەکەمجار کەرکووك".

ئەو باوەڕەی لەم ئاستەدا باوە ئەوەیە، کە سەرانی کورد بەنهێنی و نیمچە نهێنی پلان بۆ دابەشکردنی عیراق و جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی دادەنێن.

بەپێی ئەو لۆژیکەش، بۆ ئەوەی هەرێمی کوردستان ئەو ئامانجەی بەدیبهێنێت پێویستی بەفراوانبوون و خستەپاڵی کەرکووك هەیە، تا سەرچاوەی پێویستی دارایی بۆ مانەوەی کوردستانی سەربەخۆ دەستەبەر بکات.

جا بۆئەوەی ئەوە روونەدات عەشیرەتە عەرەبە سوننەکانی باکووری عیراق هەڵوێست و ئامانجی هاوبەش وەردەگرن بۆ لەخۆگرتنی ئەوەی بە پلانی فراوانخوازی کوردی دەزانن.

هەرچی ئاستی سێیەمیشە لەبیرکردنەوەی لایەنە عەرەبییە سوننەکان و پاڵپێوەنانیان بەئاراستەی پێشنیازکردنی ئەو سیاسەتەی لەسەر بنەمای"یەکەمجار کەرکووك" کاردەکات، لەو سۆنگەیەوە سەرچاوەی گرتووە، کە کەرکووك جیاوازە وەك شارێکی عیراقی کۆزمۆپۆلیتی فرە ئیتنیك، کە لەنێو خۆیاندا گشت پێکهاتە نەژادی و ئایینیەکان بەئاشتیانە و تەبایانە

چەندان سەدەیە پێکەوە دەژین. بۆیە لەبەرژەوەندی کەرکووکدایە وەك سەنتەرێکی ئۆرگانی و ئابووریی نەوتی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەکوردستان بەرێوەببرێت، تەنانەت ئەگەر ئەوە راگەیاندنی هەرێمێکی فیدراڵیش بخوازێت.

بەڵام سەبارەت بەوەی کە قەوارەیەکی لەوجۆرە چۆن حوکم دەکرێت، ئەوا ئەو پرسیارە بەکراوەیی لەبەردەم بانگهێشتکارانی ئەم پرۆژەیەدا دەمێنێتەوە.

## پوختە

هەڵوێستی روانگەی عەرەبی لەبارەی داهاتووی کەرکووکەوە زۆر لەیەکتری جیاوازن، هەندێکیان وەك پرسێکی ناوازە لەپرسی کەرکووك دەروانێت، کە پێویستی بە بایەخێکی تایبەت هەیە.

هەندێکی دیکەشیان دەڵێن هەربیرکردنەوەیەك لەکەرکووك وەك ئەوەی شارێکی عیراقی نەبێت بیرکردنەوەیەکی رەتکراوەیە، بەڵام هەردولا لەیەك بابەتدا هاوبەشن، کە ئەویش قەناعەت و بگرە باوەڕبوونەوە بەوە ئەو گۆڕانکاریانەی لەسروشتی دەسەڵاتی سیاسی عیراقدا روویانداوە گۆڕانکاریی کاتییەو ئەگەر لەئێستاشدا کورد بەهێزن ئەوا لەمنزیکانەدا رژێمی پێشوو دەگەڕێتەوە.

رەنگە ئەوە شیاوبێت بەڵام ئەو واقیعەی لە هەنووکەدا هەیە ئاماژەیە بۆ بوونی قەوارەیەکی سیاسی و سەربازی دامەزراوو بەتوانای کوردی، کە ناکرێت پشتگوێ بخرێت.

هاوکات سەرانی سیاسی عەرەب داواکارییەکان بەرزدەکەنەوە سەبارەت بەوەی، کە دەبێت پێگەیان لەکەرکووکدا چۆن بێت بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی دابەشبوونی نێوان سوننەو شیعە لەسەرتاسەری عیراقدا ناتوانن بەیەك دەنگ خواستەکانیان بخەنەروو.

لەگەڵ رۆیشتنی عەرەبە هاوردەکان لەکەرکووك، کە زۆرینەیان شیعەن، پارتە شیعەکان بەدیاریکراویش ئەنجوەنی باڵای ئیسلامی بەسەرۆکایەتی عەبدولعەزیز حەکیم ئامادەییان پیشانداوە بۆ دەسپێکردنی تاوتوێکردنی داهاتووی کەرکووك لەگەڵ کورد ئەویش لەچوارچێوەی وتارێکی فراوانتر لەبارەی فیدرالیزم لەعیراقدا.

هاوکات پارتەکانی تر بەتایبەتیش سوننەیەکانیان ئامادەنین ببنە لایەنێك لەمشتومڕی لەو جۆرەدا.

بارودۆخەکە وەك ئەوەی هەیە زۆر ئاڵۆزە لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لەسیاسییە شیعەکانیش بەتوندی لەبەرامبەر هەڵوێستی کورد لەسەر مەسەلەی کەرکووك راوەستاونەتەوە بەڵام ئەو راستیەی کە دەبێت ئیعترافی پێبکرێت، نەبوونی یەکێتی نێوان دەستەبژێرە سیاسییە عەرەبەکانە لەسەر داهاتووی کەرکووك.

دیاره داواکاری نەیارانەی سەرسەختی دژ بەکورد لەلایەن هەندێك لەسیاسییە عەرەبەکان لەبەراوردکردنیدا بە هەڵوێستی یەکگرتوو و تۆکمەی کورد، هەڵوێستێکی ناواقیعیانەیە.

PDF 4 KURD

**پێداچوونەوە**

دەکرێت لەرووی مێژووییەوە گەشەی کەرکوك لەسەرئاستی فەمانرەوایی بەگشتی و لەسەرئاستی پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی بەشێوەیەکی تایبەت بۆ سێ قۆناغی زەمەنی جیاواز دابەش بکرێت.

قۆناغی یەکەم، بەپێوەری زەمەن درێژخایانترە و دروستبوونی کەرکووك تا کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانی دادەپۆشێت.

بێگومان لەو ماوەیەدا کە هەزاران ساڵی خایاندووە، رووداوگەلێك روویانداوەو هەمیشەش ژیانی مەدەنی و ناوچە قووڵەکان لەباری هارمۆنیدا نەبوون، بەڵام لە ماوەی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکاندا، کەرکوك فرە ئیتنیکی دانیشتوانی بەخۆوە دیوەو لەگەڵ دامەزراوەکانی حوکمڕانی و دابەشکردنی بڕیادراندا هەڵیانکردوە. هەرچی قۆناغی دووەمیشە ماوەی سەدەی بیستەم دادەپۆشێت، کە لەدارِمانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەوە دەستپێدەکات و کەرکووکیش دەچێتە سەر عیراق تا بەرووخانی رژێمی سەددام لەساڵی ٢٠٠٣ دا تاج دەنێتە سەر.

لەو سەدەیەدا بەدیاریکراوی پەردە لەسەر هێڵی روو بەڕووبوونەوەی ئیتنیکیو چینایەتی هەڵگیرا ئەویش بەیارمەتی ئەو پێگە ستراتیژییەی، کە لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی نوێدا پێیدەناسرایەوە، ئەو دەوڵەتەی لەسەر بناغەی ئایدیۆلۆژیای وابەستەبوون بە ناسیونالیزمی عەرەبی دامەزرا.

هاوکات لەگەڵ گەلاڵە بوونی سیستەمی جیۆ- سیاسی لەماوەی سەدەی بیستەم لەخۆرهەڵاتی ناوڕاستدا، کاردانەوەی هێڵی روو بەڕووبوونەوە کەلەکەرکووکدا دیاردەیەك بوو بەهۆی دەستێوەردانی هێزی هەرێمیی بەدیاری کراویش تورکیاو ئێران بەرەو خراپبوون چوو.

قۆناغی سێیەمیش لەگەڵ داگیرکردنی عیراق بەڕابەرایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەساڵی ٢٠٠٣ دا دەستپێیکرد و ئەو قۆناغەش هێشتا بەردەوامە.

لەوماوەیەدا بەدیاریکراوی پێویست بوو لەسەر بڕیاردەرانی عیراقی نوێ ململانێ بکەن لەگەڵ پاشماکی بەجێماوی مومارەسەی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی سەدەی بیستەم و هەروەها مامەڵەش بکەن لەگەڵ گەلدا، کە تازە ئازادببوو لە کۆت و بەندی دکتاتۆری و چەمکەکانی ناسنامە کە لای تاکەکانی بەئینتیما تەقلیدی و بەراییەکان خەست بووەتەوە.

لەتەك مامەڵە كردن لەگەڵ کەڵەکەبوون و خواستانەدا دەبـوو بڕیـاردەران لـەعیراقی نوێـدا لەچوارچێوەی سیتمێکی نوێی حوکمڕانیدا کاربکەن، كە لەژێر کاریگەری بەهێزی نفوزی هێزە گەورەکان(ویلایەتە یـەکگرتوەکان بـەدیاریکراوی) بچەسـپێنرێت و لـەپاش جـەنگیش لەسـەر شێوەی رێککەوتن و دامەزراوەی سیاسی ودواجاریش دەستووری نوێی عیراق دەربکەوێت.

هاوکات داهاتووی کەرکوك لە گۆڕانکاریەکانی گۆڕەپانی سیاسی گۆشەگیرکرا ئەویش بەو پێیەی ئاڵۆزتر بوو، هەربۆیە سەرانی عیراقی هەندێك جار وەك بـارێکی تایبـەت مامەڵـەیان لەگەڵ کەرکوك دەکرد و دانوستانەکانیان لەبارەی ئایندەی کەرکووکەوە بـۆ وادەکـانی تـر دوا دەخست. بەڵام پاش پێنج ساڵ لەرووخانی سەددام چیتر لـەتوانادا نـەما داهـاتووی کـەرکوك فەرامۆش بکرێت، بەجۆرێك ئەو تەنگژەیەی کە لەساڵی ٢٠٠٣وە دادەمرکێنرایەوەبووە مایەی هەڕەشە نەك هەر بۆسەر لەباربردنی ئارامی باکووری عیراق بـەڵکو بـۆ سـەرتەواوی سیسـتمی سیاسی و ئەو گۆڕانکاریانەی کە ماوەی پاش ٢٠٠٣ بەخۆوە دیوویـەتی و لەئێسـتادا بووەتـە جێی بایەخ.

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# فەسڵی یەکەم

## هەڵکشانی کورد

بەهاتنی رۆژی ٩ی نیسانی ٢٠٠٣، کە کەرکووك کەوتە ژێر کۆنترۆڵی تێکەڵەیەك لەهێزی تایبەتی ئەمریکاوپێشمەرگە، مێژووی داهاتووی شارەکە بەبڕیارێکی ئەنکەرە کە پێش مانگێك دابووی گۆڕانکارییەکی ریشەیی بەخۆوە بینی.

ئەوەبوو دوای مانگێك لە سازشی خەوشدارانەی نێوان واشنتۆن و ئەنکەرە، لە ١ی ئازاردا ئەندامانی پەرلەمانی تورکیا دەنگیان دا بۆ بەرژەوەندی یاسایەك کە رێگە بە هێزەکانی ئەمریکا دەدات لەخاکی تورکیا بەرەی دووەم بکەنەوە١. بەڵام دەنگ نەدانی ١٩ پەرلەمانتار

---

١٣٤- بۆ زانیاری زیاتر لەسەر وردەکاری لایەنە ئابوورییەکان و سازشکردنەکانی پشتی پەردەوە بڕوانە بۆنموونە: Defense& Foreign Affairs Daily - راگەیەنرا کەویلایەتە یەکگرتوەکان بەدوای بەدیلی تورکیادا دەگەڕێت بۆ ئەوەی لەململانێی لەگەڵ عێراقدا پشتی پێبەستێت ،هەرچەندە ناکۆکی خۆرئاوا-تورکیای پشتگۆێخست کە خۆی لە یەکێتی سەرجەم قسەکەران بەتورکی دا دەبینییەوە.٢١(٢٥) ١٩ شوبات و هەروەها Irish Times,2003:Turkey holds out on U.S.use of bases

" تورکیا سوورە لەسەر هەڵوێستی خۆی لەدژی بەکارهێنانی بنکەکانی لەلایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە"، ٢٠ شوبات :١٢.

بەواتای ئەنجامی کۆتایی دەنگدانەکە - ٢٦٤ پەرلەمانتار لەگەڵ یاساکەو ٢٥١ پەرلەمانتاریش دژ بەیاساکە بوون- بەوەش دەنگی زۆرینەی پێویست بۆ تێپەڕاندنی پرۆژە یاساکە بەدەستنەهات.بەپێی رێککەوتنی یەکەم کە پێدەچێت لەکانونی یەکەمی ٢٠٠٣دا سازکرابێت، خاکی تورکیا بەکاردەهێنرێت بۆ چوونەژوورەی ٨٠ هەزار سەرباز لە هێزە زەبەلاحەکەی ئەمریکا بۆ نێو باکووری عێراق. لەبەرامبەریشدا تورکیا کۆمەکی ئابووری وەردەگرت و مافی بەشداریکردنی راستەوخۆی هەبوو لەدیاریکردنی سیاسەتی باکووری عێراق لەدوای جەنگ.

دەقی کۆتایی پرۆژە یاساکەش کە پێشکەش بە پەرلەمان کرابوو ریگەی بە ٦٢ هەزار سەربازی ئەمریکی دەدا بەرەی باکوور بکەنەو بۆ ئەوەش بنکە تورکییەکان بەکاربهێنن لەبەرامبەر گەرەنتی قەرزی ئەمریکی بەبەهای ٣٠ ملیار دۆلار و لەوەش گرنگتر رازیبوون بوو بە چوونە ژوورەوەی ٤٠ هەزار سەربازی تورکی بۆ نێو کوردستانی عێراق١.

رەتکردنەوەی پرۆژە یاساکە لەلایەن پەرلەمانی تورکیاوە شوێنکەوتی جۆراوجۆری لێکەتەوەو ئەوەش زیانی بە پێگەی ستراتیژی تورکیا گەیاند لەناوچەکەدا.هەڵبەت شتێکی بەڵگەنەویستی بوو کە واشنتۆن لەدەرئەنجامی دەنگدانەکە بێزار بێت.

پاش ئەوەی رێگەی نەدرا بە فیرقەی چوارەمی پیادەی خاوەن قەڵغانی چڕوپڕ لەبەکارهێنانی کەنارەکانی تورکیا، کەبۆماوەی دوو هەفتە لەسەر کەشتییەکان مابوونەوە، ویلایەتەیەکگرتوەکان ناچار بوو پەنا بۆ پلانێکی بەدیل بەرێت و ئەوەش کاری هێزی کۆماندۆزی دەخواست لەگەڵ هێزی پێشمەرگەدا (بە فەرماندەیی ئەمریکا) ئەوەبوو دواجار ١٠٠٠- ٢٠٠٠ سەربازی لەلیوای ١٧٣ی مجەوقەل بەکارهێنرا.

---

ئەمە جگە لەرەهەندی ئابووری کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەگەڵ ئەنقەرە سازشی لەسەر دەکرد لەبارەی وردەکاری شتی سەخیفی وەك ئەوەی کە کێ هەقی تێچوونی ئەو کاردی ناسنامانە دەدات کە سەربازەکان هەڵیانگرتووە یان دەبێت ئەمریکا چەند پارەی بەنزین بدات لەماوەی مانەوەی لەتورکیادا. بۆ زانیاری زیاتر بروانە:
Richburg,K.B.and P.Slevin"Turks Near Deal Given U.S. Access To Bases, Aid Pact Would Open Northern Front in War." The Washington Post, 22February:A01

١٣٥- بڕیاربوو ئەو هێزە تورکیاییە مافی چاودێری پرچەککردنی سوپای ئەمریکا بۆ هێزە کوردییەکان و دامەڵینی ئەو چەکانەش لەدوای کۆتایی هاتنی پرۆسە جەنگیەکان پێیبدرێت . بۆ زانیاری پتر بروانە:- Cockburn, P.2003."Iraq Crisis :
Turky Close to Agreeing Deal With American Military. The Independent,25 February:5.

لەگەڵ بوونی ٣٠٠٠ سەرباز لە سەر خاکی باکووری عێراق و راوەستانی شەڕ ئەستەم بوو هێزەکانی ئەمریکا کۆنترۆڵی ئەو رووداونە بکەن کە لەشارە گەورەکانی باکوور روویاندا- بەتایبەتیش لە موسڵ و کەرکووك. لەبەرئەوە لەرووی لۆجستییەوە مەحاڵ بوو ئەو بەڵێنە جێبەجێ بکرێت کە ویلایەتە یەکگرتوەکان دابوویە تورکیا بەر لەجەنگ سەبارەت بە" رێگریکردن لەبەلێشاوچوونی دانیشتوان بەرەو کەرکووك و موسڵ "لەکاتی داگیرکردنی ناوچەکەدا ١.

تورکیا لەقۆناغە جیاجیاکاندا بەشێوەیەکی زارەکی پابەندبوونی هەردو پارتە کوردییە سەرەکییەکەی مسۆگەر کردبوو بەوەی کەهیچ کامیان لەیەك لاوە نەچنە کەرکووکەوەو کاریش بکەن بۆ رێگرتن لە"جوڵەی پەنابەران و کۆچپێکراوان بەشێوەیەکی رەمەکی"٢.پاش ئەوەی تورکیا تواناى نەما بەسەر کاریگەری راستەوخۆی رووداوەکانەوە پەنای برد بۆ هەڕەشەو گورەشەکردن بەڵام دواجار گشت هەڕەشەکانی نەزۆك بوون سەبارەت تێپەڕاندنی ئەو هێڵە سوورەی کە تورکیا دایناببوو.

بۆنموونە ئەوە دەوترایەوە کە دیپلۆماتکارێکی باڵای تورکی وتبووی "نەرمێتی" لەهەڵوێستی تووکیادا نانوێنرێت وهۆشداری ئەوەیدابوو تەنانەت کەجموجۆڵی هاوڵاتیانی مەدەنی بە ئیستفزاز دادەنرێت.

هەروەها گەورە بەرپرسێکی تری سەربازی تورکیا زۆر لەوە زیاتر رۆیشتبوو، کە وتبووی هەر پێشمەرگەیەکی کورد بۆ سەعاتێك لەو دوو شارەدا بمێنێتەوە ئەوا " روو بەرووی بەرپەرچدانەوەی سەربازیی دەبێتەوە" ٣.

هەڵوێستی تورکی لە١٠ی نیساندا بەشێوەیەکی بەرچاو لاوازبوونی پێوە دیاربوو، کاتێك کەرکووك بەبێ بەرگریکردن بەیاوەری هێزە تایبەتەکانی ئەمریکا کەوتە دەست پێشمەرگەکانی

---

136-Boulton, L.2003."U.S. and Iraqi Groups in Deal to Prevent Chaos in Northern Iraq." The Financial Times, 19 March:3.

١٣٧- بۆنموونە بڕوانە کوردستانی نوێ:- Kurdistan Nuwe( BBC Monitoring Middle East).2003."Iraqi PUK leader says Kurdish forces will not enter Kirkuk Mosul" "رابەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەعێراق دەڵێت هێزی کوردی ناچنە نێو موسڵ و کەرکوکەوە" ٢١شوبات ٢٠٠٣( Lexis Nexis)

3 - Pan.P.P.2003."Turkish Offcials Back Away From Threats to Invade Northern Iraq." The Washington Post,12April:A23.

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانەوە و راگەیاندنی (ی.ن.ك)یش رایگەیاند: چوونە ناوەوەی پێشمەرگە بۆ بەپیرەوەچوونی سەرهەڵدانی خۆرسکانەی"راپەڕینی سەراپاگیرییە لەدژی رژێمی بەعس"١.

لەو سەروبەندەشدا سەرچاوە سەربازییەکانی ئەمریکا باسیان لە"راپەڕینی فرە نەژاد " دەکرد کە تیایدا کوردو تورکمان و عەرەب و مەسیحییەکان بەشدارن"٢.

بەڵام بەپشتبەستن بە وەی لە رۆژنامەی تایمز- Times دا هاتووە، چوونە ناوەوەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بۆ نێو شاری کەرکووك بەسەرکەوتووانە پلانێکی وردی بۆ دارێژراو بوو"کە شیاوە ببێتە سیناریۆیەك لە سیناریۆکانی هۆلیۆد، چونکە ئەمریکاییەکانی هەڵخەڵەتاندو بە تورکەکان پێکەنی و گزیشی لە عیراقییەکان کرد٣".

هەروەها دەشیزانی کە دەبێت وەك دیفاکتۆیەك کۆنترۆڵی کەرکووك بکات و هەڕەشەی تورکیاش پشتگوێ بخات. ئەوەبوو رۆژی پێنج شەممە لەخۆوە راپەڕینی خۆرسکانە، کە هاوکاتبوو لەگەڵ پاشەکشەی یەکە عێراقییەکان سەریهەڵدا٤. ئاشکرابوو کە"(ی.ن.ك) ئامادەییەکی تەواوی هەبوو بۆ کەوتنی کەرکووك. لەماوەی رۆژێکدا نزیکەی ١٠ هەزار پێشمەرگە و بەدواشیدا یەکەی پۆلیس لەناوچە جیاجیاکانی ژێر دەسەڵاتی یەکێتیی لەهەرێمی کوردستان چوونە شارەکەوە.

هاوکات سەرکردایەتی حزبەکە دەستپێشخەریکرد بە دامەزراندنی بارەگای پرۆسەکانی لە بینای ئەنجوومەنی شارەوانی و دیاریکردنی سەرۆکەکەی و دەستیشکرا بە دابەشکردنی کارتی "سەلامەتی هاتوچۆکردن" بەسەر گشت هاوڵاتیانی عیراق لەسەر شێوەی کارتی ئەندامێتی لە (ی.ن.ك)دا ٥.

بەوتەی هوشیار زێباری سەرکردەی پارتی دیموکراتی کوردستان چوونە نێو کەرکووکەوە هەنگاوێکی یەکلایەنە بووە لەلایەن یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کە ئەمریکاییەکانی بێزارکرد٦.

---

1 - KurdSat TV(BBC Montoring Middle East).2003." Iraq Kurdish PUK TV reports capture of Kirkuk." 10 April(LN).

2- M.orris, H.2003."U.S.Solers Begin to Replace Peshmerge in Kikuk." The Financial Times,12 April:2.

3 -Llyod,H.2003."Kurdish ploy brought early end to looting and violence." The Times,12 Apirl:4.

4 - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

5-Cockburn.P.2003."The Iraq Conflict: Kurdish Victory Provokes Fears of Turkish. Invasion: The Battle of Kirkuk". The Independent, 11 Apirl:4

لای خۆشـیەوە مەسـعود بـارزانی سـەرۆکی (پ.د.ك) بێزاربـوونی خـۆی لەپێشـێلکردنی بەرچاوی ڕێککەوتننامەکە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکان پیشانداو ڕایگەیاند"ئێمە پابەندبووین و نەچووینەتە ناوەوە تا ناسنامەی کەرکوك نەشێوێت، بەلاّم ئەو چوونە ناوەوەیە کـە ڕوویـدا وایلێکردم ترسم لە داهاتووی کەرکوك هەبێت"١.

پێناچێت ڕێککەوتنێکی ڕوون هەبێت لەنێوان چاودێران لەسەر قـەبارەی تالاّنکـاری و ئـەو توندوتیژییەی هاوکاتی ڕووخاندنەکە بوو.هەندێك لەڕۆژنامەنووسان کە لەو شوێنەدابوون، باس لە"ئاژاوە" و دوو ڕۆژ لە "تالاّنکارییەکی مەبەستداروپلان بـۆ داڕێـژراو دەکـەن" کـە لەسـەر دەستی کەسانی کورد ئەنجامدراون.

هاوکات ڕاپۆرتەکان زیاتر باسیان لەوروژاندنی میلشیا چـەکدارییەکانی سـەر بـە سـەرجەم پێکهاتە نەژادیەکان کردووە کە شارەکەیان تالاّنکردووە، ئەمە جگە لە گۆڕانی"خۆشـی بـۆ تینوێتی نەژادی بۆ خوێن".

لای خۆیەوە وتەبێژی بەرەی تورکمانیی عیراقـی هێـزی پێشـمەرگەی سـەر بـە یـەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی تۆمەتبار کرد بەوەی "کوشتارگە" دەرهەق بە تورکمانی شارەکە ئەنجام دەدات و لەهەمان کاتیشدا "ئەحمەد مرادلی" نوێنەری بەرەکە لەتورکیا ئەندامانی (ی.ن.ك)ی تۆمەتبار کرد بەدەستدرێژی و تالاّنکردنی "تۆماری نفوس و تاپۆو بەڵگەنامەی موڵکـدارێتی، کە بوونی تورکمان لەکەرکوك دەسەلمێنن"٢.بەلاّم ڕێکخراوی چـاودێری مافـەکانی مـرۆڤ کـە نوێنـەرانی لـەو توێژەرانـە بـوون کـە لـەکاتی ڕووخانـدا لەکـەرکوك بوونیـان هـەبوو،

---

1 - Williams, D.2003."Kirkuk Seize Oil Hub in Norther Iraq." The Washington Post,11 April: A01.

2- ڕۆژنامەی ئەلحەیات (BBC Montitoring Middle East)،٢٠٠٣. سەرۆکی پـارتی دیـموکراتی کوردسـتان لـەبارەی تالاّنکاری لەبکوری عێراق و بوونی ئەمریکا، ١٤ نیسان (LN).

3- Vick, k., Vogel.2003."Kurds's Looting Sweeps Across Liberated Kirkuk;U.S. Forces Take Action Late in Day."The Washington Post ,12 April:A23.

4- Daraghi, B.2003."Ethnic tensions theaten hopes for peace in Kirkuk." The Washington Times,13 April: A05.

5- Taylor,C.2003."Euphoria Gives Way to Ethnic Lust." The Ausralian,14April:14.

1-Anatolia.2003."Turkmen Front's Muratli Says PUK Entered Karkuk Disregarding Commitments."10April(World News Connection(WNC).

2- Human Rights Watch.2004."Claims in Conflict: Reversing Ethnic Cleansing in Northern Iraq."16(4)(E).August:50.

3- NTV,(BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq:"No systematic attacks" against Turkmens in Kirkuk."13 Apirl(LN)

هەڵسەنگاندنێکی وردتریان کردو رایانگەیاند"ئەو سەردەستدرێژیانەی کە چەکدارانی کورد ئەنجامیانداوەوچاوپۆشی لێناکرێت سروشتێکی دیاریکراویان هەبوەو روونیش نییە، کە ئاخۆ رەزامەندی رەسمی سەرانی کوردیان بەدەستهێناوە.

لەراستیدا تەنیا ئاماژە بە چەند کردیەکی کوشتن و دەستدرێژیکردنی تر کراوە، کەرەنگە سەرانی کوردیش_لەژێر گوشاری هاوپەیمانە ئەمریکاییەکانیاندا هەنگاوی کارایان نابێت بۆ ریگرتن لەروودانی دەستدرێژی فراوانتر کە هێزەکانیان ئەنجامی بدەن١.

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانیشە تیمێکی ١٥ کەسی لەچاودێرانی تورکیایی گەیشتنە هەمان دەرئەنجام و لەراپۆرتەکەیاند ئاماژەیان بەوە داوە:"هیچ جۆرە دەستدرێژییەکی پلان بۆدارێژراو لەدژی تورکمان لەئارادا نەبووە" و تۆماری تاپۆو نفوسیش "لەناونەچوون بەڵام هەندێکیان رووبەڕووی تاڵانکاری بوونەتەوە" وژمارەیەکی زۆری پێشمەرگەش بەفەرمانی جەلال تاڵەبانی رابەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەشارەکە پاشەکشەیان کردووە٣. کاتێکیش لە ١٢ی نیسان هێزەکانی ئەمریکا لەلیوای ١٧٣ی مجەوقەل چوونە شارەکەوە، کۆتایی بە خراپترین تاڵانکاری هات وهێمنییەکی بەئاگا باڵی بەسەر شارەکەدا کێشا.ئەوەبوو هێزەکانی ئەمریکا کە بەرەسمی کۆنترۆڵی شارەکەیان کردبوو، رووبەڕووی ئەرکێکی گرانبوونەوە، کە ئەویش نیوەندگیری بوو لەنێوان لایەنە ناکۆکە خاوەن داواکارییە جیاجیاکاندا، ئەمە جگە لەجیاکردنەوەی نێوان هێزە ئەمنییە شەرعی و ناشەرعییەکان و هەروەها گەشبینییەکی تائاستێك لەرادەبەدەر یش بۆ دامەزراندی "ناوچەی دامالڕاو لەچەك"لە کەرکووکدا.

ئەفسەرێکی لیوای ١٧٣ تەنگەتاوی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەوردی کورت دەکاتەوە کاتێك کە وتی" ئەوە تەنیا ململانێیە لەپێناو دەسەڵاتداو ناکرێت بکەوینە نێو چنگییەوە"٢.

لەماوەی کەمتر لەهەفتەیەك بارودۆخەی شارەکە ئاسایی بوەوە. لە١٣ی نیساندا رۆژنامەی واشنتۆن پۆست لەراپۆرتێکیدا بڵاویکردەوە، هێزە کوردییەکان کۆتاییان بەپاشەکشەکردنیان لەشارەکەدا هێنا.لە١٥ی نیساندا راگەیاندنی پارتی دیموکراتی کوردستان بڵاویکردەوە، کە نەخۆشخانەکان بەشێوەیەکی ئاسایی کاری خۆیان رایی دەکەن و تەزووی کارەباش بۆ زیاتر

2 -Dilanian, K.2003."Playing Diplomat for aDay: AN.J Army Captain out to Secure a Compound on Kurdish Turf Ended up a Man in the Middle." The Philadelphia Inquirer,13 Apirl:A16

لەباوەڕاستی دانیشتوانی شارەکە گەڕێنراوەتەوەو ئاویش بۆشارەکە بەردرایەوە١. لە١٧ی نیساندا ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا سەرپەرشتی پێکهێنانی ئەنجوومەنێکی کرد، کە نوێنەری سەرجەم پێکهاتەکانی شارەکەی لەخۆگرتبوو بۆیارمەتیدانیان لەبەڕێوەبردنی خزمەتگوزاریەکانی شارەکە٢.

لەسایەی نەبوونی داتای باوەڕپێکراوی دانیشتواندا ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا پشتی بە تەنیا بژاردەیەك بەست کە لەبەردەمیدا بوو ئەویش پێکهێنانی ئەنجوومەنەکە بوو لە٢٤ ئەندام و هەروەها دابەشکردنی کورسییەکانی ئەو ئەنجوومەنە بەشێوەیەکی یەکسان بەسەر هەر چوار پێکهاتەی سەرەکی شارەکەدا( کوردو تورکمان و عەرەب مەسیحی)٣.

وادیاربوو لانی کەم لەرووکەشدا کەرکوك سەرکەوتوو بوو لە بەدوورگرتنی لەخوێنڕشتنی ئیتنیکی کە زۆرێك بەر لەجەنگ چاوەڕوانیان دەکرد.بەلاّم ژێر بەژێر، چەند رووداوێکی نیگەرانکەر بەپێچەوانەی ئەوەوە کەوتنەوە. لە١٤ی نیساندا ئاژانسی هەوالّی خۆرهەلاّتی ناوڕاست بلاّویکردەوە، هێزی پێشمەرگە تورکمانێکی خەڵکی کەرکووکی لەگەڵ منداڵە حەوت سالاّنەکەیدا کوشتووە٤. لەهەمان رۆژدا پێنج عەرەب و سێ کورد لەپاش پێکدادانێکی نێوان هێزە کوردی و عەرەبیەکان لەقەزای حەویجە کە بەمۆڵگەی عەرەبە سوننەکان دادەنرێت لەباشووری خۆرئاوای شاری کەرکوك کوژران٥. لەوسەروبەندەدا رۆژنامەی ئینەتەرناشیونالّ هیرالّد تربیون لە١٥ی نیساندا بلاّوکرایەوە، کە بەرپرسانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە گوندێکی دەرەوەی داقوق فەرمانیانداوە بەدەرکردنی عەرەبەکان لەناوچەکەدا٦.

لەراستیدا زۆربەی ئەو دینامیکانەی کە دەبوو ئاراستەی داهاتووی کەرکوك دیاری بکەن بەهەفتەیەك لەپاش هەرەسەی شارەکە روونبوونەوە. ئەوەبوو تورکیا خۆی دوورە پەرێزگرت لە دیبەیت(مونازەرە) لەبارەی ئایندەی شارەکەوە، هەروەك رۆژنامەی ئینتەرناشیونالّ هیرالّد

---

1 -Brayati.2003."Iraq:Kurdish Paper Reports KDP Helping Kirkuk Hospitals to Continue Work."19 April (WNC).

2 -MENA.2003."Calm begins to return to Iraq city of Kirkuk." 19 Apirl(WNC).

-بێگومان دەزانین کە وشەی مەسیحی ئاماژە نییە بۆ وەسفی ئیتنیکی بەلاّم بەگشتی هێما کردن بۆ کلدو ئاشووری و ناوبردنیان 3بەمەسیحی تەنیا لەبەر ئاسانکارییە.

4 -MENA(BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq: Kirkuk Tense After Kurdish Forces Kill Two Turkmens."14 April(WNC).

5-Cockburn ,P.2003."The Iraq Conflct: Tensions Boil Over Between Kurds and Arabs in North." The Independent.14April:4.

6 -Chivers, C.j.2003."Iraqi Arabs are Driven from Homes by Kurds." The International Herald Tribune, 15April:3.



PDF 4 KURD

تربیونیش ئاماژەی پێدابوو کە جەنگ زۆر لەسەر سوپای تورکیا دەکەوێت. هەروەها فەرماندەکانی ئەو سوپایەش، کە بەدرێژایی نیو سەدەیە پەیوەندیەکی تایبەت بە ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە دەیانبەستێتەوە، ئەو پەیوەندیەیان لەدەست نەداو بگرە دەرفەتی جێپکردنەوەی ستراتیژی خۆیان لەباکووری عیراق مسۆگەرتر کرد ١.

هاوکات هێزی پێشمەرگەی سەر بە (ی.ن.ك) بەئاشکرا ئەوەیراگەیاندبوو، کە کەرکووك بۆ تورکیا هێڵی سوورەو نابێت یەکلایەنەو بەژمارەیەکی زۆر بێتە ناو شارەکەوە، دیارە لەرووی پراکتیکیشەوە وەك شێکارێکی ستراتیژی ئاماژە پێدابوو"تورکەکان زۆر دەستخەرۆ بوون"٢.

دواکەوتنی تورکیاش لەسەرەتاوە لەبەرپەرچدانەوەی ئەو سنوور بەزاندنە بەرچاوەی کوردی عیراق کردبوویان وایکردبوو لەراستگۆیی هەر هەڕەشەیەکی تورکیا کەمبکاتەوە کە لەداهاتوودا بیکات.

لەبنەڕەتدا هەرپێشوەخت و زوو تورکیا توانای ئەوەی نەبوو پەنا بۆ تۆقاندن بەرێت لەرێگەی بەکارهێنانی چەکەوە تا کاریگەری لەسەر رووداوەکانی کەرکووك هەبێت. دیسان بژاردەی تورکیا لەنائامادەیی بژاردەکانی تردا- بەکارهێنانی بەرەی تورکمانی وەك هێزێکی نوێنەرایەتیکردنی بەرژەوەندیەکانی تورکیا و بەرەنگاریبوونەوەی خواستەکانی کورد- بەڤیتۆی پەرلەمانی تورکیا دووچاری گورزێکی کوشندە بووەوە.

بەرپرسانی سەربازی و مەدەنی ئەمریکایی هەر لەسەرەتاوە بەدوو دڵییەوە مامەڵەیان لەگەڵ بەرەی تورکمانی دەکرد و پێیان وابوو کە ناتوانێت ببێتە بریکاری بەرژەوەندی سیاسەتی دەرەوەی تورکیا٣. هەروەها بانگەوازە دووبارەکانی بەرەی تورکمانیی عیراقی بۆ سوپای تورکیا بۆ دەستتێوەردانی سەربازیی لەپاش هەرەسی راستەوخۆی کەرکووك و ئارەزووی ئەو بەرەیە لە بزواندنی پەنخواردنەوە ئیتنیکییەکان کە زیادەرۆیی بە بانگەوازەکانیەوە هەبوو،

---

1- Cowell, A.2003." Turkey's Stand Against the War in Iraq Costs it Influence in Region." The International Herald Tribune,19 April:4.

2- Pran." Turkish Offcials Back Away F rom Threats to Invade Northern Iraq." Op.cit

١ - بەواتایەکی وردتر بەرەی تورکمانی درێژکراوەی بەرژەوەندی سیاسەتی دەرەوەی کەرتێکی دیاریکراوی دەوڵەتی تورکی بوو. هاوکات هێزە تایبەتەکانی تورکیا بەرەی تورکمانی لەساڵی ١٩٩٥ دروستکردو دواتر لەلایەن هێزە چەکدارەکانی تورکیاوە لەئەستۆ گیرا.

نەیانتوانی ئاستی میللی بوونی یاخود ناووناوبانگی وەك هێزێـك کـە کـار لـەپێناو ئـارامی و هێمنی کەرکووکدا دەکات، بەرزبێتەوە.

تەواو دژ بە چانسـی لەبارچـووی تورکیـا، کـورد لەجەنگـدا وەك هێزێکـی هەژمونگـەر لەکەرکوك هاتە دەرەوەو بەو پێیەش کـە تەنیابەشـداربوویەکی نـاوخۆیی بـوون لـە پرۆسـەی "ئازادی عێراق"دا، کورد هاوپەیمانێکی سروشتی هێزەکانی ئـەمریکا بـوون هەربۆیـە لەگـەڵ راوەستانی شەڕو ئەو بارودۆخەی هاتە ئاراوە هێزەکانی ئەمریکا پەنای بۆ بردن.

ئەوەبوو دامەرزاوەی حوکمڕانی لەکەرکووك هەرەسیهێنا هەروەك چۆن لەزۆربەی شـارەکانی تردا ئەوە روویداو بەرپرسانی ئیداری لەبەعسییەکان لەترسی تۆڵە سەندنەوە بە پۆل بەئاراستەی باشوور قوچاندیان.دواتر هێزە کوردییەکان بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی و لەگەڵ ئەو ئەزموونەی لەدە ساڵی حوکڕانییان لەهەرێمی کوردستان بەدەستیان هێنابوو پێشڕەوییان کرد و هێزی ئاسایشـی لێوەشاوەو باوەڕپێکراودەستەبەرکراو تەنیا بژاردەی مەنتقیش ئەوەبوو، کە کورد لـەحوکمڕانی شارەکە پێشەنگ بێتو کۆنترۆڵی بکات.هەرچـەندە بەرپرسـانی ئـەمریکایی هـەوڵی زۆریانـدا بۆئەوەی لەمامەڵەکردنیان لەگەڵ پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی کـەرکووك هاوسـەنگ بـن، بـەڵام زیاتر وەك پێویستییەك پشتیان بەکورد دەبەست.

هەروەها ئەو بارودۆخەش کە راستەوخۆ لەپاش جەنگ هاتە ئاراوە دەریخست ئـەو ئەرکـەی کەخراوەتە ئەستۆی نزیکەی دوو هەزار سەرباز لـە لیـوای ١٧٣ ی مجەوقـەل بـۆ ئیـدارەکردنی شارەکەچەندە گران و ئاڵۆزە.

دیسان جێگیر کردنی لیوای ١٧٣ لەژینگەیەکی نامۆو نـەیار کـە چـەندان گروپـی نـاکۆك بەیەکتری لەخۆگرتووە ئەرکێکی ئاستەمە، لەبەر ئەوەی دەبێت ژیانی ئابووری زیندوبکرێتەوەو سەر لەنوێ کۆڵەکە ماددییەکان و چوارچێوەیەکی سیاسیش لەبنەڕەتـەوە بـۆ شـارەکە بنیـات بنرێتەوە.

لەهەمان کاتدا دەبوو ئەو هێزە جیاوازی بکات لەنێوان دۆست و دوژمن راستی و خەیاڵ لە "گێڕانەوەی تێکئاڵۆزکاو"ی پێکهاتەکانی شارەکەدا.

دواجار پرسی کەرکووك بەهەموو ئاڵۆزیەکانیەوە لەگەڵ چرکە ساتی لاوازبـوونی دەسـەڵاتی رژێمی پێشوودا دەرکەوت. ئەو وەسـفەی کـە رائیـد گـرای Major Grey لـەبارەی ململانێـی کەرکووك و سروشتی بارودۆخی شارەکە کردبووی گوزراشتێکی ناوەزابوو کە وتبووی ململانێکە " شتێك لە شەڕە دەمانچەو شەڕە چەقۆو شتێك لەگەمەی شەترەنجی بەرجەستەکراوی تێدایە".

PDF 4 KURD

لەراستیدا ململانێ لەسەر داهاتووی کەرکووك فرە ئاستە و جیاجیایە بەڵام کاریگەرییان لەسەر یەکتری هەیە. لەسەر ئاستی ناوخۆیدا، ململانێ لەسەر کێبڕکێکردنی نێوان هێزە تێکئالۆزکاوەکانە بۆ کۆنترۆڵکردنی شارەکە بەواتایەکی وردتریش کورد لەهەوڵی تۆکمەکردنی هەژموونیانن بەسەر ئەو واقیعەی هەیە لەکاتێکدا عەرەب و تورکمان تێدەکۆشن بۆ رێگرتن لە کۆنترۆڵکردنی کوردو دواجاریش داماڵینی لە رەوایەتی. لەسەر ئاستی نیشتمانییش ململانێکە کوردی رووبەڕووی عەرەب کردوەتەوە.

هەروەها هەردو پارتە کوردییەکە هاوهەڵوێست بوون لەبەیاساییکردنی داواکردنەوەی کەرکووك لەدەستووری عیراقیدا.هەڵبەت رێککەوتن لەسەر میکانیزم و چوارچێوەی کاتی بۆ گەڕاندنەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان لەبەرامبەر رەزامەندی ئەو دوو پارتە بوو لەسەر دەستوور و پشتیوانیکردنیان بۆ ئەو دوو حکومەتەی کە زۆرینە تیایدا عەرەبی شیعە بوون.

لەم کاتەدا زۆرینەی سەرانی سیاسی عەرەب دژی ئەوەن کەرکووك بلکێنرێت بە هەرێمی کوردستانەوە ولەهەولی ئەوەشدابوون پەنهانی و ناأوونی ماددە دەستوورییەکانی پەیوەست بەکەرکووك بقۆزنەوە بۆ دواخستنی پرۆسەکەو پەکخستنی و ئەوەش دەچێتە پاڵ ململانێی ناوخۆی و نیشتمانی بۆ کۆنترۆڵکردنی کەرکووك کەئەوەش دوو ئاستی تەواوکەرن لەئاستەکانی شیکردنەوەی –هەرێمایەتی و نێو دەوڵەتی- کەدەکرێت قورسایی کاریگەریان لەئاییندەدا هەبێت.

هەرچی ئاستی هەرێمایەتییە، ململانێی کوردی- کوردی لەنێوان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان لەپێناو کۆنترۆڵکردنی شارەکەدا تا هەنووکە ململانێیەکی بێدەنگ و داپۆشراوە، کە لەکاتی گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان هەڕەشەی بەرەو هەڵکشان دەکات، لەبەرئەوەی دوور نییە ئەوە کاریگەری بۆ سەر هاوسەنگی ئەو هێزە فشۆڵە هەبێت کە لەگەڵ کۆتایی جەنگدا لەهەرێمی کوردستان هاتوەتە ئاراوە.دیسان رەنگە ئەو ململانێیە روو لەهەڵکشان بکات ئەگەر هاتوو کورد لەبەر هەرهۆیەك بێت کەرکووك لەدەستبدات و هەر پارتێکیش لەهەولی ئەوەدابێت ئەویتریان وەك مەڕی قوربانی بەکاربهێنێت. دواجار لەوململانێیەی لەپێناو کەرکووکدا هەیە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی تورکیا و پاشانیش هەریەك لەئێران و سوریا دەستوەردەدەن.

PDF 4 KURD

دیاره هیچ شتێك ئەو سێ دەوڵەتە کۆناکاتەوە جگە لەئەزموونی هاوبەشیان نەبێت لە حوکمکردنی دانیشتوانی کوردی رق لەدڵ و خواستی هاوبەشیان بۆ لەباربردنی خواستەکانی کورد لەباکووری عێراق.

سەرجەم ئەو ئاستانەش بەشێوەیەکی ئۆرگانی پێکەوە گرێدراون سەربای ئەگەری جیاکردنەوەیان بەشێوەیەکی شێکاریانە و کارکردنیش بە بەبەراوردکاریەکەی رائید گرای لەگەڵ رووبەری شەترەنجی خاوەن هەرسێ رەهەند، ئەوا ئەو جولانەی لەسەر ئاستێکدا روودەدەن کاریگەرییان دەبێت لە ستراتیژە جۆربەجۆرەکانی سەر ئاستەکانی تر و دەچنە ژێر کاریگەرییەوە.

بۆنموونە هەوڵە رێکخراوەکانی کورد بۆ وەرگێڕانی نفوزی سیاسییان لەسەر ئاستی نیشتمانی بۆ "خاوەنداریێتی" کەرکووك بەشێوەیەکی رەوایانە بووەتە هۆی هەڵکشانی پەنگخواردنەوەکان لەسەر ئاستی ناوخۆیی و ئەوەش زیانی بەهەوڵەکانیان داوە بۆ بە شەرعیکردنی فەرمانڕەواییان لەشارەکەدا.

لەوسەروبەندەدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا یاریزانێکی سەرەکی بووە لەسەرجەم ئاستەکان سەرباری ئەو مشتومڕەی لەئارادایە لەبارەی ئەوچەند ستراتیژە دوور بەیەکەی لەسەر ئاستە جیاجیاکان پراکتیزەی کردوون.

لەسەر ئاستی ناوخۆیشدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پشتی زۆری بە کورد بەستووە بەو پێیەی بەتواناترو و باوەڕپێکراوترین هاوپەیمانی بووە لە بنەبڕکردنی یاخیبوونی چەکداری. لەو ئاستەشدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پشکدار بووە لە چەسپاندنی دەسەڵاتی کوردی وەك دیفاکتۆیەك، بەتایبەتیش لەبواری ئاسایشدا. بەڵام هەڵوێستی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەسەر ئاستی نیشتیمانی لەو پرسەدا زۆر دوودڵ بووە.

رەنگە"بەدوورگرتنی پرسەکە" گوزراشتێکی شیاوتربێت لەوەسفکردنی ستراتیژی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەو ئاستەدا کە وایکردوە دەستی هەبوبێت لە دواخستنی چارەسەر بەو جۆرەی خزمەت بە بەرژەوەندی کورد بکات. بەڵام چارەسەرکردنی پرس و بارودۆخی کۆتایی کەرکووك ناکرێت بۆ هەمیشەیی دوابخرێت.

PDF 4 KURD



لەسەر ئاستی ناوخۆیدا ململانیٚ لەپێناو کەرکووکدا کوردی لەبەرامبەر روو بەرووبوونەوەی عەرەب و تورکماندا دانا. هەرچی بەرپرسانی ئەمریکاشە هەولیٚدا بەجۆریٚك لەجۆرەکان لەمامەڵەکردنیان لەگەڵ هەرسیٚ پیٚکهاتە سەرەکی شارەکەدا بالانسیٚك رابگرن.

لەوسەروبەندەدا پێکهاتەی بچووکی مەسیحی کەژمارەی ئەندامەکانی کەمترە لە ٥٪ی دانیشتوان جگە لە بژاردەی دوورە پەریٚزی لەو ململانێیە و مانەوەی لەسەر هەڵوێستی بێلایەنی چیتری لەبەردەمدا نەبوو.

هاوکات لەگەڵ چوونە ناوەوەی ئەمریکاییەکان بۆ ناو شاری کەرکوك لەگەڵ هێزی لیوای ١٧٣ بەفەرماندەیی ولیام مایڤیل (William Mayville) هەولیٚاندا واخۆیان پیشانبدەن کەپارسەنگ راگرو خاوێنن.

ئەوەبوو سەرۆکی شارەوانی کە لەلایەن (ی.ن.ك)ەوە و رکابەرەکەشی کەلە(پ.د.ك)ەوە دانرابوون لابران. هاوکات فەرمان بۆ هێزی پێشمەرگە دەرکرا کە شارەکە بەجێبهێڵن.

لە١٧ی نیساندا لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە لەدوای جەنگ یەکەمین حکومەتی لۆکالی(خۆمالی) لەکەرکووك پێکهێنرا. لیژنەی ئیداری نوێی کەرکووك کە لە(٢٤) ئەندام پێکهاتبوو، هەر(٦) ئەندامێکی سەر بە پێکهاتەیەکی سەرەکی شارەکە بوون لەگەڵ تەرخانکردنی (٦) کورسی بۆ بچووکترین پێکهاتەی شارەکە کە مەسیحییەکان بوون١.

هەروەها مایڤیل هەولیٚدا هاوسەنگیەکی هاوشێوە لەپۆلیسی شارەکەدا بەدیبهێنێت. لەدیدارێکیدا لەگەڵ گۆڤاری ستارز ئاند ستراپیز (Star and Strapes)، ئەو فەرمانەدە سەربازییەی ئەمریکا دەڵێت" هەرپۆلیسێك لەگشت پێکهاتەکان (عەرەب و ئاشووری وکوردو تورکمان) پێبڕاگەیەنراوە رۆژی دواتر بچێتە سەر کارەکەی. ئەوەبوو ئەوانیش ئەوکارەیان کردو پێکەوە دەست بەکاربوون، رۆژی دواتریش قەبارەی تیمەکە بووە دوو هێندەو رۆژی پاشتریش ژمارەیان زیادیکرد.

زۆرینەی پۆلیس بێچەك بوون و لەزۆر کاتدا بەهەماهەنگی لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا کاریان دەکرد٢. پێکهاتەی هێزە ناچەکدارەکانی پۆلیس بەشێك بوو لە پلانی ئەو دەمەی

---

1 - پێکهاتەی مەسیحی لەکەرکوکدا بەزۆری لە کلدان و ئاشووریەکان پێکدێن و لە٣٪ی دانیشتوانی کەرکوکیش پێکدەهێنن.

2 - Dougherty, K."Army aMayor' Plas for Diversity in Kirkuk's Future." Stars and Stripesm4 May.

ئەویش بەڵام لەکۆتاییدا جێبەجێکردنی مەحاڵبوو بۆ گۆڕینی کەرکووك بەرەو ناوچەیەکی لەچەکداماڵدراو.

بۆ سەلماندنی جێبەجێکردنی ئەو ستراتیژە بەشێوەیەکی هاوسەنگ هێزەکانی ئەمریکا لە ٢٦ی نیساندا هەڵیانکوتایە سەرەبارەگای سەرجەم بارتە سیاسییە گەورەکان لەوانەش(پ.د.ك و ی.ن.ك) و دەست بەسەردا گرتنی چەکەکانیان.

لەبەرایی ئایاردا خێرایی دەستێوەردانی ئەمریکی بەهەمان شێوە سەرکەوتنی بەدەستهێنا لە بەدوور راگرتنی کێشمەکێشێك کە خەریکبوو بۆ رووبەڕوبوونەوەی خوێناوی نێوان عەرەب و کوردە گەڕاوەکان لەنزیك شارۆچکەی مەخموور بگۆڕدرێت. کێشمەکێشەکە پەیوەندی بەمافی بەروبوومی عەرەبەوە هەبوو کە لەسەر زەوی و زاری کورد کشتوکاڵیان کردبوو.

چارەسەری ئەمریکایەکان لەوەدابوو کەداهاتی فرۆشراوی بەروبوومەکە لەنێوان عەرەب و کورددا دابەش بکرێت بەڵام چارەسەرەکانی ئەمریکا لەراگرتنی باڵانس و یەکسانیکردندا هەر زوو مایەپوچی پێوەدیاربوو.

ئاژانسی هەواڵی خۆرهەڵاتی ناوڕاست لەراپۆرتی رۆژی ٢٦ی نیساندا ئاماژە بەوە دەکات کە" یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان تەواو کۆنترۆڵی سەرجەم بینا حکومەیەکانی لەناوچەکەدا کردووە گشت فەرمانبەرە عەرەب و تورکمانەکانیش بەفەرمانبەری کوردی گۆڕیون.هەروەها زانکۆکانی شارەکەش لەپاش گۆڕینی فەرمانبەرەکانی بەفەرمانبەری کورد زیانیان بەرکەوت١.

لەوچوارچێوەیەدا بەرەی تورکمانیی عیراقی کەخاوەن دەنگێکی بلندە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پارتە کوردییەکان ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای فریوداوە کاتێك" پیاوانی میلشیا جل و بەرگی پۆلیسیان پێ لەبەرکراوەو بەسەرجەم جێگاکاندا بلاویانکردونەتەوە"٢.

بەهەمان ئاراستە سەرچاوەکانی راگەیاندنی تورکیا بلاویانکردەوە، کە نزیکەی(١٠٠٠)کەس لەپیاوانی پۆلیسی سەر بە (ی.ن.ك) ئەرکی دەورییە (پاترۆڵ) لەشارەکەدا دەبینن شان بەشانی هێزەکانی ئەمریکا.

سەرچاوەیەی راگەیاندنی سەر بە (پ.د.ك)یش کە رۆژنامەی برایەتی بوو، تەئکیدی کردەوە کە (١٥٠٠) بەرپرس لەپیاوانی پۆلیس و چاودێرانی هاتووچۆو ئەفسەری ئاسایش

---

1- MENA(BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq:U.S.Forces Begin to Disarm Factions in Kirkuk.",26April(LN).

2 -ANSTV(BBC Monitoring Middle East).2003."Iraqi Turkmen rep says Kurds "seized' state posts in Kirkuk."26 April(LN).

لەهەولێرەوە رەوانەی کەرکووک کراون و ئیدارەی پێشووی شارەکەش لەسەروبەندی هەڵوەشاندنەوەدایە١. بەپێی رۆژنامەی واشنتۆن پۆست لەسەرەتای ئایارەوە نزیکەی (٣٠٠) پۆلیسی شارەکە لەکۆی (٥٠٠) پۆلیس هەموویان لەکوردن و هاوکاتیش کەرتی راگەیاندنی شارەکە لەلایەن کوردەوە کۆنترۆڵکراوە بەتایبەتیش لەلایەن (ی.ن.ك) ەوە.

لەسەرەتای ئایاردا تەلەفیزیۆنی کەرکووك کە لەلایەن ئەمریکاوە پشتیوانی دەکرا بەرنامەکانی خۆی بەهەرچوار زمانی شارەکە پەخشدەکرد و هەرچی بەرەی تورکمانیشە تۆرێکی رادیۆی و تەلەڤیزیۆنی تایبەت بەخۆی دامەزراند، بەڵام پەیامنێرانی مەیدانی لەرۆژنامەی کریستیان ساینس مۆنیتەر ئاماژەیان بەوەدا کە سەرجەم کەناڵەکانی رادیۆو تەلەڤیزیۆن و رۆژنامەکانی کەرکووك لەلایەن (ی.ن.ك) ەوە کۆمەکی دارایی دەکرێن و بۆ ئەوەمەبەستەش ئەو پارەتە سەرمایەی خۆی لە پایتەختەکەیەوە کە سلێمانییە دابەش دەکات٢.

باڵا دەستی کورد لەشارەکەدا بێ هاوتابوو هەرچی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکاش بوو دەستەوەستان بوو بۆ رێگیکردن بەواتایەکی ساکارتر کورد خاوەنی ئەزموون بوو بەبەراورد بە ێکهاتەکانی دیکەی شارەکە. هەرچەندە لەسەرەتادا لێپرسراوانی ئەمریکی هەڵوێستێکی لایەنگرانەیان بۆ کورد نەبوو بەڵام وادیاربوو ئەوە بۆچوونی ێکهاتەکانی تر نەبوو( بەتایبەتیش بەرەی تورکمانیی عیراقی ) لەشارەکەدا، لەبەرئەوە لەدوای جەنگ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتی بە پرانسیپی نوێنەرایەتی کردن لەسەر بناغەی تەواو یەکسانی نێوان پێکهاتەکانی شارەکە بەست لەدابەشکردنی کورسیەکانی حکومەتە لۆکاڵیەکەدا.

بەرەی تورکمانی وایان لەو پلانە دەروانی کە بەڵگەی لایەنگرێتییە بۆ کورد چونکە دانیشتوانی تورکمان لەشارەکەدا ژمارەیان لەکورد زیاترە بەڵام بەلانی کەم ئەوە تەنیا لەدیدی بەرەوە بوو. دواتر بارودۆخەکە بەدابەشبوونی ریزەکانی پێکهاتەی تورکمانی ئاڵۆزتر بوو. ئەوەبوو لەسەرەتادا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (٦) کورسی بۆ تورکمان لەلیژنەی کەرکووك بۆ بەرەی ناوبراو تەرخانکردبوو بەڵام دوای سکاڵای رێکخستنەکانی تری تورکمانەکانی تر هەروەك راپۆرتەکان ئاماژەیان پێکردبوو، ویلایەتە یەکرگتووەکانی ئەمریکا (٥) ئەندامی لیژنە شەش کەسیەکەی لەتورکمانەکانی سەر بەبەرەی ناوبراو گۆڕی بەنوێنەرانی پارتە تورکمانیەکانی تر

---

1 -Brayati (BBC M onitoring Middle East).2003."Iraqi Kurdish police sent to Maintain security in Kirkuk."27April(LN).

2 - Pusher,I.R.2003."Free Media Blosson in Iraqi City." The Christian Science Monitor ,29April(LN).



PDF 4 KURD

له پەیوەندی تۆکمەیان بە کوردەوە هەبوو[1]. دەرئەنجامی ئەو کارەش بەرەی تورکمانی ڕێنمایی بۆ تەنیا ئەندامەکەی خۆی لەلیژنەکەدا دەکرد کە بایکۆتی کۆبوونەکان بکات و ئەمریکاش لەلایەن خۆیەوە بە ئێکجارەکی ئەو ئەندامەی بەرەی تورکمانی لەلیژنەکە دەکرد.

## حوکمڕانی کەرکووك

کاتێك ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەکۆتایی ئاداردا دەستیکرد بەئامادەکاری "هەڵبژاردن"ی ئەنجوومەنی نوێنەرایەتیکردن کە پتر گەرموگۆڕی لەخۆگرتبوو، مشتومڕی هاوشێوەی بەدواوە بوو.

ئەفسەرێکی ئەمریکایی کە بەرپرسی ڕێکخستنی ئەو پرۆسە سەختەبوو کە کەوتبووە ئەستۆی ولاتەکەی زۆر بە کورتی و پوختی رایگەیاند: بەمدواییانەدا هیچ سەر ژمێریکی ورد ڕێکنەخراوە و لەبەرامبەر تەعریبکردنی حزبی بەعسیشدا بۆ ناوچەکە وتی: ئەوەی کۆنترۆڵی هەرچییەك بکات و زۆرینەی دانیشتوانی پێکهاتە فرە نەژادەکانی کەرکووکیش هەرکێیەك بێت ئەوە بۆخۆی فیشەك نانە بەتاریکییەوە، چونکە پرسەکە تەنیا لە دیدی سەرژمێرییەوە مەسەلەیەکە تیایدا رادەمێنیت خۆ ئەگەر شتێکیشمان لەکاری توندوتیژی تایەفی و رق و کینەی ئیتنیکی و زۆرێك لەنامتمانەیشمان خستە پاڵ ئەوا پرسەکە رەهەندی زلکردن وەردەگرێت[2]. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هەڵبژاردنی ناراستەوخۆی دیاریکرد بۆ هەڵبژاردنی (١٥٦) نوێنەر کەنوێنەرایەتی هەرچوار پێکهاتە ئیتنیکیەکەی دەکرد لەگەڵ هەڵبژاردنی (١٤٤) نوێنەری تر( ئەویش دیسان لەهەڵبژاردنی سوپای ئەمریکا بوون) تا نوێنەرایەتی " سەربەخۆکان" بکەن.

کۆی ئەو (٣٠٠) نوێنەرە لەرێگەیەکی زانستییەوە نەبوو کە ژمارەیان لەو هۆڵەدا جێگەیان نەدەبووەوە کە پرۆسەی دەنگدانەکەی تێدا ئەنجام دەدرا. لەدوای هەڵبژاردنیش نوێنەرایەتی پێکهاتە جیاجیاکان کە لە(٦) نوێنەری هەرپێکهاتەیەك بوون، ئەمە جگە لە هەڵبژاردنی (٦) ئەندامیتر وەك نوێنەرایەتی سەربەخۆکان دیاری دەکران. ئامانجیش لەوە ئەوەبوو، کە پرۆسەکە فۆرمێکی تەوافوقی وەربگرێت و لەگەڵ ئەو سیستەمەدا بێتەوە کە لەهەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرایەتی موسڵ لەسەرەتای ئایاردا پشتی پێبەسترابوو.

---

1 -Jamawar(BBC M onitoring Middle East).2003."Iraqi Turkmen Front Reportedly Excluded from Kirkuk Administrstion."29April(LN).
2 -Quoted from Sgt,1st Class Todd Oliver,"Election Process,"173rd Airborde brigade Iraq stories.(www.173raairborne. Com/Iraq-stories.htm

ئـەو سیسـتەمەی کـە لەموسـڵ جێبـەجێکرابوو بـەمۆدێلێکی گونجـاو بـۆ کـەرکووك دادەنـرا، لەبەرئەوەی ئەوەی لەو ئەنجوومەنەوە سەرچاوەی گرتبـوو لـەلای پێکهاتـە ئیتنیکییـە جیاجیاکـانی موسڵ مایەی پەسەندکردن بوو[1].

هەڵبژاردنی راستەوخۆی ئەنجوومەنەکە لەکەرکووك لەرووی لۆجستی و لە وەهەلومەرجەی کە ئەو دەم لەئارادابوو دژواربوو، لەکاتێکدا ئەو دەسـتەیەی تـەواو دروسـتکراوی ئـەمریکا بـوو ئەوەنـدە شەعبیەتی سیاسی نەبوو کە رەنگبوو ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا روو بـەرووی تۆمـەتبارکردن بکاتەوە لەدیاریکردنی کەسەکان و ئەوپێکهاتانەی کە ئینتیمایان بۆیان هەبوو.

لەبەرئەوە ئە سیستمە لەوکاەدا لەبارتربوو تـا جێبـەجێ بکرێـت و ئامـانجیش لـەدانانی کەسـە سەربەخۆکان لەئەنجوومەنی نوێنەران " ئەو پرۆفیشنالآنە بوون کـە بیرکردنـەوەیان دوورتـر بـوو لـە ناسنامەی ئیتنیکی و سیاسی ئەو کاتـەی کـە تیایـدا بـوون"[2]. سـەرباری ئـەو سیسـتمەی کـە لەکەرکووکدا پەیڕەودەکرا، چارەسەرێکی تەوافوقی شیاو بوو بۆ پڕکردنەوەیەکی پێویسـت ئەگـەر نـا ئەوا هەرلەسەرەتاوەمشتومڕ دەهاتە ئاراوە.بۆ نموونە لەرۆژی ٢٤ی ئایـاردا کـە رۆژی دەنگـدان بـوو (٥) ئەندامی وەفدی عەرەبی لەدەوازەی هۆڵەکە دەستگیرکران ئەویش لەسەر بنەمای زانیاری ئەوەی کە ئەو کەسانە سەرجەمیان لەگەورە بەرپرسانی حزبی بەعسن.

هـەروەها نوێنـەرانی تورکمـانیش گلـەیی ئـەوەیان دەکـرد کـەهیچ کەسـێك لەنێونوێنـەرە سەربەخۆکاندا نوێنەرایەتیان ناکات بەڵکو دوو کەسیش لەوان لەهۆڵەکە دەرکران.

هاوکـات هەڵبـژاردنی هەرشـەش ئەندامـە سـەربەخۆکە _ پێـنج کـوردو مەسـیحییەك- مەسەلەیەکی ناکۆکبوو، چونکە بەوە ژمـارەی کـورد لـەنێو ئەنجوومەنەکـەدا بـووە(١١) ئەنـدام و ژمارەی مەسیحییەکانیش بوونە (٧)ئەندام و هەروەها عەرەب(٦) ئەندام و تورکمانیش (٦) ئەندام.

لەنوێنـەرە سـەربەخۆکان (٥) یـان کوردبـوون و هـیچ جـۆرە ئینیتمایـەکیان بـۆ هـەردو حزبەسـەرەکیەکەی کـورد نـەبوو، بـەڵام بێگومـان نوێنـەرانی تورکمـان و عـەرەب وایانـدەڕوانی

---

١- زۆرینەی سوننەی نێو ئەنجوومەنی پارێزگای نەینەوا، عەرەبێکیان هەڵبژارد کە ئەفسەرێکی خانـە نشـینکراو بوو(غـانم البصـو) بۆپۆستی پارێزگار لەگەڵ جێگرە کوردەکەی(خەسرەو گۆران) کە سەر بە (پ.د.ك) بوو، هەروەها هەڵبژاردنی ئاشووری و تورکمانێـك وەك دوو یاریدەدەری پارێزگار. بەڵام جیاوازی نێوان موسڵ و کەرکوك ئەوەیە لەموسڵ ململانێ نییـە لەسـەر ئـەوەی کـام پێکهاتـە زۆرینەیە بەڵام لەکەرکوك ململانێیەکی گران لەسەر ئەو پرسە هەیە.

2 - ئۆلیڤەر، هەمان سەرچاوە.

PDF 4 KURD

دەهەڵبژاردنی ئەو کوردانە بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنەکە بەواتای پشتیوانی روونی ئەمریکایی بۆ بەرژەوەندی کورد.

هاوکات تورکمان بێزاری خۆیان پیشاندا لەبەرئەوەی دوو ئەندام لەو شەش ئەندامەی هەڵبژێردرابوون بەوەناسرابوو کە پەیوەندیەکی پتەویان بە(ی.ن.ك) ەوە هەیە. لەوەڵامدانەوەی هەموو ئەوانەدا هەردو وەفدی تورکمانی و عەرەبی بایکۆتی دەنگدانی هەڵبژاردنی پارێزگاریان کرد، کەبڕیاربوو لەدوای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکە ئەنجامبدرێت.

بەپێی سەرچاوەیەکی راگەیاندنیش بارودۆخەکە بەرەو نائۆقرەیی چووەو داوا لەمیجەر ژەنەراڵ ریمۆند ئۆدێرنۆ Major General Ramond Odierno کراوە کە سەرپەرشتی دەنگدانەکەی دەکرد دەست لەمەسەلەکە وەربدات و سەرلەنوێ چاو بە هەڵبژاردنەوەی ئەندامە سەربەخۆکاندا بخشێنێتەوە١.

لەدوای پاشەکشەی هەرسێ کاندیدی عەرەبەکان بۆ پڕکردنەوەی پۆستی پارێزگار کێبڕکێ کەوتە نێوان (عەبدولڕەحمان مستەفا) کۆنە پارێزەر وکاندیدی سەربەخۆی کورد و (مستەفا کەماڵ یایجلی)، کاندیدی بەرەی تورکمانی.

هاوکات کێبڕکێ بۆ پۆستی جێگری پارێزگار کەتە نێوان (ئیسماعیل حەدیدی) کاندیدی سەرەبەخۆی عەرەبەکان کە سەر بنەماڵەیەکی دێرینی عەرەبی کەرکووك بوو لەگەڵ دوو کاندیدی تورکمانەکان کە ئەوانیش هەریەك لە( تەحسین کەهیە) سەرۆکی یەکێتی ئیسلامی تورکمانی و (عەلی مەهدی) پاڵێورای بەرەی تورکمانی بوون٢.

لە٢٨ی ئایاردا ئەنجوومەنەکە بەئەندامێتی (٣٠)کەس و بەزۆرینەی (٢٠)ئەندام دەنگیان بۆ (عەبدولڕەحمان مستەفا)دا بۆ ئەوەی ببێتە پارێزگارو لەهەمان کاتیشدا (ئیسماعیل حەدیدی) بۆ پۆستی جێگری پارێزگار هەڵبژێردرا. هاوکات (٣) یاریدەدەر بۆ پارێزگار دیاریکران کە ئەوانیش هەریەك لە(حەسیب رۆژبەیانی) بۆ سەرۆکایەتی لیژنەی نیشتەجێکردنەوەی کۆچپێکراوان و (عیرفان کەرکووکی) لەتورکمانەکان بۆ سەرپەرشتیکردنی ریشەکێشکردنی بەعس و (سەرگۆن لازار) لەمەسیحییەکان بۆ رێکخستنی کاروباری پارێزگار.

---

1 -Meixler, L. 2003."Ethnic Tensions Flare in New council." The Gazette, 26 May:A17.

٢- روو بەڕوبوونەوەی هەردو کاندیدی تورکمانەکان کە یەکێکیان شیعەو ئەویتریشیان سوننەو سەر بە بەرەی تورکمانی خاوەن زۆرینەی سوننی بوو، ئاماژەیەکی پێشوەخت بوو بۆ ئەو تەنگو چەڵەمانەی کە بەرۆکی بەرەی دەگرت لەوەی بەردەوام خۆی بەتەنیا نوێنەری پێکهاتەی تورکمانی کەرکوك بزانێت.

PDF 4 KURD

بو شێوەیە تائاستێك پێكهاتەی ئیتنیكی ئەنجوومەنەكەو پێكهاتەی تیمە دەسەڵاتدراەكەی هاوسەنگی پێوە دیاربوو. كورد لەئەنجوومەنەكەدا گەورەترین كوتلە بوون كە (١١)كورسیان هەبوو بێئەوەی ببنە زۆرینە، لەبەرئەوە پێویست بوو لەسەریان هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنەكانی تر ببەستن بۆ زامنكردنی رازیبوون لەسەر رێكارەكانی ئەنجوومەنەكە.

هەرچەندە هەڵبژاردنی پارێزگارێكی سەربەخۆوجێگرە عەرەبەكەی و یاریدەدەرەكانی لەكوردو توركمان و مەسیحی نوێنەرایەتی پێكهاتەی ئیتنیكی كەركوكیان دەكرد بەڵام پرۆسەكەو دەرئەنجامەكانی كاردانەوەیەكی دژواری لای سەرانی سیاسی عەرەب و توركمان لێكەتەوە.

(وەسفی عاسی عوبێدی) سەرۆكی كوتلەی عەرەبی لەئەنجوومەنەكە گلەیی ئەوەیدەكرد " تەنیا گرفتی ئیمە لەگەڵ دەرئەنجامەكەدا ئەوەیە كە پێشوەخت لەلایەن ئەمریكاییەكانەوە بڕیاری لەسەردراوە ١".

هاوكات وتەبێژی بەرەی توركمانی رەخنەی لەئەنجامی دەنگدانەكە گرت و بەناخاوێن وەسفیكرد و هەمان هەڵوێستی (عاسی)دووبارە كردەوە، كە ئەنجامەكان پێشوەخت زانراوبووە كە لیژنەكە بەئەندامێتی (٣٠)كەس و هەڵبژاردنی پارێزگاری نوێ و بوونی (٢٠)كورد دەكەوێتەوە٢. ئاماژەدان بەبوونی(٢٠) كورد لەئەندامێتی ئەنجوومەنەكەدا ببوە بەشێك لە سكاڵای بەرەی توركمانی بەوەی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا بەشێوەیەكی مەنهەجی بەلای بەرژەوەندی كورددا دەیشكێنێتەوە لەكاتێكدا وەك ئاشكرابوو ژمارەكان تەواو لەجێی خۆیاندا نەبوون٣. بەڵام بەگشتی سكاڵای بەرەی توركمانی لەخراپبوونی ئاستی نوێنەرایەتیكردنی لەئەنجوومەنەكەو پەراوێزخستنی لەدەزگای جێبەجیكردندا هەروا بێ پاساو نەبوو. تەنیا كەسێك توركمانی كە لەپۆستی جێبەجێكردندا بوو (عیرفان كەركووكی) ی سەركردەی پارتی گەلی توركمانی بوو كە پەیوەندیەكی بەهێزی بە(ی.ن.ك)ەوە هەبوو.

---

1 - Clover, C. 2003."Kurds Win Back Control of Kirkuk After Local Elections ." The financial Times, 29 May : 11.

2 - MENA ( BBC Monitoring Middle East ) .2003. " Iraqi Turkmens Refuse to Recognize Kirkuk Election." 29 May ( LN ).

3 - لەراستیدا هەر بیست ئەندامی ئەنجوومەنەكە بۆ بەرژەوەندی كاندیدەكەی كورد دەنگیاندا ، كە یانزەیان كوردو حەتیان مەسیحی و دووانەكەی تریشیان مەسیحی بوون.

عێرفان کەرکووکی بەو پێیەی داکۆکیکاری بەردەوامبوو لەهەڵوێستی کورد لەدژی هەڵمەتەکانی بەرەی تورکمانی، بەرەی ناوبراو پییوابوو کە عیرفان کەرکووکی دەنگێکی (ناڕەوا ) یەو ناکرێت بەناوی تورکمانەوە قسەبکات.

بەهەمان شێوە ئسماعیل حەدیدی جێگری پارێزگار کەسێکی کورد نەبوو بەڵکو بەرەگەز عەرەب و سەر بەیەکێك لەخێزانە عەرەبە دێرینەکانی کەرکوك بوو بەڵام ناسراوبوو بەوەی پشتیوانی لە هەوڵەکانی نەهێشتنی ئاسەواری سیاسەتی تەعریب دەکرد کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە پراکتیزە کرابوو.

لەبەر ئەوەی کورد لەپرۆسەکەدا بەبراوەیی هاتنە دەرەوەو بوونە خاوەنی کوتلەیەکی گەورە کە کۆنترۆڵی ژمارەیەك کورسیان لەئەنجوومەنی پارێزگاکەدا کردو نەیاری سەرەکیان لەکەرکووکدا کە خۆی لەبەرەی تورکمانیدا دەبینییەوە بەتەواوی پەراوێزخران.

ئەوەبوو پۆستە حکومییە هەستیارەکان لەلایەن کوردەوە یاخود لەلایەن پێکهاتە ئیتنیکیەکانی ترەوە بەڕێوەدەبران کە هەڵوێستی دیارو هەواداریيان بۆ کورد بەگشتی هەبوو یاخود بەلانی کەمەوە دژی کورد نەبوون.

لەروانگەیەکی فراوانترەوە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان واتایەکی رەمزی گەورەتری بۆ بایەخی پرۆسەکە هەبوو، لەگەڵ زیادەرۆیی نەکردن لەرۆڵی رەمزەکان لەسیاقی پرسی کەرکووکدا ئەوا کورد لەم ساتەوەختەوە کۆنترۆڵی کەرکووکیان کرد پاش ئەوەی زۆربەی پۆستە ئیداری و پێگە سیاسیەکانیان لەشارەکەدا کەوتە دەست.

بەم واتایەش شاری کەرکوك وەك دیفاکتۆیەك شارێکی (کوردی)یە نەك تورکمانی و عەرەبی، بەڵام نەپارێزگارو نە ئەنجوومەنەکە بەشێوەیەکی سەربەخۆ مومارەسەی دەسەڵاتی خۆیان نەدەکرد لەسەر ئاستی بڕیارداندا.

هەروەك میجەر ژەنەراڵ ئۆدێرنۆ لەرۆژی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنەکەدا بۆ نوێنەرەکانی روونکردەوە : سوپای ئەمریکا پارێزگاری لەمافی خۆی دەکات لەبەکارهێنانی مافی ڤیتۆ لەدژی کاندیدەکان و گۆشەگیرکردنی هەر ئەندامێکی هەڵبژێردراو و رەتکردنەوەی بڕیارەکانی ئەنجوومەنەکە ١ .

---

١- لەگەڵ بوونی ٢٥٠٠ سەربازی ئەمریکایی، ویلایەتە یەکگرتوەکان زۆر بەگران خۆی بە باڵادەست دەزانی لە شارەکەدا.ئەوەبوو واشنتۆن پشتی تەواوی بە هێزە ئەمنیەکانی ناوخۆیی دەبەست بەتایبەتیش هێزی هەردو پارتە کوردییەکە و بەتەنیاش هیچی پێنەدەکرا و کوردیش زۆر پێویستی بە ئەمریکا بوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە سیاسیەکانی لەو شارەو لەعێراقدا.



PDF 4 KURD

هاوكات ئەنجوومەنەكە دەسەڵاتی باج وەرگرتنی نەبوو بەڵكو دەسەڵاتێكی دیاریكراوی هەبوو لەتەرخانكردنی سەرچاوە ماڵییەكان كە لەبەردەستدابوون.

ئەوەبوو بەشی زۆری ئەو سەرچاوە داراییانە لەدوو سەرچاوەوە دەهاتن كە ئەوانیش پرۆگرامی وەڵامدانەوەی باری نائاسایی Commandres Emergency Response Program (CERP) و هەردو پارتە سەرەكیەكەی كورد كەهەریەكەیان پارەیان دەبەخشییە پرۆژەكانی ژێرخان و موچەی كارمەندانی كوردیان لەشارەكەدا دەدا.

بێتوانایی ئەنجوومەنەكە شتێكی حەتمی بوو چونكە ئامانجی سەرەكی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا لەدروستكردنی ئەو ئەنجوومەنەدا بۆ ئیدارەكردنی كارای شارەكە نەبوو بەڵكو بۆ نوێنەرایەتیكردنی پێكهاتە ئیتنیكیە تێكئاڵۆزكاوەكەی شارەكە بوو بۆ بلاوكردنەوەی ئارامی كە لەدوای جەنگ لەبەردەم ئەگەرەكانی تەقاندنەوەدا بوو.

---

هەرچەندە كورد لەو پشت بەیەكتر بەستنە بەسوود بوون بەڵام بەڵگەی ئەوە لەئارادا نییە كە سوپای ئەمریكا وەك بژاردەیەكی ستراتیژی پشتیوانی لەكورد كردبێت لەسەر حسابی پێكهاتەكانی تر.

بۆنموونە كۆمپانیای نەوتی باكوور هەر بەدەست بەڕێوەبەرانی دێرینی عەرەبەوە بوو سەرباری نارەزایی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان. هاوكات ویلایەتە یەكگرتوەكان سوور بوو لەسەر ئیدارەكردنی كێشەی موڵكداریێتی و گەڕانەوەی كوردە راگوازراوەكان لەسەر بنەمای یاسایی . بەدوور لە پرۆسەی سیاسیش بۆ چەند جارێك سوپای ئەمریكا چالاكانە و لەچەند بۆنەیەكدا پارێزگاری لەدانیشتوانی عەرەب كرد كە بەشێوەیەكی نایاساییانە لەسەر زەوی و موڵكی خۆیان لەلایەن كوردە گەڕاوەكانەوە دەركرابوون.



PDF 4 KURD

## حوکمڕانی عێراق

لەسەر ئاستی نیشتمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا روو بەڕووی کێشەگەلێکی هاوشێوەبووەوە بەڵام بەشێوەیەکی فراونتر. ئەوەبوو بەغدا راستەوخۆ لەپاش جەنگ رووبەڕووی تالآنکاریەکی فراوان بووەوە و شوێنەواری دەزگای دەسەلآتداری لەناوچوو.

هەروەها ژێرخانی شارەکە لەژێرکاریگەری هەڵمەتەکانی بۆردومانکردن و(١٠) ساڵ لەسزاکان و دیسان تالآنکاری فراواندا دارِماو هیچ پلانێکی ئاشکراش نەبوو بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو جۆرە کێشانەدا٠

لەسەر ئاستی حوکمڕانیش وەزارەتی بەرگری ئەمریکا" پەنتاگۆن" لەپەردەپۆشکردنی داگیرکارییەکەی پشتی بە عێراقییەکانی تاراوگە بەست بۆحکومەتی ئینتیقالی.

بڕیاریشبوو " ئەنجوومەنی سەرکردایەتی " لە(٧) سەرکردەی سیاسیی عێراقی بەرچاو دابمەزرێت، کە بە"گروپی حەوت" ناونراو ئەرکێکی گرنگی پێڕاسپێردرا بۆ پاش رووخاندنی رژێمی بەغداد.

بەڵام بانگکردنەوەی ژەنەراڵ جای گارنەر Genral Jay Garner ودامەزراندنی پۆل بریمەر Paul Bremer لەپۆستی حاکمی مەدەنی لەبری گارنەر لەئایاری ٢٠٠٣دا ئاماژەیەك بوو بۆگۆڕانی ریشەیی لەکاروان و فەلسەفەی داگیرکاریدا. بەپێچەوانەی گارنەریش کە ئەرکی سەرپەرشتی رادەستکردنەوەی دەستبەجێی دەسەلآت بوو بۆ دەست عێراقییەکان وەك زەمینەسازییەك بۆ کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکالەماوەی شەش مانگدا، ئەوا ئامانجی بریمەر زۆر لەوەزیاتر بوو، کەئەوەش هەڵوەشاندنەوەی سوپای عێراق و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی ئەو سوپایەو ریشەکێشکردنی بەعسی لەهەڵمەتێکی گشتگیردا لەخۆگرتبوو، ئەمە جگە لەگۆڕینی ئابووری عیراق بۆ ئابووری بازاڕی ئازادو هەڵبژاردنی دامەزراوەیەکی حوکمڕانی فراوانترو بەردەوامتر.

دەرئەنجامی ئەو پەرەسەندنەش لە١٣ی تەمووزدا بەڕەسمی ئەنجوومەنی حوکمڕانی پێکهێنرا. هاوکات وەك خواستی ئاشکرای بریمەریش کەخۆی لەکۆکردنەوەی سەرجەم پێکهاتەکانی گەلی عێراقدا دەبینییەوە، ئەنجوومەنی حوکمڕانی (٣٠) ئەندامی عەرەبی شیعە(تێکەڵەیەك لەعەلمانی وئاینیدارەکان) و (٥) عەرەبی سوننەو (٥)کورد و (١) تورکمان و(١) مەسیحی لەخۆگرتبوو، کە ئەوەش رەنگدانەوەی خەمڵاندنی باوی خۆرئاوابوو سەبارەت

PDF 4 KURD

بەقەبارەی ژمارەیی پێکهاتەکانی دانیشتوانی عێراق نەك خەملاندنی پێکهاتەکان خۆیان١.
لەسەر ئەوبناغەیەش هەڵوێستی بەڵێنداریێتی بەرەی تورکمانی سەبارەت بەوەی کە تورکمان لە١٠- ١٥٪ی دانیشتوانی عێراق پێکدەهێنن لەلایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە لەقۆناغێکی پێشوەختدا ڕەتکرایەوە٢.

وەك دامەزراوەیەکی دەسەڵاتداریش ئەنجوومەنی حوکمڕانی دەستەیەکی بێواتاو بێ دەسەڵاتبوو، بەڵام لەسیاقی پرسی کەرکووکدا ئەنجوومەنەکە لەبەردەم دوو هۆکاری گرنگدابوو. یەکەمیان ئەوەبوو کە دەخوازرا ئەندامانی ئەنجوومەنی حوکمڕانی ڕۆڵێکی کاریگەریان هەبێت لەئامادەکردنی دەستووری کاتی عیراق و بە(٥) ئەندامیش لەئەنجوومەنەکەدا کورد پێگەیەکی بەهێزی هەبوو بۆ زامنکردنی پاراستنی بەرژەوەندیەکانیان لەو بەڵگەنامەیەدا.

دووەم، کاردانەوەی سەرانی سیاسی تورکمان لەسەر ئەوەی کەتەنیا یەك کورسیان هەبوو لەئەنجوومەنی حوکمڕانیدا رووناکی خستە سەر لایەنە ئاشکراکانی ئەو هەڵوێستەی، کە تورکمان هەیبوو لەبەرامبەر مەسەلەی ئیتنیکی و تایەفی و وێناکردنیان بۆ ئەو پرسە.

ئەوەبوو کاردانەوەی سەرانی سیاسی تورکمان بەگشتی جۆرێك لەواقوڕمان و تووڕەبوونی پێوەدیاربوو لەبەرامبەر ئەو پشکەی لەئەنجوومەنەکەدا بۆ تورکمان تەرخانکرابوو، ئەمە جگە لە ناسنامەی ئەو ئەندامە تورکمانەی کەدیاریکرابوو. ئەوەبوو (ئایدن بەیاتلی) ئەندامی لیژنەی ڕاپەڕاندنی بەرەی تورکمانی ڕایگەیاند: کەتووشی شۆك بووە لەبەرامبەر بڕیاری تەرخانکردنی (١)کورسی و ئاماژەی بەوەشکرد کە"دانیشتوانی تورکمان هێندەی ژمارەی دانیشتوانی کوردن، لەبەرئەوە پێویستە تورکمانیش ئەوەندەی نوێنەرانی کورد نوێنەریان لەئەنجوومەنەکەدا هەبێت٣.

---

1 - Bremer, L.P. III ( with Michael McConnell ). 2006.May Year in Iraq: The Struggle to Build a Future of Hope . New York : Simon and Schuster, especially Chapter 4.

١- لەبیرەوەرییەکانی بریمەردا بیرۆکەیەکی ئاشکراو روون پێشکەش دەکات سەبارەت بەبایەخ پێنەدانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەتورکمان. سەرباری بانگەشەکانی بریمەر لەچەند

بۆنەیەکدا لەبارەی ئەوەی سەرکردایەتی ئەنجومەنی حوکمڕانی سەرکردایەتیەکی نوێنەرایەتیانە نەبووە چونکە نوێنەرانی تورکمان و مەسیحی و ژنانی لەخۆنەگرتوە.دیارە لەگەڵ بوونی سونگیول چاپوك وەك تەنیا نوێنەری تورکمان لەئەنجوومەنەکەدا بەڵام لەلایەن بریمەرەوە تەنیا بۆ جارێکیش لەدەقەکەدا ناوی نەهێناوە.

3 - Anatolia ( BBC Monitoring Middle East ). 2003. " Turkey : Turkmen Party Official Snubs U.S. on Election of Iraqi Governing Council. " 16 July ( LN).

لەمیانەی ئەو خۆپیشاندانە جەماوەرییەش کە لەمانگی ئـاب لەشـاری بەغـداد بەڕێوەچـوو بەرەی تورکمانی لەبەیاننامەیەکدا کەئاراستەی پۆل بریمەری کرد، تیایدا رایگەیانـد: ژمـارەی تورکمان "کەهەر لەناوچەی تەلەعفـەرەوە دەسـتپێدەکات و بەباشـووری خۆرهـەلاتی بەغـداد کۆتایی دێت زیاتر لە (٣) ملیۆن کەسن".

بۆیەعەدالەت وادەخوازێت ژمارەی نوێنەرانی تورکمان لەئەنجوومەنەکەدا لە(٣) ئەنـدامی تورکمان کەمتر نەبێت و هـەروەها ژمارەیـەك وەزیـریش لەسیاسـییە ناودارەکـانی تورکمـان هەڵبژێردرێت، کەلەگەڵ رێژەی دانیشتواندا بێتەوە١.

بڕیاری هەڵبـژاردنی "سـونگیول چـاپوك" وەك نوێنـەری تورکمـان لەلایـەن پـۆل بریمـەر، نارەزایی بەرپرسانی بەرەی تورکمانیی عیراقی لێکەوتەوە.

چاپوك ئەندازیاری مەدەنی، ژنە تورکمانێکی سوننی خەڵکی رەسەنی کەرکووك بوو، کـە کـاری مامۆستایشـی کردبـوو. ئـەو وەك وەرگێڕێـك کـاری بـۆ دەسـەلاتی ئیئـتلافی کـاتی لەکەرکووکدا کردبوو، هەربۆیە سەرنجی ئەو دەسەلاتەی بۆلای خۆی راکێشابوو.

هەڵبەتە تەنیا ئەزموونی سیاسی چاپوك کەشایەنی باسکردن بووبێت ئەوەیە، کە سـەرۆکایەتی رێکخراوێکی ژنانەی عێراقی کرد، ئەوەش ئەو باگڕاوندە بوو کـە بریمـەر بـەدیاریکراوی بەشـوێنیدا دەگەڕا بۆ ئەوەی " سیمای عێراقی نوێ " پێشکەش بکات، بـەلام چـاپوك نـەیتوانی شـەعبیەت لەنێو زۆرینەی سەرکردە سیاسیەکانی تورکماندا بۆخۆی مسۆگەربکات.

لەکۆنگرەیەکی رۆژنامەوانیشدا"سنان ئەحمەد ئاغا" سەرکردەی بەرەی تورکمانی بێـزاری خـۆی لەبەرامبەر دامەزراندنی چاپوك پیشانداو وەسفێکی سەیری ئەو ژنەی کرد بەوەی " هونەرمەنـدێکی گەورەیەو هیچ پەیوەندیەکی بەسیاسـەتەوە نییـەو رۆژێـك لـەرۆژانیش هـیچ چالاکییەکی سیاسـی نەبووە"، هەروەها دانانی چاپوکی بە"خیانەتکردن" لەتورکمان وەسفکرد٢.

هاوکات عەبباس ئەلبەیاتی ئەینداری گشتی یەکێتی ئیسلامی تورکمان هاوڕابوو لەگەڵ سـەرۆکی بەرەو نارەزایی خۆی پیشاندا و رایگەیاند: چاپوك وەرگێڕی ئەمریکایە نەك نوێنەری تورکمان٣.

---

2 – Turkmenali.2003."Iraqi Turkmen Front Submits demands to U.S. Civil Administrator."15August(L.N).

2-MENA(BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq Turkmen Front Rejects Turkmen Appointed to Governing Council."15July(LN).

3 -Anatolia(BBC Monitoring Middle East).2003."Turkey:Turkmen Party Official…"op.cit(LN).



PDF 4 KURD

لەیاداشتێکدا کە ئەلبەیاتی بڵاویکردەوە، تیایدا ئاماژەی بەوەکردووە تورکمانی شیعە کە لە ٥ ٪ی تورکمان پێکدەهێنن تورەو نائومێدن بەوەی کەهیچ کەسێك لەئەنجوومەنەکەدا نوێنەرایەتیان ناکات١. لەبەر ئەوە سەرانی بەرەی تورکمانی بڕیاریاندا کەچاپوك نوێنەرایەتی تورکمان نەکات چونکە سەر بەرێکخراوەکەیان نەبوو.

هاوکات سەرانی تورکمانی شیعەش رایانگەیاند: کەچاپوك نوێنەرایەتی ئەوان ناکات لەبەرئەوەی سوننەیە. هەڵوێستی بەرەی تورکمانیی عیراقی بەواتای ئەوەی بەرژەوەندی تورکمان تەنیا لەلایەن ئەندامێکی بەرەکەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، لەکاتێکدا هەڵوێستی ئەلبەیاتی ئەوەبوو کە ناکرێت تورکمانی شیعە نوێنەرایەتی بەرژەوەندی تورکمانی شیعە بکات.

بەو پێیەی بەرەی تورکمانی رێکخراوێکی سوننە بوو، ئەوە وایکرد ناکۆکیەکی سەرەکی لەهەڵوێستی تورکماندا سەرهەڵبدات و پەردە لەسەر رووی ئەو گرفتانە هەڵماڵێت کە ئاستەنگ بوون لەبەردەم هەوڵەکانی بەرەی تورکمانی بۆ جۆشدان و ئامادەکردنی تورکمان لەژێر پەیداخی خۆیاندا.

دیسان ئەو بەرەیە راستگۆیی خۆی لەدەستدا لەبەرامبەر بانگەشەکردنی بۆ ئەوەی کە خۆی وەك نوێنەری شەرعی تورکمان پیشان دەدا.

بەراگەیاندنی ئەو (٢٥) کاندیدە بۆ ئەندامێتی وەزارەتەکان لەسەرەتاکانی ئەیلولدا رەوشەکە بۆ تورکمان باشتر نەبوو، جگە لە"بەیان جەبر" یش نەبێت کەبە" بەیان باقر سۆلاغ" یش دەناسرێت و ئەندامی شیعی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی عێراق بوو(بەر لەگۆڕینی ناوەکەی) کەوەك وەزیری نیشتەجێکردن و ئاوەداکردنەوە دامەزرێنرا، ئەوا ( رەشاد مەندان عومەر) تەنیا نوێنەری تورکمان بوو کە لەحکومەتدا کرابووە وەزیری نوێی زاست و تەکنەلۆژیا.

دامەزراندنی عومەر کە ئەندازیارێکی مەدەنی و تێکەڵ بەسیاسەت بوو، بەشێوەیەکی هەرەمەکی دانرا کاتێك چاپوك لەلیستێکی (٥٠) کەسیدا لەنێو کاندیدەکانی تورکماندا دەستنیشانیکرد٢.

لەلێدوانێکیشیدا بۆ رۆژنامەی " کریستیان ساینس مۆنیتەر"، چاپوك بەراشکاوانە ئاماژەی بەشێوازی هەڵبژاردنی ئەو وەزیرە کردو رایگەیاند: کەسیقی ئەو (٥٠) کەسەم

---

1 - Al Hayat ((BBC Monitoring Europe).2003."Iraq Communities Demand Rpersentation Governing Council."1Augst(LN).

2- Pusher,I.R.2003."New Step Toward Ireaqi Self-Rule." The Christian Saience Monitor,.2September(http//www.csmonitor.com/ 2September(http//www.csmonitor.com/2003/0902/p06s01-woiq.htm1).



PDF 4 KURD

خوێندەوە، ناوی ئەو کەسانەم دەستنیشانکرد کە چانسی زیاتریان هەبوو، دواتر وەك چاپوك دەڵێت چاوم نوقاندو سورەتی فاتیحەم خوێندو بەچاونوقوی پەنجەم خستە سەر ناوەکان و ناوی وەزیری زانست و تەکنەبۆژیای نوێی عیراقم دەستنیشانکرد.

بەپێچەوانەی ئەوەوە کورد (٥) پۆستی وەزاری لەکۆی (٢٥) وەزارەت پێدرا لەوانەش پۆستی وەزارەتی دەرەوە کە دەستکەوتێکی گەورەبوو. هەڵبەتە رۆڵی ئەنجوومەنی حوکمڕانی و حکومەت لەئیدارەکردنی کاروباری عێراقدا پەراوێزخرابوو بۆیە بڕیارەکانیان جێبەجێ نەدەکرا، ئەگەر بهاتبایە لەگەڵ بیروڕای بریمەردا ناکۆك بووایە.

دیسان پێشوەخت بریمەر وەزیرەکانی لەسەر بناغەی موحاسەسەی تایفی بژاردە دەکرد کە دەبوو رەنگدانەوەی پێکهاتەکانی کۆمەڵگەی عێراقی بووایە. بەڵام ئەو دامەزراندنانە گرنگییەکی رەمزی هەبوو بەتایبەتیش بۆ کوردو تورکمان.

دیارە کورد یەکێکە لەپێکهاتە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی عێراقی و هەرچی تورکمان و مەسیحییەکانیشە خرانە خانەی پێکهاتەیەکی ترەوە، بەوجۆرە ئیتر لەو ساتەوە و لەرووی پراکتیکییەوە تورکمان هیچ قورساییەکی لەسیاسەتی نیشتیمانیدا نەما.

### پەنگخواردنەوە تایەفییەکان لەکەرکووکدا

رووداوە ئەمنییە مەترسیدارەکان لەچەند مانگی یەکەمی داگیرکاری لەکەرکووکدا کەم و ناو بەناو بوون بەڵام ئەوەی زیاتر مایەی نیگەرانی بوو، ئەوەبوو کە سەرانی سیاسی بەتایبەتیش سەرانی بەرەی تورکمانیی عیراقی دەستیان کرد بەئیستغلالکردنی کارە توندوتیژیەکان بۆ مەرامی سیاسی، یەکێکیش لەو دیمەنانە کاردانەوەی بەرەی تورکمانی بوو لەبەرامبەر کوژرانی باوك و کوڕێکی تورکمان کە لەناوەڕاستی مانگی نیساندا بوو.

بەگوێرەی رۆژنامەی(ئاغی) چالاکوانانی تورکمان ئاڵایەکی تورکیایان ئاڵاند لە تەرمی کوڕەکەو پاشان وێنەی تەرمەکیان گرت و پیشانی رۆژنامەنووسانی بیانیان دا.

چاودێرێکی بیانی بۆمافەکانی مرۆڤ کە لەشوێنی رووداوەکە بوو رایگەیاند: ئەوەی مایەی نیگەرانیە ئەوەیە، ئەو کارەی کە بەرەی تورکمانی کردوویەتی نەك هەر تۆمەتبارکردنی کوردە بەڵکو کوژرانەکەیان وەك سیمبولێکی ئیتنیکی بۆ بانگهێشتکردنی تورك و

رزگارکردنیان بەکاریان بردووە١. دیسان هەروەك یەكێك لەوكارە توندوتیژییە دەگمەنانەی کە لەنێوان تورکمان و کورد روویدا و لەهەمان کاتیشدا بە رووداوێکی مەترسیدار دەژمێردرێت، ئەو هێرشە چەکدارییە بوو، کە لەمانگی ئابدا کرایە سەر مەزارێکی شیعەکان لەتوزخورماتوو کە تورکمانەکان سەردانی دەکەن.

لەو هێرشەدا (٥- ٧) تورکمان و (٣)کورد بەفیشەك کوژران و لەگەرمەی پشێویەکانی دوای ئەو رووداوەش لەشاری کەرکووك خۆپیشاندانێکی دژی بەو هێرشە سازکراو لەوەشدا (٢) تورکمانی تر کوژران.

هاوکات لەلایەن بەرەی تورکمانیەوە ئۆباڵی رووداوەکە خرایە ئەستۆی پێشمەرگەکانی سەر بە(ی.ن.ك) و هەروەك ئەو بەرەیە هەوڵیدا رووداوەکە بۆ بزواندنی هەست و تورەیی بقۆزێتەوە.

هەروەها بەرەی تورکمانی کەژاوەیەکی بۆ گواستنەوەی تەرمی تورکمانەکان بەرەو نەجەف بەرێخست تالەوێ بەخاك بیانسپێرن.

رۆژنامەی "تورکمان ئیلی" زمانحاڵی بەرەی تورکمانی مەراسیمی بەخا سپاردنەکە وا وەسفدەکات:" تەرمی شەهیدەکان لەکەژاوەیەکدا گوازرانەوە بۆ شاری نەجەفی ئەشرەف تا لەوێ بەخاك بسپێردرێن، بەگەیشتنی کەژاوەکەش بە بەغداد رووی کەژاوەکە لە هوتێل فەڵەستین کرا کە رۆژنامەنووسانی بیانی تیایدا نیشتەجێبوون. ئەوەبوو تەرمەکان پیشانی راگەیاندنی جیهانی دران بۆ ئەوەی جیهان لەوە دڵنیا بێتەوە کە لەعێراقدا ئاسایش بەرقەرار نییەو ئەوانیش لەسایەی سەرکوتکردندا دەژین٢". بەڵام ململانێی تورکمانی کوردی زیاتر خۆی لەشەڕی سەرزارەکی و گوتاری گاڵدانئامێزویەکتر تۆمەتبار کردندا دەبینیەوە.

هەر رووداوێکیش کە لەنێوان تاکەکانی هەردو پێکهاتەکەدا روویان دەدا بەشێك بوون لە پیلانگێڕی ئەمریکا- کورد بۆ کۆنترۆڵکردنی شارەکەو سڕینەوەی ناسنامەی تورکمانبوونی (بەپێی ماس میدیاکانی پەیوەست بە بەرەی تورکمانی ).

هەرچی پەیوەندی بە کوردو عەرەبیشەوەیە ئەوا پرسەکانی پەیوەست بە مافی موڵکدارێتی و گەڕانەوەی کوردانی راگوازراو بۆ ناوچەکەو چارەنووسی هاوردەکان دەبیزواند.

---

1 - O'Loughlin,E.2003."Oil-rich Kirkuk a Fertile Ground for Racial Rivalry." The Age,18 April:10.

2 - Turkmenali.2003."Iraqi Turkmen March in Kirkuk Protesrs Tuzkhurmatu Incident."24 August(WNC).

PDF 4 KURD

سەرباری ئەوەی ئەو سیناریۆیە ئەگەری رووداوگەلێکی کاری توندوتیژی پێوەدیاربوو بەلاّم رووداوەکانی پەیوەست بە راگواستنی مەرنهەجی و بەزۆری عەرەب لەسەرخاك و مالّی خۆیان شتێکی هەلاّویردکراو بوو.

هاوکات بەپێی رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ Rights Wacth Human باس بەوە دەکرا کە (ی.ن.ك) لە شاری خانەقین نزیکەی (٦٠٠) خێزانی عەرەب (نزیکەی ٤٠٠٠کەس)ی دەرکردوە لەکاتێکدا پێدەچوو نزیکەی (٢٠٠٠) عەرەبیش لەباشووری شارەکەدا دەرکرابن دوای ئەوەی لەلایەن پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانیی کوردستانەوە هەڕەشەیان لێکرا کە لەسەر خاکی کوردان کۆمەلّێك گوندیان دروستکردبوو١.

لەهەمان شاردا چەند رووداوێکی تۆقاندن لەدژی ئەو عەرەبانە ئەنجامدران کە مولّك و مالّی کوردیان داگیرکردبوو بەلاّم گشت ئەو رووداوانە وەك ئەو حەمامی خوێنە نەبوون کە زۆرێك بەر لەجەنگ چاوەڕوانیان دەکرد، ئەوەش چەند هۆیەکی لەپشتەوە بوو یەکەمیان، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کە هەولّێکی راستگۆیانەی دا بۆ رێگرتن لە رووداوی پرۆسەی پاکتاوی نەژادی " پێچەوانە".

لای خۆشیەوە رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ پێیوابوو کە بەرپرسانی ئەمریکی " هەنگاوێکی یەکلاکەرەوەیان ناوە بۆ رێگرتن لە راگواستنی بەزۆری عەرەب و ئەوانیتر لەکەسانی بێدەسەلاّت.... کاتێکیش هێزەکانی ئەمریکا لەناوچەکەدا جێگیر دەبن ئەوا سیاسەتێك پەیڕەو دەکەن، کەرێگە نادات بە"مالّ چۆلّکردن" تا ئەو دەمەی میکانیزمی چارەسەر بۆ کێشەی مولّکدارێتی دەدۆزرێتەوە٢. دووەم، سەرانی هەردو پارتە کوردیەکە پابەند بوون بە پرۆسەی رێکخراوو یاسایی بۆ گەڕاندنەوەی کورد بۆ ناوچە تەعریبکراوەکان و چارەسەرکردنی کێشەی مولّکدارێتی بەواتای دان بەخۆداگرتن لەزۆربەی جموجۆلّەکانیاندا.

سێیەم، زۆرێك لەعەرەبە هاوردەکان بەتایبەتیش لەناوچە گوند نشینەکاندا لەکاتی جەنگدا بەویستی خۆیان رۆیشتنیان هەلّبژاردو ئەو زەویانەیان بەجێهێشت کە مولّکی خەلّکانی تر بوون.

دواجار ئەو کوردە راگوازروانەی کە مولّك و مالّیان درابووە عەرەب سەر لەنوێ نیشتەجێکرانەوە کە بەشێکیش لەوانە لەکەرکووکدا بوون.

١- رێکخراوی چاودێریکردنی مافەکانی مرۆڤ.

aClaims in Conflict..Op.cit:35 Watch Human Rightch ,

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو،٤٣.

بێگومان بەچەند ستراتیژێکی جیاواز گۆڕانکاری لەپێکهاتەی دانیشتوانی شاری کەرکووکدا روویدابوو، لەوانە خاپوورکردنی تـەواوەتی چـەند گـەرەکێکی کوردنشـین، ناوچـەی شـۆڕیجە یەکێکە لەو نموونانەی کەخەڵکەکەی دەرکراو تیایدا گەڕەکی نویٚ(گەڕەکی قادسییە) بۆ عەرەبی هاوردە دروستکرا١. دیارە هیچ لەو ستراتیژانەش راستەوخۆ موڵك ومالّی کوردیان نەبەخشییە عەرەبە هاوردەکان و ئەوەش وایکرد کە پرسی کوردانی گەڕاوە نەبێتە هۆی دەرکردنی بـەزۆری ئەو عەرەبانەی کە لەماڵەکانیاندا نیشتەجێببوون.

لەراستیدا گرفتی کوردە گەڕاوەکان بۆ شارەکە گرفتێکی لۆجستی بوو کەهیچ پەیوەندییەکی بە نائۆقرەیی خەڵکەکەوە نەبوو. دیسان زۆرێکیش لەکوردە گەڕاوەکان خانوویـان نـەبوو تـابۆی بگەڕێنـەوە، هـەروەها رێنمـایش بـۆ ئـەوانیتر دەرچـوو لەچـاوەڕوانیدابن تـا ئـەو دەمـەی میکانیزمێك بۆ یەکلایی کردنەوەی کێشەی موڵکدارێتی دەبینرێتەوە.

ئەوەبوو ناوەندی کاتی وەك پەناگەیەك لەشارەکەدا دروستکران لەوانەش یاریگـەی شـۆڕیجە کە لەمانگی حوزەیراندا پتر لە(٧٠٠) خێزانی گەڕاوەی لەخۆگرت کـە لـەبارودۆخێکی دژوارو سەختدا ژیانیان بەسەر دەبرد. زۆرێکیش لەو رووداوە توندوتیژانەی کە لەمانگەکانی یەکـەمی پاش جەنگ روویانـدا لـەنێوان کـوردو عەرەبـدا، کاردانـەوەی ئـەو کێشمەکێشـانەبوون کـە لەشاروگوندە هاوسێکانی کەرکووك روویاندابوو.

بۆنموونە لەناوەڕاستی مانگی ئایاردا لەدەرەوەی کـەرکووك ئـاگر لـە گونـدە عەرەبییـەکان بەردراو شەڕ لەنێوان عەرەبی خەڵکی کەرکووك و کوردا لەسەر شەقامەکانی شـارەکە روویـداو ئەوەش بەلانی کەمەوە کوژرانی (١٠) کەسی بەدواوە بوو، بەڵام لەگەڵ هاتنی هاوینـدا کـارە توندوتیژیەکان لەکەرکووك بەرەو ئاقارێکی زۆر خراپ و مەترسیدار چوون.

### سەرهەڵدانی یاخیبوونی چەکداری

زۆربەی چاودێران دەستپێکی یـاخیبوونی چـەکداری لەعێراقـدا بـۆ رووداوەکـانی فەلوجـە دەگەڕێننەوە کە لەکۆتایی نیسانی ٢٠٠٣دا روویاندا.

---

2 – لەسەردەمی رژێمی بەعسیدا رێگە بە کورد نەدەدرا ببنە خاوەنی موڵك و زەوی و زارو خانوو بەڵکو لەخانووی کرێدا نیشتەجێ دەبوون.

PDF 4 KURD

ئەوەبوو لەمیانەی خۆپیشاندانێکی نارەزایی کە لەشارەکەدا سازکرابوو لەدژی داگیرکردنی خوێندنگەیەك لەلایەن سوپای ئەمریکاوە کوژرانی (١٧)کەس و برینداربوونی (٧٥)ی تری لێکەوتەوە، کاتێك هێزە ئەمریکاییەکان تەقەیان بەنێو خۆپیشاندەرەکاندا کرد.

لەماوەی نێوان ١ی ئایارو رۆژی راگەیاندنی کۆتایی هاتنی پرۆسە سەربازییە گەورەکان و ٢١ی تەمووز، (٣١) سەربازی ئەمریکایی لەسەر دەستی یاخیبووەکان کە ریزەکانیان لەفراوانبووندا بوون، کوژران.

دەرکەوتنی یەکەم ئاماژەش بۆ سەرهەڵدانی بەرگری رێکخراو لەدژی بوونی ئەمریکا لەپارێزگای کەرکوك لەناوەراستی مانگی ئایاردا بەدیکرا، کاتێك کاروانێکی سەربازیی سوپای ئەمریکا لەگوندی" سیحا" لەسەر رێگەی کەرکووك- حەویجە کەتە بۆسەیەکەوە.

لەسەرەتای حوزەیرانیشدا یەکەمین کاری رێکخراوی تێکدەرانە لەدژی دامەزراوە نەوتییەکان لەکەرکووك راگەیەنرا١. ئیتر لەو رۆژە بەدواوە هەفتانە هەوڵی پەکخستنی هەڵمژین و رەوانەکردنی نەوت لەو بۆریەدا دەدرا کە لەباشووری کەرکووکەوە بەرەو پالاوگەی بێجی درێژ ببوەوە.

لەماوەی نێوان مانگەکانی حوزەیران و کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣، لەلایەن وەزارەتی نەوتی عێراقەوە (٨٤) کاری تێکدەرانە لەدژی دامەزراوە نەوتی و گازییەکان لەعێراقدا تۆمار کران٢.

بەهاتنی کانوونی یەکەم هێرشە یەك لەدوای یەکەکانی سەر دامەزراوە نەوتییەکان عێراقی دەوڵەمەند بەنەوتی ناچارکرد (٤٠٪)ی پێداویستی ناوخۆیی لەسووتەمەنی هاوردە بکات.

هەر لەهەمان ماوەدا بەنزیکەیی (١٨) هێرش کرایە سەر وێستگەکانی وزەی کارەبا لە کەرکووکدا و یەکەمین هێرشیش کە لە٢٩ی ئەیلوولدا بوو، بوە هۆی برینی کارەبای کەرکوك، کە ئەوەش وایکرد وێستگەی هەڵمژین و رەوانەکردنی ئاو رابوەستێت و بەدرێژایی (٣) رۆژ دانیشتوانی کەرکووك بێ ئاو بمێننەوە.

ئەوە وایکرد سوپای ئەمریکا لەتەموزدا ناچاربێت پەنا بۆ ئەو کارەبەرێت کە رژێمی پێشوو پەنای بۆ دەبرد لەپێدانی پارە بە عەشیرەتەکانی ناوچەکە بۆ پاراستنی ئەو بۆریانەی کە بەزەویەکانیاندا رەتدەبوون.

دیارە هەنگاوەکانی یەکەمی ئەو تاقیکردنەوەیە جێی دڵنیابوون نەبوون، بۆنموونە رێککەوتنێك لەگەڵ شێخ عاسی عوبێدی بەبڕی (٦)هەزار دۆلار لە١٧ی تەموزدا بۆ ماوەی ٣

---

1 - Anatolia(BBC Monitoring Europe).2003."Turkish Foreign Minster Confirms Pipeline Blast was Sabotage."13June(LN).

2 -Agence France Press.2003." Iraq Es Oil Pipelines Hit83 Times since Saddam Fell: Official."11December.

PDF 4 KURD

مانگ ئیمزا کرا بەڵام لەوماوەیەدا هێرشەکان بۆ سەر ئەو بۆریانە زیادیان کردو ئەوەش وایکرد خودی شێخی ناوبراو دەستگیربکرێت١. بۆیە بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی درێژخایان بۆ کێشەکە دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی لەعێراق گرێبەستێکی بەبڕی (٤٠)ملیۆن دۆلار لەگەڵ کۆمپانیای Erinys ی باشووری ئەفریقا ئیمزا کردبۆ پێکهێنانی هێزێك کەئەرکی پاراستنی دامەزراوە نەوتییەکان بێت بەڵام بەچاودێری سوپای ئەمریکا.

کاتێکیش مەشق و راهێنان بە(١٠) هەزار پۆلیسی تایبەت بە کەرتی نەوتی کرا، ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا هەرپشتی بە عەشایرە عەرەبە سوننەکان دەبەست، لەهەنگاوێکیشداکە جێگەی مقۆمقۆ بوو داوا لەهێزی پێشمەرگە کرا دامەزراوە نەوتییەکان بپارێزن٢.

## هاوپەیمانی عەرەبی- تورکمانی

لەبەراییدا یاخیبوونە چەکدارییەکە بەشێوەیەکی ناوبەناو ژێرخانی دەکردە ئامانجی پەلامارەکانی، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات توندوتیژییەکانی ئەو یاخیبوونە رووی لەهەڵکشان کردو کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو بۆ سەر پەیوەندییە ئیتنیکیەکانی کەرکوك و ئەوەش وایکرد ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زیاتر پشت بە هێزە ئەمنییە کوردیەکان ببەستێ وگومان لە پێکهاتە ئیتنیکیەکانی تر بکات بەتایبەتیش عەرەبی سوننە.

ویلایەتە یەکگرتوەکان لەهەوڵەکانی بەردەوامبوو بۆ پێکهێنانی پۆلیسی فرە ئیتنیك بەجۆرێك رێژەی هەر پێکهاتەیەك هێندەی قەبارەی دانیشتوانەکەی ژمارەی خۆی لەپۆلیس هەبێت.

---

١ - Mulholland,R.2003."The Iraqi Sheikh, the American l and the Oil Piplines."Agence 11December.

٢- Khabat (BBC Monitoring International Reports). 2003."Iraq: Kurdish Peshmergas Start Protecting Oil in Dibs."8 November (LN). کاتێك مەشقی پۆلیسی عێراقی تەواو بوو ژمارەیان ١٤ هەزار پۆلیس بوو لەسەر تاسەری عێراق و ٦٤٠٠کەسیشیان لە باکوور جێگیر ببوون، کە زۆربەشیان سەر بەهێزی پێشمەرگە بوون هەروەك پیتەر براون بەرێوەبەری ئۆپەرەیشنەکان لە کۆمپانیای Erinys دانیپێدا دەنێت و بێ دوودڵی دەڵێت: زۆربەی ئەو پۆلیسانەی کە لە پاییزدا بەگەڕخران سەر بەهێزی پێشمەرگە بوون کە ئەو کات لەبەردەستدا بوون .

هەروەها براون دەڵێت لەو دەمەدا پلانێکی گشتگیر نەبوو بۆئەوەی کورد لەپێشتر بێت لەبەرامبەر گروپەکانی تر بۆ بەکارخستنیان. دیسان پەنابردنی کۆمپانیای ئارینیس بۆ عەشایرە عەرەبیەکان وەك هەوڵێك بوو بۆ راستکردنەوەی جیاوازی لە ژمارەی نێوان کوردو گروپەکانی تردا.

Pelham.N.2004."Iraq Questhon capability of Group Guarding Oil Facilities ." Financial Times ,10 August:7.

PDF 4 KURD

بەو جۆرە لێكترنزیككردنەوەیە سیستمی كۆتای لێكەوتەوە و بەوەش پشكی كورد لەنێو هێزەكانی پۆلیسدا لە(٤٠٪)، عەرەب(٢٧٪)، توركمان(٢٥٪)، مەسیحی(٨٪) بوون كاتێكیش ئەو سیستمە جێبەجێكرا ڕێژەی نوێنەرایەتیكردنی كورد گەورەتربوو.

بەوشێوەیە هەریەك لە مەسیحی و توركمانەكان دووچاری دژواری بوونەوە لەپڕكردنەوەی ئەو پۆستانەی كەبۆیان تەرخانكرابوو١. ئەو پرسەش كە پەیوەندی بە متمانەو ئەمەكداری نێوان پۆلیسە عەرەبەكانەوە هەبوو لەپاییزو سەرەتای زستانی ٢٠٠٣دا لەگەڵ هەڵكشانی یاخیبوونی چەكداری گومان و بەڵگەكان لەسەر تێوەگلانی پۆلیسی عەرەب لەهێرشە چەكداریەكاندا زیادیكرد.

بۆنموونە لەسەرەتای كانوونی یەكەمدا هێزەكانی ئەمریكا (٢٤)عەرەبیان دەستگیركرد كە لەنێویاندا (٥) ئەفسەری پۆلیسی تێدابوو، كە بەشداربوون لەو پیلانەی بۆ پەلاماردانی بنكەیەكی سەرەكی هێزەكانی ئەمریكا لەفرۆكەخانەی كەركووك داڕێژرابوو، ئەوەش بەماوەیەكی كەم دوای ئەو هەڵمەتە هات كە هێزە كوردی و ئەمریكاییەكان لەشارۆچكەی حەویجە ئەنجامیاندابوو بۆ گەڕان بە دوای ئەو كەسانەی هێرشیان كردبووە سەر هێزەكانی هاوپەیمانان.

دیارە ئەنجامی ئەو هەڵمەتەش دەستگیركردنی (٣٤)كەسی گومانلێكراو بوو ئەمە جگە لەوەی دەستیش بەسەر بڕێكی زۆری چەكی سووك و (٥) سەكۆی موشەكیدا گیرابوو، بەڵام هەروەك پەیامنێری ڕۆژنامەی كریستیان ساینس مۆنیتەر كەیاوەری هێزەكانی ئەمریكا بووە، ئاماژەی بەوەكردوە ئەو كارە تورەبوون و بێئومێدی لەنێو خەڵكی شارۆچكەكەدا بەجێهێشتوە٢.

لەنێو ئەو دەستگیركراوانەی حەویجەدا (موقەدەم عەواد جبوری) فەرماندەی پۆلیسی ئەو شارۆچكەیەی تێدابوو كە بەدرێژای ماوەی پرۆسەكە ڕێگەی پێنەدرابوو بچێتە ناو حەویجەوە. ئەمە جگە لەوەی زۆرێكیش لەپۆلیسی حەیجە لەلایەن هێزەكانی ئەمریكاوەدەستگیركران.

---

١ -سەبارەت بەپڕكردنەوەی پشكی توركمان بڕوانە: Turkmenali (BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq Kirkuk Police Mount Turkmen Recruitment Drive Following Incidents."10September(NL).

سەبارەت بەجێبەجێكردنی سیستمی موحاسەسە كە لەلایەن دەسەڵاتی نێودەوڵەتی هاوپەیمانانەوە پشتیوانی لێدەكرا بڕوانە: voice of the Mujahidin ( BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq Es Kirkuk police "excludes from service"350 Kurds-Shr'I radio."18September (LN).

1-Blanford, N.2003."U.S.Raid Gets(Mixed) Results." The Christian Science Monitor,4 December:06.

هەڵبەتە ئەو جۆرە رووداوانە کە زۆرجار روویان دەدا رۆڵیان نەبوو لەکەمکردنەوەی ئەو پێشخواردنەوەیەی لەنێوان عەرەبی کەرکووك و هێزەکانی ئەمریکادا هەبوو.

جگە لەوەش ئەو رووداوانە لەلای پێکهاتەکانی تر رۆڵێکی سەرەکیان هەبوو لەدروستکردنی ئەو بۆچوونەی کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەشێوەیەکی مەنهەجی لایەنگری لەبەرژەوەندی کورد دەکات بەتایبەتیش لەپرسە ئەمنیەکاندا.

کورد لە"هێزی بەرگری میللی" دا کە تازە پێکهێنرابوو زۆرینە بوون و لەرووی ژمارەشەوە زۆر زیاتر بوون لەپێکهاتەکانی تری نێو هێزەکانی پۆلیس. هەروەها زۆربەی پۆستە بالاکانیشیان لەدەستدابوو، دیسان هێزە ئەمنیەکانی سەر بەهەردو پارتە سەرەکیەکەی کورد بەشێوەیەکی دەستکراوە لەشارەکەدا کاریان دەکرد و بەردەوام بوونیش لە پرۆسەی ریشەکێشکردنی بەعس و دوورخستنەوەی ئەو بەعسیانەی کە پلەو پایەی بەرزیان لەو حزبەدا هەبوو، لەنێو دەزگا ئەمنی و ئیداریەکانی شارەکەدا دوژمنایەتی لای عەرەب زیاتر کرد.

دەستەی ریشەکێشکردنی بەعس لەکەرکووکدا بەسەرۆکایەتی تورکمانێك "عیرفان کەرکووکی" بوو، کە ئەرکەکانی بەجۆشەوە جێبەجێدەکرد و هەمان جۆش و خرۆشی دەستەی نیشتمانی هەبوو بۆ ریشەکێشکردنی بەعس.

ئەوەبوو گشت ئەو حزبیانەی کە پلەی لێپرسراوی فیرقەو سەروتریان هەبوو دوورخرانەوە. بەهاتنی مانگی ئەیلولیش دەستەکە سەرکەوتوو بوو لەدورخستنەوەی نزیکەی (١٠٠٠) بەعسی لەفەرمانگە جۆربەجۆرەکانی شارەکەدا.

دوژمنایەتی عەرەبی کەرکووك و تورکمانیش پێکەوە بەوشێوە هەڵکشاوە وایکرد ئەگەری هاوپەیمانی ستراتیژی لەنێوان ئەو دوو پێکهاتەیەدا بێتە ئاراوەو (عەبدولفەتاح ئەلموسەوی) نوێنەری موقتەدا سەدریش سەردانی کەرکووك بکات بۆ جۆشدان و ئامادەکردنی بەرهەڵستکارانی دژ بە کورد و ویلایەتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی رێکخراو.

بەماوەیەکی کەم لەپاش گەیشتنی موسەوی بۆ کەرکووك، سەردانەکەی یارمەتیدەر بوو بۆ رێکخستنی نارەزایی لەدژی هەڵکردن و بەرزکردنەوەی ئالای کوردی لەشارەکەدا، ئەنجامی ئەوەش ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەستیکرد بەداگرتنی ئالای کوردو دیسان ئەوەش لەشۆڕیجە سەربازانی ئەمریکا ی لەلایەن کوردەوە رووبەڕووی بەردبارانکردن کردەوە.

لەهەیلولدا موسەوی پێکهێنانی "هێزی پاراستن"ی عەرەبی- تورکمانی هاوبەشی راگەیاند بۆ بەرەنگاربوونەوەی " ئیستفزازی کورد" و " ئەنجوومەنی عەشایرەکان" و رێکخستنی چالاکییە سیاسیەکان لەدژی کورد.

لەهەمان مانگدا (٣٤) بزوتنەوەی سیاسی تورکمانی وەك سەرچاوە تورکمانیەکان ئاماژەیان پێکردوە١، کۆنگرەیەکی سێ رۆژەیان لەکەرکوك سازکرد بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی نوێی بەرەی تورکمانی و دارشتنی ستراتیەکان بەئامانجی بەرەنگاربوونەوەی هەژمونگەرایی کورد لەشارەکەدا٢.

هەر لەو کۆنگرەیەدا دوو حزبی تورکمانی شیعی و خودی موسەوی و ژمارەیەك لەسەرانی عەشیرەتە عەرەبییە سوننەکان ئامادەبوون. کاتێکیش لە(فاروق عەبدوڵلا عەبدولرەحمان" سەرۆکی بەرەی تورکمانی پرسیارکرا سەبارەت بەوەی کەئامادەبوونی سەرانی عەشایرە عەرەبیەکان بەواتای پێکهێنانی هاوپەیمانی تورکمانی- عەرەبی لەدژی کورد لەوەڵامدا وتی: پێشتر لەشارەکەدا تەعریبکردن هەبوو بەڵام لەئێستادا تەکرید(بەکوردیکردن) هەیە. ئێمەش هەرگیز ئەوە پەسەند ناکەین بەڵکو ئامادەین تێبکۆشین لەپێناو رێگرتن لەوکارەو لەگەڵ عەرەبیش لەسەر ئەو پرسە هاوڕاین٣.

لەکانوونی یەکەمدا خۆپیشاندان و خۆپیشاندانی دژ روویاندا، پاش ئەوەی هەواڵی ئەوە لەئارادابوو کەسەرانی کورد لەبەغداد پرۆژەیەکیان پێشکەش بەئەنجوومەنی حوکمڕانی کردوە سەبارەت بەئیعترافکردن بەهەرێمی کوردستان وەك هەرێمێکی فیدراڵی.

لە٢٢ی کانوونی یەکەمدا نزیکەی(١٠) هەزار کورد لەشەقامەکانی کەرکوکدا بڵاوبوونەوەو پشتیوانی خۆیان بۆ خواستی فیدراڵی و گەڕانەوەی کەرکوك بۆ سەر هەرێمی کوردستان پیشاندا.

لەبەرامبەریشدا سەرانی سیاسی تورکمان و عەرەب خۆپیشاندانێکی دژیان سازکردو تیایدا هەڕەشەی رژاندنی خوێن و فرمێسکیان کردو هەروەها خۆپیشاندانی کوردیان بە ئیستفزازی وەسفکرد٤. ئەنجامی ئەوەش لە٣١ی کانوونی یەکەمدا لەنێوان (٢- ٢٠) هەزار عەرەب و تورکمان

---

1 - Kurdistan Nuwe(BBC Monitoring Middle East).2003."Iraq: Official Confirms Dismissal of Ba Æathists from Government Posts in Kirkuk."3October(LN).

2- Turkish Probe .2003. " Turkmens Seek U.S. to End Kurdish Domination in Kirkuk . " 21 September ( LN ).

3 - Unlu , M . 2003. " New Leader of Turkmens Says Turkey Won Æt Intervene in ITF Æs Policies." Turkish Daily News ,17 September.

4 - Konya ( BBC Monitoring International Reports ). 2003. " Turkish Agency : Iraqi Turkmen Official Says Kirkuk Will Never be Kurdish City ." 23 December ( LN ).



PDF 4 KURD

جەماوەریان بەپێی خەملاندنەكان جیاوازبوون لەوانەش خەملاندنی موسەوی، خۆپیشاندانێكی نارەزاییان لەدژی پرۆژەكەی كوردو جاڕدانی فیدراڵی سازكرد و خۆپیشاندەرانیش رژانە سەرشەقامەكان و گەمارۆی بارەگای(ی.ن.ك) یان دا و ١لەو میانەشدا تەقەكردن روویداو بەهۆشیەوە (٥)كوژراو(٢٠) بریندار كەوتنەوە كەسەرجەمیان لەخۆپیشاندەرەكان بوون.

دواتر گێڕانەوەكان جۆربەجۆربوون، هەرچی توركمانە رایگەیاند: پێشمەرگەكانی سەر بە یەكێتیی نیشتمانی كوردستان تەقەیان لەو خۆپیشاندانە ئاشتیانەیە كردوە بەڵام لای خۆشیانەوە راگەیاندنی كوردی وایبلاوكردەوە، كەخۆپیشاندەرەكان تێكەڵەیەك بوون لەبەعسیو پەڕگیرەكانی نێو بەرەی توركمانی كە وێنەی سەددامیان بەرزكردوەتەوەو تەقەیان لەبارەگەكەی یەكێتی كردووە٢.

دیارە گێڕانەوەی لایەنی كوردی بۆ رووداوەكان پشتیوانی عەقید(ولیام مایڤیل) ی فەرماندەی لیوای ١٧٣ی بەدەستتهێنا٣. هەرچی رۆژنامەی توركیش دەیلی نیوز- Turkish Daily News یشە شرۆڤەكردنێكی قوڵترو ژیرانەتری بۆ رووداوەكە هەبوو.

لەو رۆژنامەیەدا هاتبوو، كە بوونی كورد نوێنەری موقتەدا سەدر رۆڵی هەبووە لەپاڵنان بە توركمانەوە بۆ هاوكاریكردنی عەرەب و دواتریش دەگاتە ئەو بۆچوونەی كەنووسەر بڵێت خۆپیشاندانی توركمان و عەرەب لەدژی كورد كە توندوتیژی بەدواوە بوو دەرهاویشتەی ئەو هاوپەیمانێتییە نهێنیە نەنووسراوەی نێوان توركمانی شیعەی هەواداری سەدرو عەرەبی سوننەی لایەنگری سەددامن٤.

دیارە جیاكردەوەی راستی لەدرۆلەسیاقی بارودۆخی كەركووكدا ئەركێكی گرانە بۆ ئەو كەسانەی كە ئەو كارە دەخەنە ئەستۆی خۆیان بەڵام بەهاتنی ساڵی نوێ نەدەكرا سێ راستی بەرچاو پشتگوێ بخرێن.

یەكەمیان، كارە توندوتیژیەكان لەكەركووكدا روویان لەهەڵكشانكرد و روو بەڕووبوونەوەی نێوان پێكهاتەكان و پەلامارداني چەكداریش لەدژی یەكتری وەك یەكە.

---

1- Agence France Press . 2003. " Arabs , Turkmen demonstrate against kurds in Kirkuk ." 31 December.

2-KurdSat ( BBC Monitoring Middle East ) .2004. " Iraq : U.S. Colonel Says Demonstrators Fired at Kurdish Party Office in Kirkuk ." 1 January ( LN ).

3- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

4 - Candar , C. 2004. " Revisiting the Kirkuk Issue." Turkish Daily News , 10 January (LN ).

دووەم، پێکهاتە ناکوردییەکانی تر لەکەرکووکدا پێیان وابوو باڵا دەستی کورد دەرئەنجامی دەستێکەلاوکردنیانە لەگەڵ هێزەکانی ئەمریکا.

سێیەم، ئۆپۆزسیۆنی رێکخراو لەدژی هەژموونی کورد دەستیکردوە بەخۆدەرخستن لەشێوەی هاوپەیمانیی ستراتیژی نێوان تورکمان و عەرەب و گشت بەرەو پێشچوونەکانی داهاتووش مزگێنی خڕو ئارامییان بۆ شارەکە پێنییە.

## نوێکردنەوەی ئەنجوومەنەکە

لەکۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)دا و لەچوارچێوەی رێککەوتنامەی ١٥ی تشرینی دووەم، پرۆسەی سەرلەنوێ رێکخستنەوەی حکومەتە خۆجێییەکان لەسەرتاسەری عێراق دەستیپێکرد.

رێککەوتننامەکە چوارچێوەیەکی کاتی بۆ گەڕاندنەوەی سەروەریی بۆ عێراق و سیستمێکی تەواوکاری بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجوومەنی کاتی نیشتمانی دانا و بەو پێیەش بێت دەبوو لە ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٤دا سەروەری بۆ عێراق بگەڕێتەوە.

بەپێی ئەو سیستمەش لەسەرجەم پارێزگاکاندا کە ژمارەیان ١٨ پارێزگایە لیژنەی رێکخستن پێکهێنراو هەر یەکێکیش لەو لیژنانە (١٥) ئەندامی لەخۆگرتبوو، هەڵبژاردنی ئەندامەکانیش بەپێی فۆرمێکی ئاڵۆزبوو، کەئامانج لێی رێگەخۆشکردن بوو بۆ ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەست لەئەنجامەکان وەربدات و مەرامیش لە پرۆسەکە جێبەجێکردنی یەك پێودانگبوو.

لەبنیادنانی پێکهاتەی ئەنجوومەنی پارێزگاکاندا لەرووی ژمارەی ئەندامان و رێژەی دانیشتوان مۆدێلی ئەنجوومەنی پارێزگای موسڵنا بەنموونە وەرگیرا بۆ نۆێکردنەوەیان واتە لەبەرگرتنەوەی دابەشکردنی دانیشتوان کە لەدامەزراندنی ئەنجوومەنی ئەو پارێزگایەدا وەك بنەمایەك پشتی پێبەسترابوو.

بەپێی ئەو فۆرمە (١٢) کورسی بۆ نوێنەرانی عەشایرو (١٢) کورسی بۆ حزبە سیاسیەکان و (١٢) کورسی بۆ رێکخراوە مەدەنیەکان و (٢) کورسی بۆ ژنان و (٢) کورسیش بۆ زانایانی ئایینی تەرخانکرابوون، کە کۆی کورسییەکانیش (٤٠) کورسی بوون بەڵام ئەو کارە بۆ هەندێك لە پارێزگاکان گونجاو نەبوون١.

---

1 - International Crisis Group. 2004."Can Local Government Save Iraq" Brussels:ICG Middle East Report,33,27October:11.

PDF 4 KURD

لەکەرکووکدا ئەو فۆرمە پشتگوێخرا ئەویش لەترسی ئەوەی نەبا کاریگەری لسەر بارودۆخی ئیتنیکی بەجیبهێڵێت کە بۆخۆی پیشی خواردبووەوە.

بۆیە لەبری ئەوە سوپای ئەمریکا ئەو دەرفەتەی قۆستەوە بۆ زیاتکردنی ژمارەی نوێنەرانی عەرەب لەئەنجوومەنی پارێزگاکەدا ئەویش وەك هەوڵدانێك بۆ رێگریکردن لە یاخیبوونی چەکداری.

ئەوەبوو ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك لە(٤٠)ئەندام پێکهێنرا، کە (١٣) کوردو (١٢) عەرەبو (٨)تورکمان و (٧) مەسیحی لەخۆگرتبوو، هەرچەندە (٢) لەنوێنەرانی عەرەب بایکۆتی ئەنجوومەنەکەیان کرد.

بەوجۆرە ئەنجوومەنێکی بنکە فراوان بۆ پارێزگای کەرکوك پێکهێنرا کە (١١) لەئەندامەکانی خەڵکی دەرەوەی شارەکە بوون دیسان لەڕووی رەگەزیشەوە ژمارەی ئەندامە ئافرەتەکان لە(١) ئافرەتەوە بۆ (٤) ئافرەت بەرز بوونەوە، بەڵام زیادکردنی نوێنەرایەتی عەرەب هیچ گۆڕانکاریەکی جەوهەری لەهاوسەنگیی هێزی پێکهاتەکانی ناو ئەنجوومەنەکەدا دروست نەکرد، چونکە بوونی(١٣) ئەندام لەنوێنەرانی کوردو(٧) مەسیحی و (٢) ئەندامی پێکهاتەکانی تر لە لایەنگرانی کورد بەسبوون بۆ ئەوەی پارێزگاری لە زۆرینەی پێویست بکەن و کارەکانی ئەنجوومەنەکە رایی بکەن و بەوەش کورد باڵادەست بێت بەسەر پۆستە گرنگ و ئیدارییەکانی شارەکەدا.

بۆیە نوێکردنەوەی شارەکە شتێکی ئەو تۆی نەکرد کە نیگەرانی تورکمان و عەرەب بڕەوێنێتەوە لەبەرامبەر هەژموونگەرایی کورد بەسەر کەرکوك و دەستێکەڵاوکردنی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەگەڵیاندا[1].

## کورد پارێزگاری لەباڵادەستیان دەکەن

سەرباری ئەوەی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك بەو پێکهاتە نوێیەوە لەڕووی تیۆرییەوە لەئەنجوومەنەکەی تر بەهێزتر و لەڕووی یاسایشەوە دەستبەکارتر بوو بەڵام لەڕووی رێکخستنەوە پەیوەندیەکانی نێوان بەغدادو پارێزگاکان هێشتا لەژێر رکێفی یاسای ژمارە (١٥٩)ی ساڵی ١٩٦٩ی پارێزگاکاندا مابوو کە لەرۆژگاری بەعسدا دەرچووبوو.

---

1– بەهەمان شێوەی ئەنجوومەنە بنەڕەتیەکە ، کارێکی ئەوتۆ نەبوو بۆ رازیکردنی نوێنەرانی تورکمان جگە لە دامەزراندنی زۆریەی ئەندامە تورکمانەکانی ئەنجوومەنەکە نەبێت.

PDF 4 KURD

بەپێی ئەو یاسایە تەنیا لەسەر کاغەز دەسەڵاتی فراوان دەدرایە حکومەتی خۆجێی و هەتا دەرچوونی فەرمانی ژمارە (٧١) لەلایەن دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی لەنیسانی ٢٠٠٤، بەپێی رەوشە خۆجێییەکان کارەکانی رایی دەکرد.

لەکەرکووکدا پرۆسەی نوێکردنەوەی ئەنجوومەنەکەی دەرفەتێك بوو بۆ سنورداركردنی نفوزی پارتە سیاسیەکان بەتایبەتیش پارتە کوردییەکان و کاریگەریان لەسەر بڕیارەکانی ئەنجوومەنەکە.

لەوسیاقەدا سەرچاوەکانی راگەیاندن بڵاویانکردەوە کە" ئەنجوومەنەکە لەتوانایدایە بەپێی دەسەڵاتە نوێیەکان بەڕێوەبەری فەرمانگە حکومیەکان و بەدوور لەفشاری حزبی بڕاردە بکات و ئەو فەرمانبەرانەش لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت کە بەرژەوەندی حزبی لەسەرو پێداویستی شارەکەوە دادەنێن١. هەروەها هیواوابوو دەستکردنەوەی ئەنجوومەنەکە ببێتە هۆی هەموارکردنی پێکهاتەی ئیتنیکی لەپۆلیسی شارەکەدا بۆ ئەوەی باڵادەستی کورد سنووردار بکرێت و هەروەك "ولیام مایقیل"یش ئاماژەی پێکردبوو تا مافی عەرەب و تورکمان زامنبکرێت٢.

بیرۆکەی گرەوکردن لەسەر دەرکەوتنی ئەنجوومەنەکە بەشێوەیەکی کارا و سەربەخۆ لەڕووی سیاسی ودوور لەفشاری حزبی تەنیا بیرۆکەیەکی ساویلکانە بوو چونکە لە باشترین باردا بینینی ئەو رۆڵە بەلانی کەم پێویستی بە سەرچاوەیەکی دارایی سەر بەخۆ هەبوو تا ئەنجوومەنەکە موچەی فەرمانبەرانی خۆی بدات، بۆیە لەنەبوونی سەرچاوەیەکی لەوجۆرەدا دارایی شارەکە هەر لەدەستی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی و هەردو پارتە کوردییە سەرەکیەکەدا مایەوە.

فەرمانی ژمارە(٧١) ی دەرچوو لەلایەن دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی سەبارەت بەرێکخستنی کاری پارێزگاکان کاریکرد لەسەر روونکردنەوەی ئەو دەسەڵاتە یاساییەی کە ئەنجوومەنی پارێزگاکان هەیانە بەڵام تەنیا تائاستێکی دیاریکراو.

ئەوەبوو ئەنجوومەنەکان دەسەڵاتی ئەوەیان پێدرا کە بەرپرسە لۆکاڵییەکان دابمەزرێنن، جگە لە فەرماندەی پۆلیس نەبێت، هەروەها مافی ڤیتۆشیان هەبوو لەسەر دامەزراندنی ئەو کەسانەی کە لەلایەن حکومەتی فیدراڵییەوە لەپارێزگاکان دادەمەزرێنران٣.

---

1 - Agence France Press . 2004. " Kirkuk Appoints Arabs , Women Councillors to Calm Tensions in Northern Iraq. " 15 January ( LN ).

٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣- ئەوەی پەیوەست بوو بە دامەزراندنی فەرماندەی پۆلیس ،بەپێی بڕگەی٦(٢) لەفەرمانی ژمارە ٧ی ئەنجوومەنی پارێزگا تەنیا رێگە بە و پاڵێوراوانە دەدرا کە لەلایەن وەزارەتی ناوخۆوە لەبەغدادەوە پێشتر دیاری کرابوون . هەروەها وەوزارەتی ناوخۆ بۆی هەبوو بەرێوەبەرەکانی پۆلیس دوور بخاتەوە.

بەڵام فەرمانی ژمارە(٧١) باسی دەسەڵاتەکانی یاسادانان نەکردووەو هیچ ئامرازێکی باج وەرگرتن و داهاتی بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەستەبەر نەکردووە بۆ ئەنجوومەنەکان.لەبەر ئەوە نەتوانرا کۆنترۆڵی ئەنجوومەنەکان بکرێت و کۆتایی بە هەژموونی کورد لەشارەکەدا بهێنرێت و کوردیش هەوڵیدا دەسەڵات دابەش بکات.

سەرۆکی نوێی ئەنجوومەنەکە، کەسێکی تورکمان ( تەحسین کەهیە" و هاوپەیمانی بەرەی تورکمانی نەبوو، دیسان جێگری فەرماندەی پۆلیسیش (تۆرهان عەبدولڕەحمان) و بەرپرسانی بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی پارێزگاکەش بەهەمان شێوە تورکمان بوون.

هاوکات جەلال تاڵەبانی رابەری(ی.ن.ك) یش لەسەردانێکیدا بۆ تورکیا کە لە حوزەیرانی ٢٠٠٤دا بوو، ئاماژەی بەئەگەری دابەشکردنی دەسەڵات کرد لەسەر بنەمایەکی دادپەروەرانەتر لەکەرکووکدا و وتی: "هیچ کەس و لایەنێك نابێتە کەمینە" و بەو جۆرەش بڕیارەکان بەکۆدەنگی دەدرێن١.

هەروەها راپۆرتەکان باسیان لەوە دەکرد کە تاڵەبانی پێشنیازیکردوە کە ئەگەر هەیە بەلیستی هاوبەش لەگەڵ بەرەی تورکمانیدا بەشداری لەو هەڵبژاردنەدا بکەن کە لەکانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا بەڕێوەدەچێت٢.

لەو قۆناغەدا کە بەرەی تورکمانی هیچ گومانێکی لەوەنەبوو کە تورکمان زۆرینەی دانیشتوانی شارەکە پێکدەهێنن هەربۆیە بیرۆکەی رێکەتنی لەسەربنەمای یەکسانی سیاسی بەهەند وەرنەگرت و، ئەوەش باشتر روونبووەوە کاتێك داوا لە کەرکووك کرا نوێنەری خۆی بۆ بەشداریکردن بۆ ئەو کۆنگرەیەروانە بکات کە تیایدا ئەنجوومەنی نیشتمانی دیاری دەکران، ئەو کۆنگرەیەی کە چارەنووسی شکستهێنان بوو٣.

ئەوەبوو کورد پێشنیازی وەفدێکی (٢٠)کەسی کرد کە هەر پێکهاتەیەك (٥) ئەندامی بەشداری تێدابکەن بەڵام سەنگویل چاپوك کەتەنیا نوێنەری تورکمان بوو لەئەنجوومەنی

---

1 - Anatolia ( BBC Monitoring Euroe ). 2004 ." Premier Conveys Turkey Æs Viiews to Turkmen, Iraqi Kurd Leaders." 23 June ( LN ).

2 - Turkmenali ( BBC Monitoring Middle East ), 2004. " Iraqi Turkmen Writer Views Kurdish Leader's Turkey Visit, Kurd-Turkmen Ties ." 10 July ( LN ).

٣- پێویست بوو ئەنجوومەنی نیشتیمانی لەگەڵ ئەنجوومەنی حوکم وەك جۆرێك لەدەستەی راوێژکاریی پەرلەمانی –سەرەتایی کاربکات. وەك چاوەڕوانیش دەکرا کاریگەری لەسیاسەتدا هەست پێنەکراو بوو.

حەدەمانیدا پێشنیازەکەی کوردی بەنادادپەروەرانە وەسفکرد چونکە وەك ئـەو وتـی کـەرکووك زۆرینەی تورکمانە[1].

دەرئـەنجامی ئـەو تەنگوچـەڵەمانەی نێـوان پێکهاتـە ئیتنیکیـە جیاوازەکـان، پرۆسـەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی هەڵوەشایەوەو ئەوەش وایکـرد کـە ڕێکخـەرانی کۆنگرەکـە بـۆ خۆیـان نوێنەرانی کەرکووك هەڵبژێرن.

هەڵبەت گەیشتن بە فۆرمێك بۆ دابەشکردنی دەسەڵات ئەرکێکی سـەخت و گرانـە ئـەویش نەك هەر لەبەرنەبوونی تەوافوق لەسەر ئەوەی کام پێکهاتە دەبێتە زۆرینـە بـەڵکو هەڵوێسـتی هەرسێ پێکهاتە سەرەکییەکە ش زۆر جیاوازن و ئەوەش بەگشتی بۆ ئەو دەم لەهەرپرسێکی تر - داهاتووی کەرکووك، سەرسەختانەتر بوو.

بۆیـە ئـەو پرسـە بـەردەوام بـوو لـە ئیسـتبدادکردنی ژیـانی سیاسـی شـارەکەو ئەگـەری گەیشتنیشی بەتەوافوق بۆ هەر پرسێکی تر بەئەگەرێکی دوور دانا.

---

1 - Constable, P.2004."key Iraqi Conference On Trak To Open;Delegates Will Choose Interim Oversight Body.". The Washington Post,28 July:A12.

PDF 4 KURD

# فەسڵی دووەم

**سەرکەوتنی کورد**

**یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت**

لەئازاری ساڵی ٢٠٠٤ دا بە واژوو کردنی دەستووری کاتی لەبەغداد کە بە" یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت" ناوزەد کراوە، پرسی کەرکووك بەرەو پێشچوو.

بەر لەوەش چارەسەرکردنی ئاسەواری سیاسەتی تەعریب کەلەلایەن رژێمی پێشووەوە پەیڕەوکرابوو ئاسان نەبوو، هەربۆیە سیاسەتی( تەعریبی پێچەوانە)ش کە بەئاراستەی لابردنی زوڵم و ستەمی پێشوو بوو، بە کۆدەنگیەکی فراوانی زۆرینەی پێکهاتەکانی شارەکە پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت سەرلەنوێ مەسەلەکانی تێکەڵاو بەیەکتری کردەوە.

**فۆرمی ٨- ١**

**دەقی ماددەی(٥٨) لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت**

ئـــ _كومەتی كاتی عێراقی و لایەنە پەیوەندیدارەكان بەتایبەتش دەســتەی بــالاّ ئــەركی چارەسەركردنی كێشە موڵكدارییەكان بەشێوەیەكی خێرا لەئەستۆ دەگرێت ئەویش بەگرتنە بەری ڕێوشوێنەكان لەپێناو لابردنی ئەوستەمەی كە دەرئەنجامی موماڕەسەكانی ڕژێمی پێشووبوون و خۆیان لەگۆڕینی پێكهاتەی دانیشتوانی چەند ناوچەیەكی دیاریكراودا دەبیننەوە لەوانەش شاری كــەركووك، كــە خــۆی لــە ڕاگواســتن و دوورخســتنەوەی زۆرە ملێــی تاكــەكان لەشــوێنی نیشتەجێبوونیان و هێنانی كەسانی نــامۆ بەناوچــەكە و بێبەشــكردنی دانیشــتوانی ڕەســەنی ناوچەكە لەكاركردن و (تصحیح القومیە_ ڕاستكردنەوەی نەتەوە)دا بەرجەستە دەكات.

جابۆ چارەسەركردنی ئەو زوڵم و ستەمە پێویستە حكومەتی كاتی ئەم هەنگاوانە بنێت:

١_ئەوەی پەیوەست بە ڕاگوازراوو دوورخراوەو كۆچپێكراوان و كۆچكردووانە و لەگەڵ یاسای دەستەی بالاّ بۆ چارەسەركردنی كێشەی موڵكداری و ڕێكارە یاساییەكانی تــر دەگونجێــت ئــەوا پێویستە حكومەت لەماوەیــەكی دیــاركراودا ڕاگوازراوەكــان بۆســەر مــاڵ و مــوڵكی خۆیــان بگەڕێنێتەوە.

خۆ ئەگەر ئەوە بۆحكومەت ئاستەم و گران بوو ئەوا پێویســتە بەشــێوەیەكی دادپەروەرانــە قەرەبوویان بكاتەوە.

٢_سەبارەت بەو كەسانەی كە بەرەو ناوچەو زەوییــەكی تایبــەت گوازراونەتــەوە پێویســتە حكومەت بەپێی ماددەی (١٠) لەیاسای دەستەی بالاّ بۆ چارەسەركردنی كێشــەی موڵكــداری دەست بەكار بێت یاخود لەلایەن دەوڵەتەوە زەوی نوێ لــەنزیك شــوێنی نیشــتەجێبوونیان لــەو پارێزگایەی كە لێوەی هاتوون پێیان بدرێت یاخود لەبری تێچــوونی گواســتنەوەیان لەوناوچــانە قەرەبوو بكرێنەوە.

٣_سەبارەت بەو كەسانەی لەدامەزرانــدن و وەســیلەكانی تــری بــژێوی ژیــان بێبەشــكراون بەمەرامی ناچاركردنیان لەسەر كۆچكردن لــە زێــدی خۆیــان، واپێویســت دەكــات حكومــەت هانیانبدات بۆ دەستەبەركردنی دەرفەتی نوێی كاركردن لەناوچەكانی خۆیان.

٤_ هەرچی پەیوەستە بە (تصحیح القومیە) ئەوا دەبێت حكومــەت ســەرجەم بڕیارەكــانی تایبەت بەو پرسە ڕەتبكاتەوەو ڕێگە بەو كەسە زیان لێكەوتووانە بدات بەدوور لە فشار مافیان هەبێت لەدیاریكردنی ناسنامەی نیشتمانی و ئینتیمای نەژادییان.

PDF 4 KURD

ب_ دیسان بۆ مەرامی سیاسی رژێمی پێشوو دەستکاری سنووری ئیداری کردووە بۆیە پێویستە لەسەر سەرۆکایەتی و حکومەتی کاتی عێراقی رێنمایی بداتە ئەنجوومەنی نیشتمانی لەپێناو چارەسەرکردنی ئە گۆڕانکاریانە.

هاوکات ئەگەر نەتوانرا سەرۆکایەتی کۆدەنگی لەسەر ئەو رێنماییانە بەدەستبهێنێت ئەوا پێویستە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی بەشێوەیەکی بێ لایەن و شیاو بەکۆی دەنگ تاوتوێی ئەو بابەتە بکات و رێنمایی پێشکەش بکات.

دیسان ئەگەر ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی نەیتوانی رەزامەندی بەدەستبهێنێت ئەوا پێویستە ئەنجوومەنەکە داوا لە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان بکات کەسایەتییەکی نێودەوڵەتی دیاری بکات بۆ ئەوەی ئەرکی دادوەرییەکی خوازراو رابپەڕێنێت.

ج_ یەکلاییکردنەوەی زەوییە کێشە لەسەرەکان دوابخرێت لەوانەش کەرکوك تا ئەو کاتەی رێکارەکانی سەرەوە تەواو دەبن، هەروەها ئەنجامدانی پرۆسەیەکی عادیل و شەفافی سەرژمێریکردن تا ئەو کاتەی دەستووری هەمیشەیی پەسەند دەکرێت. دیسان پێویستە ئەو یەکلاییکردنەوە لەگەڵ بنەماکانی دادوەری کۆك بێت و ویستی دانیشتوانی ئەو زەویانە رەچاو بکرێن.

ماددەی(٥٨) باس لەهەڵگرتنی ئەو زوڵم و ستەمە دەکات کە دەرئەنجامی مومارەسەی رژێمی پێشوو بوون ئەویش لە گۆڕینی دیۆگرافیای چەند ناوچەیەکی دیاریکراو بەکەرکووکیشەوە، بەڵام ئەو ماددەیە میکانیزمێکی رۆشنی نییە بۆ گەڕاندنەوەی کۆچپێکراوان بەشێوەیەکی رێکو پێك، ئەمە جگە لەوەی ماددەکە ناڕوونییەکی پێوە دیارە لەبارەی ئەو کەسە هاوردانەی کە تازە هێنراونەتە ناوچە دیاریکراوەکان١.

دیسان هەمان ماددە لەگەڵ هەردو بڕگەی(ب) و(ج) و ماددەی (٥٣) چەند بڕیارێکی گرنگی دواخستووە بۆ پاش واژۆکردنی دەستووری هەمیشەیی لەوانەش بڕیاردان لەبارەی گۆڕانکارییە ئیدارییەکان لەسنووری پارێزگاکەو دوا بارودۆخی کەرکووك٢.

---

١-بەپێی بڕگەی ٢ لەماددەی٥٨ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت "ئەو کەسانەی کە بۆ ناوچە دیاریکراوەکان راگوازراونئەوا ئەگەر بکرێت لەلایەن حکومەتەوە کاردەکرێت بۆ سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوەیان یاخود لەلایەن دەوڵەتەوە ئەگەر کرا قەرەبووکردنەوەیان زامنبکرێت یاخود لەنزیك ئەو پارێزگایەی کە لێوەی هاتوون لەلایەن دەوڵەتەوە ئەگەر کرا پارچە زەوییەکیان پێبدرێت یان قەرەبووی تێچوونی گواستنەوەیان بۆ ئەو ناوچانە بکرێن". بەکارهێنانی چەند جارەی وشەی(ئەگەر) واتە هیچ شتێك لەوانە بەزۆر ناکرێت.

١-بەپێی بڕگەی (ب) لەماددەی٥٢ رێگە نادرێت سنووری پارێزگاکان لەقۆناغی ئینتیقالیدا گۆڕانکاری بەسەردا بهێت لەکاتێکدا ماددەی(ج)هەریەك لە بەغدادو کەرکوکی هەڵاوێرد کردوەو بەمافی پارێزگاکانی دەرەوەی هەرێمی کوردستانی دەزانێت لەنێوان خۆیاندا هەرێمەکان پێکبهێنن.

برِگەی (ب) هێڵە گشتیەکانی پرۆسەیەکی سنووردارکراو بەئامانجی سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی سنوورەکان بۆ بەر لەوەی کە لەلایەن رژێمی بەعسەوە رەنگرێژکرابوو پێشنیاز دەکات، تا ئەو دەمەی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی کە لە(٣) ئەندام پێکهاتووە بەکۆی دەنگ زنجیرە رێنماییەك دەردەکات سەبارەت بە هەموارکردنی سنوورە ئیدارییەکان و رەوانەکردنی ئەو رێنماییانە بۆ بەردەم دەسەڵاتی یاسادانان بەمەبەستی پەسەندکردنیان١. بەڵام هەرچی برِگەی (ج) ی ماددەکەیە هێڵە گشتیەکانی پرۆسە سێ هێڵییەکەی دیاریکردوە کە دەبێتە چارەسەری پرسی کەرکووك بەشێوەیەکی کۆتایی- ئاسایی کردنەوەو ئەنجامدانی سەرژمێری دانیشتوان بەشێوەیەکی خاوێن و شەفاف.

پاشان برِیاردان بەو جۆرەی لەگەڵ پرانسیپی دادوەری گونجاو بێت و ویستی هاوڵاتیانی ئەو ناوچانە بەهەند وەربگرێت. رێککەوتن لەسەر دۆزی کەرکووك چارەسەرێکی سازاندن و میانگیری لەلای کورد پێوە دیاربوو، چونکە چارەسەری کۆتایی دواخرا بۆ ئەو دەمەی کە دەستووری هەمیشەیی پەسەند دەکرێت هەربۆیە دەستەواژەی " ویستی هاوڵاتیان" جێگەی بایەخی خۆی هەبوو کە ئەوەش بەواتای چارەسەرکردن لەسەر بنەمای پرسی میللی دەبێت.

لەهەمبەر ئەو چارەسەرە تەوافوقیەدا کورد لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەتدا زۆرینەی ئەوەیان بەدەستهێنا کە خوازیاریبوون٢.

دیارە ئەوەش بۆخۆی گرنگیەکی یەکلاکەرەوەی هەبوو کاتێك توانیان " ڤیتۆی کوردی" لەسەر ماددەی (٦١)، برِگەی(ج) بەکاربهێنن. لەو ماددەیەدا هاتووە کە دەستووری

---

٢- لەکاتێکدا ئەگەر سەرۆکایەتی نەیتوانی بەکۆدەنگی رازیبێت لەسەر کۆمەڵێك رێنمایی ئەوا ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی بەکۆدەنگی دادگایەکی بێلایەن دروست دەکات...هەرکاتێکیش ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی نەیتوانی لەسەر دادگاکە رازیبێت پێویستە ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی داوا لە ئەمینداری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان بکات کەسایەتیەکی ناسراوی نێودەوڵەتی دابنرێت بۆ داوەریکردن.

٢- سەربارى ئەوەی کورد تەنازولی زۆریان پێشکەش کرد سەبارەت بە ئیدارەکردنی سامانە سروشتیەکان و مافیان لە ڤیتۆکردنی یاساکانی حکومەتی ناوەندی، بەڵام لەبەرامبەریشدا چەندان دەستکەتیان بەدەستهێنا. بۆنموونە ماددەی ٥٣(أ) ئیعتراف بە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا دەنێت. ماددەی ٩ زمانی کوردی بەزمانی رەسمی عێراق دەناسێنێت.

بەپێی ماددەی ٥٤ ئاسایشی ناوخۆی هەرێم بەدەست حکومەتی هەرێمەوە دەبێت و هەروەها مافی وەرگرتنی باج و روسماتی لەناو هەرێمدا دەبێت...... سەبارەت بە دەستکەوتەکانی کورد لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەتدا بروانە: O'Leary,B.2005."Power-Sharing, Pluralist Federation and Federacy." In The Future of Kurdistan in Iraq,eds.O'Leary,B.,J.McGarry,and Khalid Salih. Philadelphia:University of Penssylvania Press:47-91.

هەمیشەیی لەرێگەی راپرسییەکی میللی و زۆرینەیەکی سادەوە پەسەند دەکرێت ئەویش ئەگەر بێتوو لەلایەن سێیەکی دەنگدەران لە (٣) پارێزگا یان زیاتر رەتیان نەکردەوە.

بەوجۆرە مافی ڤیتۆ هێزێکی سیاسی بە دانوستکارانی کورد بەخشی بۆ ئەوەی داکۆکی لە دەستکەتەکانی کورد بکەن وەك ئەوەی لە یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەتدا هاتووە بەوەش کاریگەرییەکی گەورەیان دەبێت لەسەر پرسی کەرکوك لەدەستووری هەمیشەییدا١.

هەڵبەت ئیدارەی کاتی دەوڵەت شتێکی ئەوتۆی نەکرد بۆ ئەوەی ئاستی پەنگخواردنەوە ئیتنیکییەکانی کەرکوك هێوربکاتەوە، هەروەها بە رەتکردنەوەی داواکاریەکی تورکمان سەبارەت بە ئەنجامدانی بەپەلەی پرۆسەی سەرژمێریکردن و دواخستنی ئەو سەرژمێرە بۆ دوای نەهێشتن و لابردنی ئاسەواری تەعریب پرسی هەریەك لەگەڕاوە کوردو تورکمانەکان و چارەنووسی عەرەبی هاوردەی کر بە پرسێکی سیاسیکراو.

هەرچەند لەسەرەتادا کورد بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە کەرکوك مافی خۆیانە بەڵام یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت میکانیزمێك دەستەبەر دەکات بۆ گۆڕینی هەژموونی ژمارەیی بۆ یەکلایی کردنەوەی ئەوەی کە شارەکە بۆ کێ دەگەڕێتەوە.

بەواتایەکی راشکاوەتر لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی کوردی گەڕاوە بۆ شارەکە کە لەلایەن سەرکردایەتی سیاسی کوردەوە دەتوانن بیانگەڕێننەوە ئەوا دەرفەتی بەدەستهێنانی کەرکوك زیاتر دەبێت. لەبەر ئەوە ئاسان نییە پاڵنەرە پاساودارەکان کە خۆی لە لابردنی ئەو زوڵم و ستەمەدا دەبینێتەوە کە پێشتر هەبوون لەپاڵنەری سیاسی پەتی- دووربخرێنەوە کە دواجاریش گەڕانەوەی کەرکووکە بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

لەرۆژی واژۆکردنی بەڵگەنامەی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەتدا پیشخواردنەوەی ئیتنیکی لەکەرکووکدا بزوا، ئەوەبوو بەبەشداری دەیان هەزار کورد وەك ئەوەی راپۆرتەکان ئاماژەیان پێکردووە گردبوونەوەیەکی ئاهەنگئامێزیان سازکرد و تیایدا ئالآی کوردییان بەرزکردەوەو ئالآی عێراقیشیان سووتاند ئەوەش لەئەنجامی تێگەیشتنێکی هەڵە بوو لەوەی کە پێیان وابوو یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت بڕیاریداوە بەگەڕانەوەی کەرکووك بۆ کورد٢.

---

١- پێدانی مافی ڤیتۆ بەکورد مشتومڕێکی زۆری بەدواوە بوو ، کە لەلایەن پیاوانی ئاینی نەجەفەوە دژایەتی زۆر دەکرا، لەنێویشیاندا ئایەتوڵڵا عەلی سیستانی. بەجۆرێك کە خەریکبوو ئەو ناکۆکییە ئیمزاکردنی بەڵگەنامەکە لەباربەرێت. بۆوردەکاری زیاتر بڕوانە: Allawi,A.A.2007.The Occupation of Iraq: Winning the War,Losing the Peace .New Haven Yale University Press:222-224.

2 -Beaumont,P. 2004."Premature Rejoicing in Kirkuk." The Guardian,9March:13.

دواتر  ئاھەنگەكە بەپێكداددان لەگەڵ چەند گروپێكی عـەرەب و توركمـان و كـوژرانی (٣) كەس كۆتایی ھات. واژۆكردنی یاسای ئیدارەی كاتی دەولّەت لەكاتێكـدا بـوو كـە پەیوەنـدی ئیتنیكی بۆخۆی پەنگخواردوبوو، ھەربۆیە لەكۆتایی كانوونی دووەمدا نزیكەی (٢٥٠) كـەس لەشێخانی عەشیرەتە عەرەبیەكان لەشارەكەدا كۆبوونەوەو دژایەتی كردنی خۆیان بۆ فیـدراڵی و گەڕانەوەی كەركووك بۆ سەر ھەرێمی كوردستان راگەیاند. یەكێك لەرێكخـەرانی كۆبوونەوەكـە وتی: " ئێمە  ئـەمڕۆ لێـرەین تـا بیّـژین كـە ئێمـە دژی فیـدراڵین و كـەركووكیش شـارێكی عەرەبییە"١.پاشتر لەكۆتایی شوبات و سەرەتای ئازاردا و لەماوەی دوو ھەفتــەدا بارەگاكـانی بەرەی توركمانی تالاّن كران،  ھەروەك راپۆرتەكان ئاماژەیان پێدابوو٢.

ھاوكات ئەوەش وایكرد كە سوپای ئەمریكا ھاتووچـۆكردن لەشـارەكەدا قەدەغـە بكـات. لەسەرەتادا نیسانیشدا ئەندامانی توركمان و عەرەب لەئەنجوومەنی كەركووك پاشەكشـەیانكرد وەك نارەزاییـەك لەبەرامبـەر ھەژموونگـەرایی كـورد،  ھەربۆیـە سـەرۆكی ئەنجوومەنەكـەش ناچاربوو چالاكیەكانی ھەلّپەسێرێت.

لەوباروددۆخە ھەموارەدا ھەولّەكان بۆچارەسەركردنی ئەو پرسە ئالّۆزە و گەڕانەوەی كوردانی راگوازراو جگە لەپەنگخواردنەوەی زیاتر ھیچی تری لێنەكەوتەوە.

### ساغكردنەوەی كێشە مولّكدارییەكان

بەدرێژایی سالّی ٢٠٠٣ ئەو ھەولاّنـەی كـە دەسـەلاّتی ئیئـتلافی كـاتی  دابـووی لـەپێناو نوێكردنەوەی میكانیزمێكی یاسایی بۆ چارەسـەركردنی كێشـەی مولّكـداری لـەعێراق جگـە لەھەولّی لێكتر دابڕاوو شكستخواردوو ھیچی تر نەبوون٣.

لەسالّی ٢٠٠٤دا دەسەلاّتی ئیئتلافی كاتی رازی نـەبوو لەسـەر پێكھێنـانی لیژنەیـەك بـۆ چاوخشاندن بە سكالاّكانی پەیوەست بە مولّكدارێتی،  سەرباری ئەوەی یاسای پێكھێنانی لیژنە لە٢٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ پەسەند كرا.

1 -Agence France Press.2004." Arab Tribes Rally Aginst Iraq Oil City's Inclusion in Kurdsh Region." 27 January.

2 -Agence France Press.2004."Iraq Kurds Ransack Turkmen Party Offices Again."3 March.

3 - Humman Rights Watch.2004."Claims in Conflict: Reversing Ethnic Cleansing in Northern Iraq."16(4)(E):58.

بەپێی دەقی یاساکە کە ئاماژە بە پێکهێنانی لیژنە لۆکاڵییەکان دەکات لەسەرجەم پارێزگاکانی عێراقدا هەر لیژنەیەك لە دادوەرێك و بەڕێوەبەری نووسینگەی تۆمارکردنی عەقارو نووسینگەی موڵکدارێتی گشتی پێکدێت.

هاوکات لەسەر پێداگری کورد لەسەر دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی یاسای ئەسڵی مەرجدار کرا کە لە( کانوونی دووەم) دەرچوو، بەو پێیەش سکاڵای پەیوەست بە موڵکدارێتی پێشکەش بە لیژنەی ئەو پارێزگایە بکرێت کە موڵکەکانی تێدایە، دیارە ئەوەش ئەو بەندە بوو کە لەلایەن دەسەڵاتی ئیئتلافەوە لەو یاسایەدا لەمانگی حوزەیران بڕیاری گۆڕینی درا.

بەبۆچوونی ڕێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ ئەو بەندەی کە یاسا ئەسڵییەکە لەخۆی گرتووە" پاڵنەرێکی سیاسی ئاشکرای هەیە" لەبەر ئەوەی بەو جۆرە داڕێژراوە کە هانی گەڕانەوەی کورد بۆ کەرکووك بدات تا سکاڵاکانیان پێشکەش بکەن١.

جگە لەوەش ئەو یاسایەی کە لە حوزەیراندا دەرچوو کۆمەڵێك ڕێنمایی سەبارەت بە پرسە ڕێکارییەکان لەخۆگرتبوو بەڵام نادیاری بەپرسە چارەنووسسازەکانەوە دیاربوو.

بۆ نموونە پرسی پەیوەست بە چارەنووسی " ئەو دانیشتوانانەی کە تازە بەتازە نیشتەجێکرابوون". یاساکە زمانی یاسای ئیداری کاتی دەوڵەتی دووبارە کردبووەوە بەو جۆرەش دەکرا ئەو کەسانە سەر لەنوێ نیشتەجێبکرێنەوە و قەرەبوو لەدەوڵەت وەربگرن و ببنە خاوەنی موڵکی نوێ.

نەبوونی ناچارکردن لەدەقەکەدا بەئەنقەست بوو بەڵام لەبناغەدا بۆخۆی دژ بە هەڵوێستی نەگۆڕی کورد بوو کە دەبوو ئەو عەرەبانەی لەچوارچێوەی تەعریبدا بۆ کەرکووك هێنرابوون بۆزێدی خۆیان بگەڕێنرێنەوە ئەویش لەپێناو ئاسایی کردنەوەی بارودۆخەکە.

دیسان لەیاساکەدا باس لە سەرچاوەی پێدەری قەرەبووکردنەوەکە بۆ ئەو کەسانە نەکراوە کە ڕۆیشتنیان هەڵبژاردبوو تا سەر لەنوێ لەجێگەکانی تردا نیشتەجێبکرێنەوە.

لەبری ئەوەش پۆل بریمەری سەرۆکی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی یەك لایەنە بڕی(١٨٠)ملیۆن دۆلاری تەرخانکردبوو بۆ یارمەتیدانی دەستەی تایبەت بە چارەسەری کێشەی موڵکدارێتی ئەویش تەنیا بەدوو ڕۆژ بەر لە رادەستکردنەوەی سەروەریی بەعێراق.

هاوکات لە کۆتایی حوزەیران و لە میانەی سەردانی بۆ شارەکەدا بریمەر نوێکردنەوەی

---

١ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(سندوقی کەرکووك)ی ڕاگەیاند، کـە بودجـەی ١٠٠ ملیـۆن دۆلاری بـۆ دابینکرابـوو تـا لەساغکردنەوەی کێشە موڵکدارییەکاندا یارمەتیدەر بێت.

دوای سەردانەکانی لە کانوونی یەکەم و شوباتی ٢٠٠٤ بۆ کەرکووك، ڕێکخەری چـاودێری مافـەکانی مـرۆڤ تێبـینی ئـەوەیکرد" لەبـەر نـەبوونی میکانیزمێـك، ئـارامی لەبـەر ئـەو ڕاگوازراوانە هەڵگرتووە کە لەگەڵ خێزانەکانیان بەرەو کەرکووك دەگەڕێنەوە ١.

بەهاتنی سەرەتای حوزەیران دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی ژمارەی ئەو عەرەبانەی کـە لەلایـەن کوردەوە بەشێوەیەکی نایاسایی دوورخراوبوونەوە بە( ١٠٠) هەزار کەس مەزەندە دەکـات کـە لەنێو چادرگەکانی دیالەو سەڵاحەدین و کەرکووکدا نیشتەجێبوون٢.

پوختەی بەڵگە نامەکە ئەوەیە کە" تائێستا کارێکی توندو تیژی ئـەوتۆ نییـە بـەڵام رق و کینەیەکی زۆر هەیە کە پەنگیان خواردوەتەوەو ڕەنگـە پیاهەڵپـژانی ئیتنیکـی لێبکەوێتـەوە، ئەگەر بێتوو بەزووترین کات بارودۆخەکە چارەسەر نەکرێت"٣.

بەڵام نەبوونی سەرچاوەی دارایی و کادێری لێوەشاوە پەنگخواردنەوەی ئیتنیکی و هەڕەشەی پەنابردن بۆ توندوتیژی وایانکرد، کە بەرەو پێشچـوونی کـاری دەسـتەی چارەسـەری کێشـەی موڵکدارێتی لەکەرکووکدا سست بێت٤.

هەڵبەت دەستەکە لەلایەن پارێزەری کورد( تەحسین حامد یاسین)ەوە سـەرۆکایەتی دەکـراو لەلایەن دادوەرێکی تایبەت بە تاوتوێکردنی سکاڵاکانی پەیوەست بە کێشەکانی موڵکـدارێتی پشتی پێدەبەسترا، کە دیسان لیژنەکە (٣) دادوەری کوردو تورکمان و عـەرەبی لـەخۆگرتبوو، ئەمە جگە لە تیمێکی یاسایی کە (٢٨) پارێزەرو (١٤)یاریدەدەری لەخۆگرتبوو٥.

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو،١٧ز.

٢- بڕوانـە 15-prb.html)http://www.cpa-iraq.org/budget/PRB/May ( CPA program Review Board Minutes,15 May 2004

نازانرێت کە چۆن دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی گەیشتوەتە ئەو ژمارەیە یاخود چۆن توانیویەتی جیاوازی بکات لـەنێوان ئـەو عەرەبانـەی بەویستی خۆیان ڕۆیشتوون و ئەوانەش کە بەزۆر دوورخراونەتەوە(بەشێوەیەکی نایاسایی).

3 - United Press International.2004."100,000Arabs evicted by Kurds in Iraq."11June.

٤- بۆ وردبوونەوەی زیاتر بڕوانە: Lawrance Q.2008. Invisible Nation: How the Kurd's Quest for Statehood is Shaping Iraq and the Middle East. New York: Walker&Company:223

5 - Steele, J . .2004. " Oil Town Looks to Property Tribunal for Justice ." The Gurdian ,8 July . ( www.gurdian .co.uk /world / 2004/ jul/08/Iraq.jonathansteele )

PDF 4 KURD

بەهاتنی سەرەتاکانی ئەیلولی ٢٠٠٤ سوپای ئەمریکا ژمارەی ئەو کوردانەی کە لەسەرتای ساڵەوە لەکەرکووك نیشتەجێ بوون بە (٧٧) هەزار کەس مەزەندە دەکات[١].

دەستەی چارەسەری کێشەی موڵکداریێتی زیاتر لە(٥) هەزار سکاڵای تایبەت بە موڵکداریێتی بەدەست گەیشت کەزۆربەیان سکاڵای کورد بوون، بەڵام هیچ کامیان تەماشا نەکران بۆیە کورد بێزاربوو لەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەئەنقەست دەستی دەستی دەکات تا خۆی لە دوژمنایەتی رای گشتی عەرەبی بەدوور بگرێت.

سەرۆکی پێشووی دەستەی چارەسەرکردنی کێشەی موڵکداریێتی دەڵێت" تێدەگەم ئەوان نایانەوێت عەرەب بۆ سەر زێدو ناوچە ئەسڵییەکانی خۆیان بگەڕێننەوە بەڵام دیسان ناشخوازن کورد تووڕە بکەن، لەبەر ئەوە بەگرتنە بەری رێو شوێنی بیروکراسی هەموو شتێك دوا دەخەن"[٢].

بەرەو پێشچوونی کارەکانی دەستەکە بەو شێوە سستەزیانی بۆ سەر ئارامی هەبوو، کاتێکیش کوردو تورکمانە گەڕاوەکان هەستیان بەنائومێدی دەکرد لەوەی کە یاسا هیچیان بۆ ناکات ئەوا پەنایان بۆ توندوتیژی دەبرد ئەویش وەك رەفتارێك بۆ ساغکردنەوەی کێشەکان بەتایبەتیش لەقەزاو ناحیەکانی دەرەوەی کەرکووك.

پێشتر لەشارۆچکە کوردییەکانی وەك مەخمور، کوردە گەڕاوەکان بەیارمەتی هێزی پێشمەرگە کەوتبوونە دوورخستنەوەی عەرەبە هاوردەکان لەسەرماڵو زەویەکانیان[٣]. هەرچی تورکمانە گەڕاوەکانیشە کەخاوەنی هێزی سەربازیی نەبوون تاپشتیوانیان بکات هیچ رێگە چارەیەکی تریان لەبەردەمدا نەبوو تاپەنای بۆ بەرن بۆیە لەچاوەڕوانی چارەسەری یاسایدا بوون.

لەئەیلولی ٢٠٠٣شدا لەشارۆچکەی بەشیری تورکمانشین ئەفسەرانی سوپای ئەمریکا رۆڵی نێوبژیوانیان بینی بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی کاتی تەوافوقی لەنێوان تورکمانە گەڕاوەکان و عەرەبە هاوردەکان کە زەوی ئەوانیان بەگەرِحستبوو بۆخۆیان.

ئەوەبوو رێککەوتن لەسەر ئەوەی چاوەڕوان بن تا ئەو دەمەی میکانیزمێك بۆ ساغکردنەوەی یاسایی کێشەی موڵکداریێتی دەدۆزرێتەوە.

---

1 - Agence France Press. 2004. "Iraqi property Commission Failing .167,400 Displaced Persons Since March : US." 3 September (LN )

2 - Packer , D. 2004 ." The Next Iraq War : What Kirkuk's Struggle to Reverse Saddam's Ethnic Cleansing Signals for the Future of Iraq ." The New Yorker ,4 October.

3 - Filkins , D. "Kurds Dvancing to Recalim Land in Northren Iraq." The New York Times,20 June:1.

له ناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٤دا بەهۆی نەدۆزینەوەی میکانیزمێك لەلایەن دەسەڵاتی ئیئتلاف و جێنەهێشتنی شارۆچکەی بەشیریش لەلایەن عەرەبەوە بووە هۆی پێکدادانی خوێناوی چەند جارەی نێوان هەردو پێکهاتەی تورکمان و عەرەب لەو شارۆچکەدا١.

هەرچی بری ئەمنی ناوخۆی شاری کەرکووکیشە لەماوەی ساڵێکدا رووی لەخراپبوون کرد، لەمانگی شوباتدا یەکەم هێرشی خۆکوژی روویداو ئەوەش ژمارەیەکی زۆر قوربانی لێکەوتەوە، کاتێك لەدەرەوەی بنکەی پۆلیسی رەحیماوا کە دەکەوێتە ناوچەیەکی کورد نشینەوە کەسێکی خۆکوژ خۆی تەقاندەوەو دەرئەنجام کوژرانی (١٠)کەس و برینداربوونی(٤٥)ی دیکەی بەدواوە بوو.

دواتریش گروپێك بەناوی کەتیبەکانی موجاهیدینی عێراق بەرپرسیارێتی خۆی لەبەرامبەر ئەو تەقینەوە خۆکوژییە پیشاندا، کە ئەوەش یەکێك بوو لەو زنجیرە تەقینەوانەی کە هێزە ئەمنییەکانی کردبووە ئامانج و هەروەك ئاماژە رەسمییەکانیش ئاماژەیان پێکردبوو بەتەنیا لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٤دا (٥٠٣) هێرشی تیرۆریستی لەکەرکووکدا بەرەسمی تۆمار کرابوون٢.

هەروەها (غافڵکوژی- لەناکاوکوژی) سیاسی لەماوەی ئەو ساڵەدا بەشێوەیەکی بەرچاو رووی لە هەڵکشان کردو لەوەشدا هاوڵاتیانی سەر بەگشت پێکهاتەکان کرانە ئامانج و سەرانی سیاسی تورکمانیش ژمارەیەکیان لێکوژرا لەوانەش دوو سەرکردەی دیاری بەرەی تورکمانی، کە یەکێکیان سەرۆکی حزبی تورکمان ئیلی بوو کە لە مانگی تەموزدا کوژراو ئەوی دیکەشیان ( ئیبراهیم ئیسماعیل ) بەرێوەبەری پەروەردەی کەرکووك بوو کە لە مانگی ئابی ئەو ساڵەدا کوژرا و دیسان سەرکردەیەکی تری حزبی تورکمان ئیلی لەمانگی تشرینی یەکەمدا ناکاوکوژ کرا.

لەنێو ئەو کەسایەتیە ناودارانەی کەلەماوەی ئەو ساڵەدا رووبەرووی لەناکاوکوژی بوونەوە (غازی تاڵەبانی) برازای جەلال تاڵەبانی بوو، کە بەرێوەبەری ئاسایشی کۆمپانیای نەوتی باکوور بوو، هەروەها کوژرانی (شێخ خادم ئەلهانی) سەرۆکی ئەنجوومەنی شیعی لەکەرکووك کە ئەوئەنجوومەنەش یەکێك بوو لەو رێکخراوە دەگمەنانەی داکۆکی لە بەرژەوەندی عەرەبی شیعە لەکەرکووك دەکرد.

دیسان پارێزگاری کەرکووك لەماوەی (٢٠٠٤)دا بۆ دووجار هەوڵی کوژرانی درا بەڵام لەهەردو هەوڵەکەدا دەربازی بوو، هاوکات بەهۆی ئەو شەپۆلە لەغافڵکوژی، لەمانگی

---

1 - Kurdistan Nuwe(BBC Monitoring Interational Reports).2004."Iraq: Turkmen, Arab Settlers Clash Over Land Ownership." Augst(LN).

2 - Kurdistan Nuwe(BBC Monitoring International Reports). 2004."Iraq : Official Statistics show 503" Terrorist" Acts in Kirkuk in Six Months."30July(LN).



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئازاردا سەرجەم چالاكیەكانی ئەنجوومەنی پارێزگای كەركووك هەڵپەسێردران ئەویش لەپێناو سەلامەتی گیانی ئەندامەكانیدا.

هەڵبەت ئەو لەناكاو ژییەی كە دەكرا تەرزێكی روونی نەبوو جگە لەوە نەبێت ئەوانەی دەكرانە ئامانج خاوەنی پێگەی سیاسی بوون و ئەوەش تەنیا بارگرژی و گومانی نێوان پێكهاتە جیاوازەكانی لێدەكەوتەوە.

## حكومەتی كاتیی عێراقی

لەگەڵ هەڵكشانی ئاستی كارە توندو تیژیەكان لەمانگی نیسان لەسەر ئاستی عێراقدا، دەسەڵاتی ئیئتلافی كاتی لەهەوڵدا بوو بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێكی تەوافوقی تا گەڕاندنەوەی سەروەریی عێراق مسۆگەرببێت١.

ئەوەبوو (ئەلئەخزەر ئیبراهیمی) وەزیری پێشووی دەرەوەی وڵاتی جەزائیر لەچوارچێوەی تیمێكی سەر بە نەتەوە یەكگرتووەكان راسپێردرا بۆ ئەوەی پێدانی شەرعیەتی نێو دەوڵەتی بەهەڵبژاردنی حكومەتی كاتی عێراقی ببەخشێت تا سەروەریی بۆ عێراق بگەڕێنرێتەوە.

هەرچی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكاش بوو خوازیاری دامەزراندنی حكومەتێكی بەهێز بوو تا پشتیوانی تەواو لەپرۆسە سەربازیەكانی بكات لەوانەش گەمارۆ شكستخواردووەكەی فەلوجە كە لەلایەن واشنتۆنەوە بە پێویست دەزانرا بۆ تێكشكاندنی یاخیبوونی چەكداری.

جگە لەوەش ویلایەت یەكگرتووەكانی ئەمریكا بەدوای سەرۆك وەزیرێكی هاوپەیمان و متمانە پێكراودا دەگەڕا تا بتوانێت لەرێگەی ئەو كەسەوە كۆنترۆڵی پرۆسەی ئینتیقالی بكات.

ئەیاد عەلاوی كە پێشتر پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگری (CIA)ی ئەمریكاییەوە هەبوو كاندیدێكی نموونەیی بوو كە مەرجەكانی ئەمریكای تێدابوو.

هەرچی هەڵبژاردنی كەسایەتیەكانیش بوو بۆ پۆستی سەرۆك كۆماری تەنیا فۆرمێكی مەراسیمی هەبوو، كە ببوە مایەی مشتومڕ.

١- پلانی یۆل بریمە بۆ گەڕانەوەی سەروەری بۆ عێراق خۆی لە پرۆسەیەكی ئاڵۆزی سێ قۆناغیدا دەبینییەوە تا دەگەیشتە هەڵبژاردنی پەرلەمانی كاتی لە كۆتایی ئایاری ٢٠٠٤دا. بەڵام ئەو پلانە لەبارچوو كاتیك ئایەتوڵڵا عەلی سیستانی كە ئەو كاتە بەهێزترین دەنگ بوو لەسیاسەتی عێراقیدا پشتیوانی ئامادە نەبوو پشتیوانی هەرپرۆسەیەك بكات كە هەڵبژاردنی راستەوخۆ لەخۆ نەگرێت.

دیاره بژاردەی شیاوی ئەمریکاش بۆ ئەو پۆستە (عەدنان پاچەچی) بوو کە کەسایەتیەکی میانڕەوو دیموکراسخوازو لیبراڵ و خاوەن سەنگێکی نێو دەوڵەتی بوو[1]. بەڵام ئەنجومەنی حوکمڕانی لەهەڵوێستێکی دەگمەنیدا (غازی یاوەر) ی هەڵبژارد بۆ پۆستی سەرۆك کۆماری، کە کەسایەتیەکی سەر بەعەرەبی سوننی بوو.

لەبەرامبەر پێنەدانی پۆستی سەرۆك کۆماری بەکورد، بێزاربوونی لای کورد دروستکردو لەنامەیەکی هاوبەشی توندئامێزیش کە ئاراستەی جۆرج بوشی سەرۆکی ئەمریکا کرا، هەریەك لە جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانی گلەیی ئەوەیان کرد، کە" عێراق وڵاتێکی خاوەن دوو نەتەوەیە.... هەربۆیە کارێکی مەنتیقییە کە عەرەب یەکێك لە پۆستە باڵاکان (کەخۆیان هەڵیدەبژێرن) بگرنە دەست بەڵام پێویستە پۆستەکەی تر بۆ کورد بێت[2].

هەر لەو نامەیەدا ئیدانەی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی کراوە لەبەرامبەر هەوڵەکانی بۆ رەتکردنەوەی دانپێدانان بە حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ بەرژەوەندی سیستمی فیدراڵی کە هەر (١٨)پارێزگاکە دەبێتە بنەمای ئەو سیستمەیەو دیسان هەڕەشەی ئەوەشکرابوو کە حکومەتی هەرێمی کوردستان هیچ بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نیە جگە لە بەشداری نەکردن لە حکومەتی ناوەندی و دامودەزگاکانیدا، ئەوە لەکاتێکدا بوو لە میانەی دانوستانەکانی تایبەت بە یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت هەوڵی ئەوە دەدرا یاساکە لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشەوە بەڕەسمی بناسرێت.

کاتێکیش لە ٨ی حوزەیراندا لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتیەوە بڕیاری ژمارەی(١٥٤٦) دەرکرا، باس لە یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت یاخود هەرێمی کوردستان نەکرابوو[3]. دەمێکیش کە لە ٣٠ی حوزەیراندا بەڕەسمی سەروەری بۆ حکومەتی کاتی عێراق

---

1 - Allawi, The Occupation of Iraq, op.cit:285

2 - Kurdistan Observer.2004."Letter From Barzani and Talabani to President Bush."June. www.home.cogego.ca//kurdistan3/5-6-04-letter-bush-from-b-and-htm)

٣ - ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش لەگەڵ ئەوانیتردا کەوتە ژێر فشاری ئایەتوڵڵا سیستانی لەوەی کە ئاماژە بە یاسای ئیدارەی دەوڵەتی کاتی نەکات لە بڕیاری ئاسایشی نێودەوڵەتیدا .

ئەوەبوو لە ٦ی حوزەیراندا لەو نامەیەیدا کە ئاراستەی ئەنجوومەنی ئاسایشی کرد سیستانی دەڵێت یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت نا شەرعییە لە بەر ئەوەی لەلایەن دەستەیەکی هەڵبژێردراوەوە ئامادە نەکراوە.

یەکێك لەنیگەرانیەکانی سیستانی پەیوەندی بەو بەندەوە هەبوو کە مافی ڤیتۆی دابووە کورد و پێیوابوو کە ئەوە میکانیزمێکەو دەکرێت لەلایەن کەمینەوە (نا شیعی) بەکاربهێنرێت بۆ پەکخستنی ئیرادەی زۆرینەی شیعە. بەگشتی ئەو مەغزای ئەو ماددەیە بوو.

PDF 4 KURD

دەبینرایەوە باری یاسایی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت جۆرە نادیارییەکی پێوەدیاربوو بەتایبەتیش ماددەی (٥٨) و ڤیتۆی کوردی.

وەك قەرەبووکردنەوەیەکیش بۆ کورد چەند پۆستێکی وەزاری گرنگیان پێدرا لەوانەش یەکێك لەپۆستەکانی هەردو جێگری سەرۆك کۆمار( رۆژ نوری شاوەیس لەپ.د.ك) و جێگری سەرۆك وەزیر بۆکاروباری ئاسایشی نەتەوەیی(بەرهەم ساڵح لە ی.ن.ك) و پۆستی وەزیری دەرەوەش درایە (هۆشیار زێباری لە پ.د.ك).

تێکڕای کورد لەکۆی (٢٦)پۆستی وەزاری (٥)پۆستی وەزاری وەرگرت و زۆرینەی پۆستەکانی دیکەش بەدەست شیعەوە بوون.

دیسان بۆ جارێکی تر بەشێوەیەکی بەرچاو تورکمان پەراوێزخران و تەنیا نوێنەری تورکمانیش لەحکومەتی کاتیدا( رەشاد مەندان عومەر) بوو کە ئەویش شارەزاییەکی ئەوتۆی لە کاری سیاسیدا نەبوو، کە وەك وەزیری زانست و تەکنەلۆژیا لەپۆستەکەی خۆیدا مایەوە.

وەك ئەوەی چاوەڕوانیشدەکرا کاردانەوەکانی زۆربەی سەرانی سیاسی تورکمان نەرێنی بوو، بزوتنەوەی ئیسلامی تورکمان لەدوو تویێی بەیاننامەیەکدا ئاماژەی بە وەکرد کە پەراوێزخستنی تورکمان ناچاریان دەکات پەنا بۆ چەك هەڵگرتن و دەست سووربوونیان بەخوێنی عێراقیەکان بەرن.

هەر لەبەیاننامەکەدا داواکراوە لەپێناو مومارەسەکردنی دیموکراسی و دادوەری و یەکسانیدا یەکێك لەپۆستەکانی جێگری سەرۆك کۆمار یاخود جێگری سەرۆك وەزیر و سێ پۆستی وەزیری بۆ تورکمان تەرخان بکرێت، چونکە ئەوە لەگەڵ قەبارەی دانیشتوانی تورکمان کە ژمارەیان زیاتر لە ٣ ملیۆن کەسە کارێکی گونجاوە١.

بەڵام نوێنەرایەتیکردنی کورد بەبەراورد بە نوێنەرایەتی تورکمان لەحکومەتی کاتی عێراقدا کە نوێنەرایەتیەکی تەواو بوو لەجێبەجێکردنی ماددەی (٥٨)دا وەك خۆی پراکتیزە نەکرا.

هاوکات بۆ روو بەڕوبوونەوەی بارودۆخی خراپی ئەمنی، لەنیوەی دووەمی ساڵی ٢٠٠٤دا ئەیاد عەلاوی سەرۆك وەزیر کۆمەڵێك ئەولەویەتی دیکەی هەبوو، تەنیا بەشداریکردنیشی کە واتایەکی هەبوبێت لەچارەسەرکردنی پرسی کەرکووکدا پێکهێنانی لیژنەیەکی حکومی بوو لە جێبەجێکردنی ماددەی (٥٨) کە سەرۆکەکەی حەمید مەجید موسای سکرتێری حزبی شیوعی بوو.

---

1 - Turkmenali(BBC Monitoring Middle East).2004."Iraqi Turkmen Parties Rejcet Delay in Kirkuk Council Elections."27 November(LN).

## زەمینەسازی بۆ هەڵبژاردنەکان

لەکۆی ئەو پرسە ئاڵۆزە جۆراوجۆرانەی کە سروشتی ماوەی خۆئامادەکردنەکانی بۆ هەڵبژاردنی فیدراڵی و لۆکاڵی لە کانوونی دووەمی٢٠٠٥دا دیاریکردبوو، ئەو دیبەیتە بوو کە زۆرترین مشتومڕی لەکەرکووك لێکەتەوە سەبارەت بە خواستی هەردو پارتە کوردییەکە لەبارەی دواخستنی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی پارێزگاکان بۆ کاتی جێبەجێکردنی ماددەی (٥٨) لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت و گرێدانی ئەوە بە پرسی ڕێگەدان یاخود ڕێگە نەدان بەکوردانی گەڕاوە لەتۆمارکردن و دەنگدان.

لەبەرایی تشرینی یەکەمدا ئەو پرسە مشتومڕی بەدوای خۆیدا هێنا کاتێك دەرکەوت کە حکومەتی کاتی عێراقی بێتوانا و نائامادەیە لەجێبەجێکردنی بڕگەکانی ماددەی (٥٧)ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت.

لەپاش کۆبوونەوەیەکیش کە لەنێوان مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی لە (١٧)ی تشرینی دووەمدا بەڕێوەچوو وتەبێژێك بەناوی(ی.ن.ك)ەوە رایگەیاند: هەردو سەرکردە رێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە پێویستە هەڵبژاردنەکان ئەنجام نەدرێت گەربێتوو یەکەمجار حکومەتی عێراقی کێشەی کورد بەپێی ماددەی(٥٨) چارەسەر نەکات کە بارودۆخی کەرکوك بۆ کورد سروشتی دەکاتەوە١.

لەناوەڕۆکدا هەردو سەرکردەی کورد داوای دواخستنی هەڵبژاردنەکان دەکەن بۆ باشکردنی دەرفەتی بردنەوە لەدەنگدان تا کورد پارێزگاری لە کۆنترۆڵکردنی شارەکە بکات و لەقۆناغە جیاجیاکانیشدا کورد ترسی ئەمنی وەك هۆکارێك بۆ دواخستنی هەڵبژاردنەکان کردە بەهانە. بەڵام هەرگیز ئەو پاساوێکی باوەڕپێکراو نەبووە لەلای کورد لەگەڵ ئەوەی یارمەتیدەر بووە بۆ پێکهێنانی هاوپەیمانێتیەکی بەرژەوەندیخوازانەی کاتی لەنێوان کوردو پارتە

---

١- لەسایەی نەبوونی داتای باوەڕپێکراو کە سەرچاوەکەی سەرژمێری دانیشتوان بێت ، رژێم لەتۆمارکردنی دەنگدەراندا پشتی بەو کۆبۆنە دەبەست کە لەچوارچێوەی بەرنامەی نەوت بەخۆراك لەنەوەدەکاندا و بەسەر پەرشتی نەتەوە یەکگرتوەکان دەرکرابوو. هەرچی گەڕاوەکانیش بوون بۆ کەرکوك خاوەنی کۆبۆنی خۆراك نەبوون بۆ ئەوەی وەك کەرکوکی بەڵگەکانیان بخەنە روو.

عیراقییەکانی تردا، بەتایبەتیش لایەنە عەرەبییە سوننەکان کە ئەوانیش دیسان لەگەڵ دواخستنی هەڵبژاردنەکاندا بوون.

لەو کۆبوونەوەیەشدا کە لەتشرینی دووەم لەهاوینە هەواری دوکان سازکراو تیایدا زۆرینەی کوتلە سیاسیە عێراقییەکان ئامادەی بوون کۆدەنگیەك هەبوو لەسەر دواخستنی هەڵبژاردنەکان لەسەرتاسەری عێراق ئەویش بەهۆی ناهەمواریی ڕەوشی ئەمنیەوە.

بەڵام دواخستنی هەڵبژاردنی نیشتمانی لەبەرژەوەندی کوردو پارتە سەرەکیەکانی شیعەدا نەبوو، چونکە ئەو ناوچانەی کە تیایدا ڕەوشی ئەمنی فاکتەرێکی سەرەکی بوون بۆ ڕێگریکردن لەبەشداریکردن بۆ بەردەم سندوقەکانی دەنگدان دەڤەرە سونییەکان ببون و ئەوەش بەپێی ئەو سیستەمەی کە لەهەڵبژاردندا پەیڕەو دەکرا واتای کەمی ڕێژەی دەنگدەران لەو ناوچانەو زیادبوونی ئاستی نوێنەرایەتیکردنی لایەنەکانی تری دەگەیاند.

لەبەرئەوە هەڵوێستی کورد خۆی لەبانگەشەکردن بۆ سازاندنی هەڵبژاردنی گشتی و دواخستنی لەکەرکووکدا دەبینییەوە.

هاوکات بەرەی تورکمانیی عیراقی باوەڕی بە لۆژیکی پاساوەکانی کورد نەبوو بۆیە بەرپەرچدانەوەی بەرە بەم جۆرە بوو " ئێمە رایدەگەیەنین کە ئەو داوایە ڕەتدەکەینەوە چونکە بارودۆخی ئەمنی لەشاری کەرکووك ڕێگر نییە لەئەنجامدانی هەڵبژاردن، پاشان جێبەجێ نەکردنی ماددەی (٥٨) لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت بەهانەیەکی بەهێز نییە بۆ دواخستنی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك١.

پێدەچوو کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردن ئەو هەڵوێستەی بەرەی تورکمانی بەهەند وەرگرتبێت، ئەوەبوو لە(١٢)ی کانوونی یەکەمدا کۆمسیۆن بڕیارێکی دەرکردو بەو پێیەش داواکاری کوردی سەبارەت بە دواخستنی هەڵبژاردن لەکەرکووکدا ڕەتکردەوە و ئەوەش کۆتایی هێنا بە ئەگەری ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکووك بەر لە هەڵبژاردن، بەڵام دیسان ئەوە گومانی دروستکرد

1- Kurdistan Newsline (BBC Monitoring Middle East). 2004(LN)."Iraq:Kurds Threaten to Boycott Kirkuk Governorate Election."22December .

پاش رۆژێك لەبلاوبوونەوەی نامەی کوردەکان یەحیا عاسی حەدیدی لەکۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لەکەرکوك دەستیکێشایەو و دواتریش ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك پێکهاتەی کۆمسیۆنەکەی لەسەر بناغەی نوێنەرایەتی وەك یەکی هەر چوار پێکهاتە ئیتنیکییەکە دروستکردەوە.

PDF 4 KURD

ئەوەی ئایا کوردە گەڕاوەکان کە تا کۆتایی ساڵی ٢٠٠٥ ژمارەیان نزیکەی ١٠٠ هەزار کـەس دەبوو، ئامادەن بۆ ئەوەی ناویان لەتۆماری دەنگدەرانی پارێزگای کەرکووکدا تۆماربکرێت١.

جگە لەوەش ئەو دەستەیەی کە دەسەڵاتی هەبوو لەپێدانی مافی بەشداریکردنی دەنگـدەردا کۆمسیۆنی هەڵبژاردن بوو لەکەرکوك کە لە (١٠) ئەندام پێکهاتبوو، واتە لە (٦) عەرەب و (٢)تورکمان و ئاشوورییەك و کوردێك. یەکێکیش لەو بڕیارانەی ئـەو کۆمسـیۆنە دەریکردبـوو رێگەدان بوو بەگەڕانەوەی ئەو عەرەبانەی کەرکووکیان بەجێهێشتبوو تا بەشـداری لەدەنگـدانی پارێزگاکەدا بکەن.

جا لەترسی ئەوەی نەبا کوردانی گەڕاوە لەلیستی دەنگدەرانـدا بەئەنقەسـت دووربخرێنـەوە، سەرکردایەتی کورد دەستیکرد بەهەڵمەتێکی فراوان لەدژی کۆمسیۆنی هەڵبژاردن لە کەرکووك و گومانکردنی لە خاوێنی کارەکانی ئەو کۆمسیۆنە.

لەناوەڕاسـتی کـانوونی ئەکەمـدا ئەنـدامانی کـورد لەئەنجوومـەنی پارێزگـای کـەرکووك نامەیەکیان ئاراستەی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی عیراقی کردو تیایدا نارەزایی خۆیـان پیشـاندا لەبەرامبەر قەبارەو ژمارەی کورد لە پێکهاتەی کۆمسیۆنەکەدا.

هەروەها لەنامەکەدا ( یەحیا حەدیدی) تۆمەتبار دەکرێت بە وەی کە لەهەتیوەکانی رژێمی بەعسەو بەوەش ناسراوە کە دوژمنی کوردە.دیسان جێگرەکەشی ئەندامی بـەرەی تورکمانییـەو چارەی کوردی ناوێت.

نامەکە بەو هەڕەشەیە کۆتایی دێت کە دەڵێت :" ئەگەر هەڵبژاردنی کەرکووك دوا نەخرێت و ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت جێبەجێنەکرێت ئەوا بایکۆتی هەڵبژاردنەکانی کەرکووك دەکەین"٢.

ئەگەری بایکۆتکردنی کورد بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی کەرکووك ( بەڵام نەك بایکۆتکردنی هەڵبژاردنی گشتیی نیشتمانی) لەڕووی پراکتیکییەو هەڕەشـەیەکی راسـتەوخۆ بـوو بـۆ سـەر شەرعیەتی دەرئەنجامەکانی هەڵبژاردن.

جا لەبری زیاتر ئاڵۆزکردنی پەیوەندی نێوان پێکهاتـەکان کـە بـۆ خـۆی پـەنگخواردبووەوە، حکومەتی کاتی عێراقی هاتە پێشەوە بۆ گەیشتن بەرێککەوتنێك لەگەڵ سەرکردایەتی کورد.

1 - Kurdistan satellite TV(BBC Monitoring Middle East).2005."Iraq Kurdish Leader Reports "good result"on Kirkuk in Baghdad Talks."15january(LN).
2 - Turkmenali ( BBC Monitoring Middle East ) .2005. " Iraqi Turkmens Protest Against Kurdish Domination in Kirkuk."27Janury(LN).

به‌پێی ئه‌و ڕێککه‌وتنه‌ش هه‌روه‌ك جه‌لال تاڵه‌بانی ڕایگه‌یاند: ئه‌و (١٠٨) هه‌زار هاوڵاتیه‌ی پێبه‌ش کراون له‌مافی ده‌نگدان ئه‌وا ئێستا ئه‌و مافه‌یان بۆ گه‌ڕێنراوه‌ته‌وه.

ئه‌وه‌بوو ماوه‌ی تۆمارکردن بۆ ١٥ ڕۆژیتر درێژکرایه‌وه‌و ئه‌و پێیه‌ش هه‌رکورد تورکمانێك که هه‌ڵگری ناسنامه‌ی باری که‌سێتی که‌رکووك بن ئه‌وا بۆیان هه‌یه به‌شداری ده‌نگدان بکه‌ن بێئه‌وه‌ی ناوی خۆیان تۆمار بکه‌ن١.

له‌به‌رامبه‌ردا لایه‌نی کوردی ڕازیبوون به‌وه‌ی عه‌ره‌ب هاورده‌کان مافی ده‌نگدان و ناوتۆمارکردنیان هه‌بێت. وه‌ك دیاربوو ئامانج له‌و ڕێکه‌تننامه‌یه ڕازیکردنی کورد بوو به‌ڵام ئه‌و ڕازیکردنه‌ش کاردانه‌وه‌ی توندی لای به‌ره‌ی تورکمانی لێکه‌وته‌وه.

(ریاز سری که‌هیه) سه‌رۆکی پارتی تورکمان ئیلی به‌راشکاوانه سه‌باره‌ت به ڕێکه‌تننامه‌که وتی: هه‌ڵبژاردنه‌که ساخته‌کاری تێدا کراوه چونکه هه‌موو لایه‌ك ده‌زانن که چ لایه‌نێك براوه‌یه له‌و هه‌ڵبژاردنه‌دا....و ئه‌مرۆ ئابڕووچوونی هه‌ڵبژاردنه له‌که‌رکووکدا٢. دوای غه‌زه‌لێکی کورت و ئه‌گه‌ری بایکۆتکردنی له‌لایه‌ن به‌ره‌ی تورکمانییه‌وه ڕاوبۆچوونی به‌ره‌ی ناوبراو به سیاسه‌تی به‌شداریکردن کۆتایی هات له‌گه‌ل ڕه‌تکردنه‌وه‌ی شه‌رعیه‌تی ده‌نگی کورد له‌که‌رکووکدا٣.

### لیسته حزبییه‌کان

له‌به‌رایی کانوونی یه‌که‌مدا سه‌رانی هه‌ردو پارته کوردییه‌که به‌ره‌سمی پێکهێنانی لیستی برایه‌تی که‌رکووکیان ڕاگه‌یاند بۆ به‌شداریکردن له‌هه‌ڵبژاردنی ئه‌نجوومه‌نی پارێزگای که‌رکووك.

لیستی برایه‌تی که‌رکووك نوێنه‌رایه‌تی لیستی هاوپه‌یمانی کوردستانی بوون له هه‌ڵبژاردنی گشتی له‌سه‌ر ئاستی فیدراڵی به‌ڵام له‌گه‌ڵیدا له‌کۆنگره‌یه‌کی ڕۆژنامه‌وانیدا جه‌لال تاڵه‌بانی ڕایگه‌یاند: لیستی برایه‌تی که‌رکووك " چه‌پکه گوڵ" ه‌و نوێنه‌رایه‌تی سه‌رجه‌م پێکهاته‌کانی

---

1 - Turkmenali ( BBC Monitoring Middle East ) .2005. " Iraqi Turkmen Front Decides to Participate in Kerkuk Council Elections." 28 January ( LN ).

2 - Turkmenali ( BBC Monitoring Middle East ) . 2005. " Iraqi Turkmen Front Decides to Participate in Kirkuk Council Elections." 28 January ( LN ).

3 - KDP Satellite TV ( BBC Monitoring International Reports ).2005. " Iraq : Kurdish Leaders From Joint Election List, Discuss Topical Issues. " 2 December ( LN ).

PDF 4 KURD

پارێزگای کەرکووك دەکات، بەو جۆرە بەبۆچوونی تاڵەبانی لیستی برایەتی بەتەنیا لیستی کورد نەبوو بەڵکو کوردستانی بوو لەنوێنەرایەتیکردنی ئەوانیتردا١.

لەڕووی تەکنیکییەو ئەوە راستبوو بەڵام هەندێك نارۆشنیش بوو چونکە باڵا دەستی پارتە کوردییەکان بەسەر لیستی برایەتیەوە دیارو بەرچاو بوو.

لەتەك هەردو پارتەسەرەکیەکەی کورددا (١٠) پارتی تر بەشدار بوون لەوانەش یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان( کە جەماوەرییوونی لەزیادبووندا بوو)، حزبی شیوعی کوردستان، حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان( پارتێکی بچکۆلە بوو).

لەڕووی فرەیی ئیتنیکییەوە تورکمان بە نوێنەرایەتی لیستی پارتی گەلی تورکمان و پارتی یەکێتی تورکمانی عێراقی بەشدارییان کردبوو، هەروەها ژمارەیەك عەرەبیش وەك سەربەخۆ لە لیستی برایەتیدا پاڵێوراو بوون.

لەڕووی رەگەزیشەوە فرەیی هەبوو چونکە سێیەکی پاڵێوراوانی لیستەکە لەژنان بوون. هەرچەندە لیستی برایەتی ئەو "چەپکە گوڵە" نەبوو کە تاڵەبانی بانگەشەی بۆ دەکرد بەڵام کورد تەنیا پێکهاتەی ئیتنیکی بوو کە هەوڵی شێلگیرانەی دا بۆ دامەزراندنی هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنە ئیتنیکیەکانی تردا.

لەنێو ئەو پارەتە تورکمانیانەی کە بەشدار نەبوون لە لیستی برایەتی کەرکووك پێشنیازی پێکهێنانی لیستی تورکمانی کرا کە جیاواز بوو لەو بەرەیەی کە هەبوو هەرەندە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو بەرەیەدا بوو.

جگە لە چوار پارتە سەرەکیەکەی تورکمان □ پارتی نیشتمانی تورکمانی، پارتی تورکمانی ئیلی، پارتی سەربەخۆی تورکمان و بزوتنەوەی ئیسلامی تورکمانی □ لیستەکەی تورکمان هەریەك لە پارتی وەفای تورکمانی و پارتی دادو رزگاری لەخۆگرتبوو٢.

لەگەڵ راگەیاندنی ئەو بەرەیەش (فاروق عەبدوڵڵا عەبدولڕەحمان) سەرۆکی بەرەی تورکمانی رایگەیاند: ئەو پارتانەی لەو لیستەدا کۆبوونەتەوە نوێنەرایەتی ٩٠٪ی کۆمەڵگەی تورکمانی

---

1 - بەرەی تورکمانی لەقۆناغە جیاجیاکاندا لەنێوان ٤-٦ پارتی سیاسی لەخۆگرتبوو. لەکاتی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥بەرەی تورکمانی ٤ پارتی لەخۆ گرتبوو.

2 - Al-Mustaqbal web site ( BBC Monitoring Middle East ).2004. "Iraq Turkmen Front Leader on Participation in Elections , Situation in Kirkuk ." 30 November ( LN ).

دەدەن و بەوەش (٢٥) کورسی لە پەرلەمانی نیشتمانیدا مسۆگەر دەکەن، بەڵام ئەو خەملاندنەی بەرەی تورکمانی لەبنەڕەتدا تایبەت بوو بە حزبە سوننیەکانی تورکمان.

هەروەك سەرۆکی بەرەی تورکمانی ئاماژەی پێکرد دابەشبوونی تایەفی نێوان تورکمانەکان بەنزیکەیی پەنجا بەپەنجایە لەگەڵ ئەوەی ئەو ڕێژەیەش جێگەی ناکۆکییە. هەرچی پارتە شیعەکانی تورکمانیشە کە زیاتر لە یەکێتی ئیسلامی تورکمانی عێراقدا کۆببوونەوە بەلیستی جیاوازو بەدوور لە لیستی بەرەی تورکمانی لەکەرکوك بەشداری هەڵبژاردنیان کردو لەسەر ئاستی نیشتمانیشدا چوونە نێو ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقییەوە١.

سەبارەت بە پارتە عەرەبیەکانیش لەبارودۆخێکی دژوارتردا بوون ئەوەبوو لەسەر ئاستی نیشتمانی پارتە سوننەکانی عەرەب پابەندی دەستەی زانایانی موسڵمانان و لەگەڵ بایکۆتکردنی هەڵبژاردندا بوون. بەڵام کەرکووك لەلایەن ئەو دەستەیەوە هەڵاوێرکراو بگرە فەتواش بۆ لایەنگرانیان لەو پارێزگایەدا دەرکرا تا بەشداری هەڵبژاردن و دەنگدان بکەن.

دیسان ئەوەش واینەکرد کە ڕێگر بێت لەپاشە کشەی یەکێك لە کوتلە عەرەبییە سوننە سەرەکیەکانی کەرکووك ( بەرەی یەکگرتووی عەرەبی ) بەشەش ڕۆژ بەر لە هەڵبژاردنەکان، ئەویش وەك نارەزاییەك لەبەرامبەر بڕیاری کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان سەبارەت بە ڕێگەدان بە کوردانی گەڕاوە بۆ ئەوەی دەنگی خۆیان بدەن.

دیارە ئەو پاشە کشە کردنە وایکرد هەردو پارتی گەورەی عەرەبە شوننەکان لەگۆڕەپانەکەدا بمێننەوە کە ئەوانیش گردبوونەوەی نیشتمانی عێراق و گردبوونەوەی کۆماریی عێراق بوون.

هەرچی عەرەبی هاوردەشە کە سەر لەنوێ لەکەرکووك نیشتەجێکرابوونەوە زۆربەیان شیعە بوونو خاوەنی ڕێکخراوێك یان دەنگێکی سیاسی یان پارتێك نەبوون کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانیان بکات هەرچەندە هەندێك پارتی نێو ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی لەبنەڕەتدا شیعە بوون لەوانەش ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی( بەر لەگۆڕینی ناوەکەی) و حزبی دەعوە

---

١- یەکێك لەو ڕێکخراوانەی کە پەیوەندی بە بەرەی تورکمانییەوە نەبووە، بزوتنەوەی ناسیونالیزمی تورکمانە ، کە بزوتنەوەیەکی زۆر پەرگیرە و دەنگۆی ئەوەش لەئارادایە کە پەیوەندی بە ڕێکخراوی "گورگە بۆرەکان"ەوە هەیە کە ڕێکخراوێکی نیمچە سەربازییە لە تورکیا.

PDF 4 KURD

که‌ پارێزگاریان له‌مانه‌وه‌ی خۆیان له‌که‌رکووکدا ده‌کرد، به‌ڵام پێنه‌ده‌چوو ژماره‌یه‌کی ئه‌وتۆی شیعه‌ی شاره‌که‌ له‌خۆیان کۆبکه‌نه‌وه‌، هه‌ربۆیه‌ دواجار تێکه‌ڵ به‌هاوپه‌یمانی ئیسلامی تورکمان بوون١.

هه‌رچی پارتی سه‌ره‌کی مه‌سیحیه‌کانیشه‌ که‌ له‌ده‌ره‌وه‌ی لیستی برایه‌تی که‌رکووك به‌شداری هه‌ڵبژاردنی کرد، بریتی بوو له‌ بزوتنه‌وه‌ی دیموکراسی ئاشووری که‌ به‌ناوی " لیستی نیشتمانی رافیدێن" دابه‌زی٢. سیستمی هه‌ڵبژاردن که‌ له‌کانوونی دووه‌می ساڵی ٢٠٠٥ له‌سه‌ر ئاستی فیدراڵی و لۆکاڵی جێبه‌جێکرا شێوه‌یه‌ك بوو له‌شێوه‌کانی نوێنه‌رایه‌تی رێژه‌یی لیسته‌ حزبیه‌کان که‌ کورسی له‌په‌رله‌مان و ئه‌نجوومه‌نی پارێزگاکان ته‌رخان ده‌کرد به‌و جۆره‌ی له‌گه‌ڵ ده‌نگی هاتووی پارته‌کان گونجاوبێت٣.

پشت به‌ستنیش به‌و سیستمه‌ هۆکارێکی لۆجستی (ده‌کرا به‌بێ سه‌رژمێریی دانیشتوان بێ گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ نه‌خشه‌ رێژکردنی سنووری بازنه‌کانی هه‌ڵبژاردن جێبه‌جێ بکرێت) و سیاسی(له‌لای سه‌رجه‌م پێکهاته‌ ئیتنیکیه‌کان ده‌رفه‌تی گونجاوی نوێنه‌رایه‌تی کردنی هه‌بوو) هه‌بوو٤.

دیسان سه‌ربای ناڕه‌زاییه‌کان له‌به‌کارهێنانی سیستمی نوێنه‌رایه‌تی رێژه‌یی به‌ڵام په‌نابردن بۆ جێبه‌جێکردنی ئه‌و سیستمه‌ له‌چوارچێوه‌ی عێراق له‌ساڵی ٢٠٠٥دا کاریگه‌ری گه‌وره‌ی له‌سه‌ر

---

١- ره‌نگه‌ ئه‌و بزوتنه‌وه‌یه‌ی که‌ موقته‌دا رابه‌رایه‌تی ده‌کرد زیاد له‌هه‌ر رێکخراوێکی تری عه‌ره‌بی شیعی له‌که‌رکوك پشتیوانی جه‌ماوه‌ری به‌ده‌ستهێنا و له‌توانایدا هه‌بوو جه‌ماوه‌ری عه‌ره‌بی شیعه‌ له‌شاره‌که‌دا جۆش بدات به‌ڵام سه‌در ئاماده‌ نه‌بوو له‌سایه‌ی داگیرکاریدا به‌شداری هه‌ڵبژاردن بکات.

٢- به‌ڵام لیستی نیشتملنی رافیدێن به‌شه‌ش پاڵێوراو به‌شداری هه‌ڵبژاردنی که‌رکوکی کرد که‌ ئه‌وه‌ش بیگومان بۆ خۆی هه‌ڵسه‌نگاندنێکی ره‌شبینانه‌ بوو به‌ڵام بۆ خۆ سه‌پاندنی ئه‌و لیسته‌ واقیعی بوو.

٣- به‌پێی ئه‌و سیستمه‌ی که‌ دواجار به‌ ژماره‌ ٩٦ ( یاسای هه‌ڵبژاردن) له‌لایه‌ن ده‌سه‌ڵاتی ئیئتلافی کاتییه‌وه‌ ده‌رچوو ، عێراق بووه‌ یه‌ك بازنه‌ی هه‌ڵبژاردن که‌پشت به‌ ( Quota Hare یاخود به‌کۆی ده‌نگه‌کان له‌سه‌ر کۆی ژماره‌ی کورسییه‌کان) ده‌به‌ستێت له‌ دابه‌شکردنی کورسیه‌کانی په‌رله‌مان به‌سه‌ر حزبه‌کاندا. یاساکه‌ رێژه‌ی دیاریکراوی ده‌نگه‌کانی ده‌ستنیشان نه‌کردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی بچنه‌ په‌رله‌مانه‌وه‌. واته‌ هه‌رپارتێك پشکی خۆی به‌ده‌ستبهێنێت ئه‌وا نوێنه‌رایه‌تی ده‌بێت.

٤- له‌به‌ر چه‌ند هۆیه‌کی جیاواز سییستمی یه‌ك بازنه‌یی سزای ئه‌و پارته‌ بچووکانه‌ ده‌دات که‌ خاوه‌نی بنکه‌یه‌کی هه‌ڵبژاردنی په‌رتبووی جوگرافیاین و ئه‌و سیتمه‌ش که‌پشت به‌ بنکه‌ی نوێنه‌رایه‌تی رێژه‌یی ده‌به‌ستێت له‌و گرفته‌ به‌دوور ده‌بێت.

٣- بیر له‌ فره‌جۆری له‌ سیستمی نوێنه‌رایه‌تی رێژه‌یی کرایه‌وه‌ ، بۆنموونه‌ دانانی پارێزگاکان وه‌ك بازنه‌ی هه‌ڵبژاردن و پاشان ته‌رخان کردنی ژماره‌یه‌ك کورسی بۆ هه‌ر پارێزگایه‌ك به‌پێی ژماره‌ی دانیشتوانه‌که‌ی، ئه‌و سیستمه‌ش دواجار جێبه‌جێکرا له‌هه‌ڵبژاردنه‌کانی کانوونی یه‌که‌می ٢٠٠٥. به‌ڵام بریمه‌ر له‌ له‌حوزه‌یرانی ٢٠٠٤ به‌ رێنمایی راوێژکارانی نه‌ته‌وه‌ یه‌کگرتوه‌کان ئه‌و پێشنیازه‌ی ره‌تکرده‌وه‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی پرسه‌که‌ بووه‌ مایه‌ی مشتومڕێکی زۆر.بۆ زانیاری زیاتر بڕوانه‌:

بەشداربوونی دەنگدانەکە هەبوو١، چونکە ڕێژەی نزمی دەنگدەرانی سوننە (یان گرپەکانی تر) رەنگدانەوەی دەبێت لەلاوازبوونی نوێنەرایەتیان لەنێو دەستەی راسپێردراو بەئامادەکردنی دەستووری هەمیشەیی عێراق ( واتە ئەنجوومەنی نیشتمانی).٢ دیارە ئەوەش مەسەلەیەکی گرنگ بوو کە لەپارێزگا فرە ئیتنیکیەکان رەچاودەکرابوو لەوانەش کەرکووك کە پەیوەندی بە کۆنترۆڵکردنی پارێزگاکەوە هەبوو.

دیسان سەربای هەڕەشەی گروپە چەکدارییەکان بەوەی لەرۆژی هەڵبژاردندا شەقامەکان بۆ رووباری خوێن دەگۆڕن، لەشاری کەرکووك هەڵبژاردن بەبێ ڕووداوێکی ئەوتۆ بەڕێوەچوو، کە ئەوەش بەپلەی یەکەم دەگەڕایەوە بۆ ئەو ڕێوشوێنە ئەمنیە توندو تۆڵەی لەکەرکووك و سەرتاسەری عێراق گیرابووە بەر کە تیایدا هاتوچۆکردنی گشت ئۆتۆمبیلێك قەدەغەکرابوو.

ئەوەی پەیوەندی بە هەڵبژاردنەکانی کەرکووکیشەوە هەبوو خۆی لە ئاراستەکردنی تۆمەتی ساختەکاریدا دەبینییەوە.

ئەوەبوو رۆژێك لەپاش هەڵبژاردنەکان بەرەی تورکمانی یەکەم نامەی نارەزاییان ئاراستەی کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان کرد و لیستی تۆەتبارکردنەکەش ئەوەی لەخۆگرتبوو کە "ژمارەیەکی زۆر لەدەنگدەران بۆ چەند جارێك دەنگیان داوە" و " رێگەش بەدەنگدانی کەسانی مردو"ش دراوە، ئەمە جگە لەوەی پێشێلکاری یاسایی لەکاتی تۆماری دەنگدەران و دەنگداندا هەبوو٣.

لەوسەروبەندەدا سیاسییە عەرەبە سوننەکانی حەویجە رایانگەیاند: کە لەکۆی (٣٨ ) ویستگەی دەنگدان تەنیا (١٩) ویستگەیان کراونەتەوو بەوەش کۆی (٩٥) هەزار دەنگدەری عەرەبی شارۆچکەی حەویجە لەدەرفەتی دەنگدان بێبەش کراون چونکە کارتی دەنگدانەکان کەمی هێناوە.

---

Dimond , L. 2005. Squandered Victory : The American Occupation and the Bungled Effort to Bring Democracy to Iraq. New York : Times Books : 269.

٢- لەبارە ئاساییەکاندا ناماقوڵ و نا عادیلانە لە سیستمدا نییەبەجۆرێك پاداشتی ئەوانە بکات کە بەژمارەیەکی زۆر دەنگدان هەڵدەبژێرن و سزای ئەوانەش بدات کە لەماڵەکانیان دەمێننەوە. بەڵام نەدەزانرا کە ئایا عەرەبی سوننە مانەوەیان لەماڵەکانیان هەڵبژاردووە یاخود پابەندبوون بەبایکۆتکردن یان ترس لەوەی ببنە ئامانجی کارە تیرۆریستیەکان.

3- Assyrian International News Agency . 2005. " Iraqi Turkmen Document Details Kurdish Election Rigging in Iraq." 6 February ( www.aina.org/news/200506115345.htm)

PDF 4 KURD

ڕێگەدان بە (١٠٠) هەزار کوردی گەڕاوە لەناو نووسین و دەنگدان بەلای سەرانی سیاسی عەرەبو بەرەی تورکمانیشەوە مایەی نیگەرانی بوو. بەوتەی شێخی یەکێك لەخێڵە گەورەکانی عەرەب " ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بەر لە دەستپێکردنی زانرابوو"١.

هاوکات پارتە مەسیحیەکانیش تۆمەتی مەترسیداریان راگەیاندو باسیان لە پێشێلکاری و ڕێگریکردن لەدەنگدەران کرد بۆچوونە نێو سەنتەرەکانی دەنگدانەوەو ئاماژەیان بەوەکرد کە لەسەر ئاستی فراواندا ڕێگری کراوەو لەکەرکووك و موسڵیش بەشداریکردنی ئاشووریەکان دابەزیوە بەهۆی هەڵمەتی تۆقاندنەوە کە لەلایەن مەسعود بارزانی بەر لەهەڵبژاردن دەستی پێکردبوو٢.

سەربای ئەو لێکۆڵینەوانە" تیۆری" ی لەسەرجەم سکالاکان کران سەبارەت بە ڕوودانی پێشێلکاری بەلام نەبوونی چاودێری نێودەوڵەتی لە نێو وڵات لەرۆژی دەنگداندا وایکرد لێکۆڵینەوەکە بەشێوەیەکی سەربەخۆ کارێکی ئەستەم و دژوار بێت.

هەرچی هەڵبژاردنەکانی کەرکووکیشە بەبێ پێشێلکاری بەڕێوە نەچوون بۆیە ئەو ساختەکاریانەی کە ڕوویاندا بەس بوون بۆ ئەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان بەشێوەیەکی دراماتیکی بگۆڕن٣.

### ئەنجامی هەڵبژاردنەکان

لە١٣ی شوباتدا کۆمسیۆنی بالای هەڵبژاردنەکان ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانی و ئەنجوومەنەکانی هەر( ١٨ ) پارێزگاکە و پەرلەمانی هەرێمی کوردستانی پەسەند کرد و لەکەرکووکیش ئەنجامەکان بەمجۆرە بوون:

1 - Kurdish Life .2005. "Free and Fair Elections a Fable." Winter: 2. (www.findarticles.com /p /articles/mi-m0SBM/is-n13805780/pg-1 )

2 - Assyrian International News Agency .2005. " Kurds Prevent Assyrian Representation .Continue Divisive Formula in Iraq."28 March ( www.aina. Org/releases /20050328112133.htm)

٣- دوای ئەوەی بایکۆتکردنی عەرەبی بەهەند وەرگیرا ،دۆخی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ جیاوازیەکی ئەوتۆی لەگەڵ هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا نەبوو کە لەژێر چاودێری چاودێرانی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە ناحکومیەکان لەکەرکوك بەڕێوەچوو.

PDF 4 KURD

خشتە ٨- ١

ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی پارێزگای کەرکووك، کانوونی دووەم/ ٢٠٠٥

| ژمارەی کورسییەکان لەسەرئاستی پارێزگای کەرکووك | ڕێژەی دەنگەکان | ژمارەی دەنگەکان | پارت |
|---|---|---|---|
| ٢٦ | ٥٩.١ | ٢٣٧٣٠٣ | لیستی برایەتی کەرکووك |
| ٨ | ١٨.٤ | ٧٣٧٩١ | بەرەی تورکمانی |
| ٥ | ١٠.٨ | ٤٣٦٣٥ | گردبونەوەی کۆماریی عێراقی |
| ١ | ٣.١ | ١٢٦٧٨ | ئیئتلافی ئیسلامی و تورکمانی |
| ١ | ٣.١ | ١٢٣٢٩ | گردبوونەوەی نیشتمانیی عێراقی |
| سفر | ٠.٤ | ١٨٥١ | بزوتنەوەی نیشتمانی |
| سفر | ٠.٤ | ١٥٥٤ | لیستی نیشتمانیی رافدێن |
| سفر | ٤.٤ | ١٧٧٥١ | ئەوانیتر |
| ٤١ | ١٠٠ | ٤٠٠٨٩٢ | کۆ |

سەربای ئیدانەی فراوانی لایەنی عەرەبی و بەرەی تورکمانی و تۆمەتبارکردنی کورد بەساختەکاری هەڵبژاردنەکان و دەستکاریکردنی ئەنجامەکان، لیستی برایەتی کەرکووك نزیکەی لە ٦٠٪ی دەنگەکانی بۆخۆی مسۆگەر کردبوو.

هەڵبەتە ژمارەی ئەو دەنگدەرە عەرەب و تورکمانانەی لەترسی کاری توندو تیژی یاخود وەك ڕێزێك بۆ بایکۆتکردنی عەرەبی سوننە لەسەرئاستی نیشتمانی بەشداری دەنگدانیان نەکردبوو ژمارەیەکی زۆربوون، لەکاتێکدا توانای ڕێکخستن لەلای هەردو پارتە کوردییەکە و دابینکردنی ئارامی لەو گەڕەکانەی کە زۆرینەی دانیشتوانیان کورد بوون لەشارەکەدا وایانکرد ڕێژەی بەشداریکردنی کورد لە هەڵبژاردنەکاندا زیاد بکات لەبەر ئەوە سەیر نەبوو کە هێزی دەنگدانی کورد جۆرە گەورەییەکی پێوەدیاربێت.

هەڵبژاردنەکان ئەزموونێکی تاڵ بوون بۆ لیستی نیشتمانی رافیدێن چونکە(١٥٠٠) دەنگ کە ئەو لیستە لە هەڵبژاردنەکانی کەرکووکدا کۆی کردبووەوە بەش نەبوو بۆ ئەوەی زامنی نوێنەرایەتی کردنی بکات لەئەنجوومەنی پارێزگاکەدا. دیسان لەپارێزگای نەینەواش دەنگەکانی ئەو لیستە تەنیا(٤٦٠٠) دەنگ بوونو ئەوەش کەمتر بوو لەوەی کە لێی چاوەڕوان دەکرا بەڵام ئەو ژمارەیە بەس بوو بۆ ئەوەی تەنیا یەك کوردسی لەئەنجوومەنی پارێزگای نەینەوا مسۆگەر بکات.

لەسەر ئاستی نیشتمانییش سەرچاوەی سەرەکی دەنگەکانی لیستی نیشتمانیی رافیدێن دەنگی دەنگدەرانی تاراوگە بوون کە پتر لە نیوەی کۆی دەنگەکانی بۆ مسۆگەر کرد[١]، و بەش ئە لیستە توانی تەنیا بەکورسییەك بەشداری پەرلەمانی عێراق بکات کە ئەویش لەلایەن "یونادم کەنە" ی سەرکردەی بزوتنەوەی دیموکراسی ئاشووری پڕکرایەوە. بەڵام ئەو ژمارەیە لیستی نیشتمانیی رافیدێنی بێزار کرد چونکە لەکۆی شەش ئەندامی مەسیحی لەپەرلەماندا چواریان سەر لە لیستی کورد( هاوپەیمانی دیموکراسی کوردستانی) هەڵبژێردرابوون.

هەرچی ئەدای هەردو کوتلە سەرەکیەکەی عەرەبیش گردبوونەوەی نیشتمانیی عێراقی و گردبوونەوەی کۆماریی عێراقی- بەشێوەیەکی نەرێنی لەهەڵبژدنەکاندا کەوتبوونە ژێر کاریگەرییەوە، چونکە بەشداریبوونی سوننەکان لەئاستێکی نزمدا بوو کە ئەوەش دەگەڕایەوە بۆ ئەگەری ئەنجامدانی کاری توندو تیژی یاخود بەشداری نەکردنی سوننە لەسەر ئاستی نیشتمانی.

بێگومان کارێکی گرانیشە کە بزانرێت کام لەو دووفاکتەرە ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو، بەڵام لەهەڵبژاردنی نیشتمانیدا کە لەکانونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥ بەڕێوەچوو توندو تیژییەکان لەکەرکووکدا لەو پەڕیدا بوو. هەربۆیە هانی عەرەبی سوننە درا بەشداری دەنگدان بکەن و

---

١- کۆی ئەو دەنگانەی لیستی رافیدێن لەعێراق بەدەستیهێنا ٣٦٢٥٥دەنگ بوو کە ١٨٥٣٨دەنگی دەنگدەرانی دەرەوەی وڵات بوون.

ئەوەش حزبە عەرەبیە سوننەکانی کەرکووك دوو هێندەی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥ دەنگیان بۆ خۆیان فەراهەمکرد.

ئەوەبوو گردبوونەوەی کۆماریی عێراقی (٥) ئەندامی گەیاندە ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك، کاتێك توانی ئەوەندەی ژمارەی دەنگ مسۆگەر بکات کەسێ هێندە لەبەرامبەر ئاستی نیشتمانی زیاتر بێت١.

کە ئەوەش بەواتای زۆرێك لەلایەنگرانی گردبوونەوەی کۆماریی پابەندبوون بە بانگەوازەکەی دەستەی زانایانی موسڵمانان کە تیایدا داوای بایکۆتکردنی هەڵبژاردنی کردبوو لەسەر نیشتمانیو بەشداریکردن لە هەڵبژاردنی کەرکووکدا.هەرچی گردبوونەوەی نیشتمانیی عێراقیشە (١٢) هەزار دەنگی لەهەڵبژاردنی پارێزگای کەرکووك بەدەستهێنا کە ئەو ژمارەیەش بەس نەبوو بۆ ئەوەی کورسییەك لەئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك مسۆگەربکات.

هەروەها لەسەر ئاستی هەڵبژاردنی نیشتمانیشدا بەهەمان شێوە گردبوونەوەی کۆماریی بایکۆتی هەڵبژاردنەکەی کرد٢.ئەم جۆرە دەنگدان و دەرئەنجامانەی هەڵبژاردن، عەرەبی شیعەی کەرکووك( کە لەڕووی ژمارەوە زۆرتربوون) ی تووشی واقوڕمان کردبوو.

سەبارەت بەدەنگدەرانی عەرەبی شیعە لەکەرکووکدا دەنگەکانیان لەهەڵبژاردنی نیشتمانیدا چوو بۆ ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی کە بەتەنیا لەو پارێزگایەدا (١٩) هەزار دەنگی بۆ خۆی مسۆگەر کردبوو چونکە پارتێکی تر نەبوو نوێنەرایەتی بەرژەوەندی عەرەبی شیعە بکات جگە لە ئیئتلافی ئیسلامی تورکمانی نەبێت. لەراستیدا زۆرینەی عەرەبی شیعەی کەرکووك شارەکەیان بەجێهێشتبوو یاخود ناوی خۆیان بۆ دەنگدان تۆمار نەکردبوو یان زۆر بە سادەیی لەرۆژی هەڵبژاردندا روویان لە سندووقەکانی دەنگدان نەکرد.

---

١- لەکەرکوك گردبوونەوەی کۆماریی لەهەڵبژاردنی پارێزگاکەدا زیاتر لە ٤٣ هەزار دەنگی بە دەستهێنا بەڵام لەهەڵبژاردنی نیشتمانیدا تەنیا ٦٠٠٠هەزار دەنگی دەستەبەرکرد.

٢- گردبوونەوەی کۆماریی عێراقی لەهەڵبژاردنی نیشتمانیدا تەنیا ٧٦٥ دەنگی لەکەرکوك بەدەستهێنا. کۆی دەنگەکانیش کە گردبوونەوە لەهەڵبژاردنی نیشتمانی بەدەستیهێنابوو زیاتر لە١٨ هەزار دەنگ بوو، کە پترلە ١٥ هەزاردەنگی لە سەڵاحەدین بوو.

PDF 4 KURD

## لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی بەرەی تورکمانی

ئەوەی سەیر بوو لەهەڵبژاردنەکانی کانونی دووەمدا ئەدای خراپی بەرەی تورکمانی بوو لەسەر ئاستی لۆکاڵی و نیشتمانیدا. لەهەڵبژاردنەکانی پارێزگای کەرکووکدا بەرەی تورکمانی تەنیا (٨) کورسی مسۆگەر کرد کاتێك کەمتر لە (٧٤) هەزار دەنگی بۆخۆی دەستەبەرکرد. لەهەردوو پارێزگای نەینەواو دیالەش کە تیایدا تورکمان ڕێژەیەکی گەورەی دانیشتوان پێکدەهێنن (بەبۆچوونی بەرە)، نەیانتوانی هیچ کورسییەك لەئەنجوومەنی ئەو دوو پارێزگایەدا دەستەبەربکەن١. بەڵام لەئەنجوومەنی پارێزگای سەڵاحەدین ئەویش بەهۆی کەمی بەشداریکردنی عەرەبی سوننە لەهەڵبژاردنەکەدا بەرەی تورکمانی توانی کورسی بۆخۆی مسۆگەر بکات٢. لەسەرئاستی فیدراڵیش بەرەی تورکمانی کەمێك زیاتر لە ١٪ی دەنگەکانی لەسەرتاسەری وڵاتدا بەدەستهێناو ئەوەش بەس بوو بۆ دەستەبەرکردنی (٣) کورسی لەپەرلەمانی نیشتمانیدا٣.

کاتێکیش ئیتر بەرەی تورکمانی لەئەگەری بایکۆتکردنی هەڵبژاردن دوورکەوتەوە، داوای لەلایەنگرانی کرد تەئکید لەسەر "هێزی تورکمان" بکەنەوە، چونکە بەرە نوێنەرایەتی لە٩٥٪ی کۆمەڵگەی تورکمان دەکات. لەبەرامبەر ئەدای خراپیشی لەهەڵبژاردنەکاندا هیچ شرۆڤەیەکی نەبوو جگە لەوەی کە ئۆباڵی ئەو ئاستەخراپەی بخاتە ئەستۆی کورد بەوەی کە بەشێوەیەکی بەربڵاو ساختەکارییان لەو هەڵبژاردنەدا کردووە.

بێگومان دوو شرۆڤەی بەدیلی دیکەش هەبوون کە لەبەرژەوەندی بەرەی تورکمانیدا نەبوون ئەوانیش ئەوەبوون، کە بەرەی تورکمانی زۆر زیادەڕۆیی کردبوو لە خەمڵاندنی ڕێژەی تورکمانی

---

١- لەهەڵبژاردنی پارێزگای دیالە بەرە کەمتر لە ٠.٥٪ی دەنگەکانی بەدەست هێنا. لە نەینەواش پشکی بەرە لەدەنگەکان کەمتر لە٢٪ بوو.

٢- ڕێژەی بەشداربووانی دەنگدەران لە سەلاحەدین بەگشتی لە ٣٠٪ کەمتر بوون و بەو ڕێژە کەمەی بەشداربووانیش بەرەی تورکمانی توانی ٤ کورسی لەئەنجوومەنی پارێزگاکە بۆخۆی مسۆگەر بکات لەکاتێکدا ژمارەی دەنگەکانی لە ١٥ هەزار کەمتر بوو.

٣- لەراستیدا ئەوەی بەرەی تورکمانی بەدەستیهێنابوو لەکەرکوك بەبەراورد بە ئەدای لەسەر ئاستی نیشتمانی سەرکەوتن بوو.ئەوەبوو لەکۆی ٩٥هەزار دەنگ کە لەسەرتاسەری عێراق بەدەستیهێنابوو ٦٥ هەزاری لەکەرکوکدا بوو.

دانیشتوانی کەرکووك و لەلایەکی تریشەوە دەرکەوت کە بەهیچ شێوەیەك بەرە نوێنەرایەتی لـە ٩٥٪ی کۆمەڵگەی تورکمانی ناکات.

دیارە ئـەم دوو شـرۆڤەیەی دواتـر راسـترن چـونکە ئەگـەر بێتـوو سـەرجەم ئـەو دەنگانـە کۆبکرێنەوە کەچوون بۆ پارتە تورکمانەکان لەکەرکووك (گریمان گشت دەنگەکان کـە چـوون بـۆ ئیئتلافی ئیسلامی و تورکمانی دەنگی تورکمان بوون) ئەوا تێکرای دەنگەکان لـە(١٠٠)هـەزار دەنگ کەمترن و هەرچی بەرەی تورکمانیشە سێ بۆ چواری ئەو ژمارەیەی بەدەستهێناوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تێکرای ژمارەی دەنگـی تورکمـان کـەمتر بـوو لەچـارەکی کـۆی دەنگـەکانی کەرکووك.رەنگە نزمی رێژەی بەشداربوون هەندیك لێکدانەوەی خۆی هەبێت بۆ دابەزینی ئاستی جەماوەریبوونی پارتە تورکمانیەکانی عێراق وبەدڵنیاییشەوە ئەوە یەکێك بوو لە فاکتـەرەکانی دەنگدانی کەسانی نیشتەجێی تاراوگە١.

ئەوەی زیاتریش بەرەی تورکمانی جاڕسکرد دەنگدانی دەنگدەرانی تورکمـان بـوو بەلیسـتە ناتورکمانیەکان لەنێویشیاندا لیستە کوردییە جیاجیاکان.

هەروەك وەزیری دەرەوەی ئەو دەمەی تورکیا (عەبدوڵلا گیول) باسی لە شکستی بەرە بـەم جۆرە کرد: دەڵێن ژمارەی ئەو تورکمانانەی کە دەنگیان بەبەرەی تورکمـانی داوە کـەمترە لـەو دەنگانەی کە تورکمان داویانە بەلیستی کوردی و شیعەکان.

ئـاخۆ ئـەوە سـەیر نیـە؟ بـەرەی تورکمـانی شکسـتی هێنـا لەبەدەسـتهێنانی پشـتیوانی رۆشنبیرانی تورکمان تا بیانخاتە سەر لیستەکەی خۆی٢.

خراپی ئەدای بەرەی تورکمانی لەهەڵبژاردنەکاندا وایکرد تورکیا چاو بە هەڵوێسـتی خـۆی لەباکووری عێراق بخشێنێتەوە، هەر بۆیە لەسەر ئەو بنەمایەش هەڵوێستی خۆی راستکردەوە و بەکردەیی وازی لەبەرەی تورکمانی هێناو لەبری ئەوە هەوڵەکانی خۆی لەکوردستان بەگەڕخست ئەویش بە تێکـەڵاوکردنی پەیوەندییـە ئابوورییـەکان و دروسـتکردنی پەیوەنـدی بـاش لەگـەڵ سەرانی کورددا٣. بەوەش ئیتر بەرە کەمێك ئامادەیی ئەوەی هەبوو گوتاری توند ئامێزی خۆی

---

١- لەکۆی نزیکەی نزیکەی ٣٥ هەزار تورکمان لە تورکیا کە پێشبینی دەکرا زۆرێکیان دەنگ بدەن بۆ بەرژەوەندی بەرەی تورکمانی بەڵام لەراستیدا کەمتر لە ٤٠٠٠هەزار دەنگیان دا.

2 - Birnad, M . A. 2005. " Imitation Raki Won't Affect Us " ( ! ). Turkish Daily News , 5 March ( www.turkishdailynews.com.tr/ article.php?enewisd =7476

3-International Crisis Group . 2006. Iraq and the Kurds: The Brewing battle over Kirkuk ." Brussels : ICG Middle East Report 56,18 July : 21.

هێوربکاتەوەو دانی بەوەشدانا کە دوژمنایەتی سەرسەختی بۆ خواستەکانی کورد شکستی هێناوە لەبەدیهێنانی هەر دەستکەوتێکی بەرچاو لەهەڵبژاردندا.

لەدوای هەڵبژاردنەکانیش ( ریاز سری کەهیە) سەرۆکی پارتی تورکمان ئیلی رایگەیاند: چیتر بەرەی تورکمانی دژ بەوە نییە کە دەستوور لەچوارچێوەی سیستمی فیدراڵی لەسەر ئاستی گشتی عێراقدا ئیعترافی بە هەرێمی کوردستان کردووە.

هەروەها داوای (گفتوگۆی جددی کرد لەگەڵ سەرکردایەتی کورد) لەبارەی داهاتووی کەرکووك و پێشنیازیکرد کەرکووك" قەوارەیەکی فیدراڵی سەربەخۆ بێت کە لەلایەن کوردو تورکمان و عەرەبەوە بەڕێوە ببرێت"١.

لەکۆتایی مانگی ئازاریشدا زۆرێك لەگەورە سەرانی بەرەی تورکمانی بەدوور لەو نەرێتەی کە پێشتر هەیانبوو (جەلال تاڵەبانی) یان وەك سەرۆك کۆماری عێراق دەستنیشانکرد.

هاوکات (فاروق عەبدولڕەحمان) بەیاننامەیەکی رەسمی دەرکردو ئاراستەی "خاوەن شکۆ جەلال تاڵەبانی " کردو تیایدا رەناوی تورکمانەوە پیرۆزبایی لێدەکات و هیوای " خێرو سەرکەوتن" ی بۆ دەخوازێت٢.

وەك ئەوەی تەواو روونبووەوە ستراتیژی بەرەنگاریبوونەوە کە لەلایەن بەرەوە پەیڕەو دەکرا نەك هەرشکستی هێنا لەبەدەستهێنانی پشتیوانی میللیدا بەڵکو درزیشی خستە نێو ریزەکانی بزووتنەوەکەوە.

---

1 - Dawde ,S. 2005. " New Strategy for Turkmen Bloc. " The Journal of Turkish Weekly Opinion , 10 March (www.turkishweekly.net/comments.php?id =434 ).

2- Turkmenli ( BBC Monitoring Middle East ) .2005 . "Turkmen Leader Congratulates New Iraqi President." 11 April (LN).

ئەندامەکانی تری بەرەی تورکمانی جوامێرییان کەمتر بوو .بۆ نموونە ئەحمەد موراودلی نوێنەری بەرە لە ئەنقەرە تەقەلایەکی ئازایانەی دا بۆ ئەوەی شتێکی ئیجابی بدۆزێتەوەو لەبارەی هەڵبژاردنی تاڵەبانییەوە بیڵێت. لەکۆتاییشدا وتی: "ئێمە دڵنیاین لەوەی کە تاڵەبانی هەمان هەڵەی سەددام دووبارە ناکاتەوە" ، بەڵام دەبوو بەر لەوە ئاماژە بەوە بدات کە بەدەستهێنانی پۆستی سەرۆك کۆمار بەڵگەیەکی تری براوەیی کوردە لەنێوان پێکهاتە ئیتنیکیەکانی تردا. بڕوانە

(BBC Monitoring International Reports ) .2005." Iraqi Turkmen Front Announces Support for Talabani as President."13
April ( LN ).

لەسەرەتای مانگی ئازاردا ( عەبدولقادر بازرگان) ئەندامی ئەنجوومەنی سەرکردایەتی پارتی تورکمان ئیلی و ئەندامی دامەزرێنەری بەرەی تورکمانی رایگەیاند: بڕیاری بەرە بەبەشدارینەکردنی لەگەڵ لیستی کوردیدا " هەڵەیەکی تەکنیکی" بوو، هەروەها رەخنەی لەسەرکردایەتی بەرەی تورکمانی گرت بەوەی ملی بۆ خواستەکانی ئەنقەرە شۆڕکردووە.

لەکۆنرگەی چوارەمی بەرەی تورکمانی کە لەماوەی(٢٢- ٢٤) ی نیساندا سازکرا، لایەنەکانی نێو ئەو بەرەیە پیوەندیەکانی نێوانیان لەو پەڕی نائۆقرەیدا بوو.

ئەوەبوو لقی بەرە لەهەولێر بەسەرۆکایەتی ( عەبدولقادر بازرگان) پاشەکشەی کردو لەبەرەی تورکمانی جیابووەوە، دواتریش لە دیدارێکیدا بازرگان رەخنەی توندی ئاراستەی بەرەو پەیوەندیەکانی بەتورکیاوە کردو رایگەیاند: بەرەی تورکمانی گەمەیەکە بەدەست تورکیاوە و نارەزایشی پیشاندا بەرامبەر بەوەی کە بەرەی تورکمانی بووەتە ئامرازی دەستی بێگانە١.

دیسان ئەوەی زیاتر بازرگانی بێزارو تووڕە کرد تەرکیزی بەرەی تورکمانی بوو لەسەر کەرکووك ئەویش لەسەر حسابی لقی هەولێر کە خودی بازرگان سەرۆکایەتی دەکرد، ئەمە جگە لەنەزۆکی ستراتیژی روو بەڕووبوونەوە کە بەرەی تورکمانی لەبەرامبەر کورددا پشتی پێدەبەست٢.

لەکۆنگرەی چوارەمی بەرەدا ئەوە ئاشکرا بوو کە قەیرانێکی قووڵ لەنێوان سەرانی سیاسی تورکماندا هەیە بەتایبەتیش ئەوانەی لەناوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی کورددا کاردەکەن لەگەڵ ئەو سەرکردە تورکمانانەی لەدەرەوەی ئەو ناوچانەن.

---

1- Ridolfo , K. 2005. " Iraq Will the Turkmen Spilt Break Turkish Interference ? "RFE/RL,6 May.

٢- لەنیسانی ٢٠٠٣ لەدوای رووخانی رژێمی پێشوو بەماوەیەکی دیارکراو ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بەرە مەڵبەندی کارەکانی لەهەولێرەوە بۆ کەرکوك گوازرایەوە. دواتریش بەرە پشکی شێری لەداهاتی خۆی بۆ کەرکوك تەرخان کرد کە ئەویش لەسەر حسابی لقەکانی تری بوو. هاوکات هەڵوێستی نەیاری بەرە لەبەرامبەر دوو پارتە کوردییەکەدا زۆر لەسەری کەوت بەتایبەتیش لەو پارێزگایانەی کە کورد تیایدا باڵادەست بوون. لە هەولێر کە تورکمانی تێدایە بەرە لەهەڵبژاردنی پارێزگادا کەمتر لە ٠.٣٣٪ی دەنگی بەدەستهێنا.

PDF 4 KURD

## سەرکەوتنی کورد

بێگومان بەگشتی هەڵبژاردنەکان لەسەرجەم ئاستەکاندا بۆ کورد سەرکەوتن بوو، لەسەر ئاستی نیشتمانیدا هاوپەیمانی دیموکراسی کوردستانی (٧٥) کورسی لەپەرلەمانی عێراق مسۆگەر کرد کاتێك نزیکەی (٢٦٪)ی دەنگەکانی بەدەستهێنا.

لەسەر ئاستی پارێزگاکانیشدا لیستە کوردییە جیاوازەکان زۆرینەیان لەهەردو ئەنجوومەنی پارێزگای نەینەواو کەرکووك دابینکردو لەپارێزگای سەلاحەدینیش چەند کورسیەکی ئەنجوومەنەکەیان بەدەستهێناو لەدیالەش بوونێکی گەورەیان لەئەنجوومەنی پارێزگاکەدا هەبوو١. ئەمە جگە لەوەی لە هەرسێ پارێزگا کوردییەکاندا هەرد پارتە گەورەکەی کورد بەجیا بەشداری هەڵبژاردنیان کرد.

هەڵەتە هەموو ئەو ئەنجامانەش وایانکرد کورد لە(٥) پارێزگادا باڵادەست بن، کە دوو لێکدانەوەش بۆ سەرکەوتنی پارتە کوردییەکان لەئارادابوو.

یەکەمیان بەشداری تەواوو زۆری دەنگدەرانی کوردودووەمیشیان بایکۆتکردنی عەرەبی سوننە بوو لە هەڵبژاردنەکاندا. هاوکات هەرسێ پارێزگا کوردییەکەی عێراق لەسەر تاسەری وڵاتدا بەرزترین ڕێژەی بەشداریکردنی دەنگدەرانیان تۆمارکرد، کە ئەوەش بۆ سەقامگیری باری ئەمنی و پەرۆشی گەلی کورد لەو ساتەوەختەدا بۆ دیموکراسی دەگەڕایەوە٢.

لەسەر ئاستی نیشتیمانیشدا ئەو ئەنجامانە دەرفەتی لەبەردەم کورددا خۆشکرد تا ڕۆڵێکی سەرەکی ببینن لە پێکهێنانی حکومەتی نوێدا و لەئامادەکردنی دەستووری هەمیشەیشدا کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبوو.

دیسان لەسەر ئاستی پارێزگاکانیش بردنەوەی کورد بەزۆرینە زەمینەی سازاند بۆ کۆنترۆڵکردنی هەردوو ئەنجوومەنی پارێزگای نەینەواو کەرکوکی فرە ئیتنیك و دەستەبەرکردنی

---

١- کورد لەکۆی ٤١ کورسی ، ٣١ کورسی لەئەنجوومەنی پارێزگای نەینەوا و لەکەرکوکیش ٢٦ کورسی و لە لەسەلاحەدین ٨ کورسی و لە دیالەش ٧ کورسی بۆخۆی مسۆگەر کرد.

٢- پارڕێزگا کوردییەکان بەرزترین ڕێژەی بەشداریکردنیان لەهەڵبژاردنی وڵاتدا تۆمارکرد( دخۆك ٩٢٪،هەولێر ٨٤٪، سلێمانی ٨٢٪). بەپێچەوانەی ئەوەوە ڕێژەی بەشداریکردن لە ناوچە سوننیەکان لەنزمترین ئاستدا بوون، بۆنموونە ڕێژەی بەشداریکردن لە ئەنبار لەهەڵبژاردنی نیشتمانیدا تەنیا لە٢٪ بوو.

PDF 4 KURD

سی بۆ چواری کورسیەکانیان بەڵام لەپارێزگای نەینەوا وەك رێزێك بۆ واقیعـی دانیشـتوان کـە تیایدا عەرەبی سوننە زۆرینە پێکدەهێنن، ئەندامانی کورد لەئەنجوومەنەکـەدا بڕیاریانـدا بـە هێشـتنەوەی (دوورویـد محەمـەد کەشمولـە) لەپۆسـتەکەیدا وەك پارێزگـاری نەینـەوا١.بـەڵام لەکەرکووکدا کورد سەلماندنی کە ئامادە نین دەستبەرداری باڵادەستیان بن.

### پێکهێنانی ئەنجوومەن

ئەو (٢٦) ئەندامەی کە لەسەر لیستی برایەتی کەرکووك هەڵبژێردرابوون تائاستێکی لەبار نوێنەرایەتی ئەو پارتانەیان دەکرد کە لەژێر سایەی ئەو لیستەدا بوون. پشکی (ی.ن.ك) بریتی بوو لە(٧) کورسی بەو پێیەی گەورەترین پارتی کوردی بـوو لـە کەرکووکـدا.هەرچـی پشـکی (پ.د.ك) یشە (٥) کورسی بوو.

هاوکات(٣) کورسی تر بەر یەککگرتووی ئیسـلامی کوردسـتان و (٣) کورسـی تـریش بـەر حزبی شیوعی کوردستان کەوت.

بنکەی نوێنەرایەتیکردنی لیستی برایەتی کەرکووك بەجۆرێك فراوان بوو کـە هەریـەك لـە حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و پارتی نیشتمانی ئاشووری و پارتی گەلی تورکمـان و پـارتی یەکێتی تورکمانی عێراقی سەرو کورسییەکیان بەرکـەوت و هەرچـی سەربەخۆکانیشـە بـوونی خاوەنی (٤) کورسی٢.

لەسەرئاستی ئیتنیکی ئەندامانی لیستی برایەتی کەرکووك کە (٢٦) ئەندام بـوون بەسـەر (٢٠) کوردو (٣) عەرەب و (٢) تورکمان و (١) مەسیحیدا دابەش ببـوون. لیسـتی برایـەتی کەرکووك بەو پێیەی زۆریەی کورسیەکانی ئەنجوومەنەکەی لەدەسـتدا بـوو دەیتـوانی پارێزگـار بەبێ پشتیوانی پارتەکانی تر هەڵببژێرێت بەڵام لەڕووی پراکتیکیـەوە شـەرعیەتی حکـومڕانی کورد لەو پارێزگایەدا پشتی بە یەککگەیشتن لەگەڵ پێکهاتەکانی تردا دەبەست لەسـەر شـێوازی دابەشکردنی دەسەڵات تا لای هەموو لایەك پەسەندبێت.

---

١- کەشمولە لە ناوەڕاستی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٤ لەپاش کوژرانی پارێزگای پێشوو لەپۆستەکەیدا دانرا.

٢- بەهۆی بەشداریکردنی هەردو پارتەکە لە لیستێکی هاوبەشدا داتای تەواو نییە لەسەر ئـەوەی بیسـەلمێنێت بنکـەی جـەماوەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان فـراوانترە لـە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان. بـەڵام تەنانـەت بەرپرسـانی (پ.د.ك) لـە کۆبوونـەوە تایبەتەکانیاندا دان بەوەدا دەنێن کە (ی.ن.ك) لەکەرکوکدا گەورەترین پارتە و ئەوەش رەنگدانەوەی لـە دابەشـکردنی کورسـییەکانی لیستی برایەتی کەرکوك و رێژەی نوێنەرایەتی کردن هەیە لە دەستەکانی تری پەیوەندیدار بە بەرکوك لەوانەش لیژنەی ماددەی ١٤٠.

ئەو گرفتە هەنووکەییەی کە رووبەڕوی سەرانی سیاسی عەرەب و تورکمان دەبووەوە ئەوەبوو کــە رێککــەوتن لەگــەڵ کــورد لەناوەڕۆکــدا بــەواتای پەســەندکردنی شــەرعیەتی ئــەنجامی هەڵبژاردنەکان، بەڵام ئیعترافکردنێکی لەو جۆرە لەئارادا نەبوو.

ئەوەبوو رۆژێك دوای پەسەندکردنی رەسمیانــەی ئــەنجامی هەڵبژاردنــەکان (جــەمال شــان) ئەندامی بەرەی تورکمانی ئەنجامی هەڵبژاردنەکەی وەســفکرد بــە پلانێــك لــەدژی تورکمــان و عەرەب، لەکاتێکدا (شێخ عەبدولرەحمان مونشد ئەلعاسی) لەگردبوونەوەی کۆمــاریی عێــراق رایگەیاند: هەڵبژاردنەکان خاوێن نەبوەو پێشبینی کرد شەڕی ئەهلی لەکەکوکدا بەرپابێت١.

سەبارەت بەکوردیش ئەنجامی هەڵبژاردنەکان تەئکیدکردنــەوە بــوو لەســەر (کوردبــوون) ی کەرکووك یان وەك جەلال تاڵەبانی وتی: ئەنجامەکە ناسنامەی کوردستانی بوونی کەرکووکە٢.

رزگار عەلی لە (ی.ن.ك) رایگەیاند: ئێمە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی کەرکووك نادەین... بەڵکو گەرەکمانە ناسنامەی کوردبوونی کەرکووك ئاشکرا بکەین. بەدڵنیاییەوە ناسنامەی کەرکووکی کێشە لەســەر بــەدیاریکراوی سەرچــاوەی نــاکۆکی نێــوان پێکهاتــە ئیتنیکیــەکان بــوەو لــەو رێگایەشەوە هەڵبژاردنەکان شتێکی ئەوتۆی چارەسەر نەرکرد کە جێگەی باسکردن بێت.

لەگەرمەی ئاراستەکردنی ئەو تۆمەتانەشدا کە لەپاش هەڵبــژاردن لــەئارادابوون چــاوەڕوان دەکرا لیستی برایەتی کەرکووك تووشی ئاستەنگ بێت لەدۆزینەوەی فۆرمێك بــۆ دابەشــکردنی دەسەڵات بەو جۆرەی هەمووولایەك رازیبکات.

لایەنــەکانی کوتلــەی عــەرەبیش داوایــانکرد پۆســتەکانی حــوکمڕانی بــەپێی رێــژەی هەرپێکهاتەیەك دابەش بکرێت نەك لەسەر بنەمای ئەنجامی هەڵبژاردنەکان. وادیاربوو کوتلەی تورکمانیش بەهەمان شێوە لەگەڵ ئەوەدا نەبوون کە دابەشکردنی پۆستەکان لەسەر بنەمای ئەو هێزە بێت کە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان جەختیان لەسەر کردوەتەوە.(تەحسین کەهیە) کــە تــەنیا تورکمانی نێو ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك بوو کە سەربە ئیئــتلافی ئیســلامی و تورکمــانی

---

1 - Anie ,M. and J. Spinner. 2005. " Regional Kurdish Victory Could Lead to Conflict : Results Anger Turkmens and Arabs in Kirkuk. " The Washington Post , 14 February : A08.

2- KurdSat ( BBC Monitoring Middle East ). Iraqi Kurdish Leader Talabani Hails Poll Success in Kirkuk ." 15 February (LN).

ئەو رایگەیاند: مافی خۆمانە کە چەند پۆستێکی دیاریکراو بگرینە دەست١. ئەوەش ئەو ناکۆکییە بنەڕەتیە بوو لەبارەی سروشتی دابەشکردنی ئەو دەسەڵاتەی کە کورد لەرێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە بەدەستیهێنابوو تابگاتە فۆرمێك و تیایدا دان بەمافەکانیدا بنرێت لەگرتنە دەستی پۆستە هەستیارەکانی نێو حکومەتی پارێزگای کەرکووك.

بەڵام داواکاری عەرەب و تورکمان لەدابەشکردنی دەسەڵات وەك ئەوە وایە ئەو هەڵبژاردنە کە بەدیدی ئەوان ساختەبوو رووینەدابێت.بەپێی ئەنجای هەڵبژاردنەکەش پۆستەکانی پارێزگارو سەرۆکی ئەنجوومەنی پارێزگا کەوتنە دەست کوردو هەرچی پۆستەکانی جێگری پارێزگارو یاریدەدەری سەرۆکی ئەنجوومەنەکەشە خرانە بەردەم لیستەکانی تر.

لەسەر ئاستێکی قووڵتریشدا ململانێکە رەنگدانەوەی لەسەر دابەشبوونی ریشەیی هەبوو لەبارەی داهاتووی شارەکەوە. هەروەك (موحەمەد کەمال) ئەندامی لیستی برایەتی کەرکووك رایگەیاند: ئێمە پۆستە هەستیارەکان نادەینە ئەوانەی ئیعتراف بەکوردبوونی شارەکە ناکەن و لەجێبەجێکردنی ماددەی (٥٨)دا هاوکار نین٢.

ئەوەی کە پتر بارودۆخەکەی ئاڵۆزتر کرد ئەو ناکۆکیانە بوون کە لەنێوان هەردو پارتە کوردیەکەدا هەبوون سەبارەت بە کۆمەڵێك پرس کە لەئینتیمای پارێزگارەوە دەستیپێدەکرد تا دەگەیشتە دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوانیاندا لەسەر ئاستی پارێزگاکەدا٣.

سەرئەنجامی ئەو هەلومەرجەش پرۆسەیەکی سیاسی پەککەوتوو بوو، ئەوەبوو لەماوەی درێژکراوەی یەکەمین کۆبوونەوەی رەسمی ئەنجوومەنی پارێزگاکە لە ١- ٢٩ی ئازار، ٢٢ کۆبوونەوەی جیا لەنێوان کوتلە جیاجیاکانی شارەکەدا سازکران بێ ئەوەی بگەنە تەوافوقێك لەسەر شێوازی دابەشکردنی دەسەڵات. لەناوەڕاستی ئازاریشدا هەریەك لەپارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان گەیشتنە رێککەوتن لەسەر مانەوەی (

---

3- Sanders, E. 2005. " The Conflict in Iraq : Kurds Wield New Power in Kirkuk Politics . " The Los Angels Times, 27 March: A5.

2 - Tharwa Review of Events in Iraqi Kurdistan. 2005. " Groupin Kirkuk Far from Making Concessions . "17 -23 May ( www.tharwa project.org/ node/2620#Groups-in-kirkuk-far-from-making-concessions)

٣- لەفەسڵی دەیەمدا بەتێرو تەسەلی لەم پرسانە دەدوێین.



PDF 4 KURD

عەبدولڕەحمان مستەفا) وەك كەسايەتيەكی سەربەخۆ لەپۆستی پارێزگاردا بەڵام بەهاتنی كۆتايی ئازارداهێشتا كەركوك نەبووە خاوەنی حكومەتێكی دەستبەكار.

PDF 4 KURD

لە٢٩ی مانگی ئازارو لە كۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پارێزگادا وابڕياربوو تيايدا هەرسێ پۆستی جێبەجێكاری پارێزگارو جێگرەكەی و سەرۆكی ئەنجوومەن هەڵبژێردرێن بەڵام نوێنەرانی كوتلەی عەرەبی و بەرەی توركمانی ئامادە نەبوون ئەويش وەك بەهانەيك لەبەرامبەر پێداگرتنی كورد لەسەر دابەشكردنی پۆستەكان.

بەپێی ژێدەرێكی راگەياندنی( ی.ن.ك) لەسەرەتاكانی ئاياردا هەردو پارتە كورديیەكە رێككەوتن لەسەر دابەشكردنی پۆستە جێبەجێكارەكان و بڕياريشدار بەهێشتنەوەی پارێزگار لەپۆستەكەيداو ( عيرفان كەركووكی) يش وەك نوێنەری توركمان كە لەكوردەوە نزيك بوو بەوەكالەت بكرێتە جێگری پارێزگارو (رزگار عەلی) كە سەر بە (ی.ن.ك) بوو بكرێتە سەرۆكی ئەنجوومەنی پارێزگارو نوێنەری (پ.د.ك)يش بۆ سەرۆكی ئەنجوومەنی شارەوانی كەركوك.

لە٩ی ئاياردا ليستی برايەتی كەركوك لەدووتوێی ياداشتێكدا ليستەكانی تری ئاگادار كردەوە كە دەست بە دوا گفتوگۆی جددی و فراوان بكەن لەپێناو كەركووكدا.

لەياداشتەكەدا هەڕەشەی ئەوەشكرابوو كە ئەگەر لەماوەی (٣) رۆژدا وەڵامێكی ئيجابييان دەست نەكەوێت ئەوا مافی ئەوەيان هەيە ئەنجوومەنی پارێزگاری كەركوك و ئيدارەكەی وەك ئەوەی بەرژەوەندی باڵای پارێزگاكە دەيخوازێت پێكدەهێنرێت١.

لە١٢ی ئاياردا كوتلەی توركمانی تەئكيدی لەسەر خواستی وەرگرتنی پۆستی جێگری پارێزگار كردەوەو كوتلەی عەرەبيش بەياننامەيەكی توندی دەركردو تيايدا دواخستنی پێكهێنانی حكومەتی پارێزگاكە بۆ كاتێكی تر دەكات٢.

دياربوو دەستپێشخەريەكی هاندەرانە لەئارادا نەبوو بۆ گەيشتن بە تەوافوق، هەربۆيە لە ٢١ی حوزەيراندا ليستی برايەتی كەركوك (عەبدولڕەحمان مستەفا)ی بۆ پۆستی پارێزگارو (رزگار عەلی) بۆسەرۆكی ئەنجوومەنی پارێزگاكە دياری كردەوە.

---

1 - Kurdistani Nuwe(BBC Monitoring Middle East). 2005."Efforts to Form Kirkuk Council Continue Despite Differences Among Lists."11May(LN).

2 -Kurdistani Nuwe(BBC Monitoring Middle East). 2005."Iraqi  Turkmens Demand Post of Kirkuk Deputy Governor." 14May(LN).

هەروەها لەسەر ڕێنمایی سەرکردایەتی هەردو پارە کوردییەکە لیستی برایەتی پۆستی جێگری پارێزگارو یاریدەدەری پارێزگاری بەبەتاڵی هێشتەوە تا دواتر لەلایەن نوێنەرانی پێکهاتە ئیتنیکیەکانی دیکەوە پڕ بکرێتەوە.

پاش نزیکەی شەش مانگ لە هەڵبژاردن کەبوکوك بووە خاوەنی جۆرە حکومەتێك بەڵام لەتوانایدا نەبوو ببێتە حکومەتێکی کاراو ئیعتراف پێکراو لەلایەن زۆرینەی پێکهاتە ناکوردیەکانی کەرکووك بۆ ئەوەی ڕەوایەتی بەدەستبهێنێت.

هەرچەندە لیستی برایەتی کەرکووك لەڕووی تەکنیکیەوە بۆی هەبوو بەدوور لە دەنگی کوتلەکانی تر فەرمانڕەوا بێت بەڵام بەشداری نەکردنی ئەندامانی ئەنجوومەنەکە لە هەردو کوتلەی تورکمانی و عەرەبی لەدەنگدان یاخود نائامادەبوونیان لەکۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنەکە وایکردبوو حکومەتەکەی پارێزگای کەرکووك ئەو شەرعیەتەی نەبێت تامومارەسەی دەسەڵاتی چالاکانەی خۆی بکات لەناوچە نا کوردییەکاندا و دەبوو ئەو دینامیکیەتە بنەڕەتییەش بۆ ماوەی دوو ساڵو نیوی داهاتوو ببێتە هۆی ئیفلیجکردنی فەرمانڕەوایی لەو پارێزگایەدا.

## کێ حوکمی کەرکووك بکات ؟

لەنەبوونی حکومتێکی کارا لەپارێزگاکەدا، کە پشتیوانی سەرجەم پێکهاتە ئیتنیکیەکان بەدەستبهێنێت ئەو بڕیارە گرنگانەی کە پێویست بوون لەکەرکووکدا بدرێن لەشوێنەکانی تر دەدران.

ئەو ڕەوشە تەمومژاوی و تێکئاڵۆزکاوەی کە هێڵەکانی دەسەڵات پێیگەیشتبوون ئاستەم بوو ئەوە دیاری بکرێت کە کێ حوکمی پارێزگاکە دەکات ئەگەر چی کەسانێکیش هەبن حوکم بکەن.

ئەوەبوو تابڕیاردان لەدەستووری هەمیشەیی کارکردن بە بەندەکانی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت و فەرمانەکانی دەسەڵاتی کاتی ئیئتلاف بەردەوامبوو لەدیاریکردنی شێوازی دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوان بەغدادو پارێزگاکاندا.

بەپێی ماددەی (٢٥) لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت هەندێك دەسەڵاتی تایبەت بەسترابوونەوە بە حکومەتی فیدراڵی لەکاتێکدا ماددەی (٥٧) سەرجەم دەسەڵاتەکانی تری بەخشیبووە پارێزگاکان.

سەبارە ب پرسی دەستبەسەردا گرتنی بودجەش، پارێزگاکان بەتەواوی لەمەسەلەی داراییدا پشتیان بە حکومەتی عێراقی دەبەست لەکاتێکدا ئەنجوومەنی پارێزگاکان لەڕووی



PDF 4 KURD

نیوریپەو بۆیان هەبوو بەپێی ماددەی (٥٦، بەشی أ) داهاتی خۆیان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەرێگەی باجو رسوماتەوە زیاد بکەن، بەڵام لەرووی عەمەلییەوە لەو قۆناغەدا پارێزگاکان نەیاندەتوانی چاوەڕوانی دەستەبەرکردنی سەرچاوەی دارایی و ژێرخانی ئابووری بکەن.

ئەوەش بەواتای مەرکوك بەردەوام بوو لەپشت بەستنی تەواوی بە بەغدادو هەردو پارتە کوردییەکە و کەمێکیش بە کۆمەکی دارایی ئەمریکا بۆ ئاوەدانکردنەوە.

لەبەرامبەریشدا ئەوە رێگەی بەحکومەتی ناوەندی دا کە جێبەجێکردنی ماددەی (٥٨) دوا بخات.

گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری کوردیش بۆ پارێزگاکە پێویستی بە شوێنی نیشتەجێبوونی تازەو وەبەرهێنانی گەورە هەبوو لەبونیاتی بنچینەیی کەرکووك کە داتەپیبوو. بەڵام سەرچاوەی دارایی تەرخانکراو لەلایەن حکومەتی عێراقییەوە وەك سیاسیە کوردەکان ئاماژەیان پێداوە بەس نییە بۆ دابینکردنی پێداویستیەکان.

لای خۆشیەوە (نەسرین بەرواری) وەزیری شارەوانی و ئەشغالی گشتی روونیکردەوە: لەو بوارەدا حکومەت بەڵێنی زۆریداوە هەروەك پێشتریش پۆل بریمەر بەڵێنیدا بوو (١٠٠) ملیۆن دۆلار بۆ کەرکووك تەرخان بکات بەڵام ئەوەی جێبەجێ نەکرد.

جەعفەری بەڵێنیدا بە تەرخانکردنی (٥٠) ملیۆن دۆلار دیسان ئەوەش نەهاتە دی، بۆیە چارەسەر ئەوەیە کە سووربین لەسەر ئەو برە پارە بەڵێن پێدراوە.... چونکە پێداویستیەکانی کەرکووك گەلێکن.

هەروەها پرسەکانی خاوێنکردنەوەی ئاوو ئاوەڕۆو رێگاوبان و سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەو دروستکردنی شوێنی نیشتەجێبوون هەر هەمووی پێویستیان بە پارەیەکی زۆر هەیە[1]. لەبری ئەوە بودجەی ساڵانەی کەرکووك دیاریکرا بە (٧٦) ملیۆن دینار واتە (٥٠٠) هەزار دۆلار کە ئەوەش نەیدەتوانی ژێرخانی خراپی ئابووری کەرکووك ببوژێنێتەوە.

لەنیسانی ساڵی ٢٠٠٥دا بەم جۆرە وێنای کەرکووك دەکرێت: ژیان کولەمەرگییەو ئەو خزمەتگوزاریانەی کە حکومەتی خۆجێیش پێشکەشی دەکات سەرەتایی و وەك پێویست نین. هێشتا تەزووی کارەبان دەبچڕێت و لەهەندێك ناوچەشدا ئاوی خواردنەوە زۆر کەمە و رێگاو بانەکانیش پڕ لەچاڵ و چۆڵن و ئەوەش کاری شۆفێری مەترسیدار دەکات.

---

1- Khabat ( BBC Monitoring Middle East ) .2005, "Iraqi Minister Comments on Delayed Funding for Kirkuk Reconstruction." 17 November ( LN ).

هۆکات تۆڕی ئاوەڕۆ لەکەرکووکدا بوونی نییەو ئەوەش وایکردوە کەرکووك یەکێك بێت لە پیسترین شوێنی سەر ڕووی زەوی. خۆڵ و خاشاك لەگشت جێگەیەکی شارەکەدا هەیەو هەموانیش شەقامەکانیان کردوەتە سەرە نوێلك١.

ناڕوونییەکی تری یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت لەوەدابوو کەجاروبار بەریەك کەوتن لەنێوان ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووکی زۆرینەی کوردو حکومەتی ناوەندی دروست دەبوو سەبارەت بە دەسەڵاتی دامەزراندن، بەتایبەتیش کەچوارچێوەیەکی یاسایی دیاری نەکرابوو بۆ دامەزراندن و لابردنی بەڕێوەبەری پۆلیسی پارێزگاکە کەئایا دەسەڵاتی ئەنجوومەنی پارێزگا یاخود دەسەڵاتی وەزارەتی ناوخۆی بەغدادا بێت٢.

بۆنموونە لەکانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥دا هەواڵەکان باسیان لەوە دەکرد وەزارەتی ناوخۆ بڕیاریداوە بەگواستنەوەی ژمارەیەك لەئەفسەرانی پۆلیسی کورد لەکەرکووکەوە بۆ دیالە لەوانەش ( لیوا فەهمی) سەرۆکی هەواڵگری کەرکووك و عەقید رزگار نەجم خەتاب بەڕێوەبەری پۆلیسی هاتوچۆ یاخود دوورخستنەوەو خانەنشینکردنیان٣.

هەروەها مشتومڕێکی توند هاتە ئاراوە لەسەر هەوڵی لابردنی بەڕێوەبەری پەروەردەی کەرکووك( شەن عومەر موبارەك) لەلایەن ئەنجوومەنی کەرکووکەوە کە کەسێکی تورکمان بوو. بەڵام ئەو بەڕێوەبەرایەتیە لەژێر رکێفی تورکماندا مایەوە بەجۆرێك لەکۆی (٣٠)وەزیفەی باڵای ئەو بەڕێوەبەرایەتیەدا (٢٦)یان بەدەست تورکمانەوە بوون و ئەوەش بێزاری لای دانیشتوانی کورد دروستکردبوو٤.

---

1- Kirkuk Media . 2005. "Everybody's Business is nobody's Business in Kirkuk." 15 April reposted at ( www. indybay.org/newsitems/2005/04/05/17315131.php).

٣ – بەپێی فەرمانی (٧١) ی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی سەبارەت بە چاکسازییەکانی حکومەتی خۆجێی، دامەزراندنی بەڕێوەبەرەکانی پۆلیسی پارێزگاکان دەسەڵاتێکی هاوبەشە. لەکاتی بوونی پۆستێکی بەتاڵدا وەزارەتی ناوخۆ لەبەغدا لیستی کاندیدانی کارامە پێشکەش بە ئەنجوومەنی پارێزگا دەکات و ئەوانیش کاندیدێك بەزۆرینەی دەنگ هەڵدەبژێرن. هەروەها دەکرێت بەرێوەبەرابەتی پۆلیس بەبڕیاری وەزارەتی ناوخۆ بەزۆرینەی دوو بۆسیی دەنگی ئەنجوومەنی پارێزگا دووربخرێتەوە.

3- Khabat ( BBC Monitoring Middle East ).2005. Iraqi Ministry Replaces Kurdish Officials in Kirkuk ,Diyala."20 December ( LN).

٢– عومەر موبارەم لەزۆر کاتدا دەکرایە ئامانجی نەیارانەی هەڵمەتەکانی راگەیاندنی کوردی لەبەرامبەر رێگریکردنی لەدابەشکردنی پرسیاری تاقیکردنەوەکانی کۆتایی ساڵ بەزمانی کوردی و بێبەشکردنی بەرێوەبەرایەتی پەروەردەی کوردی لەکەرکووك لەسەرچاوەکان. لەهۆکارەکانی تریش وەك (یوسف سەعید) بەڕێوەبەری پەروەردەی کوردی لەکەرکوك ئاماژەی پێکردوە پەروەردەی

دامەزراوەیەکی تریش کە بەڕووی کورددا داخرابوو کۆمپانیای نەوتی باکوور بوو، هەرچی یاسای ئیدارەی کـاتی دەوڵەتیشــە دەســەڵاتی بــەڕێوەبردنی سەرچــاوە سروشــتیەکانی دابــووە حکومەتی کاتی عێراق کە ئەویش لەلایەن خۆیەوە دەســەڵاتی دامەزرانــدن و دوورخســتنەوەی لەکۆمپانیای نەوتی باکووردا هەبوو.

لەسەتای ساڵی ٢٠٠٥دا هێشتا زۆرینــەی کادێرەکــانی ئــەو کۆمپانیایــە عــەرەب بــوون، بەجۆرێك لەکۆی (١١) هەزار فەرمانبەرو کرێکار (٨) هەزاریان عەرەب و تەنیا(٥٠٠) کەسیان کورد بوون١. بەڵام هەریەك لە کۆمپانیای نەوتی باکوور و بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی پارێزگای کەرکووك دووحاڵەتی دەگمەن بوون چونکە بوارە هەستیارەکانی تر بەدەست کوردەوە بوون.

هەرچی هێزەکانی پۆلیسی نیزامیشە جۆرە هاوسەنگیەکی ئیتنیکــی شــیاوی لــەخۆگرتبوو بەجۆرێك کورد لە ٤٠٪ی ئەو هێزانــەیان پێکــدەهێنا بــەڵام ئــەو دەزگــا جۆربەجۆرانــەی کــە پرۆسەکانی بنەبڕکردنی تیرۆریان بەڕێوەدەبرد سەرجەمیان لەژێر کۆنترۆڵی کورددا بوون و خۆیان لەدەزگا ئەمنی و هەواڵگریەکانی هەردو پارتە سەرەکیەکەی کورددا دەبینیــەوە، کــە لەگــەڵ هەڵکشانی قەبارەی کردەوە چەکداریەکاندا ئەوانیش چالاکیەکانیان لەزیادبونــدا بــوون، بــەڵام دیسان یەکەی خزمەتەکانی بــاری نائاســایی (الگــواریو) لەســەرجەم پێکهاتــە ئیتنیکیــەکان پێکهاتبوون و لەلایەن عەقید خەتاب عەبدوڵڵاوە کە سەر بە (ی.ن.ك) بوو سەرپەرشتی دەکرا.

هەڵبەتە لەبنەبڕکردنی تیرۆردا پشت بە بەهێزە کوردیەکان دەبەسترا کە باوەڕپێکراووکــاراو خاوەن ئەزموون بوون.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕووداوە گەورە ئەمنیەکان لەکەرکووکدا شتێکی دەگمــەن بــوون ســەرباری پێکهاتە سوننییە گەورەکەی و بــوونی پەنگخواردنــەوەی ئیتنیکــی لــەو شــارەدا٢. هاوکــات

---

گشتی پارێزگای کەرکوك هەر هەماهەنگی و هاوکاری ڕەتناکاتەوە بەڵکو پــەنا بــۆ ســەرجەم ئامرازەکــان دەبــات بــۆ دروســتکردنی ئاستەنگ لەبەردەمماندا...بڕوانە:

Abdullah , S. 2005. " The Dire Situation of the Directorate of Kurdish Education in Kirkuk. " 20 April

1 - Kurdistani Nuwe ( BBC Worldwide Monitoring ). 2005. " Iraqi Kurdish PUK Official Says Oil Company Not Employing Enough Kurds . "21 February ( LN ).

١-ئەوەی جێگەی سەرنجە ڕادیۆی گشتی نیشتمانی لەویلایەتە یەکگرتوەکان( ) هــەواڵێکی لەســەر کــەرکوك بڵاوکــردەوە کەگوایــە لەکەرکوك شتی وا ڕووینەداوە. کەرکوك ئەو شارەی کەوتوەتە باکوری خۆرهەڵاتی عێراق ململانێی ئاشکراو بەرچاوی نێوان پێکهاتە ئیتنیکیەکانی بەخۆوە نەدیوە ئەوەش مایەی هێما بۆ کردنیەتی. بڕوانە

[illegible]کانی لەناکاوکوژی و تەقینەوەی بۆمب لەسەر ڕێگاکان بەردەوام بوون و ئەوانەش مایەی نیگەرانی بوون بەڵام تەنیا هێرشی خۆکوژی کە زۆرترین قوربانی بەدواوە بوو لەوکەرکووکدا ئەوەبوو کە لە ١٤ی حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٥دا لەدەرەوەی بانکێکی ناوچە کوردییەکان ڕوویدا و لەئەنجامدا (٢٠) کەس کوژران و (٨٦)ی تریش بریندداربوون. بەڵام دیاربوو کارابوونی تەکتیکەکان کە لەلایەن هێزە ئەمنیە کوردیەکانەوە جێبەجێدەکران زۆر دەکەوتن چونکە مەترسی پشت بەستن بەو هێزانە بەشێوەیەکی سەرەکی دەبوو ئەندامانی پێکهاتە ئیتنیکیەکانی تر بکاتە ئامانج بەتایبەتیش عەرەب و ئینجا تورکمان.

دیسان ئەوەش بووە هۆی تاوسەندنی پەنگخواردنەوە ئیتنیکیەکان کە هەرددەبوو بەو جۆرە بێت و لەگەڵیشیدا بارودۆخەکە لەحوزەیراندا ناهەموارتر بوو کاتێك ڕۆژنامەی واشنتۆن پۆست چەند پەڕەگرافێکی لەبروسکەیەکی دزە پێکراوی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بڵاوکردەوە، کە تیایدا دەستی تۆمەتبارکردن بۆ دەزگا ئەمنیە کوردیەکان درێژ دەکات سەبارەت بەئەنجامدانی کۆمەڵێك کاری جۆراو جۆر لەدەرەوەی یاسا لەوانەش دەستگیرکردنی هەڕەمەکی و ڕاگواستنی نهێنی وکاری ڕفاندن.

بەپێی بروسکەکە ئەو چالاکیانە لەچوارچێوەی" دەستپێشخەرییەکی هەماهەنگ و فراوانی نێوان هەردو حزبە کوردیەکەدا بەڕێوەدەچێت لەپێناو مومارەسەکردنی دەسەڵات لەکەرکووك بەو جۆرەی کە زۆر بێزارکەرە". ئەمە جگە لەوەی بووەتە هۆی تاوسەندنی پەنگخواردنەوەیەکی ئیتنیکی ١.

قەبارەی ئەو مومارەسانە ڕوون نەبوون بەڵام لەناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٥دا لەلایەن سوپای ئەمریکاوە (١٨٠) حاڵەتی ڕفاندنی دژ بە یاسا تۆمارکران و سەرانی سیاسی عەرەب و تورکمانیش ئەو ژمارەیەیان گەیاندە نزیکەی (٦٠٠) حاڵەت.

دیارە کێشەکە لەبەکارهێنانی ئەو تەکتیکانەدا نەبوون کە لەسەرتاسەری عێراق بۆ بنەبڕکردنی تیرۆر پەنای بۆدەبرا بەڵکو پەیوەندی بە ڕاستییەکەوە هەبوو ئەویش ئەوەبوو ئەو

---

National Public Radio ( NPR ).2005. " ( Lack of Violence Despite Ongoing Ethnic Tensions in Kirkuk . " Broadcast 18 April ( LN ).

1 - -Fainaru, S., and A. shadid .2005. " Kurdish Officials sanction Abductions in Kirkuk : U.S. Memo Says Arabs, Turkmens Secretly Sent to the North ." The Washington Post, 15June : A01

هێزانەی پۆلیس لەبەکارهێنانی ئەو شێوازەیاندا کە(بەپلەی سەرەکی) سەر بە پێکهاتەیەکی ئێتنیکی بوون لەسەر حسابی پێکهاتەکانی تر ئەنجامیان دەدا.

چاوپۆشینیش لەکارایی ئەو جۆرە تەکتیکانە لەکەمکردنەوەی ئاستی توندوتیژییەکان لەکەرکووکدا ئاسەواری خۆی هەبوو لەسەر تاوسەندنی پەنگخواردنەوەی توندی تایەفی لەو پارێزگایەدا.

## حکومەتی ئینتیقالیی عێراقی

لەسەرئاستی نیشتمانیدا هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم وایانکرد کە کورد لەپێگەیەکی ئایدیالی ئەوتۆدا بن کاریگەرییان لەسەر ناوەرکی دەستووری هەمیشەیی هەبێت.

هاوکات سەرباری بالاّ دەستی ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی بەسەر زۆرینەی رەهای کورسیەکانی ئەنجوومەنی نیشتمانیدا بەلاّم ماددەی (٣٦) لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت ئاماژەی بە زۆرینەی دوو بۆ سێ دەکرد لەپێکهێنانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی کە لە (٣) پێکدێت.

هەروەها رێککەوتنی ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی بەکۆدەنگی لەسەر کاندیدی پۆستی سەرۆك وەزیران دەرفەتی بەکاندیدی براوە دەدا دەسەلاّتی پێکهێنانی حکومەتی هەبێت و کابینەی حکومەتەکەشی پێشکەش بە پەرلەمان بکات بۆ ئەوەی رەزامەندی زۆرینە بەدەستبهێنێت.

بەلاّم ئەوە لەڕووی پراکتیکیەوە دەبوو لەپێکهێنانی هەرحکومەتێکدا پشتیوانی دوو بۆ سێی پەرلەمانتاران بۆخۆی مسۆگەر بکات تا بەشداریکردنی کورد لەو پشتیوانیکردنەدا جگە لەزەرورەتێکی حسابی چیتر نەبێت، ئەگینا زۆرینەی دوو بۆسێی نێو پەرلەمان کە لەکۆی (٢٧٥)کورسی دەگەیشتە (١٨٣) کورسی دەیتوانی لەڕووی تەکنیکیەوە بەبێ بەشداریکردنی کورد حکومەت دروست بکات، بەلاّم ئەوەش وایدەخواست سەرجەم کوتلەکانی نێو پەرلەمان بەشداربن بەلیستی عێراقییەشەوە کە لەلایەن ئەیاد عەلاوییەوە سەرۆکایەتی دەکرا.

هەرچەندە ئەولیستە هەڵوێستی دژ بە هەڵوێستی ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی بوو لەزۆربەی پرسە گرنگەکاندا بەلاّم دیسان نەدەکرا لاتەریك بکرێت ئەگەر چی لەڕووی حسابییەوە ئەوە کارێکی شیاو بوو. لەو سۆنگەیەشەوە بەشداریکردنی کورد ئەگەر لەڕووی حسابیەوە گرنگ نەبووبێت ئەوا لەڕووی سیاسیەوە جێگەی بایەخ بوو.



PDF 4 KURD

هەرچی کوردە لەناوەڕاستی هەردو تای تەرازووەکەدا دەستەوەستان نەبوو بەڵکو کۆمەڵێك داواکاری خستە بەردەم ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی لەوانەش پۆستی سەرۆك کۆمارو پەرلەکردن لە جێبەجێکردنی ماددەی(٥٨)دا.

وادیاربوو بەهاتنی بەهاری ٢٠٠٥ ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی رازیبوو بە داواکاریەکانی کورد سەبارە بە کەرکووك و لە ٧ی نیسانیشدا جەلال تاڵەبانی وەك یەکەم سەرۆك کۆماری کورد لەعێراق دەست بەکار بوو١. هەرچەندە پۆستی سەرۆك کۆمار پۆستێکی تەشریفییە بەڵام ئەوە سەرکەوتنێکی رەمزی گرنگی بۆ کورد تۆمارکرد ئەویش بەهۆی ئەو پەیامەی کە لەنێو سیستمی سیاسی نوێی عێراقی دووانە نەتەوەدا ئاراستەیانکرد٢.

کاتێکیش حکومەتەکەی" ئیبراهیم جەعفەری" سەرۆك وەزیر لە ٣ی مانگی ئایاردا سوێندی یاسایی خوارد، لەو حکومەتەی کە ژمارەی وەزیرەکانی (٣٧) بوون (٨)پۆستی وەزاری درایە کورد٣، و نوێنەرایەتی تورکمانی شیعەش لەرێگەی (جاسم موحەمەد جەعفەر) ی وەزیری نیشتەجێکردن و ئاوەدانکردنەوە بوو.

جەعفەر لەدایکبووی دوزخورماتوو و جێگری سەرۆکی یەکێتی ئیسلامی تورکمانی عێراق بوو، کە پارتێکی تورکمانی شیعە بوو لەچوارچێوەی ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقدا بەشداری هەڵبژاردنەکەی کرد.

---

١- بڕوانە کەنالی ئەلجزیرە( BBC Monitoring International Reports) ٢٠٠٥، راپۆرتێك لەبارەی وەڵامی سەرکردەیەکی تورکمانی لەسەر رێکەوتنی نێوان کوردو ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی(شیعی) سەبارەت بە کەرکوك، ١١ی ئازار(LN).

٢ - تەنیا دەسەڵاتی راستەقینە لەدەست ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی جگە لە ناونانی سەرۆك وەزیر، دەسەڵاتی ڤیتۆکردنی پرۆژە یاساکانە کە لەلایەن پەرلەمانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێت. بەلام ڤیتۆیەکی لەوجۆرەش پێویستی بەرێکەوتنی ئەندامانی ئەنجوومەنەکە هەیە بەکۆدەنگی. بەڵام هەندێك ئاستەمیش بوو وێنای ئەو سیناریۆیە بکرێك کەتیایدا نوێنەرانی پارتە باڵادەستەکانی نێو پەرلەمان (ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی و هاوپەیمانی کوردستانی بەکۆدەنگی رێکبکەون لەسەر ڤیتۆکردنی یاسایەك کە پشتیوانی زۆرینەی پەرلەمانی بەدەست هێنابێت.

٣- هەشت پۆستەکەن رۆژ نوری شاوەیش جێگری سەرۆك وەیر،هۆشیار زێباری وەزیری دەرەوە،بەرهەم ساڵح وەزیری پلاندانان و پەرەپێدان،نەسرین بەرواری وەزیری شارەوانی و ئەشغالی گشتی،جوان فوئاد مەعسوم وەزیری پۆستەوگەیاندن،عەبدوللەتیف رەشید وەزیری سەرچاوە ئاوییەکان،نەرمین عوسمان وەزیری ژینگە، عەبدلباست کەریم مەولود وەزیری بازرگانی،ئیدریس هادی وەزیری کاروکاروباری کۆمەڵایەتی.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

هەرچی تورکمانی سوننەشە کە خۆی لە بەرەی تورکمانیدا دەبینییەوە لەنێو ئەنجوومەنی وەزیراندا فەرامۆشکرابوون. هاوکات کوردیش لەگەڵ ئەوەی پێگەی بەهێز و دەسەڵاتی سیاسی باڵایان هەبوو بەڵام هەر زوولەدروستکردنی پەیوەندیەکی بەسوودو گونجاو لەگەڵ سەرۆك وەزیر هیوابڕاو بوون.

ئەوەبوو لەکاتی رێو رەسمی سوێندخواردنی یاساییدا، ئیبراهیم جەعفەری بەئاشکرا دەستەواژەی " عێراقی دیموکراسی فیدراڵی " فەرامۆش کردو لەوەش خراپتر لەدیدی کوردەوە ئەوەبوو لەمیانەی وتەکەیدا جەعفەری کە لەبەردەم پەرلەماندا خوێندیەوە باسی لە لەکەرکووك و جێبەجێکردنی ماددەی(٥٧) نەکرد، بەڵکو باسی لە ئەولەویاتی کاری حکومەتەکەی کرد لەماوەی ئینتیقالیدا.

دیارە ئەو سەهوکردنەشی بەئاشکرا بەئەنقەستبوو کە بەسەر سەرکردایەتی کوردو راگەیاندنی کوردیدا گوزەری نەکرد١. دواخستنی درێژخایانی پێکهێنانی حکومەتی نوێ دەرفەتی ئەوتۆی لەبەردەم حکومەتی ئینتیقالی نەهێشتەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە سەرەکیەکەی کە ئامادەکردنی دەستووری نوێ بوو.

لە١٠ی ئایاردا پەرلەمان لیژنەیەکی (٥٥) ئەندامی بۆ نووسینەوەی دەستوور دیاریکرد و پشکی ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقیش کەخاوەنی ٥١٪ی کورسیەکان بوون (٢٨) ئەندام بوولەلیژنەی نووسینەوەی دەستووردا.

هاوکات پشکی هاوپەیمانی کوردستانییش کە لە٢٧٪ی کورسیەکانی لەدەستدا بوو بەس بوو بۆ ئەوەی بە ١٥ ئەندام لەلیژنەی نووسینەوەی دەستووردا بەشداری بکەن و هەردو لیستەکەش بەتێکڕای ٤٣ ئەندام لەبارودۆخێکی وەهادا بون کە دەیانتوانی ناوەڕۆکی دەستووری نوێ بنووسنەوە.

---

١- بۆ نموونە بڕوانە فریاد رەواندوزی،٢٠٠٤ لەبارەی( ئەجندەی جەعفەری و ماددەی ٥٨)، رۆژنامەی ئەلئیتیحاد( BBC) . Monitoring Middle East

PDF 4 KURD

هەرچی عەرەبی سوننەشە تەنیا دوو ئەندامیان گەیشتنە لیژنەی نووسینەوەی دەستوور کە ئەوانیش یەکێکیان سەر بە ئیئتلافی یەکگرتووی عێراق و ئەوی تریشیان سەر بە ئیئتلافی عێراقییە بوو١.

هاوکات بەرەی تورکمانیش بەنوێنەرێك لەو لیژنەیەدا بەشدار بووکە ئەوەش جاری یەکەم بوو لەدامەزراوەیەکی سیاسیی نیشتمانی گرنگدا لەسەرو قەبارەی راستەقینەی خۆیەوە بەشداری بکات٢.

هەڵبەت کێشەی سەرەکی ئەو لیژنەیەش نەبوونی نوێنەرایەتیکردنی عەرەبی سوننە بوو کە ئەوەش بۆخۆی کێشەیەك بوو کە هەڕەشەی لە شەرعیەتی سەرلەبەری پرۆسەکە دەکرد٣.

### راپرسی لەسەر دەستوور

لەماوەی نیوەی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥دا بڕیاربوو کە پرسی کەرکووك لەسەر ئاستی نیشتمانی بەشێك بێت لەدوا گۆڕانکاریەکانی- بەدیاریکراویش نووسینی دەستووری هەمیشەیی لەتشرینی یەکەمدا، هەروەها بەدواشیدا هەڵبژاردنی نوێی نیشتمانی لە ١٥ی کانونی یەکەمدا بەڵام گرفتی هەرە گەورەی نێو گرفتە زۆرو زەوەندەکان کە ئەو پرۆسەیەی پەکدەخست نائامادەیی عەرەبی سوننە بوو لەهەر بەشداریکردنێکی پڕواتا- بەدانانی (١٥) کەسی تر لەعەرەبی سوننە کە بەگشتی نوێنەرایەتی بەرژەوەندی سوننەیان دەکرد لەنێو لیژنەی ئامادەکردنی دەستوور کێەشەکەچارەسەر کرا.

---

1 - دابەشکردنی کورسییەکان لەلیژنەکەدا بەپێی نوێنەرایەتی کوتلە سیاسیەکان بوو، بەم جۆرە: ئیئتلافی یەکگرتووی نیشتمانی ٢٨کورسی، هاوپەیمانی کوردستانی ١٥کورسی، لیستی عێراقییە ٨کورسی، لیستی رافیدێن ١ کورسی، بەرەی تورکمانی ١ کورسی، یەکێتی گەل ١ کورسی،لیستی کادێران و دەستەبژێری نیشتمانی ١ کورسی. لیژنەکە بەسەرۆکایەتی شێخ هەمام حەمودیبوو لەئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی، هەرچی فوائاد مەعسومیشە لەهاوپەیمانی کوردستانس پۆستی جێگری یەکەمی سەرۆکی لیژنەکەو عەدنان جەنابیش لەلیستی عێراقییە پۆستی جێگری دووەمی سەرۆکی لیژنەکەی لەدەستدابوو.

٢ - ژمارەی کورسی بەرەی تورکمانی لەپەرلەماندا نزیکەی ١.١٪ بوو لەکۆی کورسیەکانی پەرلەمان کە ئەوەش بە کورسیەك لەلیژنەکەدا نوێنەرایەتی دەکرد واتە ١.٨٪ لەکۆی کورسیەکانی لیژنەکە.

٣ - بۆ هەڵسەنگاندنی رەخنەیی لەپرۆسەی نووسینەوەی دەستوور و گرفتەکانی پەیوەست بە غیابی نوێنەرایەتی عەرەبە سوننەکان و هەوڵەکان بۆ چارەسەرکردنی بڕوانە:

The International Crisis Group .2005. Iraq : Don't Rush the Constitution . Brussels : CGI Middle East Report 42, 8June: 3-5

بڕیاریش بوو لیژنەکە لەسەر بناغەی تەوافوق کاربکات بەڵام زۆربەی بڕیارەکانی پەیوەست بە پرسە ناکۆکەکان لەلایەن گروپێکی بچووکی سەرانی شیعە( بەشێوەیەکی سەرەکی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لەوددەمەدا) و سەرانی کورد لەپشت دەرگا داخراوەکانەوە دەدران١.

دواتریش رەشنووسی دەستوور پێشکەش بەئەنجوومەنی نیشتمانی کرا، هەرچی دەقەکەشە کۆمەڵێك چارەسەری تەوافووقیی گران و تێکئاڵۆزکاوی نێوان کوردو عەرەبی شیعەی لەخۆگرتبوو.

لەپێش هەموو ئەو چارەسەرە تەوافوقیانەش سیستمی فیدراڵی بوو کە پرۆژەی دەستوورەکە لەخۆی گرتبوو بەتایبەتیش میکانیزمی پێکەوە لکاندنی پارێزگاکان لەدروستکردنی هەرێمە فراوانترەکاندا٢. بەهەمان شێوە لەو ناکۆکبوونانەدا دابەشکردنی دەسەڵات بوو لەنێوان حکومەتی فیدراڵی و هەرێمەکان سەبارەت بە کەرتی نەوت و گاز.

بەپێی ماددەی (١١٢)، ئیدارەکردنی سامانی نەوت و گاز بەشێوەیەکی هاوبەشە لەکاتێکدا ماددەی(١١٥) لەکاتی ناکۆکی لەسەر دەسەڵاتە هاوبەشەکان بەر لەیاسای فیدراڵی گرنگی دەدات بەیاسای هەرێمەکان٣. جگە لەوەش ماددەی (١١٢) رۆڵی حکومەتی فیدراڵی

---

١ – لەرووی مەبدەئییەوە دەبوو بیرۆکەی بڕیارە تەوافوقیەکان بەڵگەنامەی مامناوەندو پەسەندکراوی لای سەرجەم پێکهاتەکانی لێبکەوێتەوە. بەڵام لەڕووی عەمەلییەوە هەڵوێستی ئەندامانی عەرەبی سوننە لەلیژنەکەدا سەبارەت بەپرسە سەرەکیەکانی وەك فیدراڵی و ناسنامەی دەوڵەتی عەرەبی و کەرکوك زۆر لەهەوڵوێستی کوردو ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامییەوە دوور بوو بەجۆرێك هەرچارەسەرێکی تەوافوقی مەحاڵبوو لەماوەیەکی زەمەنی دیاریکراودا.

٢ – ماددەی(١١٩) کە لەدواساتەکاندا هەمووارکرایەوە لەسەر پێداگری ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی مافی دایە پارێزگاکان لەدروستکردنی هەرێمە فیدراڵی فراوانتر . بەپێچەوانەوەی یاسای ئیدارەی کاتی کەسنوورێکی بر قەبارەی هەرێمەکان دەستنیشان کردبوو.دیارە ئەوەش زەمینەی خۆشکرد لەبەردەم ئەگەری پێکهێنانی هەرێمی(سۆپەر) کە (٩) پارێزگالەباشووری عێراق لەخۆبگرێت.ئەو ئەگەرەش سوننەکانی نیگەران کرد.

٣ – نائۆقرەیی لەوەدا سەرهەڵدەدات کە ماددەی(١١٠) فرەیی لە تایبەتمەندێتییەکانی حکومەتی فیدراڵیداهەیە بەبێ ئەوەی ئەو تایبەتمەندێتیانە ئیدارەی کەرتی نەوت و گاز ودابەشکردنی داهاتەکان بگرێتەوە. هەروەها ئەو دوو پرسە بەشێوەیەکی دیاریکراو لەماددەی(١١٤) دا بوپێیەی تایبتمەندێتی هاوبەشن باس نەکراون. بەڵام ماددەی(١١٥) دەڵێت: هەموو ئەوانەی لەتایبەتمەندێتی دەسەڵاتی فیدراڵیدا نییە لەدەسەڵاتی هەرێمەکاندایە، کە ئەوەش ئاماژەیە بۆ "کیڵگەکانی ئێستا" هەروەك وەك (عەلی عەلاوی) هێمای پێداوە. بەواتای دوورخستنەوەی حکومەتی فیدراڵی لەبەڕێوەبردنی ئەو کێڵگانەی کە لەداهاتوودا ئاشکرا دەکرێن. بڕوانە:
Allawi, The Occupation of Iraq. Op.cit :414-415



PDF 4 KURD

دیاریکردووە لەئیدارەکردنی کێڵگە نەوتییەکانی (ئێستا) واتە ئیدارەکردنی ئەو کێڵگانەی لەداهاتوودا ئاشکرا دەکرێن دەکەونە ژێر دەسەڵاتی هەرێمەکانەوە.

دیسان ئەوەی کە مایەی نیگەرانی بوو نەك هەربەلای عەرەبی سوننەوە بوو بەڵکو بەلای هەمووانەوە ماددەی(١٤٠) و پرسی کەرکووك بوو.

فۆرمی ٨- ٢

دەقی ماددەی ١٤٠

یەکەم: دەسەڵاتی جێبەجێکار هەنگاوی پێویست دەنێت بۆ تەواوکردن و راپەڕاندنی پێداویستیەکانی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتی عێراق لەقۆناغەکانی ئینتیقالی بەگشت بڕگەکانیەوە.

دووەم: بەرپرسیارێتی لەحکومەتی ئینتیقالیدا دەکەوێتە ئەستۆی دەسەڵاتی جێبەجێکاری هەروەك ئەوەی لەماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی کاتی بۆ قۆناغی ئینتیقالی(گواستنەوە) هاتوەو بەردەوام دەبێت بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکردنی هەڵبژێردراو بەپێی ئەو دەستوورە تا تەواوی (بەسروشتیکردنەوە"ئاسایی کردنەوە"، سەرژمێرو پاشان راپرسی لەکەرکوك و ناوچە دابڕاوەکانی تر بۆ دیاریکردنی ئیرادەی هاوڵاتیانی) بەئەنجام دەگات ئەویش لەماوەیەکدا کە دوا وادەکەی ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی (٢٠٠٧)ە.

لەگەڵ دیاریکردنی ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧ وەك دوا وادە بۆ کۆتایی هات بۆ بەئەنجام گەیاندنی پرۆسە سێ قۆناغیەکە ( بەسروشتیکردنەوە و سەرژمێری دانیشتوان و راپرسی) بۆ دیاریکردنی داهاتووی کەرکوك. بەچەند واژەیەکی بەرجەستەکراو لەئێستادا سەرانی کورد خاوەنی میکانیزم (دەنگی میللی) و خشتەیەکی دەستووریی دیاریکراون بۆ گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

تەنیا تەقەلایەکی راستەقینەش بۆ رەواندنەوەی مەترسیەکانی عەرەبی سوننە دانانی مادەی(١٤٢) بوو لەدوا ساتەکاندا بۆ ئەوەی لەماوەی چوار مانگ لەدوای پێکهێنانی حکومەتی نوێ هەمواری دەستوو بکرێت. هەڵبەتە ئەو رێکارە کاتییە بۆ هەمواركردنی



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دەستوور کارێکی ئاسان نییە وەك ئەوەی لەهێڵە گشتیەکانی ماددەی(١٢٦)دا هاتووە بەڵام دیسان ئەو ڕێکارەش دەکەوێتە بەر" ڤیتۆی کوردی"١.

هاوکات لەبەرامبەر پشتیوانی هەرد پارتە سەرەکیەکەی کورد و ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی و مەرجەعی ئایینی ئایەتوڵڵا "عەلی سیستانی" بۆ دەستوور تەنیا ڕێگە لەبەردەم عەرەبی سوننەدا بریتی بوو لە سوود وەرگرتن لە"ڤیتۆی کوردی" لەیاسای ئیدارەی کاتی بەندێك خرایە نێو یاسای ئیدارەی کاتی ئەویش بەپێداگری کورد کە بەپێی ئەو بەندەش ڕەشنووسی دەستوور پەسەند ناکرێت ئەگەر بێتوو دوو بۆ سێی دەنگدەرانی سێ پارێزگا یاخود زیاتر ڕەتیبکەنەوە.

هەرچەندە ڕەتکردنەوە لەرووی پراکتیکییەوە زامنکرابوو لەهەردو پارێزگای ئەنبار و سەلاحەدینی خاوەن زۆرینەی سوننە بەڵام دیسان بەهی کەمی داتای ئاماری ورد لەعێراقدا زۆر روون و ئاشکرا نەبوو کە ئاخۆ لەتوانای عەرەبی سوننەو گروپەکانی تردا هەیە لەوانەش بەرەی تورکمانی و بزوتنەوەی دیموکراسی ئاشووری دەنگی پێویست کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی دوو بۆ سێی ٣ پارێزگا تێپەڕێنن٢. هاوکات ڕەتکردنەوەی دەستووریش بە (نا) لەهەریەك لە ئەنبارو سەلاحەدین و نەینەوا سەرکەوتنی بەدەستهێنت- بەڵام لە نەینەوا شکستی هێنا لەبەدەستهێنانی ڕێژی دوو لەسەر سێی.هاوکات لە زۆربەی پارێزگاکانی تری عێراق دەنگدەران بەزۆرینە رازیبوون بە ڕەشنووسی دەستوور٣.

---

١ – بڕیاربوو ئەو کۆمەڵە تەعدیلاتانە کە بۆ پەرلەمان پێشنیاز کرابوون لەسەر بنەمای زۆرینەی سادەی پەرلەمان و بەراپرسی گشتی بڕیاری لێبدرێت. هەروەها دەکرێت بەزۆرینەی دوو بۆ سێی دەنگدەرانی ٣پارێزگا یان زیاتر ڕەتبکرێتەوە.

٢ – جگە لەماددەی (١٤٠)یش، دژایەتی بەرەی تورکمانی بۆدەستوور لەوەدابوو کە ئیعترافی بەتورکمان نەدەکرد وەك پێکهاتەیەکی سەرەکی(سێیەم) لەدوای عەرەب و کورد. هەروەها بزوتنەوەی دیموکراسی ئاشووریش دژی دەستوور بوو لەبەرئەوەی بەئەنقەست کلد لەئاشوورییەکان لەسەربنەمای ئیتنیکی جیاکرابوەوە و بەبۆچوونی بزوتنەوەکەش ئەوە لەبەر یەکهەڵوەشاندنەوەی پێکهاتەی مەسیحی بوو لەعێراق.

٣ – پارێزگای دیالە لەبارێکی هەڵاوێردکراودابوو چونکە دەستوور لەو پارێزگایەدا ڕەزامەندی زۆرینەیەکی سادەی بەدەستهێنا کاتێك ٥١٪ بۆ بەرژەوەندی دەستوورەکەو ٤٨٪یش لەدژی دەستوور دەنگیان دا.

ئەنجامی دەنگدانیش لەکەرکووك زیاتر لەهەرپارێزگایەکی تر نزیکتر بوو بەجۆرێك لەکۆی (٥٤٢) هەزار دەنگ بۆ بەشداریکردن لەو راپرسیەدا پتر لە (٣٤٠) هەزار (٦٣٪) بۆ بەرژەوەندی رەشنووسی دەستوور دەنگیان داو کەمتر لە (٢٠٠) هەزار دەنگدەریش (٣٧٪) لەدژی رەشنووسی دەستوورەکە بوون.

بەگشتی پتر لە (١٤٠) هەزار دەنگدەری تر بەشداری راپرسیەکەی تشرینی یەکەمیان کرد ئەو ژمارەیەش ئاماژە بوو بۆ زیادبوونی ئاستی بەشداریکردنی عەرەبی سوننە و فراوانبوونی بنکەی دەنگدان.

هاوکات ئەو ئەنجامانەش دەریانخست کە کورد تەنیا پێکهاتەیەکی ئیتنیکی نییە کە بۆ بەرژەوەندی رەشنووسی دەستوور دەنگیان داوە.

بەپێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم و دواتریش هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم، لایەنی کوردی توانی(٢٦٠) هەزار دەنگ لەکاتی راپرسیەکەدا لەوناوچانەدا کۆبکاتەوە ئەوەش بەواتای نزیکەی(٨٠) هەزار دەنگ کە بە(بەڵێ) بوو بۆ دەستوور دەنگی کورد نەبووبەڵکو دەنگی شیعەی کەرکووك بوو( تورکمان و عەرەب پێکەوە).

لەسەر ئاستێکی فراوانتریشدا راپرسیەکە واتایەکی قووڵی هەبوولە تارێگەی دەستوورەوە قەبارەی دانیشتوان بەهەند وەربگیرێت و لەو سۆنگەیەشەوە خاوەنداریێتی کەرکووك بەدەنگدانێکی میللی و لەکاتی زانراودا دیاری بکرێت.

دەبوو ئەنجامی ئەو دیبەیتە حەتمی و بێ کۆتاییە لەبارەی ناسنامەی راستەقینەی شارەکە لەرێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە بەژمارەیەکی سادە یەکلایی ببێتەوە.

تەحەددی بەردەم هەردو پارتە کوردییەکەش خۆی لەگەڕانەوەی ئەو ژمارەیەی هاوڵاتیانی کورددا لەکاتێکی گونجاو بۆ پارێزگاکە دەبینییەوە کە هێندە بەس دەبێت بۆ بردنەوە بەزۆرینەیەکی سادە لەو راپرسیەی کە لەکانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧دا ئەنجام دەدرا.

لەرووی دانیشتوانەوە پێویست بوو کوردانی راگوازراو بۆ کەرکووك و عەرەبە هاوردەکانیش بۆ پارێزگا ئەسڵییەکانی خۆیان بگەڕێنرێنەوە.

لەڕووی جوگرافیایشەوە پێویستی دەکرد کەرکووك بۆ سنووری ئیدارەی ئەو دەمە بگەڕێنرێتەوە کە دەستی بەعسی پێڕانەگەیشتبوو، ئەویش بەگەڕانەوەو خستنە تەکی ئەو ناوچانەی کە زۆرینەی کوردنشین بوون.

لەرووی لۆجستیشەوە ئەو ئەرکانە تەواو ئاڵۆزبوون کە دەبوو بەزوویی جێبەجێ بکرێن لەبەرامبەر ئەو دژایەتیە توندەی کە لەلایەن کوتلە سیاسیەکانی ترەوە دەکران.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

هەرچی پابەندبوونی راگەیەنراوی کوردیش بوو ئاساییکردنەوەی رەوشی کەرکوك بوو لەرێگەی ئامرازە نیزامی و یاساییەکانەوە کە گیرۆدەی پرۆسەی دەستی دەستی پێکردن و دواخستنی بەئەنقەست ببوو، کە ئەوەش بەروونی بەدیدەکرا.

بۆنموونە کارەکانی دەستەی باڵا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی موڵکداریێتی زەوی و زار کە کیسەڵ ئاسا بەرێوەدەچوو هیچ ئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو.

بەهاتی سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ دەستەکە زیاتر لە ١٠ هەزار سکاڵای بەدەست گەیشت بەڵام تەنیا ٢٥ کەیسیان بینران١.

لەدوای نزیکەی ساڵێکیش دەستەکە نزیکەی(٢٥٠٠) کەیسی لەکۆی (٣٥) هەزار کەیسی پێشکەشکراو چارەسەرکرد کە زۆربەی لەلایەن کوردەوە خرابوونە بەردەمی.

تا ئەو دەمەش حکومەتی عێراق هیچ سەرچاوەیەکی دارایی بۆ قەرەبووکردنەوەی کوردە گەڕاوەکان و ئەو عەرەبانەی کەرکوکیان بەجێهێشتبوو دەستەبەر نەکردبوو کە بەدیدی کوردیش حکومەتی جەفەری بەئەنقەست هەوڵی پەکخستنی ئاسایی کردنەوە دەدات، هەربۆیە هەردو پارتە کوردییەکە لەدەرەوەی ئەو چوارچێوە کە یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت دایناوبوو کاریان بۆ گۆڕینی دیموگرافیای کەرکوك دەکرد.

سەرانی سیاسی تورکمان و عەرەبیش پارتە کوردیەکانیان تۆمەتبار دەکرد بەوەی کورد لەهەرێمی کوردستانەوە بۆ کەرکوك دەگوازنەوە تا تیایدا نیشتەجێیان بکەن. بگرە کوردانی ناعێراقی دەهێننە شارەکەوەو لەبەرامبەریشدا پارتە کوردییەکان ئەو تۆمەتانەیان رەتدەکردەوە.

بەڵام بەهاتنی کۆتایی ساڵی ٢٠٠٥ ئاشکرابوو، کە کورد لەگەڵ پرۆسەکەدا ئارامی لەبەر بڕاوەو بەئاشکرا لەلایەن خۆیانەوە دەست بەکاربوون و پرۆژەکەش لەلایەن (ی.ن.ك) ەوە لەسەرئاستێکی بەرز لەرێکخستن دەستپێکرد.

رۆژنامەی واشنتۆن پۆست بلاویکردەوە کە (ی.ن.ك) ئەندازیاری بەگەڕخستووە بۆ دروستکردنی یەکەی نیشتەجێبوونی کۆکرێتی لەباکووری کەرکوك و بەشێوەیەکی قیستیش (٥) هەزار دۆلاری بۆ هەر خێزانێکی کوردی گەڕاوە تەرخان کردووە.

رزگار عەلی ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك کە سەر بە (ی.ن.ك) ە رایگەیاند" ئامانج لەو دەستپێشخەرییە ئەوەیە کە ئایا دانیشم و دەست بۆ حکومەتی فیدراڵی

---

1 - Wong, E . 2005."Kurds' Return to City Shakes Politics in Iraq. " New York Times, 14 March:A01.

نابەمەوە یاخود ئەو بڕە پارەیە خەرج بکەم..... چاوەڕوانی جەعفەری ناکەم تا ئیمزا لەسەر پارچە کاغەزێك بکات ئەو رۆژگارە بەسەر چوو حکومەتی ناوەندی حوکمڕان بێت١.

بەپێی خەملاندنی سوپای ئـەمریکا ژمـارەی ئـەو کوردانـەی بـۆ کـەرکووك گەڕاونەتـەوە لەماوەی ساڵی ٢٠٠٥دا بە دەیان هەزار کەس دەبـن و تێکـڕای ژمارەشـیان لەوەتـەی رژێمـی سەدامی رووخاوەو گەڕاونەتەوە لەنێوان(٨٥- ٣٥٠) هەزار هاوڵاتی کورد دەبن٢.

سەرانی سیاسی عەرەب و تورکمانیش بەبەردەوامی ژمارەی کوردە گەڕاوەکان بـە (٣٠٠-٤٠٠) هەزار کورد هەژمار دەکەن، بێگومان ئاستەمیشە تەئکیـد لـەو ژمـارە خـەملێنراوە بکرێتەوە کە پاڵنەری سیاسییان لەپشـتەوەیە. بـەڵام بەڵگـەی تـەواو ورد لەسـەر پێکهاتـەی دانیشتوانی کەرکووك ئەو ئەنجامانە بـوون کـە پارتـە جۆراوجۆرەکـان لەهەڵبـژاردنی یەکـەم و دووەمی ساڵی ٢٠٠٥دا بەدەسـتیان هێنـا بەتایبـەتیش هەڵبـژاردنی نیشـتمانی کـە لـە ١٥ی کانوونی یەکەم ئەنجامدراو تیایدا پارتـەکان بەنوێنەرایـەتی سـەرجەم پێکهاتـەکان چـالاکانە بەشدارییان کرد، کە ئەوەش بۆخۆی وردترین پێودانگە لەنێوان هەردو دەنگدانەکەدا.

---

1 - Fainaru, S. 2005. " Kurds Reclaiming Prized Territory in Northern Iraq , Repatriation by Political Parties Alters Demographics and Sparks Violence . " The Washington Post ,30 October A01.

2 - Wong ,E . 2005 " Kurds Are Flocking to Kirkuk , Laying Claim to Land and Oil ." The New York Times , 29 December :A12.

PDF 4 KURD

# فەسڵی سێیەم

## ئاوەڕدانەوە لەدەستکەتەکانی کورد

## هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم/ ٢٠٠٥

هەڵبژاردنە گشتییە فیدراڵییەکان کە لە کانوونی یەکەمدا بەڕێوەچوو لانی کەم لەسێ ڕووەوە لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم جیاوازتر بوو.

یەکەم، نزیکەی (١٣٠٠) چاودێری نێودەوڵەتی سەرپەرپشتی هەڵبژاردنی کانوونی یەکەمیان لەناوخۆی وڵاتدا دەکرد، لەکاتێکدا لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمدا چاودێرانی نێودەوڵەتی بەناچاری لەئوردونەوە سەرپەرشتیان دەکرد.

ئامادەبوونی چاودێران بەواتای بەدواداچوون بۆ هەرپێشێلکاریەکی هەڵبژاردن و بڕیاردان لەسە ئەو پێشێلکاریانە بەشێوەیەکی خێراو باوەڕپێکراو. لەبەر ئەوە بەگشتی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم خاوێن و زیاتر متمانە پێکراو بوو بەبەراورد بەهەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم.

دووەم، لانی کەم بەشداریکردنی چالاکانەی دوو گەورە کوتلە لەنوێنەرانی عەرەبی سوننە (بەرەی تەوافوقی عێراقی و بەرەی دیالۆگی نیشتمانی) سەلماندی کە سەرجەم پێکهاتە

سەرەکیەکانی گەلی عێراق بۆجاری یەکەم لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم لەنێوان خۆیاندا لە کێبڕکێدابوون.

سێیەم، سیستمی هەڵبــژاردن لەگــەڵ ئــەوەی بەشــێوەی نوێنەرایــەتی ڕێــژەیی بــوو بــەڵام لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا لەپێناو ئــەوەی ئەنجامــەکان کاریگــەری کــەمتری لەســەر بەشداریکردنەکان هەبێت سیتمەکە راستکرایەوە و لەبری ئەوەی وڵات ببێتە تەنیا یەك بازنــەی هەڵبژاردن ئەوا بەپێی سیستمە نوێکە هەرپارێزگایەك لەهــەر ١٨ پارێزگاکــەی عێــراق کرایــە بازنەیــەکی هەڵبــژاردنی ســەربەخۆو هەرپارێزگایــەکیش لەئەنجوومــەنی نوێنەریەتیــدا پشــکی لەکورسی بۆ تەرخانکرا.

ئەویش لەســەر بناغــەی ژمــارەی دەنگــدەرانی تۆمــارکراو لــەو پارێزگایــەدا١. بــەواتای هەرپارێزگایــەك ژمارەیــەکی دیــاریکراو لەنوێنــەران هەڵدەبــژێرن ئــەویش بــەدەر لــە ڕێــژەی بەشداربووان لە دەنگدەرانی ناوخۆی پارێزگاکەدا٢.

هــەروەها لەهەرپارێزگایەکیشــدا کورســیەکان بــەپێی پشــکی هــەر قەوارەیــەکی سیاســی لەدەنگی دەنگدەران دابەشکران و بەپشــت بەســتنیش بــە ژمــارەی دەنگــدە تۆمارکراوەکــانی کەرکووك کە لەرۆژی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا (٥٧٦) هــەزار دەنگــدەر بــوون، (٩) کورسی درایە ئەو پارێزگایە.

دیســان جگــە لــە بەشــداریکردنی هــەردو گــەورە کوتلەکــەی عەرەبــە ســوننەکان کوتلــە سەرەکیەکانی دیکەش کــە نوێنەرایــەتی ئــەو هێزانــەیان دەکــرد لەهەڵبژاردنــەکانی کــانوونی

---

١- ٢٣٠ کورسی لەکۆی کورسییەکانی پەرلــەمان(٢٧٥) کورســی بــەم جــۆرە دابەشــکران. دواتــر کورســییە "قــەرەبوویی" و "نیشتمانی" بەسەر ئەو پارتانەدا دابەشکران کە لەسەر ئاستی نیشتمانی ســنوورێکی دیاریکراویــان تێپەڕانــد، بــەڵام لەســەر ئاســتی پارێزگاکاندا کورسییان بەدەست نەهێنا.پاشان بەسەر پارتەکانی تردا دابەش کران بەشت بەستن بە فۆرمی موحاسەسەی نیشتمانی.

٢- لەبنەڕەتــدا ئامــانج لــە و هەمــوارکردنــە زامنکردنــی ئاســتێکی دیــاریکراوبوو لەنوێنەرایــەتیکردنی عــەرەبی ســوننە لــە ئەنجوومەنەکەدا. بۆنموونە پارێزگای ئەنبار ٩ کورسی پێدراو بەو شێوەیەش ٩ نوێنەر هەڵبژێردران جا ڕێــژەی دەنگــدەران ١٪یــان لــە ١٠٠٪ بێت.



PDF 4 KURD

دووەمدا بەشداربوون لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمیشدا بەشدارییان کـرد١. لەچوارچـێوەی ململانێش لەسەر کەرکووك ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم لەبەردوو هۆ گرنگ بوون:

یەکەم، لەبەر ئەوەی قەبارەی نوێنەرایەتیکردنی کورد لەپەرلەمان و حکومەت و تواناکانی کورد لەبەکارهێنانی گوشار بۆ پاڵنان بەکوتلەکانی ترەوە دیاری دەکات تا هەنگاو بنێن بـەرەو جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠).

دووەم، بەشداریکردنی سـەرجەم پێکهاتەئیتنیکییـە سـەرەکیەکان و ئـارەزووی ئاشـکرای عێراقییەکانیش بۆ دەنگدان لەسەر بنەمای ناسنامەی ئیتنیکـی تایـەفی ئـەوەی سـەلماند کـە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان تائێستا وێنەیەکی وردتر لـەبارەی قـەبارەی ژمـارەو رێـژەی پێکهاتـە ئیتنیکیـە جیاجیاکـانی سەرتاسـەری عێـراق و هەرپارێزگایـەکیش دەبەخشـێت، هەربۆیـە هەڵبژاردنەکان لەخۆیدا ئامارێکی نزیکەیی و ئامادە بوو کە دەکرێـت لەرێگەیـەوە پێکهاتـەی ئیتنیکی کەرکووك بۆ جاری یەکەم لەدوای ساڵی (١٩٥٧)ەوە ئاشکرا بکات.

### ئەنجامی هەڵبژاردنەکان

ئەم خشتەیەی لای خوارە ئاماژەیە بۆ دابەشکردنی دەنگـەکان لەکـەرکووك بەسـەر کوتلـە سەرەکیەکاندا کە لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا لەکێبڕکێدابوون.

جـا بەمـەرامی بـەراوردکاری، خشـتەکە دەنگـی ئـەو کوتلانـە دەردەخـات کـە لـە هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمدا بەدەستیانهێناوە.

١- ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی بەرەسمی لە هەریەك لە رەوتی سەدرو حزبی فەزیلەی لەخۆگرتبوو بەڵام کۆنگرەی نیشتمانی عێراقی بەسەرۆکایەتی ئەحمەد چەلەبی لەدەستدا، لەکاتێکدا ئەو گۆڕانکاریەی بەسـەر لیسـتی کوردیـدا هـات چـونە دەرەوەی یـەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی بوو.

## خشتەی ٩- ١

ئەنجامی هەڵبژاردنی نیشتمانیی کانوونی یەکەم و دووەمی ٢٠٠٥ی کەرکووک

| ژمارەی کورسییەکان لەئەنجومەندا- هەڵبژاردنی کانوونز | جیاوازی دەنگەکان (٪) | ڕێژەی سەدی لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم | ڕێژەی سەدی لەهەڵبژاردنی کانوونی یەکەم | ڕێژەی سەدی لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم | دەنگەکان بەهەزاران لەهەڵبژاردنی کانوونی یەکەم | دەنگەکان بەهەزاران لەهەڵبژاردنی کانوونی دووەم | پارت |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ٥ | ٥.٧- | ٥٣.٤ | ٥٧.١ | ٥٧,٨+ | ٣١٢.٨ | ٢٣٧ | هاوپەیمانی کوردستانی |
| ١ | ١٤+ | ١٤ | - | ٨٢.١+ | ٨٢.١ | - - | بەرەی دیالۆگی نیشتمانی |
| ١ | ٥٠٧- | ١٠.٩ | ١٨.٤ | ١.٩- | ٦٣.٧ | ٦٥.٦ | بەرەی تورکمانیی عێراقی |
| ١ | ٥.٩+ | ٥.٩ | - - | ٣٤.٧+ | ٣٤.٧ | - - | بەرەی تەوافوقی |
| ١ | ١.٢+ | ٢.٩ | ١.٧ | ٢١.٢+ | ٢٧ | ٦.٨ | ئاشتەوایی رزگاریخواز |
| سفر | ١.٥ - | ٣.٤ | ٤.٩ | ٠.١ - | ١٩.٧ | ١٩.٨ | ئیئتلافی نیشتمانیی عێراقی |
| سفر | ٣.٤ - | ٢.٢ | ٥.٦ | ٩.٣ - | ١٣.١ | ٢٢.٤ | لیستی نیشتمانی عێراقییە |
| سفر | ٣.٤ - | ٢.٢ | ٥.٦ | ٩.٣ - | ١٣.١ | ٢٢.٤ | لیستی نیشتمانیی رافیدێن |
| - - | ٥.٤ - | ٦.٨ | ١١.٣ | ٤.١ - | ٤٠.٦ | ٤٤.٧ | ئەوانیتر |
| ٩ | - | - | ــ ــ | ــ ــ | ٥٩٥.٤ | ٣٩٧.٢ | کۆ |

PDF 4 KURD

زانیارییەکانی نێو خشتەی ٩- ١ وێنەیەکی روون لەسەر ئەو کاریگەرییە دراماتیکییە پێشکەشدەکات کە بەشداریکردنی عەرەبی سوننە لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا هەیبووە بەجۆرێك لەو دەنگدانەدا بەبەراورد بە کانوونی دووەم نزیکەی(٢٠٠) هەزار دەنگدەر زیادیکردووەو زۆربەی ئەو دەنگانەش چوونەتە پاڵ یەکێك لەوسێ کوتلە سوننییە.

هاوکات پشکی دەنگەکانی هاوپەیمانی کوردستانیش (٧٥) هەزار دەنگی تر زیادیکردوە و بەپێچەوانەی ئەوەش ژمارەی دەنگەکانی هەریەك لە ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی بەرەی تورکمانی و لیستی نیشتمانیی عێراقی لەنێوان هەردو هەڵبژاردنی یەکەم و دووەمدا کەمیکردووە، لەگەڵ ئەوەی لەماوەی ئەو دەنگدانەدا تێکڕای ژمارەی دەنگدەرانی تۆمارکراو نزیکەی(١١٥) هەزار دەنگدەری تر لە کەرکووك زیادی کردووە١.

ئەوەی زیاتر جێگەی سەرنجە کاریگەری بەشداریکردنی عەرەبی سوننەیە لەدابەشکردنی پشکی پارتەکانی تر لەدەنگەکان.

بۆنموونە پشکی لیستی کوردی بەنزیکەی (٦) خاڵی سەدی لەرێژەی ٥٩٪ لەکانوونی دووەم بۆ ٥٣٪ لەکانوونی یەکەم پاشەکشەی کردووە، سەرباری ئەوەی زیاتر لە (٧٥)هەزار دەنگی تری لەهەڵبژاردنی کانوونی یەکەمدا بۆ خۆی مسۆگەر کردووە.

دیارە رێژەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکاندا گەیشتە (٨٦٪) و بەگشتیش دەنگدەران لەسەر بناغەی ناسنامەی ئیتنیکی دەنگیان بەلایەنی هەڵبژێردراو دا.

هەڵبەت ئەنجامەکان بەلای تورکمانی کەرکووکەوە مایەی رەزامەندی نەبوو هەرچەندە بەرەی تورکمانی بەرەی تورکمانی ناسنامەی ئیتنیکی خۆی راگەیاندبوو بەڵام بەوەشەوە کەمتر لە ١١٪ی دەنگەکانی بۆخۆی دەستەبەر کرد.

لەو هەڵبژاردنەدا حزبی سەرەکی تورکمانی شیعە (یەکێتی ئیسلامیی تورکمانی عێراقی) چوە پاڵ لیستی ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی بەڵام خودی ئەو ئیئتلافەش لەکەرکووکدا (١٩٧٠٠) دەنگی بەدەستهێنا، واتە نزیکەی(٣.٤٪) لەتێکڕای دەنگەکان.هەرچی کوردیشە

---

١ – لەماوەی نێوان هەڵبژاردنی کانوونی دووەم و یەکەمدا ژمارەی دەنگدەرانی تۆمارکراو لەکەرکوك لە ٥٧٦هەزارەوە بۆ ٦٩١هەزار بەرزبووەوە.

بەنجامەکان ئاماژەیەکی پۆزەتیڤ بوون و دەریاندەخست کە گەورەترین پێکهاتەی ئیتنیکییە لەپارێزگای کەرکووکدا ئەویش بەجیاوازیەکی زۆر بەبەراورد بە پێکهاتەکانی تر.

لەگەڵ ئەوەی هێزی ئەو ژمارەیە بەسە بۆ ئەوەی زۆرینەی دانیشتوان پێکبهێنن بەلاّم ئەو پرسە لەبەردەم ئەو راپرسییەدا کە بڕیارە لەسەر ئایندەی کەرکوك سازبکرێت بەکراوەیی دەهێڵرێتەوە. بەهەرحاڵ بەهاتنی کانوونی دووەمی (٢٠٠٥) کورد رێژەیەکی گەورە لەدانیشتوانی کەرکووك یان زۆرینەیەکی رەها بەپەراوێزێکی سادە پێکدەهێنێت١.

لەسەرئاستی فیدراڵی(نیشتمانی) بەشداریکردنی هەردو گەورە کوتلەکەی عەرەبی سوننە بەشێوەیەکی گشتی کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبوو لەدابەشکردنی کورسیەکانی پەرلەمان و تەرازووی هێزە سیاسیەکان.

بەپێی خشتەی(٩- ٢) هەردو کوتلەنوێیەکەی عەرەبی سوننە لەنێوان خۆیاندا کەمێك کەمتر لە٢٠٪ی دەنگەکانیان بەدەستهێناو ئەو رێژەیەش بەس بوو بۆ ئەوەی بەرەی تەوافوقی عێراقی (٤٤)کورسی و بەرەی دیالۆگی نیشتمانیش (١١) کورسی بۆخۆیان دابین بکەن.

ئەنجامی ئەوەش پشکی ئیئتلافی یەکگرتووی نیشتمانی بەرێژەی لە ٧٪ دابەزینی بەخۆوە بینی سەرباری زیادبوونی پشکی لە دەنگەکان کە بەنزیکەیی (٢) ملیۆن دەنگی تری بۆخۆی کۆکردەوە، بەلاّم لەگەڵ دابەزینی رێژەی سەدی وایکرد (٢٠) کورسی پەرلەمان لەدەست بدات و بەوەش زۆرینەی نێو پەرلەمانی لەکیس بچێت و نەتوانێت کۆرنترۆڵی پەرلەمان بکات.

هاوکات بەپێی ژمارەی کورسی و رێژەی دەنگەکان هاوپەیمانی کوردستانیش زیانی بەرکەوت ئەویش بەهۆی بەشداریکردنی فراوانی عەرەبی سوننە و ئەدای یەکگرتووی ئیسلامی

---

١- سەرباری بەرزی رێژەی بەشداربووان لەهەڵبژاردنەکانی کەرکوك بەلاّم نزیکەی ١٤٪ی دەنگدەرانی تۆمارکراو زیاتر لە (٩٠ ) هەزار کەس دەنگیان نەدا. هاوکات پارێزگا کوردییەکان لەسەر ئاستی ولاّت بەرزترین رێژەی بەشداریکردنیان لەهەڵبژاردنەکاندا تۆمار کرد. بۆیە بەدوور دەزانرێت ئەو توێژەی دەنگدەرە تۆمارکراوەکان کە بەشداری دەنگدانیان نەکرد رێژەیەکی بەرزی کوردی لەخۆگرتبێت. ئەگەر وامان دانا لەنێو ئەو (٩٠) هەزار کەسەدا کوردی تێدا نەبێت ئەوا لە ٥٣٪ی دەنگدەران کەدەنگیان بۆ بەرژەوەندی هاوپەیمانی کوردستانی داوە نزیکەی زیاتر لە ٤٥٪ لەکۆی ژمارەی دەنگدەرانی تۆمارکراوی کەرکوك پێکدەهێنن.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

کوردستان کە سەربەخۆ بەشداری هەڵبژاردنەکانی کردو توانی (١٥٠) هەزار دەنگ و (٥) کورسی بۆخۆی مسۆگەر بکات١.

دیسان ئەو هەڵبژاردنە ئەدایەکی نائومێدانەی بۆ بەرەی تورکمانی تۆمارکرد ئەویش بەو پێیەی تەنیا پارت بوو کە لەژێر ئاڵای ئیتنیکیدا بەشداری هەڵبژاردنی کردو لەسەرتاسەری عێراقیشدا کەمتر لە (٩٠) هەزار دەنگی بۆخۆی بەدەستهێنا کە زۆربەی دەنگەکانیش لەکەرکووك و کەمتر لە ٠.٠٢٪ ی ئەو دەنگانەش لەهەولێرو لە ٣٣٪ یشی لەدیالە بوون.

بەوشێوەیە لەرووی پراکتیکیەوە دەرکەوت بەرەی تورکمانی لەدەرەوەی سنوورەکانی کەرکووك ئەو هێزە سیاسییە باوەڕپێکراوە نییە.

ئەوەبوو لەپارێزگای نەینەوا بەرەی تورکمانی لەگەڵ بەرەی تەوافوقی عێراقی هاوپەیمانی بەست بەڵام هیچ کاندیدێکی پێشنیاز نەکرد.

بەو شێوەیە لەکاتێکدا ژمارەیەك پاڵێوراوی بەنەژاد تورکمانی لەلایەن کوتلەکانی ترەوە بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنی نوێنەران هەڵبژێردران و بەرەی تورکمانیش بۆخۆی تەنیا یەك کورسی لەپەرلەمانی عێراقدا بەدەستهێنا.

١- ئەوە هۆکارێك بوو بۆ دابەزینی ژمارەی کورسییەکانی لایەنی کوردی لەگەڵ دوورکەوتنەوەی زیاتر لە نوێنەرایەتی رێژەیی لەو سیستمەی کە لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا جێبەجێ کرا. ئەنجامی بەرزبوونەوەی رێژەی دەنگدەران و تەرخانکردنی کورسی پارێزگاکان لەسەر بنەمای خەملاندنی ژمارەی دانیشتوان لەبری رێژەی بەشداربووان لەدەنگداندا بۆ کورد قازانجێکی ئەوتۆی نەبوو. گەورەترین لایەنی براوە ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی(٤٧.٧٪کورسی بەدەستهێنا واتە بەرێژەی ٤١.٢٪ دەنگەکان) و گەورە حزبە عەرەبیە سوننییەکان بوون.

خشتەی ٩- ٢

ئەنجامی هەڵبژاردنی فیدراڵی لەکانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥دا

| پارت | ژمـــارەی کورسی | ڕێژەی سەدی ٪ | ژمـــارەی دەنگـــەکان بەهەزاران | ڕێـــژەی ســـــەدی دەنگەکان |
|---|---|---|---|---|
| ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی | ١٢٨ | ٤٦.٥ | ٥٠٥١.١ | ٤١.٢ |
| هاوپەیمانیی کوردستانی | ٥٣ | ١٩.٣ | ٢٦٤٢.٢ | ٢١.٧ |
| بەرەی تەوافوقی عێراقی | ٤٤ | ١٦ | ١٨٤٠.١ | ١٥.١ |
| لیستی نیشتمانیی عێراقی | ٢٥ | ٩.١١ | ٩٧٧.٣ | ٨ |
| بەرەی دیالۆگی نیشتمانی | ١١ | ٤ | ٥٠٠ | ٤.١ |
| یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان | ٥ | ١.٨ | ١٥٧.٧ | ١.٣ |
| ئاشتەوایی رزگاریخواز | ٣ | ١.١ | ١٢٩.٨ | ١.١ |
| پەیامخوازان | ٢ | ٠.٧ | ١٤٥ | ١.٢ |
| بەرەی تورکمانی | ١ | ٠.٤ | ٨٨ | ٠.٧ |
| لیستی رافیدێن | ١ | ٠.٤ | ٤٧.٣ | ٠.٤ |
| لیستی ئەمـەی عێراقـی(میسـال ئالوسی) | ١ | ٠.٤ | ٣٢.٢ | ٠.٣ |
| بزوتنـــەوەی یەزیـــدی لـــەپێناو پێشکەوتن و چاکسازیدا | ١ | ٠.٤ | ٢١.٩ | ٠.٢ |

سەرچاوە: htt:middleeastreference.org.uk/Iraq.0512results.html



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمدا، تورکمان ئۆباڵی ئەدای خربی بەرەی تورکمانی خستە ئەستۆی کورد بەوەی کە ساختەکاری فراوانیان کردووە بەڵام هەڵبژاردنـەکانی کـانوونی یەکـەم بەسەرپەرشتی چاودێرانی نێودەوڵەتی و رێکخراوە ناحکومیەکان بەڕێوەچوو، ئەمـە جگـە لـە بەشداریکردنی(٤٠٠) چاودێری باوەڕپێکراوی عێراقی.

لەکۆی (١٩٨٥) سکاڵا کە گەیشتبوونە دەست کۆمسـیۆنی سـەربەخۆی هەڵبژاردنـەکان، کۆمسیۆن بڕیاریدا کە(٥٨) لەو سکاڵایانە سکاڵای جددین(سکاڵای سوور) ن١، کە لە(٨٪)ی ئەو سکاڵایانەش لەکەرکووك بوون بـەڵام کۆمسـیۆنی سـەربەخۆی هەڵبژاردنـەکان دانـی نـەنا بەدروستی هیچ کام لەوسکاڵایانە.

جگە لـەوەش سیسـتمی وردبـینی پـێش و پـاش هەڵبژاردنـەکان تـەنیا (٧) پێشـێلکاری ئاشـکراکرد کـە لەویسـتگەکانی دەنگـدانی کـەرکووك کـە ژمارەیـان ١٤٨٨ویسـتگە بـوو روویاندابوو٢.

دیارە هەڵبژاردنەکان لەکەرکووك دوور نەبوون لەمشتومڕ ئەوەبوو چوار رۆژ بەر لەدەنگـدان کۆمسیۆنی سەربەخۆی هەڵبژاردنـەکان راپـۆرتێکی بڵاوکـردەوەو ئامـاژەی بـەوەکرد کـە لـەو هەڵکشانەچاوەڕوان نەکراوە دەڕوانێت کە لەتۆمارکردنی دەنگدەرانی پارێزگاکەدا روودەدەن٣.

لەرۆژانی دەنگدانیشدا بەرەی تورکمانی بەگومانەوە باسی لەو پێشێلکاریانەی کورد کرد کە بەئاشـکرا دەیکـەن و ئـەوەش خـۆی لەهاتووچـۆی ئۆتۆمبیلەکانـدا دەبینێتـەوە لەکاتێکـدا هاتوچۆکردن لەکاتی هەڵبژاردنەکان لەسەرتاسەری عێراقدا قەدەغەکرابوو.

لەچیرۆکێکی باوەڕپێ نەکراویشدا وتەبێژی بەرەی تورکمانی رایگەیاند: کـە سـەدان هـەزار کورد بەشـێوەیەکی نایاسـایی لەهـەرێمی کوردسـتانەوە روویـان لەکـەرکووك کـردوە لـەپێناو

---

١ – سکاڵای(سوور) ئەو سکاڵایانە بوون کە دەکرا کاریگەربن لەسەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکان .

2 --Fischer, J.2006. "Council of representative Election Report Iraq: December 15,2005 , Final Report." Center for Transitional and Post- Conflict Governance,20 February.

٣ – لەراستیدا ئەو مشتومڕی لەسەر پرۆسەی تۆمارکردن بۆ بەشداریکردن لەراپرسـی لەسـەر دەسـتوور هاتـە ئـاراوە. بەگشـتی ٨١هەزار دەنگدەر تۆمار کـران کـە زۆربـەیان کـورد بـوون و دواتـریش کۆمسـیۆنی بـاڵای سـەربەخۆی هەڵبژاردنـەکان هەڕەشـەی رەتکردنەوەی دەنگی ئەو ٨١ هەزار کەسەی کرد کە بەشداری هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمیان کردبوو. بەڵام دواجار لەژێر فشاری کورددا کۆمسیۆن پاشگەز بوەوە.

دەنگداندا ١. بەڵام بەگشتی هەڵبژاردنەکان بەخاوێنترین هەڵبژاردن دەژمێردرێن بۆ بارودۆخێکی وەك ئەو دەمەی عێراق.

هاوکات بەرپرسێکی هەڵبژاردنی سەربەنەتەوە یەکگرتووەکان رایگەیاند: کە هەڵبژاردنەکان بەپێی نۆرمە نێودەوڵەتیەکان بەرێوەچووەو وتیشی " مرۆڤ ئەوەی لەسەرە کە بێژێت هەڵبژاردنەکان شەفاف و باوەڕپێکراو و باش بووە"٢.

بەزمانێکی حسابی پەتیش هاوپەیمانی کوردستانی کە شتێك لەهێزی سیاسی لەدەست دا بەڵام هەڵوێستی راوێژکارانەی لەبەرامبەر کوتلەکانی تر لەهەندێك رووەوە بەهێزو تۆکمە بوو.

لەگەڵ ئەوەی ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی بەجیاوازیەکی گەورە مەزنترین کوتلەی سیاسی نێو پەرلەمان بوو بەڵام هەرزوو دووچاری دابەشبوونی ناوخۆیی هات و لەسەر پۆستی سەرۆك وەزیر دەستی بە دانوستان کرد.

لەوسەروبەندەدا جگە لەیەکگرتووی ئیسلامی کوردستان لایەنی کوردی بەردەوام بوون لەسەر هەڵوێستی یەکگرتوویان لەکاتی دانوستانەکان لەسەر پێکهێنانی حکومەتی یەکێتی نیشتمانی.

هەرچەندە لەرووی هەژمارکردنەوە دەشیا زامنی زۆرینەی ٣/٢ی پێویست بکرێت لەپێکهێنانی حکومەتی نوێ بێ پشتیوانیکردنی کورد بەڵام دوورخستنەوەی کورد لەحکومەتی یەکێتی نیشتمانی لەرووی سیاسییەوە کارێکی مەحاڵ بوو.

لەبەرئەو سەرکردایەتی کورد لەتوانایدا بوو رۆڵێکی دروستکەر بگێڕێت وەك (نێوەندکار)ی نێوان کوتلە جیاجیاکان و بەوەش پابەندبوونی خۆی لەسەر پرسی یەکێتیی عێراقی پیشاندا.

لەنێو ئەو (هێڵە سوورانە) ی یەکەم، کە کورد نەخشاندی دوورخستنەوەی بەرەی تەوافوقی عێراقی یاخود لیستی عێراقییە بوو بەسەرۆکایەتی ئەیاد عەلاوی لەحکومەتی یەکێتیی نیشتمانیدا٣.بەڵام خەمی سەرەکی سەرکردایەتی کوردی بەدەستهێنانی گەرەنتی بوو لەبارەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ لەلایەن هەرحکومەتێکی داهاتوو.

---

1 - Turkish Daily News ( Internet Version –www).2005. (Turkmens complain Kurds cheated in elections in Kirkuk."17 December." ( WNC).

2 –CNN.com 2005. "Iraqi Protests Continue in Kirkuk ."29 December (LN).

٣– بەشداریکردنی لیستی عێراقییە لە حکومەتی یەکێتی نیشتمانی لەهەندێك ناوەندا دژایەتی دەکرا بەتایبەت لەلایەن موقتەدا سەدرەوە چونکە سەرۆك وەزیری ئەو دەم ئەیاد عەلاوی پشتیوانی لەهەوڵەکانی ئەمریکا دەکرد بۆ لەناوبردنی سوپای مەهدی لەساڵی ٢٠٠٤دا.

هەروەك تاڵەبانی رایگەیاند: هاوپەیمانی کوردستانی هیچ داواکارییەکی نییە جگـە لـەوە نـەبێت کە هەمووان پێویستە بزانین لەبارەی پێویستیی جێبەجێکردنی مـاددەی ١٤٠ی دەسـتوور١. ئـەو داواکاریە کوردی خستە سەر رێگەی بەریەککەوتنی راستەوخۆ لەگەڵ هـەردو کوتلـە سـەرەکیەکەی عەرەبی سوننەوهەروەها کوتلەکانی دیکەی نێو ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقیش.

لەبەراییدا ئەو ململانێیە لەشێوەی شەڕێکی ئـاڵۆزو درێـژکراوە بـوو لەسـەر رێککـەوتنی کاندیدی سەرۆك وەزیران و لەبەر نەبوونی تەوافوقیش لەسەر ناوەکە هەڵبژاردنە ناوخۆییـەکانی ١٢ی شـوباتی ٢٠٠٦ بردنـەوەی ئیـبراهیم جەعفـەری سـەر بـەحزبی دەعـوەی لێکەوتـەوە لەبەرامبەر عادل عەبدولمەهدی پالێوراوی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسـلامی لـەعێراق(ئـەو کات) کە( ٦٤ )دەنگ بۆ جەعفەری و (٦٣ )دەنگیش بۆ عەبدولمەهدی بوو٢.

زۆربەی دەنگەکانیش کە بۆجەعفەری دران لەرەوتی سەدرییەوە بوون، ئەوەبوو بەماوەیەکی کەمیش لەدوای دەنگدان دەنگۆی ئەوەهەبوو کە موقتەدا سەدر هەڕەشـەی پاشەکشـەپێکردنی لایەنگرانی لەئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی کردووە، ئەگەر بێتوو (عادل عەبدولمەهدی) لـەبری جەعفەری بژاردە بکرێت٣.

بڕیارەکەی سەدر بۆ پشتیوانیکردن لە جەعفەری لەو سـۆنگەیەوە سەرچاوەی گرتبـوو کـە دوژمنایەتیەکی دێرین هەبوو لەنێوان ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشـی ئیسـلامی و رەوتـی سـەدر، ئەمە جگـە لـەوەی سـەدریەکان لـەرووی سیاسـییەوە جەعفـەری لەسـەر زۆر پرسـی گـرنگ لەسەدرییەکانەوە نزیکتر بوو.

---

1 -Garwood, P. "Iraqi Kurds Flex Muscles over Kirkuk in Talks on New Government." The Associated Press , 15 February.

٢- دووکاندیدەکەی تر بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران هەریەك لە ( نەدیم جابری) لەحزبی فەزیلـە و(حسـێن شەهرسـتانی) کەسـایەتی سەربەخۆ بوو کە بەر لە پرۆسەی دەنگدان پاشەکشەیان کرد.

٣-پێدەچێت ئەو هەڕەشەیە کاریگەری لەسەر هەندێك لە سەربەخۆکان هەبووبێت بەئاراسـتەی دەنگـدان بـۆ بەرژەوەنـدی جەعفـەری چونکە ئەویان پێ باشتربوو لەو پشێوییەی کە رەنگە لەگەڵ کشانەوەی سەدریەکان بێتە ئاراوە... بڕوانە Worth , R. F., and S. Tavernise . 2oo6. " Radical Cleric Rising as Kingmaker in Iraqi Politics ." The New York Times,16 February: A18.

بەرلەوەی پرۆسەی دەنگدانیش بەڕێوەبچێت موقتەدا سەدر بەرنامەیەکی (١٤) خاڵی پێشکەش بە جەعفەری کرد کە لەنێویدا خشتیەکی کاتی لەخۆگرتبوو سەبارەت بە پاشەکشەی هێزەکانی ئەمریکا وداواخستنی دامەزراندنی هەرێمە فیدراڵییە خاوەن ئۆتۆنۆمیەکان، ئەمە جگە لە وەرگرتنی هەڵوێستێکی توند لەبەرامبەر خواستی کورد لەبارەی کەرکووکەوە.

بەوتەی نوێنەری سەدرییەکان (بەها ئەلئەعرەجی) رەوتەکەیان پێیوابوو کە جەعفەری نزیکە لەجێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیەوە١.

هاوکات هەریەك لەتەوافوقی عێراقی و لیستی عێراقییە لەدژی کاندیدکردنی جەعفەری راوەستان ئەویش لەبەرچەند هۆیەکی جیاواز، هەرچی کوردیشە هێرشیان کردە سەر جەعفەری لەبەرئەوەی وەك ئەوان دەڵێن هەوڵی جددی نەداوە لەجێبەجێکردنی ماددەی(٥٨)یاسای ئیدارەی کاتیدا٢.

بەوتەی سیاسەتمەدارێکی کورد کە پێشتر ئەندامی ئەنجوومەنی حوکمڕانی بوو، جەعفەری لەساڵی رابردووەوە سەرۆك وەزیری لەدەستدایەو کوردیش هەمیشە کێشەی لەگەڵداهەیە... ئەویش بەهۆی جێبەجێ نەکردنی ماددەی (٥٨)٣.

کاتێکیش جەعفەری لەکۆتایی شوباتدا بێ ئاگادارکردنەوەی تاڵەبانی سەردانێکی لەناکاوی بۆ تورکیا ئەنجامدا بۆ دیداری رەجەب تەیوب ئەردۆغانی سەرۆك وەزیر بۆ تاوتوێکردنی کۆمەڵێك پرس لەنێویشیاندا پرسی داهاتووی کەرکووك کورد بەوە تەواو بێزار بوو٤.

دواتر لەئازاردا بەپێی ئەو راپۆرتەی کەرۆژنامەی(چاودێر)ی کوردی کە لەلایەن (ی.ن.ك)ەوە پشتیوانی دەکرێت بلاویکردەوە، جەعفەری چاوی کەتووە بە بەرپرسانی پێشووی بەعس (سالح موتلەگ- سەرۆکی بەرەی دیالۆگی نیشتمانی- و مشعان جبوری □سەرۆکی کوتلەی

---

١- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢ - ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دژی مانەوەی جەعفەری بوو لەسەرۆکایەتی حکومەتدا. دەنگۆی ئەوەش هەبوو زەڵکای خەلیل زاد داوای لە عەبدولعەزیز حەکیمی سەرۆکی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی کردبێت حکومەتی داهاتوو لەلایەن جەعفەرییەوە دروست نەکرێت چونکە سەرۆك بوش وادەخوازێت.. بڕوانە: Allawi The Occupation of Iraq , op cit, 443.

3 - Negus, S .2006. " Kirkuk Disputes Dedevils Iraq' Political Crisis . " The Financial Times ,11Mach :9.

٤ – بەپێی سەرچاوە کوردیەکان خاڵێکی تری ناکۆکییەکان لەوەدا بوو کە جەعفەری بەبێ کورد بەئەندامێتی تورکمان وەفدەکەی پێکهێنابوو.

PDF 4 KURD

ئاشتەوایی و رزگاریخواز) لەو دیدارانەشدا جەعفەری تەئکیدی بۆکردونەتەوە کە هەرگیز رێگـە بەگەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان نادات١.

خۆئەگەر بەتەنیا کورد دژ بە کاندید کردنی جەعفەری نەبووبن ئەوا رەتکردنـەوەی بـەردەوامیان لەو حکومەتەدا کە جەعفەری سەرۆکایەتی دەکرد بۆخۆی گورزێکی گورچـك بـڕ بـوو بـۆ دەرفـەتی مانەوەی، هەربۆیە دواجار جەعفەری ئامادەیی خۆی بۆ وازهێنان لە پۆستەکەی راگەیاند.

ئەوەبوو نوری مالکی لەبری ئەو خۆی دانا ئەویش بەو پێیەی هەر هیچ نـەبێت لای گشـت کوتلەکان کەمێك پەسەندبوو، هەربۆیە لە ٢٠ی ئایاری ٢٠٠٦دا حکومــەتی نـوێی یـەکێتی نیشتمانی رەزامەنـدی پەرلـەمانی بەدەسـتهێنا و هەریـەك لەپۆسـتەکانی بـەرگری و نـاوخۆو نەوتیش بەشێوەیەکی کاتی درانە وەزیرەکان.

حکومەتی نوێ کە لە(٣٧) وەزیر پێکهـاتبوون، پۆسـتەکان دابەشـکران لەسـەر بناغـەی نوێنەرایەتی رێژەیی کوتلە بەشداربووەکانی نێو ئیئتلافی دەسەلاتدار٢.

پشکی کورد(٦) پۆست بوو کە دوانیان پۆستی گرنـك بـوون( جێگـری سـەرۆك وەزیـر بـۆ بەرهەم ساڵح لە (ی.ن.ك) و وەزارەتی دەرەوە بۆ هۆشـیار زێبـاری لـە(پ.د.ك). بەگشـتی هەردوپارتە سەرەکیە کوردییەکە پشکی هاوپەیمانی کوردستانیان نیواو نیو دابەشکرد٣.

هاوکات جەلال تالەبانی لەپۆستی سـەرۆك کۆمـاردا مایـەو یـەك لایەنـە مـافی ڤیتۆشـی لەدەستدا بوو لەبەرامبەر دارشتنی هەریاسـایەك کـە دژ بەبەرژەوەنـدی کـورد بێـت٤. کـورد بەوپێیەی لایەنێکی

---

1 - Chawder ( BBC Monitoring International Reports ). 2006. " Al-Ja'afari Won't let Kirkuk Return to Kurdistan ."28 March ( LN).

٢ - تەنیا گەورە کوتلە کە بەشداری حکومەتی نیشتمانی نەکرد بەرەی دیـالۆگی یشـتمانی و حزبـی فەزیلـەی ئیسـلامی بـوون . یەکەمیان بەحکومەتی تایەفی و دووەمیشیان بەحکومەتی دەستی ئەمریکای وەسفکرد ئەمە جگە لەوەی وەزارەتی نەوت نـەدرابووە حزبەکەیان. هاوکات ٤ حزبی بچووکی دیکەش کە لەنێویاندا یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی تێدابوو بەشداری ئـەو حکومەتـەیان نەکرد. بەگشتی ئەو لایەنانەی بەشداری حکومەتەکەیان کرد لەکۆی ٢٧٥ کورسی ٢٤٠ کورسییان بەدەستەوە بوو.

٣ - پارتی دیموکراتی کوردستان وەزارەتەکانی ئاوەدانکردنەوەو نیشتەجێکردن( بەیان دزەیی)، پیشەسازیو کانزایی( فەوزری حەریری کە ئاشووری بوو) بەدەستەوە بوو، لەکاتێکدا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەزارەتەکانی سەرچـاوە ئاوییـەکان( لـەتیف رەشـید)و ژینەگە(نەرمین عوسمان)ی بەدەستەوە بوو.

٤ – ئەوە جیاوازییەکی گرنگ بوو لەدەسەلاتەکانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی بەپێی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت . هـەروەها وەك دەستووریش دیاری دەکات مەرجی یەکەم، رێکەوتنی ئەندامانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتییە بـەکۆدەنگی لەسـەر بـەکارهێنانی مـافی ڤیتۆ . هەرچی دووەمیشە کۆدەنگییە لە پەسەندکردنی بڕیارەکاندا.

بنچینەیی بوون لە حکومەتی نوێی یەکێتی نیشتمانی و خاوەنی شـوێنگەی هەسـتیاربوون دەسەڵاتی سیاسیدا، لەسەر ئاستی فیدراڵی و لە پێگەیـەکی بـەهێزەوە دەجـوڵان و دەرفـەتی ئەوەیان هەبوو خزمەت بەبەرژەوەندی خۆیان بکەن لەمەسەلەی کەرکووکدا.

بەپێچەوانەی ئەوەوە تاکە نوێنەرەکەی بەرەی تورکمانی هیچ پۆستێکی وەزاری بۆ تـەرخان نەکرابوو سەرباری ئەوەی لەڕووی تەکنیکییەوە لایەنێك بوون لە حکومەتی یەکێتی نیشتمانی.

تەنیا تورکمان لەحکومەتدا( جاسم موحەمەد جەعفەر) ی وەزیری وەرزش و لاوان بوو، کە تورکمانێکی شیعەی سەر بەیەکێتی ئیسـلامی تورکمـانی بـوو کـە لەسـەر لیسـتی ئیئـتلافی یەکگرتووی عێراقی هەڵبژێردرابوو.

پەراوێزخستنی سیاسیانەی تورکمان بەتایبەتیش بەرەی تورکمـانی لەسەرتاسـەری عێـراق لەو قۆناغەدا بەتەواویی بەئەنجام گەیەنرا.

## بەنێو دەوڵەتیکردنی پرسی کەرکووك

بەرەی تورکمانی وەسیلەیەکی ئەوتۆو ئاشکرای نـەبوو بۆکاریگـەری خسـتنە سـەر ژیـانی سیاسی لەسەر ئاستی نیشتمانی بەڵکو تەنیا توانایـەکی سـنووورداری هـەبوو بـۆ پەکخسـتنی رەوتی رووداوەکان لەسەر خاکی کەرکووك.

تەنیا بژاردەی راستەقینەی بەردەم بەرەی تورکمانی بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکات تێوەگلانی هێزی دەرەکی بوو لەململانێکەو رێگرتن بوو لە جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠)، کە بێگومان تورکیا سەرچاوەیەکی بەڵگەنەویستی پشتیوانیکردنی بوو.

بـەڵام پەیوەنـدی نێـوان ئەنقـەرەو هـەرێمی کوردسـتان لەسـاڵی ٢٠٠٦دا تـەواو ئـاڵۆز پێوەدیاربوو بەجۆرێك کە ئەو دەم پەیوەندییـە ئابوورییـە گەشەسـەندوەکانی نێـوان هـەردولا-بەهای ساڵانەی

زیاتر لەیەك ملیۆن دۆلار بوو وایکرد بەرەنگاریبوونەوەی ستراتیژی نێوانیـان تێچـوونێکی گران بەها بکەوێت.

دیارە رەگەزێکی ئاڵۆزی دیکەش، هەڵبژاردنی پەرلەمانی و سەرۆکایەتی داهاتووی سـاڵی ٢٠٠٧ی تورکیاو دابەشبوونی رووکەشانەی نێوان مەدەنیخوازان و دامـەزراوەی سـەربازی بـوو



PDF 4 KURD

لەدەولەتی تورکیا سەبارەت بە ئیعترافکردن بە مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و وتوویژکردنی راستەوخۆ لەگەڵیدا.

دیسان لەسایەی ئەدای خراپی بەرەی تورکمانی لەدووەم هەڵبژاردندا ئاشکرابوو کە پشت بەستن بەبەرەی تورکمانی بۆ سەرپەرشتیکردنی بەرژەوەندیەکانی تورکیا لەعێراقدا نەك هەر ستراتیژێکی دۆڕاوەبەڵکو کاریگەرییەکەی پێچەوانەشی هەیە.

رۆژنامەی "میللییەت" ی پرفرۆش پشت بەستوو بە بەرپرسانی تورك کەهێمای بەناوەکانیان نەکردووە، باسی لەوە کردوە حکومەتی تورکیا ئیعترافی بەوە کردووە" تورکمان کوتلەیەکی هاوچوونیەك" نین و بەرەی تورکمانیی عێراقیش کە وا خۆی دەردەخات نزیك بەتورکیایە پێدەچێت زیان بە یەکێتی تورکمان بگەیەنێت١. لەوچوارچێوەیەدا دامەزراوەی توێژینەوەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تورکیا کە خاوەن نفوزێکی فراوانە، لە مانگی نیساندا راپۆرتێکی بڵاوکردەوە و تیایدا بەتوندی دەستی تۆمەتبارکردن بۆ سیاسیەکانی تورکیا "بەئاراستەی تورکمان" درێژدەکات.

بەپێی راپۆرتەکە "شکستی مۆدێلی بەرەی تورکمانی لەئێستادا روونبوەتەوە و سووربوونیش لەسەر ئەو مۆدێلە تەنیا تورکمان لاواز دەکات"٢. هاوکات توێژینەوەکە تورکمانی عێراق وەسفدەکات بەوەی بەشێوەیەکی بەرچاو دابەشبوون، بەتایبەتیش تورکمانی سوننە کە لەبری ئەوەی ریزەکانیان یەکبخەن بەردەوام پەرتەوازە دەبن.

هاوکات لەتوێژینەوەکەدا رێنمایی ئەوەدراوە پشت بەو ستراتیژە ببەسترێت، کە لەسەر پەیوەندی دیپلۆماسی دروست دەبێت و دواجاریش دەگاتە ئەوەی " بەهۆی بارودۆخ و راستییە سیاسیەکانی عێراقی نوێ تورکیا ناتوانێت درێژە بەسیاسەتی ئێستای بدات لەبەرامبەر تورکماندا.... هەربۆیە پێویستە لەسەر تورکیا سیاسەتێکی جیاوازو نوێ یاخود مۆدیلێکی جیاوازتر بۆ تورکمان دابڕێژێت٣. وەك کاردانەوەیەك لەبەرامبەر ئەو شکستە ئاشکرایەی کە بەرەی تورکمانی دوچاری بووەوە،

---

1 - -Idiz, s. 2006. " Ankara's Self-Criticism Regarding the Turkmens. " Milliyet (Internet version –www) ,31 January ( WNC ).

2 - Cetinsaya, G .2006. The New Iraq, The Middle East and Turkey : A Turkish View , Foundation for Political ,Economic and Social Research ( SETA ), Report SEL-406 :47-48.

٣ -هەمان سەرچاوەی پێشوو،ل٤٨.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

حکومەتی تورکیا لەوەرچەرخانی بۆ هێزێکی سیاسی باوەڕپێکراو لەعێراقدا، پەیڕەوی سیاسەتێکی چاپووکترو بەرەنگاریبوونەوەی کەمتری کرد لەبارەی پرسی کەرکووکەوە.

بەئاشکرا لێدوانی لێپرسراوانی تورك هەژماری بۆ دەکراو هەوڵیشیان دەدا خۆیان لە گاڵدان بەدوور بگرن. بۆنموونە راستەوخۆ لەدوای چاوخشاندنەوە بەباروودۆخی عێراق لەدوای هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا کە خاوەنی باڵادەستیەکی زۆرە لەوڵاتەکەیدا بەیاننامەیەکی دەرکردو تیایدا رایگەیاند: پرسێکی هەستیاری وەك کەرکووك پێویستە بەجۆرێك چارەسەربکرێت کە بەلای سەرجەم عێراقییەکانەوە پەسەندبێت١.

لەسەر ئاستی چارەسەرکردنیش بۆ پرسی کەرکووك تورکیا ژمارەیەك پێشنیازی پێشکەش کرد لەوانەش بەشداریکردنی (UN) بەرۆڵێکی گەورەتر لەو پرسەدا، لەپێشنیازێکی دیکەشدا کە لەرووی پراکتیکیەوە جێبەجێکردنی ئاستەم بوو، تورکیا داوایکرد هەوڵبدات سەرجەم دانیشتوانی عێراق دەنگ لەسەر داهاتووی کەرکووك بدەن٢. بەڵام دواتر ئەوەی کە تورکەکان لەپێشنیازکردنی پرۆژەیەکی گونجاوو دیاریکراودا پێیگەیشتن بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخەکەدا هەوڵەکانیان بوو بەر لە راپرسی بۆ نێوبژیوانیکردن لەنێوان کوتلە عێراقییەکان لەسەر سازدانی رێککەوتنێك کە پەیوەندی هەبێت بەگۆڕینی ناوەڕۆکی ئەو پرسیارەی کە لەراپرسییەکەدا دەکرێت.

بیرۆکەکەش ئەوەبوو کەواز لەبژاردەی چوونە پاڵی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان بهێنرێت و بارودۆخێکی تایبەت بە کەرکووك ببەخشرێت. خۆئەگەر ئەو فۆرمەش درایە راپرسییە گشتیەکە ئەوا ئەنجامەکان لەلایەن زۆرینەوە بە"بەڵێ" دەبێت، بەڵام ئەگەر بێتوو پرسیار لەهاوڵاتیان بکرێت کە ئایا گەرەکیانە بەشێك بن لە هەرێمی کوردستان ئەوا دەرئەنجامەکان بە شێوەیەکی دابەش بوو دەبێت٣.

---

1 (Milliyet internet version –WWW ). 2006. " Turkey : MIT Issues Secret Report on Kirkuk, Iraqi Kurds' Intensions ."29 December (WNC ).

٢- دوا پێشنیاز لە سەر ئەو راپرسییەی کە لەسەر ئاستی عێراق لەبارەی کەرکوکەوە خرایە روو، لەلایەن کوردەوە دەرفەتی پەسەند کردنی نەدەبوو چونکە وەك دۆڕاو لەو راپرسیە دەهاتنە دەرەوە. بڕوانـە: Milliyet ( Internet Version –WWW ) .2006 ."Turkish Columnist Views Ankara's Assessments, Expectations Regarding Iraq. " 31 January ( WNC ); Milliyet (Internet Version- WWW) .2006. " Turkey : Erdogan Seeks Special Statue for Kirkuk in Meeting With Rice. " 28 April (WNC).

3- Turkish Daily News . 2006 . " Turkey Seeks Pre-Referendum Deal on Kirkuk's Statues." 10 August (LN).

بەپێی بڕیارەکانی ماددەی ١٤٠ دەنگدان لەسەر بەخشینی بارودۆخێکی تایبەت بە کەرکووك کارێکی گونجاوە چونکە ماددەکە سروشتی ئەو پرسیارەی دیاری نەکردوە کە لەدەنگدەران دەکرێت.

جگە لەو تەقەلایەش وزەکانی تورکیا خۆی لەدواخستنی وادەی راپرسیەکەدا دەبینیەوە، هەرچی بەرەی تورکمانیشە خۆی خستبووە پاڵ تورکیاوە ئەویش نەك هەربۆئەوەی تورکیا وەك ئامرازێك مومارەسەی نفوزی راستەوخۆی بکات لەسیاسەتی عێراقدا بەڵکو دیسان وەك پاساوێکی گونجاو تا دەست وەربدات لە پرسێکی ناوخۆیی کە چارەسەرکردنەکەی ئەرکی عێراقییەکان خۆیان بوو.

نیازی ئاشکرای تورکیا لەپاراستنی "براکانی کە هەڵگری هەمان ناسنامەی ئیتنیکی"بوون لە زوڵمی کوردو رێگری کردنیش لەوەی کەرکووك بکەوێتە ژێر" هەژموونی ئیتنیکی " دیسان ئەنجەتێکی پڕگرفت بوو بۆ تورکەکانن چونکە بەهەمان شێوە پشتی بەجیاوازی ئیتنیکی نێوان تورك و کورد دەبەست کە رۆژگارێکی دوورو درێژە تورکەکان لەوڵاتی خۆیاندا لەهەوڵی نکۆڵی کردنی کورددان.

هاوکات بەرەی تورکمانیش لای خۆیانەوە بەردەوام بوون لە تۆمەت بەخشینەوە بەرامبەر بەکورد لەکەرکووکدا بەوەی کاری شەرمەزارانە و کوشتار ئەنجام دەدەن بۆیە داوای دەستێوەردانی سوپای تورکیایان دەکرد[١].

## هەڵکشانی کارە توتدو تیژییەکان

لەبەرایی ساڵی ٢٠٠٦دا کەرکووك بەبەراورد بە زۆربەی پارێزگاکانی تری عێراق بووە مۆڵگەی بڵاوبوونەوەی کاری توندوتیژی. خشتەی(٩- ٣) داتاو زانیاری بەراوردکاری لەبارەی ئەو هێرشە چەکداریانە دەخاتە روو، کە رۆژانە لەپارێزگا هەڵبژێردراوەکاندا روو دەدەن.

**خشتەی ٩- ٣**

**داتای بەراوردکاری ژمارەی رۆژانەی پەلامارە چەکدارییەکان لەپارێزگا هەڵبژێردراوەکاندا.**

---

١- بۆزانیاری زیاتر لەسەر نموونە جۆراوجۆرەکان لەبەکارهێنانی ئەو جۆرە زمانە لەلای نوێنەری بەرەی تورکمانی بڕوانە:
Anatolia. 2007. " Turkey : ITC Chairman Ergec Warns of Approaching Danger in Kirkuk." 8 January ( LN ); Turkish Daily News. 2006. " Turkmen Official Warns Against Massacre in Iraq's Kirkuk ." 8 January (LN); Turkish Daily News. 2006. " Iraqi Turkmen Complain of Kurdish Attacks ."14 March ( LN ).



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

| پلە | مامناوەند شوبات٢٠٠٥ ئاب ٢٠٠٦ | ئایار – ئاب٢٠٠٦ | شوبات- ئایار ٢٠٠٦ | ئاب ٢٠٠٥ حوزەیران ٢٠٠٦ | شوبات- حوزەیران ٢٠٠٥ | پارێزگا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | ٢٥.١ | ٣٠.٣ | ٢٨.٩ | ٢١ | ٢٠.٣ | بەغداد |
| ٢ | ٢٢.١ | ٣١.١ | ٢٢ | ٢٣.٣ | ١٢.٣ | ئەنبار |
| ٣ | ١٢.٨ | ١٥.٥ | ١٣.٧ | ١٣.٨ | ٨ | سەلاحەدین |
| ٤ | ٩.٢ | ١٠.٣ | ٧.٦ | ٨.٥ | ١٠.٤ | نەینەوا |
| ٥ | ٧.٨ | ١٤.٥ | ٨.٣ | ٥.٤ | ٣.١ | دیالە |
| ٦ | ٤.٢ | ٤.٨ | ٤.٣ | ٤.٧ | ٣.١ | کەرکووك |
| ٧ | ١.٧ | ٢.٤ | ٢ | ١.١ | ١.٢ | بەسرە |
| ١٨ | ٠.٠٣ | سفر | سفر | سفر | ٠.١ | دهۆك |

سەرچاوە: Iraq Index:Tracking variable of Reconstruction&Security in Post-Saddam Iraq.The Brokking Institution,December 21,2007,P.27

www.brookings.edu/saban/media/Files/centers/Iraq%20Index/index20071221pdf

لەماوەی نێوان شوبات و ئایاری ٢٠٠٦دا پارێزگاکە رۆژانە دووچاری (٤.٣) هێرشی چەکداری دەبووەو بەوەش کەرکووک لەئاستی کارە توندو تیژیەکاندا لەپلەی شەشەمدا بوو لەنێوان پارێزگاکانی تری عێراقدا١. لەشوباتدا "گریگ فۆرد- Greg Ford" یەکێك لەئەفسەرانی هەوالگری ئەمریکا لەبارەی زیادبوونی کارە توندوتیژیەکان لەماوەی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمدا دەڵێت سەرجەم پێکهاتە ئیتنیکیەکانی کردوەتە ئامانج. هەروەك ئاماژەی بەوەکردوە لەکانوونی دووەمدا کەرکووك (٢٥)تاوان یاخود هەوڵی ناکاوکوژی

---

١- بۆزانینی زیاتر بڕوانە: The Brookings Institution .2007. Iraq Index: Tracking Variables of Reconstruction & Security in Post Saddam Iraq .21 December: 27. www.brookings. edu / saban /- / media / Files / Centers /Saban / Iraq % 20 Index / index 20071221.pdf ).

PDF 4 KURD

بەخۆوە دیوە[1]. بەبەراورد بەپارێزگای دهۆك كەهیچ پەلامارێكی رۆژانەی تۆمارنەكردووە كەركووك جێگەیەكی مەسترسیداربووە بەڵام دیسان بەبەراورد بەپارێزگایەكی وەك ئەنبار كە رۆژانە لەمامناوەندی پەلامارە چەكداریەكان (٢٢) هێرش بوون لەرۆژێكدا ئەوا كەركووك مێرگی ئاشتی و ئارامی بوو، لەگەڵ ئەوەی وەك نەینەواو دیالە پێكهاتەی فرە ئیتنیكی لەخۆگرتووە.

لەسەرەتای حوزەیرانی ٢٠٠٦ ەوە گروپە چەكداریەكان دەستیان بە زنجیرەیەك هەڵمەتی تەقاندنەوە كرد كەماوەی دوو مانگی خایاندو ئەوەش گیان لەدەستدانی بەكۆمەڵی بەدواوە بوو.

لە١٢ی حوزەیراندا (٢٢) كەس كوژران و (٤٣) ی دیكەش بەهۆی هێرشی خۆكوژی و تەقینەوەی بۆمب لەرێگەی ئامێری كۆنترۆڵەوە بریندار بوون.

لەمانگی تەمووزیشدا (٦) تەقینەوەی ئۆتۆمبیلی بەمینرێژكراو روویاندا كە گەورەترینیان لە(٢٣ی) تەموزدا بوو لەكەركووك، وەك راپۆرتەكانیش ئاماژەیان پێداوە پتر لە (١٠٠) كوژراوی بەدواوە بووە[2].

لەپاییزیشدا ئاستی پەلامارەكان روویان لەهەڵكشان كرد و بەتەنیا لەمانگی ئەیلولدا (١٦) هێرش لەرێگەی ئۆتۆمبیلی بەمینرێژكراو تۆماركران. لەهەوڵێكیش بۆ رێگرتن لەگێژاوی توندوتیژی، قەدەغەكردنی هاتووچۆكردن لەكەركووك راگەیەنراو لەمیانەی پرۆسەیەكی ئەمنی فراوانیشدا بەناوی (كلیلی ئاسایش) كە تیایدا لە(١٤) هەزار سەربازی عێراقی بەشداربوون پشتێنێكی ئەمنی بەدەوری شارەكەدا دروستكراو لەلایەن هێزەكانی پۆلیسیشەوە لەناوكەركووكدا دەستكرا بە پشكنین.

لەبەشی باشووری شارەكەش خەندەق لێدرا تاكۆنترۆڵی چونە ناوەوەو هاتنە دەرەوەی شار بكرێت. ئەنجامی ئەو پرۆسەیەش دەستگیركردنی(١٥٠) چەكدارودەست بەسەرداگرتنی برێكی زۆر لەچەكی لێكەوتەوە بەڵام كاریگەری گشتی لەسەر ئاستی توندوتیژیەكان دیاریكراو نەبوو.

ئەوەبوو تەنیا هەفتەیەك بەسەر پرۆسەكەدا گوزەری نەكرد(٧) ئۆتۆمبیلی بۆمرێژكراو لەیەك رۆژدا تەقێنرانەو ئەوەش كوژرانی(١٤) كەس و برینداربوونی (٧٢)ی تری لێكەوتەوە.

---

1-National Public Radio . 2006 . " Unrest Worsens in Iraq ." 2 February ( LN ).

2 - KDP Satellite TV ( BBC Monitoring International Reports ).2006. " Iraqi Kurdish TV : Car Bomb Kills More than 100 in Kirkuk . " 23 July ( LN ).

PDF 4 KURD

بەپێی داتاکانی سوپای ئەمریکا تاکۆتایی تشرینی یەکەم شاری کەرکووك رووبەڕووی(٢٠) تەقینەوەی خۆکوژی بوەتەوەو لەمانگی ئابیشەوە(٦٣) تەقینەوەی بۆمبی چێنراوی لەسەر رێگەکان بەخۆوە دیوە١.

بەر لەراپرسی لەسەر ماددەی ١٤٠، زۆربەی سەرچاوەکانی راگەیاندنی خۆرئاوا هەڵکشانی کارە توندوتیژیەکانی کەرکووکیان گرێ دەدا بە"پەنگخواردنەوەی ئیتنیکی لەرادەبەدەر". بەدڵنیاییشەوە پەنگخواردنەوە هەبوو لەنێوان پێکهاتە ئیتنیکیە جیاوازەکانی کەرکووك کە هۆکارەکەشی ئەو راپرسییە بوو کە پێشنیازکراو. هەروەك ئەفسەرێکی سوپای ئەمریکا ئاماژەی پێدابوو چەکدارەکان لێوەشاوە بوون لەبەکارهێنانی تەکنیکە تیرۆریستیەکانیان، ئەوە جگە لەهەڵمەتەکانی پروپاگەندەو راگەیاندنیان لەپێناو هێشتنەوەی نیگەرانییەکان... و تاوسەندنی پەنگخواردنەوەی ئیتنیکی، بەڵام زۆربەی کارە توندوتیژیەکان رق و کینەی نەژادی بەدواوە نەبوو٢. زۆربەی ئەو تەقینەوانەکە ئەوەدەم لەکەرکووکدا روویان دەدا دەخرانە ئەستۆی گروپە چەکداریەکانی وەك "ئەنسارولسوننە، کەتیبەکانی شۆڕشی بیست" کە زۆربەی ئامانجەکانیشیان هێزە ئەمنیەکانی شارەکە بوو نەك گروپێکی دیاریکراوی ئیتنیکی٣. بەڵام زۆربەی پێکراوەکانی ئەو پەلامارانە سەر بەهێزە کوردیەکان بوون و هێرشبەرەکانیش زۆربەیان عەرەبی سوننە بوونو لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە واتای ئەوەی نەدەگەیاند کە ململانێی ئیتنیکی لەئارادایە هێندەی گوزراشتبوو لەراستیەکی سادە کە ئەوەیش ئەوەیە کورد زۆرینەی هێزە ئەمنیەکان پێکدەهێنێت.

---

1 - Howard, M . 2006." Iraq: As Violence Grows ,Oil- Rich Kirkuk Could Hold Key to Iraq's Future :Tribal Chiefs Call for Return of Saddam while Kurds Eye New Federal State ." The Guardian , 27 October:21.

2 - United Press International . 2006. " Iraq urged to lessen Kirkuk ethnic tension ." 21 April.

٣ - زۆربەی ئەو تەقینەوانەی زۆرترین قوربانی مەدەنی لێدەکەتەوە لەدژی هێزە ئەمنیەکان و رەمزەکانی دەسەڵاتی سیاسی بوون.

PDF 4 KURD

خشتەی ٩- ٤

ڕێژەی کوژراوانی پۆلیس لەتێکڕای ژمارەی کوژراوانی (٩)پارێزگای عێـراق کـە تونـدترین توندوتیژی بەخۆوە دیوە(ئایاری ٢٠٠٣- تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦)١

| ڕێــــــــژەی پۆلیســـــــــە کوژراوەکان لەکۆی گشتی % | کۆی گشتی | کــــــــوژراوانی مەدەنی | کوژراوانی پۆلیس | پارێزگا |
|---|---|---|---|---|
| ١٨ | ٢٢٧٠ | ١٨٦١ | ٤٠٩ | دیالە |
| ١٦ | ١١٩٢ | ١٠٠٥ | ١٨٧ | کەرکووک |
| ١٤ | ١٦٩١ | ١٤٥٢ | ٢٣٩ | سەلاحەدین |
| ٩ | ٢٧٤٩ | ٢٥١٤ | ٢٣٥ | ئەنبار |
| ٨ | ١٨٩٩ | ١٧٣٩ | ١٦٠ | بابل |
| ٧ | ١٨٣١ | ١٥٧٢ | ٢٥٩ | نەینەوا |
| ٣ | ١٠٦٢ | ١٠٣١ | ٣١ | کەربەلا |
| ٣ | ١٨٣١ | ١٧٦٨ | ٦٣ | بەسرە |
| ٣ | ٢٨٨٦٩ | ٢٨١٥٤ | ٧١٥ | بەغداد |

سەرچـاوە: Iraq Index:Tracking variable of Reconstruction&Security in Post-Saddam Iraq.The Brokking Institution, October 29,2006,p.22

www.brookings.edu/saban/media/Files/centers/Iraq%20Index/index2001029pdپە

یانگەی برۆکنز Brokking Institution لەنێو پەراوێزەکانیدا سوودی لەمانەش وەرگرتووە:

"Iraq Body Count: War Dead Figures",BBC News ,October 23,2006

١ - کۆی ژمارەی کوژراوەکان زۆر کەمترە لە زۆربەی خەمڵاندنەکان چونکە داتاکان لەرێکخراوی بۆدی کاونـت(Body Count) ەوە وەرگیران کەهەرحاڵەتێکی مرد لەسەرچاوە ئیعلامییە سەربەخۆکانەوە تەئکید دەکەنەوە.

هەروەك لەخشتەكەدا هێمای پێكراوە كەركووك بەبەراورد بە پارێزگاكانی تری عێراق جگە لەدیالە نەبێت بەرزترین رێژەی لەكۆی گشتی كوژراوان تۆماركردووە، كە ئەوەش رێژەیەكی بەرزی كوژراوانی پۆلیسەو بێگومانیش كەركووك جێگەیەكی مەترسیداربوو بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا بەگشتی لەكاری توندوتیژی تایەفی بەرچاو بەدوور بوو هەروەك ئەوەی لەدوای چەند مانگێك لەتەقاندنەوەی سەربازگەیەك بەغداد روویدا.

رۆژنامەی گاردیان Guardian ی بەریتانی بارودۆخی كەركووك بەم جۆرە پوختەدەكاتەوە" لە كەركووك.... جگە لە یاخیبوونی چەكداری شەڕی ئیتنیكی سەریهەلّنەداوە"١. ئەوەی سەیر بوو بەلای زۆرێك لەچاودێران دوورە پەرێزی كەركووك بوو لەو گرژی ئیتنیكی- تایەفیەی شارە فرە ئیتنیكەكانی تری گرتبووەوە.

بەوجۆرە لەنیسانی ٢٠٠٣دا پەنگخواردنەوەی تایەفی نێوان پێكهاتە ئیتنیكیەكان خۆی لەگوتارەكاندا دەبینییەوە وەك لەوەی خۆی لەتوندوتیژی جەستەییدا ببینێتەوە.

هەلّبەت سەرە رمی شەڕی زارەكی لەلایەن سەرانی سیاسی توركمانەوە پەنای بۆدەبرا، لە ئازاری ٢٠٠٦دا نووسینگەی بەرەی توركمانی لەئەنقەرە بەیاننامەیەكی دەركردو تیایدا داوا لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەكات " چارەسەرێك بدۆزێتەوە و كۆتایی بە كاری ئابڕووبەرانەی لایەنی كوردی بهێنێت كە دەرهەق بە توركمان دەیكات"٢. لەكانوونی دووەمی ٢٠٠٧دا گەورە سەركردەیەكی توركمانی پێشبینیكرد كوشتارگەیەكی چاوەڕوانكراو لەدژی توركمان ئەنجام بدرێت لەلایەن زیاتر لە (١٠٠) هەزار پێشمەرگەوە، كە ئەوەش بەشێك بوون لەو (٤٠٠) هەزار پێشمەرگەیەی لەناوشاری كەركووكدا بلاّوكرابوونەوە، كە ئەو قەبارەیەش باوەڕپێكردنی ئاستەم بوو٣. لەتەمووزدا سەركردەیەكی بەرچاوی توركمان پارتە كوردیەكانی بەئاشكرا تۆمەتبار كرد بەوەی لەتەقینەوە خۆكوژیەكانی قەزای دوزخورماتودا تێوەگلاون كە

---

1 -Steele, J. 2006. " Comment & Debate : Iraq is already Enduring Two Wars . Could it Survive a Third ?: The Competing Claims of Arabs , Turkmens and Kurds in the Oil –rich Iraqi North are an Explosion Waiting to Happen ." The Guardian , 1 December :39.

2 - Turkish Daily News . 2006 "Iraqi Turkmen Complain of Kurdish Attacks ."14 March.

3 - Anatolia .2007. "Turkmen Official Warns Against Massacre in Iraq's Kirkuk . "8 January (LN).

تیایدا تورکمـان کراونەتـە ئامـانج و چـەندان قوربـانی لێکەوتوەتـەوە١. هاوکـات بـەپێی خەمڵاندنەکانی بەرەی تورکمانی ژمارەی کوردە هاوردەکان بۆ کەرکوك لەو پەڕیدایە بەجۆرێك بەر لەهەڵبژاردنـەکانی کـانوونی یەکـەم ژمارەکـە بـە(٣٠٠) هـەزار و لەسـاڵی ٢٠٠٧یشـدا بە(٦٠٠) هەزارو دواتریش ئەو ژمارەیە گەیشـتوەتە (٦٥٠) هـەزار کـەس کـە تـازە ناویـان تۆمارکراوە٢.

بێگومان ئەو ژمارانە زۆر بەئاشکرا ژمارەیەکی خەیاڵین بەڵام ئامانجی خۆیان پێکا چـونکە کورد لەنەبوونی سەرژمێری دانیشتواندا نەیدەتوانی لەو ژمارانە دڵنیا بن.

زۆرکات سەرانی کـوردیش لەلایـەن خۆیانـەوە لـەگوتاری گاڵـدانئامێز دوور دەکەوتنـەوە، هەروەها لەو دەمەدا کورد لەبەرامبەر جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠)یشدا هۆکاری خۆی هەبوو لە هێورکردنەوەی پەنگخواردنەوەی ئیتنیکی و نەژادی نەك تاودانی.

هاوکات سەرانی کورد چەند کارێکی ئیستفزازییان کرد کە ناکرێت نکۆڵییـان لێبکرێـت و لەهەمان کاتیشدا کاردانەی پێچەوانەیان هەبوو لەسەر ئامانجی گشتی کـورد ئـەوەبوو لـە ١ی ئەیلولی ٢٠٠٦دا مەسعود بارزانی بڕیـاری قەدەغـەکردنی بەرزکردنـەوەی ئـاڵای عێراقـی دا لەهەرێمی کوردستان کە ئەو کارەش چووە خانەی ئیستفزازکردنەوە.

لەگەڵ ئەوەی ئە بڕیارەی بارزانی پاساوی خۆی هەبوو بـەڵام ئـەو هـەنگاوە مشـتومڕێکی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا، ئەوە جگە لەوەی بـووە بەهانەیـەك بـۆ ئەوانـەی کـە دەیانـەوێت ئاستەنگ لەبـەردەم هەوڵـەکانی کـورد لەسـەر پرسـەکەیان دروسـت بکـەن٣. سـەبارەت بـە پروپاگەندە سەیرەکانی نەیانی کوردیش لەمەڕ ئەوەی پارتە کوردیەکان سـەرقاڵی گواسـتنەوەی کوردن لەشارۆچکەکانی دەوروبەرەوە بەرەو کەرکوك تا ژمارەی کورد بەر لە راپرسییەکە زیـاد بکەن بەڵگەی ئەوە لەبەردەستدا نەبوو ئەو پروپاگەندانە بسەلمێنێت.

---

1 - Anatolia .2007 . "Turkmen Group in Turkey Hold Kurds Responsible for Tz Khurmatu Blast ." 9July (WNC ).

2 - Anatolia .2007 ." Iraqi Turkmen Leader Warns Kirkuk is æa Powder Keg' . " 10 January ( LN ).

٣- ئەو خاڵە ماقوڵەی کە بارزانی وروژاندی خۆی لەئالای عێراقیدا دەبینیەوە کە ئاڵای بەعسیەکان بوو کە ئەوەش بۆ کورد بەواتای ئەو نەهامەتیەی کە دووچاری بوەتەوە. بەڵام ئەو هەڵوێسـتەی بـارزانی دەرفـەتێك بـوو بـۆ ئەوانـەی دەیـانگوت کـورد کـەرکوك و نەوتەکەی دەوێت تا زامنی توانای دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی بکات لەمانەوەدا

هاوكات لەراپۆرتە باوەڕپێكراوەكانیشدا هاتبوو كە هەردو پارتە كوردیەكە گوشارێكی زۆریان

خستوەتە سەر كوردە راگوازراوەكان تا بۆ سەرماڵ و حاڵی خۆیان لەكەركوك بگەڕێنەوەن كەهەندێك جاریش دژ بەویستیان بوو١.

هەروەها بەردەوام ترس لەوتەكنیكانە هەبوو كە دەزگا ئەمنییە كوردیەكان بۆ بەرەنگاریبوونەوەی گروپە چەكداریەكان پەنایان بۆ دەبرد و دەكەوتنە خانەی پێشێلكردنی مافەكانی مرۆڤەوە٢.

## چەقبەستن لەئەنجوومەنی پارێزگاكەدا

لەسەر ئاستی سیاسی پەیوەندی نێوان لایەنەكانی نێو ئەنجوومەنی پارێزگا پەیوەندیەكی كرچ وكاڵبوو. لەناوەڕاستی نیساندا ئاژانسی فرانس پرێس وێنەیەكی نیمچە جوانی لەسەر "حكومەتی خۆجێی كەركوك كە دەزانن پێكەوە كاربكەن" پێشكەشكرد.

هەروەك لەسەر زاری (تەحسین كەهیە) ئەندامی ئەنجوومەنكە بلاَویكردەوە: ئێمە وەك ئەنجوومەن بەردەوام دەبین لەسەر كاركردن و ئەوەی لەدەستمان بێت دەیكەین بۆ درێژەدان بەدیدارو مامەڵەكردن لەگەڵ یەكتری و هەوڵدان بۆ چارەسەركردنی كێشەكانمان٣.

تەنانەت رائید ڤیكتۆر ڤاسكویز - Major Victor Vasquez لەسوپای ئەمریكا زۆر گەشبینانە وتی: كاتێك گەیشتمە كەركوك پێویستی بەوە نەدەكرد ئەو خەڵكە هانبدرێت بۆ ئەوەی رێكبكەون لەسەر شینێتی ئاسمان... ئەوان ئێستا دەتوانن بەكۆدەنگی لەسەر پرۆژەو كارە گرنگەكان رێكبكەون٤.

بەلاَم چاودێرانی تر بەشێوەیەكی كەمتر سەرسوڕمانی خۆیان پیشاندا لەئاستی هاوكاری نێوان پێكهاتە ئیتنیكیەكانی ئەنجوومەنكە هەروەك گروپی تەنگژەی نێو دەوڵەتی( The Internation Crisis) كە باسی لە "رێگەی داخراو" كرد لەكاری ئەنجوومەنی پارێزگای

---

١- بۆنموونە بڕوانە: " Farrel ;, S. 2007. " As Iraqis Vie for Kirkuk 's Oil ,Kurds Are Pawns ." The New York Times , 9 December.

٢- بڕوانە رێكخراوی چاودێری مافەكانی مرۆڤ Human Rights Watch ,Reaping the Whirlwind ,op cit.

3 - A fence France Press ." Northern Iraq City's Fragile Ethnic Mix Persevers ." 17 April.

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو.



PDF 4 KURD

کەرکووک و هێمای بەوەدا ئەندامانی تورکمـان و عـەرەب کـە لەهـەمان کاتـدا لـەبڕیارەکانی ئەنجوومەنەکەدا بەشدارن لەکاتی دەنگداندا ئامادە نابن بۆ ئەوەی نەگەنە هیچ ئەنجامێك١.

لەسەرەتای ئایاری ساڵی( ٢٠٠٦ ) و بەدواوە هەڵوێستی ئەندامانی عەرەب و تورکمـان زۆر روون نـەبوو، بۆنموونـە لـەئایاردا راپۆرتـەکان باسـیان لـەوە دەکردکـە گروپێکـی هاوپـەیمان لەئەنـدامانی عـەرەب کارەکانیـان لـەنێو ئەنجوومەنەکـەدا هەڵپەسـاردووە ئـەویش بـەهۆی "هەڵکوتانی بەردەوام بۆ سەر ماڵی شـێخە ناسـراوەکانی عەشـیرەتی ئەلعوبێـد و تۆقانـدنی خێزانەکانیان لەوشارەدا٢.

پێدەچوو ئەو هەڕەشەیە سوودی نەبێت چونکە کوتلەی عەرەبی ناڕازی بوون لەسـەر ئـەوەی ئەندامانی کورد لەئەنجوومەنەکەدا باڵادەستن، باڵادەستیەکی ناعادیلانە٣. لـە ١٠ی تشـرینی یەکەمی ٢٠٠٦ دا بایکۆتی کۆبوونـەوەی ئەنجوومەنەکـەیان کـرد وەك کاردانەوەیـەك لەسـەر نەبوونی ئەنـدامانی دادپـەروەر لەلیژنـەی مـاددەی ١٤٠دا٤. بـەڵام وەك لێپرسـراوانی کـورد ئاماژەیـان پێـدابوو بـایکۆتکردنی ئەنـدامانی عـەرەب و تورکمـان لەدڵسـۆزییانەوە نـەبووە، بۆنموونە رزگار عەلی سەرۆکی ئەنجوومەنەکە رایگەیاند: لەکۆبوونەوەی هەفتانەدا بەشدار نـابن بەڵام موچە وەردەگرن و خاوەنی ئیمیتازاتن و هەنـدێکیش لـەو ئەندامانـە شـەڕەکانیان تـەنیا لەپێناو دەستکەتدایە، هەندێکی تریشیان بەشداری لیژنەکان دەبن بەڵام بەشداری کۆبوونەوەی هەفتانە نابن تا ئاشکرا نەبێت کە جەنابی لەکۆبوونەوەی ئەنجوومەنی پارێزگادا بەشدارە٥.

---

١- گروپی قەیرانە نێو دەوڵەتیەکان: International Crisis Group .2006. " Iraq and the Kurds : The Brewing battle over Kirkuk." Op cit: 9.

2 - Al-Hayat ( BBC Monitoring International Reports ).2006 . " Al-Ubayd Tribe Threatens to Boycott Iraq Political Process ." 25 October ( LN).

3 - Associater Press World stream . 2996. " Arab ,Turkmen Members Boycott Meetings of Kirkuk Provincial Council ."16 November .

4 - Hawlati ( BBC Monitoring International Reports ). 2007. úIraqi Turkmen Official Accuses Kurds of Trying to Control multi-Ethnic Kirkuk . " 15 February (LN ).

ئەو لیژنەیەی لەئابی ٢٠٠٦دا دروسترا لەسەرەتادا دوو ئەندامی تورکمانی لەخۆگرتبووکەهیچ کامیان نوێنەرایەتی بەرەی تورکمانیان نەدەکرد.

٥- ئەنسـاتی رادیـۆی بـەریتانیاBBC. ( BBC Monitoring International Reports ) . 2007. "Iraqi Kurdish Paper Interviews Kirkuk Governorate Council Chairman ." 30 October ( LN ).



PDF 4 KURD

بایكۆتكردنی هەردو كوتلەی عەرەبی و توركمانی لەكارەكانی ئەنجوومەنەكەدا رەنگدانەوەی بەیەككگەیشتنی ستراتیژییان بوو چونكە هەردولا بەتوندی دژی جێبەجێكردنی مـادەی ١٤٠ و هەژموونی كورد بوون لە پێگەكانی دەسەڵات لەو پارێزگایەدا.

سەرباری ئەو ستمە هاوبەشە زۆرخاڵی تر هەبوو هەردوكوتلەكە لەسەری ناكۆك بـوون، بۆنموونـە هەردولا رێك نەدەكەوتن لەسەر ئـەوەی كامیـان پۆسـتی جێگـری پارێزگاربگرنـە دەسـت هـەروەك بەرپرسێكی ئەمریكاییش بەزمانێكی باوكانە وتی: وەك ئەوە وایە پارچـە شـیرینییەكت بەدەسـتەوە بێت و نەتوانیت دابەشی بكەیت بۆیە دەیدەیتە هەردو منداڵەكەت تابۆخۆیان بڕیاری لەسەر بدەن١.

ناكۆكی لەسەر دابەشكردنی دەستكەوتە ئیداریەكان لەرایی كردنی كاروباری رۆژانـەی كـەركووك كاریگەری ئەوتۆی نەبوو چونكە ئەنجوومەنی پارێزگاكە وەك ئەوەبوو بێدەسەلات بێت لەبڕیاردانداد.

لـەدوای بڕیـاردانیش لەسـەر دەسـتوور، كـەركووك لـەرووی تەكنیكییـەوە بـوو یـەكێك لـە پارێزگاكانی دەرەوەی هەرێمەكان بەڵام بوونی دەسـەڵات لـەلای ئـەو جـۆرە قەوارانـە لەچـاوەڕوانی یاسایەكدا بوو.

ماددەی (١٢١) برگەی(٥) لەدەستوور حكومەتی هەرێمەكانی سەرپشك كرد لەرێكخستنی هێزی ئاسایشی ناوخۆدا بەڵام ئەو مافەی نەبەخشییە پارێزگاكان. لەبەرئـەوە هێـزی پۆلیسـی كەركووك لەڕووی تەكنیكییەوە لەژێركۆنترۆڵی بەغدادا بوو.

هەروەها وەزارەتی ناوخۆی عێراقیش بەردەوام بوو لەسـەر سیسـتمی موحاسەسـەی نێـوان پێكهاتە ئیتنیكیەكان لـەهێزی پۆلیسـدا و دەسـەڵاتی دوورخسـتنەوەی فەرمانـدەی پۆلیسـی كەركووكیشی لەدەستی خۆیدا هێشتەوە٢.

لەئـەیلوولی ٢٠٠٦ دا هێزەكـانی ئـەمریكا بەرپرسـیارێتی ئـەمنییان لـە ناوچـەكانی دەرەوەی كەركووك رادەستی هێزە عێراقییەكان كردەوە١، ئەو هێزانەش كە ژمارەیەكی بەرچـاو لەپێشـمەرگەی لەخۆگرتبوو بەڵام لەڕووی تەكنیكییەوە لەلایەن وەزارەتی بەرگری لەبەغدادەوە بەرێوەدەبرا.

---

1 –Agence France Press . 2006 . " Northern Iraq City's Fragile ethnic Mix Perseveres ." 17 April.

٢ – وەزارەتـی نـاوخۆ لەمارسـی ٢٠٠٦دا مومارەسـەی ئـەو دەسـەلاتەی كـرد كاتێـك فـەرمانێكی دەركـرد سـەبارەت بـە خانەنشینكردنی لیوا "شێركۆ شاكر عەلی" فەرماندەی پۆلیس. بڕوانە" الفرات" ٢٠٠٦. وەزارەتی ناوخۆ فەرمانـدەی پـۆلیس دوور دەختەوە،٨ماس(WCN).



PDF 4 KURD

هەرچی دۆسیەی ئەمنی ناو شاری کەرکووکیشە لەڕووی ئەمنییەوە دەسەڵاتێکی ڕاستەقینەی لەدەستدا نەبوو.

بەهەمان شێوە حکومەتی عێراقی دەسەڵاتی دامەزراندنی لەچەند سەنتەرێکی هەستیارو کۆنترۆڵکردنی قەبارەی بودجەی پارێزگاکەی لەدەستی خۆیدا هێشتەوە، هەرچەندە پارەی تەرخانکراو بۆ ئەو بودجەیە بڕێکی کەم و بەشێوەی قیست دەگەیشت و هەروەها دواش دەکەوت۲.

لەبەرامبەر بێبەشکردنی حکومەتی کەرکوك لە پێدانی دارایی لەلایەن حکومەتی ناوەندەوەو نەبوونی سەرچاوەیەکی سەربەخۆی داهات، حکومەتی خۆجێی نەیتوانی هیچ جۆرە پێشکەوتنێك بەدەستبهێنێت لەسەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی ژێرخانی خراپی شارەکەدا.

زۆربەی پرۆژە گەورەکانی ئاوەدانکردنەوەی ژێرخانی شارەکە لەرێگەی یارمەتی دارایی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە ( لەرێگەی پرۆگرامەکانی ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکان) یاخود بەکۆمەك و سەرپەرشتی هەردو پارتە کوردییەکە ئەنجام دەدران۳. دواجار لەهەردو بارەکەشدا حکومەتی خۆجێی رۆڵێکی ئەوتۆی نەبوو کە جێگەی هێما بۆکردن بێت.

زیادەرۆیی هەردو پارتەکە لەنێو دامەزراوەکانی حوکمڕانی کەرکوك و دەستێوەردانی ڕاستەوخۆیان لەرایی کردنی کاروبارەکانی گرفتێکی سەرەکی بوو لەلاوازکردنی دەسەڵاتی بەرپرسە هەڵبژێردراوەکان.

لەئاماژە دانێکیش بەهەوڵی هەردو پارتەکە لەیارمەتیدان بۆ ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکە، پارێزگای کەرکووك سوپاسگوزاری و لەهەمان کاتیشدا نائومێدبوونی خۆی پیشاندا" هەردو پارت هەوڵیانداوە زۆربەی گوندەکان ئاوەدان بکەنەوەو رێگا و بانەکان قیرتاو بکەن و کوچەو کۆڵانەکانی کەرکووکیش کۆنکرێت بکەن، ئەمە جگە لەوەی پشتیوانی لەوەرزش و خوێندن و زانکۆکان دەکەن

---

1 - Defence Department Documents and Publications. 2006 . Iraqi Army Takes the Lead in Kirkuk Provence ." 1 September ( LN).

۲– بۆ ساڵی ۲۰۰٦بودجەی پارێزگا هەرهەمووی کەمێك لە ۸۱ملیۆن دۆلار زیاتر بوو بەڵام لەحوزەیراندا تەنیا لە۱۰٪ی درا.بڕوانە:

Govari Gulan . 2006. " Iraq: Kirkuk Official Criticizes Central Government Inaction ." 20 March ( WNC).

۳– لەساڵی ۲۰۰٦ کۆمەڵێك پرۆژە بەسەرۆکایەتی تیمی سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکان دەستیپێکرد لەوانەش نۆژەن کردنەوەی وێستگەی شەمەندەفەری کەرکوك و دەستکردن بە دروستکردنی ریسایکلین بۆ لەخۆگرتنی خۆڵ و خاشاك.

بەڵام خۆ ئەگەر ئەو کارانە لەرێگەی خۆمانەوە بکرانایە ئەوا باشتر دەبوون چونکە ئێمە کێشەی هاوڵاتیانی خۆمان دەزانین و هەروەها خواست و داواکاریەکانی خۆشیان دەخستە بەردەممان١.

هەندێك لەماس میدیا کوردیەکان کەمتر موجامەلەیان دەکرد بۆ نموونە رۆژنامەی" رێگای کوردستان" زمانحاڵی حزبی شیوعی کوردستانی، (پ.د.ك)و(ی.ن.ك) ی تۆمەتبار دەکرد بەوەی لە پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی کەرکووکدا جێدەستی ئەوانی پێوەدیارە بەڵام ئەوکەسانەی کە کۆمەکی دارایی وەردەگرن لەلایەن ئەو دوو پارتەوە مەرجی ئینتیمابوونی حزبیان بۆدانراوە.

بەپرسانی ئەمریکایی بەبێ سەرکەوتنێکی بەرچاو لەهەوڵدابوون بۆ سنووردارکردنی نفوزی حزبە سیاسیەکان بەتایبەتیش هەردو پارتە کوردییەکە لەژیانی سیاسی کەرکووکدا.

بۆنموونە لە تەموزی ٢٠٠٦دا کۆنسوڵگەی ئەمریکا لە کەرکووك هەموو هەوڵی خۆی بەگەڕخست بۆ دروستکردنی بەرەیەکی ئۆپۆزسیۆن کە ژمارەیەك پارتی کوردیشی لەخۆگرتبوو بۆ دژایەتیکردنی هەژموونی (پ.د.ك) و(ی.ن.ك) ٢، بەڵام وەك ئەوەی لێیچاوەڕوان دەکرا ئە هەوڵە بێئاکام بوو.

هەروەها هەوڵەکانی سوپای ئەمریکاش بۆ دوورخستنەوەی نفوزی حزبی لە نێو هێزی پۆلیسدا هەولێکی نەزۆك بوو٣.

راستیەکی ئاشکرا لەئارادابوو ئەویش ئەوەبوو کە زۆربەی کۆمەکە داراییەکان کەڕوویان لەکەرکووك دەکرد لە (پ.د.ك) و(ی.ن.ك) ەوە سەرچاوەیان گرتبوو. دیسان زۆربەی کارمەندانی هێزە ئەمنیەکان و بەرپرسانی ئیداری شارەکەش کورد بوون و جگە لەپارێزگاش سەرجەمیان سەر بەو دوو پارتە بوون.

---

1- Kurdistani Nuwe . 2006. " Iraq :Kirkuk Governor's Complaints Against Baghdad Regarding Article 140, "21 June (WNC).

٢ – گرفتەکە لەوەدا بوو کە هەرچوار پارتی پەیوەندیدار (بزوتنەوەی دیموکراسی میللی و پارتی رزگاری کوردستان و پارتی چارەسەری دیموکراسی کوردستان و بزوتنەوەی دیموکراسیخوازان) خاوەنی سەرچاوەی دارایی نەبوون و بنکەی جەماوەری ئەوتۆشیان نەبوو تا ئۆپۆزسیۆنێکی باوەڕپێکراو لەدژی هەردو پارتە فەراهەم بکەن.

٣- عەقید مایکڵ براودەر (Colonel Michael Browder)ئەفسەری ئەمریکایی و بەرپرس لە سەرلەنوێ رێکخستنەوەی هێزی پۆلیس داوای گەرەنتی نوسراوی لە(ی.ن.ك وپ.د.ك) کرد کەدەست لەکاروباری پۆلیس وەرنەدەن. هاوکات دەنگۆی ئەوەهەبوو کە(ی.ن.ك) ئامادەیە ئیمزا بکات بەڵام(پ.د.ك) مەرجی ئەوەی دانا کە دەبێت حزبە عەرەبییەکانیس ئەو بەڵێننامەیە ئیمزا بکەن.

کۆتایی هێنان بەنفوزی هەردو پارتە یان سنووردارکردنیان نەك هــەر ئاســان نــەبوو بــەڵکو دەکرا کاردانەی پێچەوانەشی هەبێت چونکە هەردو پارتەکە بەپراکتیکی بۆخۆیان دامــەزراوەی تۆکمەو بڕیاردەربوون لەکەرکووکدا.

لیژنەی ماددەی ١٤٠

لەهەمبەر پشتیوانیکردن لەحکومەتەکەی مالکی، هەردو پارتــە کوردییەکــە بەنووســراو گەرەنتی تەواوی جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠) یان بەدەستهێنا.

بەپێچەوانەی جەعفەری مالکی راشکاوانە پابەند بوو بەو بەڵێنە و ئــەوەش لــەو وتارەیــدا رەنگیدایەوە کە لەئابی ٢٠٠٦دا پێشکەشکردو تیایدا بەرنامــەی حکومــەتی نــوێی یــەکێتی نیشتمانی ئاشکراکرد. بەپێی برگەی (٢٢)ی ئەو بەرنامەیــەی حکومــەت کــە لــە(٣٤) خــاڵ پێکهاتووە" تەئکید لەسەر جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠)ی دەستوور کراوەتەوەو وادەش بــۆ تەواوکردنی هەرقۆناغێك لەسێ قۆناغەکە دیاریکراوە".

بریــاریش بــوو قۆنــاغی ئاساییکردنەوە(بەسروشــتیکردنەوە) کــە گەڕاندنــەوەی شــارو شارۆچکەکانی بۆ سەر کەرکووك کە بەشێکبوون لەو پارێزگایــە لــەخۆگرتبوو، بــەهاتنی ٢٩ی ئازاری ٢٠٠٧ تەواو بێت و لە ٣١ی تەموزیشدا سەرژمێری دانیشتوان بکرێــت و دوا بــەدوای ئەوەش لە ١٥ی تشــرینی دووەمــدا راپرســی ســازبکرێت. لەحوزەیرانیشــدا مــالکی یەکــەمین هەنگاوی پراکتیکی نا بەرەو پێکهێنانی لیژنــەی جێبــەجێکردنی مــاددەی(١٤٠)[1]. هاوکــات مشتومڕ لەسەر کۆی رووەکانی لیژنەکە کرا کــە بــەرەسمی بەلیژنــەی جێبــەجێکردنی مــاددەی ١٤٠ی دەستوور دەناسرێت. لەسەرەتادا ئەندامێتی لیژنەی ماددەی(١٤٠) بەم جۆرە بوو:

---

١ – دواتر لیژنەیەك بۆ سەرپەرشتی کردنی کاری لیژنەی ماددەی ١٤٠ لەبەغدادو هەولێر پێکهێنرا.

PDF 4 KURD

خشتەی ٩- ٥

ئەندامێتی لیژنەی ماددەی(١٤٠) لەسەرەتای پێکهێنانیەوە

| تێبینییەکان | نەتەوە/ تایەفە | ئینتیمای سیاسی | پۆست | ناو |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| لەئازاری (٢٠٠٧) وازیهێنا | عەرەبی- سوننە | پارتی نیشتمانیی دیموکراسی/ لیستی نیشتمانیی عێراقییە | وەزیری داد لەحکومەتی عێراقی | هاشم شبلی (سەرۆکی لیژنە) |
|  | عەرەبی- سوننە | سەربەخۆ/ ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی | وەزیری ناوخۆ لەحکومەتی عێراقی | جەواد بولانی |
|  | کوردی | (ی.ن.ك)/ هاوپەیمانیی کوردستانی | وەزیری ژینگە لەحکومەتی عێراقی | نەرمین عوسمان |
|  | کوردی | (پ.د.ك) | وەزیری کاروباری ناوچەکانی دەرەوەی هەرێم/ حکومەتی هەرێم | محەمەد ئیحسان |
|  | کوردی | (ی.ن.ك) لیستی برایەتی کەرکوك | ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای دهۆك | بابەکر سدیق کاکە رەش |
| لەنیسانی (٢٠٠٧) دەست لەکارکێشانەوەکەی لەلایەن سەرۆك وەزیر رەتکرایەوە(١) | تورکمانی- شیعە | یەکێتی ئیسلامی تورکمانی | ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك | تەحسین کەهیە |
| لەتشرینی دووەمی ٢٠٠٦ دەستیکێشایەوە | تورکمانی- شیعە | یەکێتی ئیسلامی تورکمانی / ئیئتلافی یەکگرتووی عێراقی | وەزیری وەرزش و لاوان لەحکومەتی عێراقی | جاسم محەمەد جەعفەر |
| لەشوباتی ٢٠٠٧ دەستی کێشایەوە و لە نیسانی ٢٠٠٧ لەو هەنگاوەی پەشیمانبوەوە | عەرەبی- سوننە | گردبوونەوەی کۆماریی عێراق | ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك | محەمەدخەلیل جبوری |
|  | کلدو- ئاشووری | بزوتنەوەی دیموکراسی ئاشووری | ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك | ئاشور یەلدا |

١ - دیدارێکی نووسەر لەگەڵ ( تەحسین کەهیە)،برۆکسل،٢٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٨.

وادیاره پێکهاتەی لیژنەکە لەڕووی ئیتنیکییەوە بۆ ئەو ئەرکە گونجاو بێت کە سێ عــەرەب و سێ کوردو دوو تورکمان و یەك مەسیحی کارەکان جێبەجێ دەکــەن و ئــەوەش ڕەنگدانــەوەی وردو سیمای دیموگرافیای کەرکوکە. بەڵام دیسان دوو کەلێن لەئارادان، یەکەمیان نائامادەیی عەرەبی شیعەی دانیشتوانی کــەرکوك و دووەمیشــیان نــەبوونی تورکمــانی ســوننەیە یــاخود بەواتایەکی وردتر نوێنەری بەرەی تورکمانی.

بێگومان ئەو نائامادەییەش هەڕەمەکی نەبووە، چونکە کورد ئەوەیان سەپاندو پێیان وابوو بوونی نوێنەری بەرەی تورکمانی دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم جێبەجێکردنی خێرای ماددەکەدا.

ئەوەش بۆخۆی گرنگیەکی تایبەتی هەبوو چونکە دەبــوو بڕیارەکــانی لیژنەکــە بــەکۆدەنگی بێت و نەبوونی نوێنەری بەرەی تورکمانیش لەو لیژنەیەدا مانگرتنی (٩) ئەندامە تورکمانەکەی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووکی بەدواوە بوو.

لای خۆشیەوە (عەلی مەهدی) ئەندامی ئەنجوومەنەکە رایگەیاند: هاوسەنگی لەپێکهێنانی لیژنەکەدا نییە و نوێنەری تورکمانیش لەلیژنەکەدا لەلایەن پارت و بزوتنەوە تورکمانیەوەکانەوە هەڵنەبژێردراوە١. تەنانەت ماس میدیا کوردییەکانیش نیشانەی پرسیاریان لەســەر حیکمــەتی دوورخستنەوەی بەرەی تورکمانی لەبەشداریکردنیان لەلیژنەکەدا دانا.

بۆ نموونە رۆژنامەی(ئاسۆ) کە توندڕەوی بەرەی تورکمانی رەتدەکاتەوە دەڵێت "ئێمە هێشتا دەزانین یەکلایی کردنەوەی ململانێکان بەبێ بوونی بەرە بەشێوەیەکی سروشتی بەدینایەت بۆیە گەرەکمان نییە بەرەی تورکمانی پشت گوێ بخرێت و ئیستفزاز بکرێــت٢.لەتشــرینی یەکەمــدا نیگەرانیەکانی تورکمان ڕەوییەوە کاتێك مالکی بڕیاریدا یەکلایەنــە دوو ئەنــدام بــۆ لیژنەکــە زیاد بکات ( ئەحمەد ئەلبەراك- عەرەبی شیعەی عــەلمانی) و(ئــەنوەر بەیرەقــدار- تورکمــانی ســوننی و ســەرۆکی پــارتی دادی تورکمــانی ســەر بەبــەرە). یەکــەمیان ئەنــدامی پێشــووی ئەنجوومەنــەی حــوکمڕانی و ســـەرۆکایەتی لیژنــەی چارەســـەرکردنی کێشــەی زەوی و زارو

---

1 رۆژنامــەی ئاسـۆ - Aso ( BBC Monitoring International Reports ).2006 . Iraqi Turkmen Leader Supports Kirkuk Normalization ,No Referendum û Paper ." 14 September (LN).

٢ - رۆژنامەی ئاسۆ

Aso ( BBC Monitoring International Reports ).2006 . " Iraqi Kurdish Newspaper " " Comments on Formation of
Kirkuk Status Committee ." 27 August ( LN ).



PDF 4 KURD

مولكداريتي دەكردو دانانيشي لەليژنەكەدا ناكۆكبووني لەسەر نەبوو بەلاَم هەلْويستي كورد لەبەرامبەر  داناني بەيرەقدار ساردو سڕييەكي پێوەدياربوو.

قادر عەزيز، نوێنەري بارزاني لەليژنەي جێبەجێكردني ماددەي (١٤٠) رايگەياند: ئێمە ناڕازين لەبەرامبەر زيادكردني توركمانێك لەبەرئەوەي داناني ئەندامێكي نوێي توركمان دژي جێبەجێكردني ماددەي(١٤٠) وە ئاستەنگ لەبەردەم جێبەجێكردني ماددەكەدا دروست دەكات١.

وەك ريزگرتنێكيش لەتەحەفوزي كورد لەسەر ژمارەي توركمان لەليژنەكەدا (جاسم موحەمەد جەعفەر) لە ٢٢ي تشريني دووەم دەست لەكاركێشانەوەي خۆي پێشكەش كرد.

پێكهاتەي ئيتنيكي –تايەفي ليژنەكە سەرباري فرەييەكەي كێشەكاني سادە دەكردەوەو لەسەرەتاشدا كارەكاني ليژنەكە بەشێوەيەكي باش بەرەو پێشەوە هەنگاوي دەنا.

لەكۆتايي مانگي ئابدا ليژنەكە يەكەم كۆبوونەوەي خۆي سازكردو (٥) ليژنەي فەرعي دروستكرد بۆ مامەلْەكردن لەگەلْ رووە جياوازەكاني ماددەي(١٤٠) و وادەشي بۆ تەواوكردني جێبەجێكردني هەرقۆناغێك لەسێ قۆناكە(ئاسايكردنەوەو سەرژمێريكردني دانيشتوان و راپرسي) دياريكرد٢. هاوكات حكومەتي عێراقي دەستپێشخەري كرد لەدابينكردني (٢) مليۆن دۆلار بۆخەرجي  ليژنەي ئيداري و بەلْێنيشي دا بەدەستەبەر كردني (٢٠٠) مليۆن دۆلاري تر بۆ قەرەبووكردنەوەي خەلْكاني ناوچە دابڕاوەكان ( ئەوانەي ئەو ناوچانە چۆلْ دەكەن‌و ئەوانەش كە بۆ ئەو جێگايانە دەگەڕێنەوە)٣.

لەناوەڕاستي كانووني يەكەمدا نێچيرڤان بارزاني سەرۆكي حكومەتي هەرێمي كوردستان گەشبيني خۆي بەئاسۆي جێبەجێكردني ماددەي ١٤٠ پيشاندا.

هەروەها ئاماژەيكرد بەدوا كۆبوونەوەي خۆي لەگەلْ نوري مالكي لەبەغداد" ئەز ئاسوودەم بە هەلْويستي سەرۆك وەزيرو سەرۆكي ليژنەكە..چونكە هەرهەموويان تەئكيد لەسەر

---

1- Hawlati  ( BBC Monitoring International Reports ). 2006 . " Iraqi Kurds Object TO Adding  Turkmen TO Kirkuk Committee ." 26 October (LN).

٢- بڕياربوو تاكۆتايي تەموز قۆناغي يەكەمي ئاسايي بوونەوە تەواو بێت و قۆناغي دووەميش(سەرژمێري دانيشتوان) لەناوەڕاستي مارس و هەرچي قۆناغي سێيەم(راپرسي)يشە لە ناوەراستي تشريني يەكەم ئەنجام بدرێت.

٣- ليژنەي ماددەي ١٤٠ تەنيا بۆ چارەسەركردني بارودۆخي كەركوك نييە بەلْكو بۆ سەرجەم ناوچەكاني عێراقە وەك لە ماددەي (١٤٠/٥٨)دا ئاماژەي پێكراوە بە(جێناكۆك) بەلاَم روون نيە كە ئاخۆ تەوافوق هەيە لەسەر ئەوەي ئەو ناوچانە سەر بەگروپێكە ياخود لەسەر شێوازي دياريكردني سنووري ئەو ناچانە.

لەدەستووری بوونی ماددەکەو جێبەجێکردنی دەکەنەوە...لەڕاستیدا ئەوەی لە بەغداد بینیم جەخت لەسەر سووربوونیان لەجێبەجێکردنی ئەو ماددەیە دەکاتەوە١. رەنگە ئەوە ترۆپکی گەشبینی کورد بوو بێت لەجێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ لەوادەی دیاریکراوی خۆیدا.

ئەگەر کۆدەنگیەکی فراوان لەنێوان لایەنە ناکۆکەکان هەبووایە لەسەر گشت رووەکانی ماددەی ١٤٠ کە هەوڵێك بوو بۆ راستکردنەوەی سیاسەتەکانی رژێمی پێشوو ئەوا چوار بڕیارە یەکەمییەکانی لیژنەکە مشتومڕی فراوانی بەدوادا نەدەهات٢.

بەپێی ئەو بڕیارانە رێگە بەگەڕانەوەی ئەو راگوازراوانە بۆ کەرکووك دەدرا کە لەماوەی نێوان ١٩٦٨- نیسانی ٢٠٠٣ راگوازرابوون لەگەڵ قەرەبووکردنەوەیان بەپارچە زەویەك و ١٠ ملیۆن دینار.هەروەها گەڕاندنەوەی سەرجەم ئەوانەی کەرژێمی پێشوو لە وەزیفەکانیان لەکەرکووك دووریخستبوونەوە.

دیسان قەرەبووکردنەوەی عەرەبە هاوردەکانی کەرکووك بەبڕی ٢٠ ملیۆن و پارچە زەوییەك. هاوکات لیژنەکە سەرجەم ئەو گرێبەستانەی هەڵوەشاندەوە کە موڵکداری زەویەکانی دابووە ئەو عەرەبانەی لەچوار چێوەی هەڵمەتی تەعریب کردندا نیشتەجێکرابوون٣. هەروەك دواتریش موحەمەد ئیحسان روونیکردەوە، ئەو بڕیارانە هەربەتەنیا کەرکووك ناگرێتەوە بەڵکو گشت ناوچە جێناکۆکەکان لەخانەقینەوە تا شەنگال دەگرێتەوە٤.

ئەو مشتومڕەی لەسەر ئەو بڕیارانە هاتنە ئاراوە پەیوەست بوون بەوەی کە ئایا عەرەبی هاوردە جگە لەناچارکردن بۆ ئەوەی بڕۆن بژاردەیەکی تر لەبەردەمیاندا هەیە یان نا؟ ئەو زمانە عەرەبییەی بەڵگە نامە ئەسڵییەکەی پێداڕێژرابوو ئاماژە بەناچاربوون دەکات بەڵام راپۆرتەکان

---

1- Kurdistan Satellite TV. 2006 . " Iraqi Kurdish PM Says Breakthrough Made Talks with Baghdad ." 20 December (WNC ).

٢- لەگوتاری سەرجەم لایەنەکانی کەرکوك بەبەرەی تورکمانی و گردبوونەوەی کۆماریشەوە لەرووی مەبدەئییەوە بانگەشە بۆ پشتیوانیکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوور دەکەن.

٣- دوا بڕیار ئەو زەویانەش دەگرێتەوە کە بەزۆر لەخاوەنەکانیان داگیر کراون بۆدروستکردنی سەربازگە تیایاندا.

4 -Kurdistan Satellite TV .2007 . " Iraqi Kurdish Minster Says Nobody to be Forced to Leave Kirkuk ". 8 February (LN).

باسیان لەوە دەکرد ئەو زمانە ئەوە نەبووە کە ئەندامانی لیژنەکە لەسەری ڕێکەوتوون کاتێك ڕەزامەندیان لەسەر بڕیارەکان داوە١.

هاوکات لێدوانی بەرپرسانی کورد لەتەشویش خستنە سەر پرسەکە زیادیکردو دەمێکیش لەکەناڵی ئەلجزیرەوە پرسیار لە(موحەمەد ئیحسان) کرا لەبارەی بڕیارەکان، ئەو تەئکیدی لەوە کردەوە کە سروشتی بڕیارەکان خۆبەخشانەیەو ناچارکردن نییە بەڵکو هەڵبژاردنە.

ئەو کوردانەی کە لەو ناوچانەوە ڕاگوازراون ناچار ناکرێن بۆ ناوچە ئەسڵیەکانی خۆیان بگەڕێنەوە هەروەك چۆن عەرەبی هاوردەش ناچار نەکراون بۆ زێدی خۆیان بگەڕێنەوە٢.

پاش هەفتەکیش (رزگار عەلی) نەیارانی بڕیارەکانی لیژنەکەی بە شۆڤێنیست و پاشماوەی بەعسی هەولۆەشاوەو تیرۆریست وەسفکردو وتی "ئێمە ناتوانین هەر بەعەرەب بلێین کەرکووك بەجێبهێڵن بەڵکو بەهەموو ئەو خێزانانە دەڵێین کە لەشارەکەدا نیشتەجێ کراون، پێویستە بۆ ناوچە ئەسڵیەکانی خۆیان بگەڕێنەوە٣.

بڕیارەکان لەزۆر ناوەندا کاردانەوەی توندیان لێکەوتەوە، (موحەمەد خەلیل) ئەندامی لیژنەی ماددەی ١٤٠ کە ئیمزای لەسەر دەقی ئەسڵی بڕیارەکان کردبوو هەڕەشەی دەست لەکارکێشانەوەی کرد گەر بێتوو بڕیارەکان هەموار نەکرێنەوەو وتی: ئێمە ئەو بڕیارە تازانە ڕەتدەکەینەوەو بەراگواستنی بەزۆری دادەنێین٤.

هاوکات دەستەی زانایانی موسڵمانیش کە ڕێکخراوێکی ئاینی عەرەبی سوننی خاوەن نفوزێکی فراوانن و پەیوەندیان بەبەرەی تەوافوقەوە هەبوو سەرکۆنەی بڕیارەکانی کردو

---

١- گروپی قەیرانە نێو دەوڵەتیەکان، ICG-٢٠٠٧-٦.

٢ - کەناڵی ئەلجزیرە. Al-Jazera ( BBC Monitoring International Report ).2007 ." Iraqi Kurdish Minister Denies Forcible Deportation of Arabs From Kirkuk ." 8 February ( LN ).

3 - Muhammed ,A. 2007. " Article 140 to Translate Talks about Kirkuk to Deeds ." The Kurdish Globe ,14 February.

4 –Senanayake ,S. 2007 . " Iraq : Committee Decision Increases Tensions in Kirkuk ." Radio Free Europe /Radio Liberty , 8 February (www.rferl.org /featuresarticle/2007/02/3a63f415-eb59-4a80-b97e-64c245661555.html)

PDF 4 KURD

رایگەیاند: پرۆسەی پاکتاوکردنی نەژادی لەپارێزگای کەرکووك لەلایەن ژمارەیەك پارتی سیاسی دیارکراوەوە ئەنجام دەدرێت١.

لە٩ی شوباتدا لەشاری کەرکووك نزیکەی هەزار کەسایەتی سوننی و شیعی لەکۆنگرەیەکدا لەژێر دروشمی "عێراقی بوونی کەرکووك و یەکێتی عێراق" دا بەشداییان کرد کە لـەو شـارەدا بەرێوە دەچوو.

ئـەو کۆنگرەیـە وەك نارەزاییـەك بـوو لـەدژی بریارەکـان و هەرەشـەی ئـەوەیان کـرد کـە جێبەجێکردنی ئەو بریارانە وا لەدانیشتوانی کەرکووك دەکات پەنا بۆ بەگری چەکداری بەرن٢.

بەهەمان ئاراسـتە وتەبێـژی بـەرەی تورکمـانی رایگەیانـد: دەکردنـی بریـاری لـەو جـۆرە لەکاتێکی وەك ئێستا پێکدادانی نێوان نەتەوەکانی بەدواوە دەبێت.

هاوکات نوێنەری موقەدا سەدر لەکەرکووك بەڵێنیدا کە" ئێمە نـە بـەهێزو نەبەشـتی تـر کەرکووك بەجێناهێڵین"... خۆگەر کوردیش ناچارمان بکەن لەشارەکەدا برۆین ئەوا کاردانەوەی مەترسیدار لەدژیان روودەدات٣.

جگە لەوەی کە ناوەرۆك و زەمانی دەقی بریارەکان مشتومری لێکەتـەوە، دیسـان لـەرووی یاسایشەوە نائارامی دروست دەکرد.

لای خۆشیەوە کورد رایگەیاند: کە بریارەکانی لیژنەکە هێزی یاسایی خۆیان هەیەو پێویست بەئیمزای سەرۆك وەزیر ناکات تابچنە بواری جێبەجێکردنەوە، بەڵام کورد لەتوانایدا نەبوو بێ هاوکاری حکومەتی عێراقی بریارەکان جێبەجێبکات.

پەسەندکردنی چوار برشیارەکەش لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیرانەوە تا ٢٩ی ئازاری خایانـد و ئەو دواکەوتنەش پاساوی خۆی هەبوو بەتایبەتیش لەپاش تەقینەوەکەی کۆتایی شوبات کە سەربازگەیەکی کردبوە ئامانج و لەگەڵ خۆیدا بـارودۆخێکی ناهـەمواری هێنـابووە ئـاراوە.

---

١-سەرچاوەی پێشوو.

2 - Al-Bayyina, ( BBC Monitoring Middle East). 2007 " البينه "

" Iraqi Shi'I leader in Tehran , Seeks to Revive U.S.- Iran Dialogue on Iraq. " 9 February (LN).

3 - Senanayake,S. 2007 ." Iraq: Committee Increases Tensions in Kirkuk." Op.cit.

ئەوە لەوەش سروشتی ناکۆکبوونی بڕیارەکان خۆیان و دواکەوتنەکەش تووڕەبوونی بەرپرسـانی کوردی لێکەوتەوە١.

PDF 4 KURD

لە٣١ی ئازاردا (هاشم ئەلشبلی) سەرۆکی لیژنەکە بەماوەیەکی کەم لەدوای پەسەندکردنی بڕیارەکان لەلایەن حکومەتەوە دەستی لەکارەکەی کێشایەوە٢و روونیشیکردەوە، کـە لـەکاتی تاوتوێکردنی بڕیارەکاندا هیچ زۆر لێکردنێك نەبووە بڕیارەکانیش بەهێز جێبەجێ ناکرێن٣.

دەبوو ئەو لێدوانانە یارمەتی دەر بێت لەرەواندنەوەی خەمی ئەوانەی ترسیان لەراگواستنی بەزۆری عەرەب هەبوو بەڵام لەراستیدا کاریگەرییەکی ئـەوتۆی نـەبوو لەهێوکردنـەوەی ئـەو نارەزایەتیەی لەدژی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ لەئارادابوو.

## پەنگخواردنەوەی زیاتری کورد و تورکمان

بەهاتنی سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧ و بەرەو پێشچوونی کیسەڵ ئاسای پرۆسەی جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠)، ئەنقەرە روو بەڕووی ئەگەری ئەوەبووەوە کە بەکۆتایی ساڵ کەرکووك بکەوێتـە ژێـر چـەپۆکی کـوردەوە. بـەڵام بژاردە(ئۆپشـن)ەکانی تورکیـا سـنووردارببوون، هەرچـی دەستێوەردانی راستەوخۆی سەربازیی بوو ئەگەرێکی دوور بوو ئەویش لەبەر چەند هۆکارێك.

هاوکـات بـەرەی تورکمـانیش لـەرووی هێـزی سیاسـیەوە نەیـدەتوانی رێگـری بکـات لەجێبـەجێکردنی مـاددەی (١٤٠) و ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکاش تـەنیا هێـز بـوو کاریگەری راستەقینەی لەسەر کورد هەبێت.

ئەوەی بارودۆخی ستراتیژیی کوردی ئاڵۆزکردبوو، زنجیرە پەلامارەکانی پـارتی کرێکـارانی کوردستان بوون لـەدژی ئامانجـەکانی تورکیـا کـە لـەئایاری ٢٠٠٧ بـەدواوە لەبنکـەکانیان لەکوردستانی عێراقەوە دەستیان پێکرد لەوانەش کردەوەیـەکی خۆکـوژی کـە لـە ٢٢ی ئایـار لەئەنقەرە ئەنجامیان داو تیایدا (٨)کەس کوژران و پتر لە(١٠٠) کەسی تریش بریندار بوون.

---

١- بۆنموونە قادر عەزیز، نوری مالکی تۆمەتبار کرد بە بەفیڕۆدانی کات، دواجار تا کۆتایی بەپاساوی ئـەوەی وادەکـەی بەسەرچووەو کاتی ئەوە لەبەردەستدا نەماوە دەکرێت ماددەی ١٤٠ وەك دیفاکتۆیەك بەسەر کورد دا بسەپێنرێت. بڕوانـە: Plani, S. 2007 ." Iraqi Kurdish Official Criticizes PM's æ Negative Attitude' on Kirkuk Article." Aso ( BBC Monitoring International Reports )12 March ( LN).

٢ - سەرباری پروپاگەندەی ماس میدیاکان، ئەلشبلی ئەوەی رەتکردەوە کە دەست لەکارکێشانەوەکەی پەیوەندی بە ناکۆکی لەگـەڵ حکومەت و لیستی عێراقیەوە هەبێت. هەرچەندە دەوترێت سەرۆك وەزیر بەنیازی گۆڕینی بووە بەڵام ئەو پێشتر وازی هێناوە.

3 - Hurst ,S . R. 2007. "Iraq Endorses Contentious Plan to Relocate Arabs from Kirkuk ." Associated Press, 31 March.

دیسارە ئـەوەش هەڵبــژاردنی پەرلــەمان( لەنیســانی ٢٠٠٧) و ســەرۆکایەتی(لەتەمووزی ٢٠٠٧)دا دووچاری مەترسی سیاسی کردەوە، بەتایبەتیش مەترسی بۆ سەر سیاسیەکانی نێـو پارتی دادوگەشەپێدانی فەرمانڕەوا.

بۆیە گرتنە بەری هەڵوێستێکی ئاشتەوایی و ئاسانکارانە لەبەرامبــەر کــەرکوك و پرسـی کورد ترسی ئەوەی هەبوو لەلایەن پارتی کاری ناسیونالیزمی پەڕگیرو راستەڕەوی تورکیاوە کـە لەباری بوژانەوەدا بوو موزایدە بکات١.

تورکیا کاردانەوەیەکی توڕەی هەبوو لەبەرامبەر مەرسومێکی مەسعود بارزانی ســەبارەت بە داگرتنی ئاڵای عێراقی هەربۆیە زنجیرەیەك هەڵمەتی دژ بەیــەك لــەنێوان هــەولێرو ئەنقــەرە رووی لە هەڵكشان کرد.

لەئـەیلوولی ٢٠٠٦دا شـاندێکی پەرلـەمانی تورکیــا ســەردانی هــەرێمی کوردســتانی کــرد بــۆ هێورکردنەوەی ئەو نائۆقرەییەی کە لەئارادابوو بەڵام ئەوە دەرئەنجامێکی تەواو پێچەوانەی لێکەوتەوە.

تۆرهان جۆمیز پەرلەمانتاری بەرچاوی پارتی دادوگەشــەپێدان لەگەڕانەوەیــدا بــۆ ئەنقــەرە سوکایەتی بەدەستکەوتەکانی کورد کردو چەندان دەســتەواژەی نــاجۆری بــەکارهێناو نــاڕەزایی پیشاندا بەوەی کە پێویستە هەرگیز راپرسی نەکرێت چونکە شەڕی ئەهلی بەرێوەیە٢.

هاوکات رەجەب تەیوب ئەردۆغانی سەرۆك وەزیریش لەکانوونی دووەمی ٢٠٠٧دا بەیاننامەیەکی دەرکردو تیایدا ئاماژەی بەوە کرد شەرشێکی ناوخۆی گەورە لەکەرکووك سەرهەڵدەدات، ئەگەر رێگە بەسازدانی راپرسی بدرێت هەربۆیە ناکرێت تورکیا وەك تەماشاکەرێك لەکورسیەکانی دواوە لەدیمەنی عێراق بڕوانێت٣.

---

١- هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٧ی تورکیا سەلماندیان کە هەڵبژاردنێکی ئاڵۆزو پڕناکۆکین. یەکێك لەو بڕیارە سەیرانەی کەپارتی دادوگەشە پێدان دای ، پێشکەشکردنی پاڵێوراوێکی ئیسلامی بوو بۆ پۆستی سەرۆك کۆمار کــە کــە بــۆ ســەردەمانێك ئــەو پۆســتە پەناگــەی عەلمانیەت بوو لەدژی ئیسلامگەرایی.

2-Anatolia .2006. "Turkish Deputies Visit North Iraq ,Draft Report ,Warn Against Kirkuk Referendum ." 6October (WNC).

جۆمیز رایگەیاند کە دەچیتە کەرکوکەوە هەست بەپشێوی دەکەیت ،، کەئەوەش دەرئەنجامی ئەو جەنگەیە کە بەهۆی خۆنەســازاندنی ٦٠٠ هەزار کورد لەگەڵ ژیانی شارەکەدا هاتوتە ئاراوە.

Turkish Daily News. 2006 ." Comez Reports on Tour of Northern Iraq." 8 October ( LN).

3 - Civaoglu, G.2007." Bleachers and Mevlana ." Milliyet ( Internet Version – WWW), 18 January ( WNC).

PDF 4 KURD

پەیمانگەی ستراتیژی نێودەوڵەتی تورکیا_ Turkish Gloal Strategy Institue، لەئەنقەرە میوانداریێتی کۆنگرەی "کەرکووك ۲۰۰۷"ی کرد.

بۆ بەشداریکردن لەو کۆنگرەیەدا داوەتنامە ئاراستەی سەرجەم پێکهاتەئیتنیکیەکانی عێراق کرا جگە لەکورد نەبێت کە داوایان لێکرابوو بۆچوونی نووسراوی خۆیان پێشکەش بکەن.

لەبەرامبەر دا سەرانی کوردو حکومەتی عێراقیش سەرزەنشتی سازدانی کۆنگرەکەیان کردو بەدەستێوەردانێکی بێ پاساو لەکاروباری ناوخۆی عێراق وەسفیان کرد.

بەوجۆرە نائۆقرەییەکان لەشوباتدا رووی لەهەڵکشان کرد کاتێك بەرپرسی لقی دیاربەکردی پارتی کۆمەڵگەی دیموکراسی سەر بەکورد تۆمەتبار کرا بەهاندانی نەژادپەرستی کاتێك وتبووی " هەرهێرشێك بۆ سەر کەرکووك هێرشکردنە بۆ سەر دیاربەکر"١. دواتریش بارزانی هەڕەشەی ئەوەیکرد کە رێگە بەتورکیا نادرێت دەست لەپرسی کەرکووك وەربدات و بەدەستێوەردانیشی ئەوا ئەوانیش دەست لەکاروباری دیار بەکرو شارەکانی تری تورکیا وەردەدەن٢.

لەبەرامبەر ئەو لێدوانانەدا "کورساد توزمان" وەزیری دەوڵەتی تورکیا ئەوانەی ئاگادارکردەوە کەوەك ئەو وتی دۆستی تورکیا نین دەبێت چەپۆکی پۆڵاینی وڵاتەکەیان بچێژن٣.

جگە لەلێدوانەکانیان، تورکیا هەڵمەتی دیپلۆماسی خۆی چڕکردەوە بەمەرامی پەیداکردنی پشتیوانی لەپێناو دواخستنی راپرسییەکەدا.

دواتریش ئەنقەرە پلانی خۆی بۆ یەکلاییکردنەوەی پرسی کەرکووك لەکۆبوونەوەیەکی داخراوی پەرلەمان کە لەکانوونی دووەم بەرێوەچوو ئاشکرا کرد.

بەپێی پلانەکە دەبوو هەمواری دەستوور بکرێتەوە بۆ دواخستنی جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠) و باروودۆخی کەرکووکیش بۆماوەی (١٠) ساڵ بخرێتە ژێر چاودێریی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە٤.

---

1 - Milliyet . 2007. " DTP To Invite Talabani, Barzani To Celebrate Nevruz in Diyarbakir." 26 February ( WNC).

2 - Mroue , B. 2007 ." Kurdish Leader Warns Turkey Not to Intervene in Kirkuk ." Associated Press World stream ,7 April(LN).

3- Anatolia . 2007 ."Turkey Minister Tuzmen Views Barzani Remarks , Threatens æIron Fist'." 9April (WNC).

4. 2007. "Turkish Government Said to Propose 10-Year UN Control of Kirkuk ." 19 January (LN).-

بەڵام بێگومان کورد مافی ڤیتۆی هەیە لەهەمواركردنی دەستوورو بەڵنیایشەوە ڕێگە بەهەر هەوڵێك نادەن بۆ گۆڕینی ماددەی(١٤٠) ١، بۆیە باشترین دەرفەت لەبەردەم تورکیادا ئەوەبوو کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا قایل بکات بەوەی گوشار بخاتە سەر کـورد بۆرازیبوونیـان بەدواخستن بەڵام واشنتۆن بۆخۆی لەپرسی کەرکووکدا تێوەگلابوو.

## پەرەسەندنی هەڵوێستی ئەمریکا لەکەرکووکدا

هەتاوەکو سەرەتای ساڵی ٢٠٠٧ ویلایەتە یـەگرتوەکانی ئـەمریکا لـەزۆرجاردا پارێزگـاری لـە هەڵوێستی نەگۆڕی خۆی دەکرد لەمەسەلەی دووڕپەرێزبوونی لەجێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠)دا.

دیارە هەڵوێستی واشنتۆن ئەوەبوو کە پێویستە دەستووری عێراقـی بەتـەواوەتی جێبـەجێ بکرێت و داهاتووی کەرکووکیش لەلایەن عێراقیەکان خۆیانەوە بڕیـاری لەسـەر دەدرێـت بـەبێ دەسـتێوەردانی دەرەکـی –تەنانـەت لـەدوای جـاڕدانی ڕاپـۆرتی بیکـەر- هـاملتۆن -Baker Hamiltion، کـە لەلایـەن گروپـی لێکۆڵینـەوەی عێراقـی- Iraq Study Group لـەکانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٦ بڵاوکرایەوە.

ئامۆژگاری ژمارە(٣٠) لەراپۆرتەکەدا کـەرکووك بـە ( بـەرمیلێك بـارود) وەسـفدەکات و داوای دواخستنی ڕاپرسییەکە دەکات، ئەمە جگە لە نێوبژیوانی نێو دەوڵەتی بۆ بـەدوورگرتن لە سەرهەڵدانی کاری توندوتیژی نێوان پێکهاتە جیاوازەکان٢.

ڕاپۆرتەکـــە لەلایـــەن سیاســـییە کوردەکانـــەوە کاردانەوەیـــەکی دوژمنکارانـــەی لێکەوتەوەلەکاتێکدا ئەو ئامۆژگارییە سەبارەت بـە پرسـی کـەرکووك لەلایـەن جـۆرج بوشـی سەرۆکی ئـەمریکاوە پشـتگوێخرا، کاتێـك سـتراتژی خـۆی ڕاگەیانـد بەرەوانـەکردنی هێـزی سەربازیی نوێ بۆ عێراق لەساڵی داهاتوودا٣.

---

١ – ماددەی ١٤٢کە لەدواساتەکان لەدەستووردا نووسرا، وەك هەوڵێك بوو بۆرازیکردنی عەرەبی سوننە کە بـەو پێیـەش بـاس لـە پرۆسەیەکی کاتی دەکرێت لەپێناو هەموارکردنی دەستوور بەڵام لەگەڵ پێدانی مافی ڤیتۆی کوردی کە دەکرێت لەو چوراچێوەیەدا دوو بۆ سێی دەنگدەرانی ٣ پارێزگا یان زیاتر هەر هەموارکردنێك رەتبکەنەوە کە نەیخوازن.

٢- بـۆ بینـینی تـەواوی ڕاپۆرتەکـە بڕوانـە ئـەم سـایتە: www.usip.org / isg / Iraq-study-group-report/ report/ 1206/Iraq-study-group-report.pdf.

٣- بۆ زانیاری زیاتر لەسەرکاردانەوە جۆراوجۆرەکان کەزۆربەیان سلبیبوون وەك ئەوەی لەراپۆرتی بیکەر-هاملتۆنـدا هـاتووە بڕوانـە گۆڤاری ئەلەکترۆنی:

Stratigic Insights (Volume VI, Issue 2 ) ,especially O'Leary B.,"Iraq's Future 101:The Failings of the Baker-Hamilton Report,"

لەناوەڕاستی کانوونی دووەمدا روس ولسن- Ross Wilson، باڵیۆزی ئەمریکا لـەتورکیا سەرلەنوێ تەئکیـدی لەسـەر هەڵوێسـتی نـەگۆڕی وڵاتەکـەی کـردەوەو رایگەیانـد: پێویسـتە داهاتووی کەرکووك لەلایەن عێراقیەکان خۆیانەوە بڕیاری لەسەر بدرێت١. دوای هەفتەیەکیش نیکۆلاس بیرنز– Nicholas Burns، یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا سەردانی ئەنقەرەی کـرد بـۆ ئـەوەی پـەیامێکی هاوشـێوە بگەیـەنێت٢. یەکـەمین ئاماژە بـۆ رووداوانـی سـوکە گۆڕانکاریەك بەڵام گرنگ لەهەڵوێستی ئەمریکا لەنیسانی ساڵی ٢٠٠٧ دا بوو، کاتێك گەورە بەرپرسـێك لـەوەزاراتی دەرەوەی ئـەمریکا سـەرلەنوێ جـەختی کـردەوە لەسـەر هەڵوێسـتی وڵاتەکەی بەرامبەر بە جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠) بەڵام پێداگریشی کرد لەسەر ئـەوەی کـە پێویستە کەوتنەوەی هەر دەرئەنجامێك نیگەرانی سەرجەم لایەنەکان لەبەرچاو بگیرێت.

هێماشیکرد بەرووداونی گۆڕانکاری لەسیاسـەتی پەیوەسـت بـە ئەگـەری دواخسـتنی ئـەو ماددەیەو وتی " ئێمە هەڵوێستمان لەدیارکردنی کاتدا نییەو خۆمان لەقەرەی ئـەو مەسـەلەیە نادەین، دیسان بۆ ئێمە نییە کە بڵێین دەبێت وادەکە لە ٣١ی کانوونی دووەمدا بێت یان نا٣.

لەتەمووزدا زاڵمای خەلیل زاد، باڵیۆزی پێشووی ئەمریکا لەعێراق لەرۆژنامەی نیویۆرك تایمز وتارێکی بڵاوکردەوەو تیایدا داوای دەستێوەردانی نەتەوە یەکگرتوەکانی کرد لەچارەنووسی پرسی کەرکووکدا.

بەوتەی خەلیل زاد پێویستە نێردەیەکی نوێی نەتەوە یەکگرتوەکان روو لـەعێراق بکـات و سەرپشك کرابێت لەیارمەتیدانی چارەسەرکردنی بارودۆخی کەرکوك و ناوچە دابڕاوەکان٤.

---

www.ccc.nps.navy.mil/si/2007/Mar/introMar07.asp
1- MENA . 207." U.S. Ambassador :Future Of Kirkuk To Be Determined by Iraqis ." 16 January (WNC).

٢- بەوتەی برنز(Burns) ئاسودە دەبین کاتێك گوێبیستی دەسەڵاتدارانی تورکیا بـین بـەڵام ئـەوەی زۆر گـرنگترە مامەڵـەکردنی دەسەڵاتدارانی عێراقە لەگەڵ ئەو پرسەدا.

3 -(Turkish Daily News. 2007." U.S. Says Kirkuk Decision Up to Iraqis ."20 January )

٤- زاڵمـای خـەلیل زاد: Khlilzad, z.2007 ."Why the United Nations Belongs in Iraq."New York Times,20 July (www.nytimes.com /2007/07/02/opinion/20khalilzad.html? r =2&oref=slogin )

بەهاتنی مانگی ئاب هەڵوێستی ئـەمریکا خـۆی لەلێـدوانێکی رایـن کرۆکـەر- Ryan Croker ی باڵیۆزی نوێی ئەو وڵاتەدا دەبینیەوە کـە رایگەیانـد: زۆر دووره دەرفـەت هـەبێت راپرسییەکە بەر لەوادەی دیارکراوی خۆیدا کە کانوونی یەکەمە سازبکرێت١.

لەبەر ئەوە کاتێك وەرزی هاوین تەواو بوو کورد تەواو بێ دەرەتان بوون لەپێداگریان لەسـەر جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠) لەکاتی دیارکراوی خۆیدا.

**ماددەی (١٤٠)جێی پرسیارە**

سەرباری ئەوەی سەرکردایەتی کورد تا درەنگانێك باوەڕی نەدەکرد بەحەتمیەتی دواکـەوتنی جێبەجێکردنی مـاددەی (١٤٠) لـەوادەی خۆیـدا تـا ئـەو کاتـەی بـەر لـە دوو رۆژ لـەوادەی جێبەجێکردنی قۆنـاغی یەکـەم لـەکۆی هەرسـێ قۆنـاغی پرۆسـەکە بـاوەڕی هێنـا، کاتێـك ئەنجوومەنی وەزیران رەزامەندی پیشاندا لەسەر ئەو چوار بڕیارەی کە یەکەمجار لەلایەن لیژنەی ماددەی(١٤٠)ەوە دەرکرابوو.

ئەوەبوو لەگەڵ ئەو پێشکەتنە کەمەی لەقۆناغی ئاسایی کردنەوە بـەدیهاتبوو بـەڵام وادەی جێبەجێکردنی قۆنـاغی دووەم (سـەرژمێری دانیشـتوان) کـە لەتـەمووزدا بـوو بەسەرچـوو٢. لەراستیدا مالکی تا مانگی ئاب سەرۆکی نوێی بۆ لیژنەی ماددەی ١٤٠ لەجێگەی ئەلشبلی دانەنا٣. سەرۆکی نوێی لیژنەکە کە(رائید فەهمی) وەزیـری زانسـت و تەکنـەلۆژیا بـوو، کـە یەکێك بوو لەسـەرکردەکانی حزبـی شـیوعی عێـراق کـەوەك پەرلـەمانتارێك لەسـەر لیسـتی عێراقییە هەڵبژێردرابوو.

---

1 - Senanayake, S." Iraq: Kirkuk Referendum Likely to be delayed ." Radio Free Europe/ Radio Liberty ,13 September

٢ - کاتی سازدانی سەرژمێری دانیشتوان بەسەرچوو،کە بڕیـاربوو لەتـەموزدا بکرێـت ، ئـەوەش گـورزێکی کوشـندە بـوو درا لـە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠، چونکە سەرژمێری دانیشتوانی گشتی کەرکوکیشی دەگرتەوە کە بڕیاربوو لە ١٧ی تشرینی یەکـەمی ٢٠٠٧ ئەنجام بدرێت کە ئەوەنەکرا.

٣- کورد گەیشتە ئەو باوەڕەی کە حکومەت پەنا بۆ خۆدزینەوە دەستی دەسـتپێکردن دەبـات بـەڵام دۆزینـەوەی کەسـێك کـەلای هەمووان پەسەندبێت و ئامادەبێت "کاسی ژەهر" بنۆشێت

کە خۆی لە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ دا دەبینێتەوە کارێکی وائاسان نەبوو.

دواكەوتنی جێگرەی ئەلشبلی و هاوكارینەكردنی وەزارەتە پەیوەندیدارەكانی عێراق لەگەڵ لیژنەكەدا كوردی گەیانادە ئەو باوەڕەی كە حكومەتی بەغداد بێ بەڵێن دەرچووە لەپابەند نەبوونی بەدەستوورەوە.

لەكۆتایی تەمووزدا سەرۆك مەسعود بارزانی حكومەتی بە "دەستی دەستی پێكردن" تۆمەتباركردو لەهەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆش وریای كردەوە گەربێتوو ماددەی(١٤٠) جێبەجێ نەكرێت١.

لەهەمان كاتدا لەگەڵ هاتنی سەرەتای حوزەیران شێوازی وتارەكانی بارزانی گۆڕانكاری بەسەردا هات.

لەوتەیەكیدا كە لە ١٩ی حوزەیران لەشاری دهۆك پێشكەشی كرد تەئكیدی لەسەر دژایەتیكردنی خۆی بۆ دواخستنی ماددەكە (بەبڕیارێكی سیاسی) كردەوە، بەڵام دانی بەوەشدانا كە ئەگەر دواخستنەكە بۆكاتێكی كەمەو هۆكارەكانیش تەكنیكین نەك سیاسی ئەوا دەكرێت پەرلەمانی كوردستان بڕیارێك لەوبارەیەوە دەربكات٢.

ئامادەبوونی بارزانی بۆ جیاوازیكردن لەنێوان هۆكاری تەكنیكی و هۆكاری سیاسی لەمەسەلەی دواخستنەكەدا گرنگ بوو لەبەرئەوەی دواجار دەرفەتی بەخشیە چارەسەری تەوافوقی و میانگیری٣.

لەراستیدا ئاستەنگە تەكنیكیەكان كە ڕێگر بوون لەجێبەجێكردنی ماددەی ١٤٠دا خۆیان لە دەیان هەزار سكاڵای پەیوەست بە كێشەی موڵداری لەكەركووك دەبینییەوە كە لەڕووی یاساییەوە كاری لەسەر نەكرابوو.

ئەمە جگە لە هەزاران كەس كە دەبوو بەرەو كەركووك یان لەكەركووكەوە بگوازرێنەوە، لەگەڵ تەواوكردنی بەڵگەنامە پێویستەكان.

دیسان دەبوو ئەو چوار ناوچەیەی كەركووك كە ڕژێمی پێشوو لێی دابڕیبوو بگەڕێنەوە سەر پارێزگاكە١.

---

1-Hendawi, H. " Kurdish Leader Warns of " Civil War" over Kirkuk ." Associated Press World Stream,31 July.

2- Kurdistan Satellite TV (BBC Monitoring International Reports ). 2007. "Iraqi Kurdish Leader Hints at Accepting Delay on Kirkuk Article."19 June ( LN).

٣ – لەراستیدا لەحوزەیراندا لەرۆژنامەی هاوڵاتیدا هاتبوو كە جەلال تاڵەبانی لەگەڵ سەرۆك بوش پێكهاتووە لەسەر درێژكردنەوەی كاتی دیاریكراو بۆ جێبەجێكردنی ماددەی ١٤٠.

PDF 4 KURD

هەموو ئەوانەش پێویستیان بە کۆدەنگی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی هەبوو، هاوکات دەبوو سەرجەم ئەو ئاستەنگە تەکنیکیانە کەنەك هەر لەکەرکووك بەڵگو لەگشت ناوچە دابڕاوەکانی تر کە ماددەی ١٤٠ دەیگرتنەوە، هەڵبگیرێن٢.

لەو روانگەیەشەوە مەزەندەی (راین کرۆکەر) سەبارەت بە دواکەوتنی ئەنجامدانی راپرسیەکە لەوادەی خۆیدا دەبرینێکی لەبار بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکان بۆ جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠) بەردەوام بوو سەربای ئەوەی دواکەوتنی شتێکی حەتمی بوو.

لەکۆتایی ئەیلولیشدا نەرمین عوسمان، جێگری سەرۆکی لیژنەی ماددەی ١٤٠ رایگەیاند: نزیکەی (٢٠٠٠) کەس لەعەرەبی هاوردە رازیبوون بە قەرەبووکردنەوەو گەڕانەوەیان بۆ ناوچە ئەسڵیەکانی خۆیان و زۆربەی بەندەکانی ماددەی(١٤٠) یش جێیەجێکراون٣.

بەوتەی نەرمین عوسمان بریار وایە لەناوەڕاستی تشرینی دووەمدا سەرژمێری تەواوی دانیشتوان لەپارێزگای کەرکووکدا بکرێت لەلایەن وەزارەتی پلاندانانەوە بەڵام روون و ئاشکرا بوو کە بەهاتنی ناوەڕاستی تشرینی دووەم ٤، پرۆسەی ئاساییکردنەوە بەئاراستەی راوەستان چەقیبەستبوو.

لەو قۆناغەدا لەکۆی (٣٦) هەزار داخوازی کە لەکوردو عەرەبەوە پێشکەش کرابوون تەنیا هەزار داوایان تەماشا کرابوون٥.

## رێککەوتنی عەرەبی- کوردی

---

١- بڕوانە فەسڵی دووەم بۆئاشنا بوون بە وردەکاری و نەخشەی پەیوەست بەو گۆڕانکاریانەی لەگەڵ تێپەڕبوونی کات بەسەر سنووری ئیداری کەرکوکدا هاتووە.

٢- هەوڵەکان بۆ زەمینە سازی لەناوچەجێناکۆکەکان بۆ لکاندنیان بەحکومەتی هەرێمی کوردستانەوە لەئەیلولی ٢٠٠٦ دەستیپێکردن کاتێك بارزانی نێردراوی بۆ ئەو ناوچانە رەوانە کرد تا لەرووی ئیداریەوە بەحکومەتی هەرێمی کوردستانەوە ببەسترێنەوە.دەستپێشخەرییەکەی بارزانی هاوکات بوو لەگەڵ دەنگدانی هەردو ئەنجوومەنی مەندەلی و خانەقین بۆ بەرژەوەندی وونە سەر ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

3 - Agence France Press.2007. "Thousands of Iraqi Arabs Paid to Leave Kirkuk."27 September.

4 - Rozhnama ( BBC Monitoring International Reports ). 2007. "Census to be Held in Oil-Rich Kirkuk in Mid-Nov 2007."4 October.

چاوەڕوان نەدەکرا لەو کاتەدا (عەلی بابان) وەزیری پلاندانانی عێراق کە سەر بەحزبی ئیسلامی عێراقی بوو پەرۆش بێت لەگەڵ خواستی کورد لەکەرکوکدا.

5- Moutot ,M.2007. "Trouble on the Doorstep of Kirkuk 's Disputed Homes ."Agence France Press,21 November.

PDF 4 KURD

لەگەڵ پەککەوتنی پرۆسەی جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠)، لەسەرتای تشرینی دووەمدا لەناکاو گۆڕانکاری لەگۆڕەپانی سیاسی کەرکووکدا روویدا، کە مایەی پێشوازیکردن بوو ئەویش بەراگەیاندنی رێککەوتن لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوان لیستی برایەتی کەرکووك و گردبوونەوەی کۆماریی عێراق کە خۆی لەعەرەبەکانی کەرکووکدا دەبینییەوە.

بەپێی بەندەکانی رێککەوتننامەکە هەر پێکهاتەکی سەرەکی دەبێتە خاوەنی ٣٢٪ی پۆستە ئیداریەکانی کەرکووك. هەروەها بەپێی رێکەتننامەکە دامەزراندن لەسەرجەم ئاستەکاندا بوو هەر لە بەڕێوەبەرەکانەوە تا کرێکارەکان، لەگەڵ تەرخانکردنی ٤٪ بۆ مەسیحییەکان.

هەروەها لیستی برایەتی کەرکووك رێکەوت لەسەر دانانی عەرەبێك وەك جێگری پارێزگارو یەکێکی تریسش وەك جێگری سەرۆکی ئەنجوومەنی دادوەری.

لەدوای جێبەجێکردنی بەندەکانی رێککەوتننامەکەش ئەندامانی گردبوونەوەی کۆماری کە ژمارەیان (٥) کەس بوو لەنێو ئەنجوومەنی پارێزگاکەدا لە ٤ی کانوونی یەکەمدا گەڕانەوە بۆ سەر کارەکانیان و بەوەش بەرەسمی کۆتاییان بەبایکۆتکردنەکەیان هێنا کە ماوەی ساڵێکی خایاند.

لای خۆشییەوە هاورد کیگان- Howrd Keegan، لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا رێکەتننامەکەی بە گرنگ وەسفرکد بەڵام وتیشی ئەوە هەنگاوێکی بچووکە بۆ ئاشتەواییەکی درێژخایان1. لەرووی ستراتیژییەوە رێککەوتنەکە بۆ کورد گرنگ بوو لەبەر ئەوەی کەلێنی خستە نێوان ئەو هاوپەیمانێتیەبەرژەوەندیخوازیەی لەنێوان تورکمان و عەرەب تاتشرینی دووەمی ساڵی ٢٠٠٦ بوونی هەبوو.

بەو رێککەوتنە کوتلەی تورکمانی لەدەرەوەی ئەنجوومەنەکە دووچاری گۆشەگیریەکی خنکێنەر بووەوە.

هەرچەندە فۆرمێك بۆ دابەشکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی یەکسان پێشکەش بە کوتلەی تورکمانی کرابوو وەك ئەوەی ماوەیەکی زۆربوو داوای دەکرد، بەڵام ئامادە نەبوو کۆتایی بە بایکۆتکردنەکە بهێنێت و بەپرسێکی تورکمانیش تەئکیدی لەوە کردەوە کە کێشەکانی کەرکووك بەقەرەبووکردنەوەی لایەنێك و پەراوێزخستنی لایەنێکی تر چارەسەر ناکرێت2.

1 -Faryer, L.2007."Arab Lawmakers Win Power-sharing Deal,Return to Kirkuk-area Council After Yearlong Boycott."Associated Press,4 December.
2-Ibrahim,M.2007."Arabs and Kurds Reach Accord in Iraq's Kirkuk." Agence France Presse, 3December.

بەوتەی کیگان ڕێکەتنەکە بەچەشنی ڕازیبوونێکی ناوەخنانەی لایەنی عەرەبییە بە دەستووری عێراقی لەنێویشیدا ماددەی(١٤٠)، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پابەندبوونێکی ڕاشکاوانە ئاشکرا بەدی نەکرا.

لەماوەی چەند مانگێکدا کوتلەی عەرەبی داوای هەڵپەساردنەوەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠و هەڕەشەی بایکۆتکردنەوەی ئەنجوومەنەکەی کرد لەپای دواکەوتنی کورد لەجێبەجێکردنی بەندەکانی ڕێکەتننامەکە.

## تەنیا چیاکان دۆستن

ئەو ساڵەی کە دەبوو تیایدا بەسەرکەوتوویی کۆتایی بە گەڕانەوەی"قودسی کورد"ی بهێنرێت لەرووی سیاسیەوە ساڵێکی دژوار بوو.

لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژەکانی ساڵ کورد تەواو گۆشەگیر بوون و لەهەوڵەکانیان بۆ جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠).

لەکانونی دووەمدا ڕاپۆرتێکی ساڵانەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان سەبارەت بە مافەکانی مرۆڤ لەعێراق هۆشیاری دەدات لەو "تەنگژە ناکاوگیرە"ی کەرکووك دەگرێتەوە لەگەڵ دیاریکردنی ڕەوشی ناهەمواری کەرکووك بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە مافی کەمینەکانی عەرەب و تورکمان کە لەروانگەی مافەکانی مرۆڤەوە بەمایەی نیگەرانیەکی زۆر وەسف کراوە١.

بڵاوکردەوەی ئەو ڕاپۆرتە لەبارەی باروودۆخی کەرکووك کە بەشێك بوو لەو زنجیرە ڕاپۆرتانەی گروپی قەیرانە نێودەوڵەتیەکان(خاوەن پێگەیەکی باوەڕپێکراوە) بڵاوی کردنەوە، ئاماژەیەك بوو بۆ کەمبوونەوەی هاوسۆزی لەگەڵ کورد لەسەر ئاستی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا.

هەر لەو ڕاپۆرتەدا ڕەخنە لەپێداگری کورد کرا لەسەر ئەنجامدانی ڕاپرسیەکە و لەهەمان کاتیشدا بەهەڵوێستێکی دیراسە بۆنەکراو وەسفیدەکات و سەرلەنوێ تەئکید لەسەر ئامۆژگاریەکی پێشووتر دەکاتەوە سەبارەت بە بەخشینی باروودۆخێکی تایبەت بە کەرکووك(

---

پارادۆکسەکە لەوەدا بوو کە (عەلی مەهدی) ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك پێشنیازی فۆرمی (٣٢+٣٢+٣٢+٤)کرد بۆ دابەشکردنی دەسەڵات.

1 -UN Assistance Mission to Iraq (UNAMI) .2006."Human Rights Report."1November-31 December:3 www.uniraq.oug/Filelib/misc%20Report%20Nov%20Dec%202006EN.pdf.



PDF 4 KURD

هەرێمێکی فیدراڵیی سەربەخۆ)، کە پشت بە فۆرمێك ببەستێت لەدابەشکردنی دەسەڵاتی نێوان پێکهاتە سەرەکیەکان بەیەکسانی١(ICG April 07).

پاشان رێکخراوی چاودێری مافەکانی مرۆڤ HRW لەمانگی تەمووزدا لەراپۆرتێکیدا هێزە ئەمنییە کوردیەکان تۆمەتبار دەکات بەئەنجامدانی پێشێلکاری فراوان لەوانەش مومارەسەکردنی ئەشکەنجەدان وپشتگوێخستنی بنەما یاساییەکان.

هەتاوەکو ساڵی ٢٠٠٧ زۆربەی رۆژنامەنووسانی خۆرئاوا هەرێمی کوردستانیان بە مێرگێکی نیمچە ئارام و پەرەسەندو لەجێبەجێکردنی پێوەرەکانی دیموکراسی وەسف دەکەن بەڵام لەناوەڕاستی ٢٠٠٧دا گێڕانەوەو سەربوردەیەکی جیاواز سەرهەڵدەدات کە تیایدا باس لەپێشێلکاری مافەکانی مرۆڤ و گەندەڵیو مەخسوبیەت دەکرێت لەئیدارەی کوردیدا.

لەکۆتایی ساڵدا گەورە ماس میدیاکانی ئەمریکا کورد بە زیادەڕۆ وەسفدەکەن لەمەسەلەی پەیوەست بە بۆندە نەوتییەکان و هەڵوێستیان لەسەر پرسی کەرکووك٢.

لەراستیدا کورد لەسەر هەردو پرسەکە لەلایەن سەرجەم لایەنە سیاسیەکانی ناوخۆوە دژایەتی دەکرا.

لەپرسی نەوتدا کورد لە ساڵی ٢٠٠٤وە دەستی کرد بە واژۆکردنی گرێبەست لەگەڵ کۆمپانیا بیانیەکانی کنەکردن و بەرەپێدان و بەرهەمهێنانی نەوت لەهەرێمی کوردستاندا٣.

بەهاتنی کۆتایی ساڵی ٢٠٠٧ حکومەتی هەرێمی کوردستان واژۆی لەگەڵ پتر لە (٢٠) کۆمپانیای جیهانیدا کرد و یاسای هایدرۆکاربۆنی تایبەت بە هەرێمی کوردستانی لە ئابی ٢٠٠٧دا دەرکرد.

---

1-International Crisis Group.2007.Iraq and the Kurds:Resolving the Kirkuk Criss.Middle East Report 64,19April:177-18.

٢- بۆنموونە بڕوانە:

O'hanlon,M.,and O. Taspinar."Time for Kurdish for Realism." The Washington Post,18 February:A15;Radio Free Europe/Radio Liberty.2008."Iraq Kurdish Ambitions Generate Backlash."26January, Rubin,A.2008."Kurds' Power Wanes as Arab Anger Rises." The New York Times,1February. www.nytime.com/2008/02/01/world/middleeast/01kurds.html?scp=2&sq=kurds&st=nyt);Oppel,R.A.2007."Kurds reach New Oil deals,Straining Ties With Baghdad."The New York Times,4 October.
www.nytimes.com/2007/10/04/world/middleeast/04/kurds.html?scp-=3sq=kurds&st=nyt.

٣- کۆمپانیای (DNO)ی نەرویژی یەکەم کۆمپانیا بوو گرێبەستی لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان ئیمزا کردو بەدواشیدا کۆمپانیای Western oilsandsی کەنەدایی هات.

PDF 4 KURD

ی خۆشیەوە حسێن شەهرستانی وەزیری نەوتی عێراقی رایگەیاند، ئەو گرێبەستانە بەبێ رەزامەندی وەزارەتەکەیان ئیمزا کراون و نایاساییین، لەگەڵ ئەوەشدا ئە پاساوانەی کە شەهرستانی پشتی پێبەستبوون ئاشکراو روون و نەبوون١.

جگە لەوەش شەهرستانی هەڕەشەی بێبەشکردنی هەرکۆمپانیایەکی کرد کە بۆندی لەگەڵ کورددا ئیمزا کردبێت بەوەی چیتر ناتوانێت لەگەڵ حکومەتی فیدراڵی گرێبەست واژۆبکات و رێگەش نادرێت هێڵە نەوتییەکانی عێراق لەگواستنەوەی نەوتی بەرهەم هاتوودا بەکاربهێنرێن.

هەرچی کوردیشە بەماددەی(١١١) ی دەستوور داکۆکی لەهەڵوێستی خۆی دەکرد بەوەی ئەو ماددەیە مافی ئەوەیان بەخشیوەتە هەرێمەکان نەك حکومەتی فیدراڵی لەوەی کۆنترۆڵی گشت شتێك بکەن جگە لە "کێڵگەکانی ئێستا" نەبێت، ئەمە جگە لەپەنابردنیان بۆ ماددەی(١١٥)ی دەستوور کە ئاماژە بە دەسەڵاتی هەرێمەکان دەکات و لە تایبەتمەندێتی حکومەتی فیدراڵیدا نییە.

کورد بەهانەیەکی بەهێزی یاسایی و دەستووریی لەدەستدا بوو لەوەی بۆندە نەوتییەکان لەگەڵ رۆحی دەستوور و دەقەکەیدا دێنەوە٢.

بەڵام لەغیابی یاسای هایدرۆکاربۆنی فیدراڵیدا پێناسەی "کێڵگەکانی ئێستا"و دیاریکردنیان پێویستیان بەچارەسەری یاسایی هەبوو٣. دیسان پرسێکی تر بۆ کورد هاتە ئاراوە ئەویش ئەوەبوو کە ئاخۆ کێڵگە نەوتییەکانی ناوچە جێناکۆکەکان دەکەنە ژێر رکێفی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەو پێیەی بەشێکن لە هەرێم٤.

---

١ - نازانرێت گرێبەستیە نەوتیەکانی کورد کام یاسا ئەگەر هەبێت پێشێل دەکەن.

٢ - مەبەست لەدەستەواژەی (کێڵگەکانی ئێستا) لەماددەی ١١٢مەبەستدارە واتە ئەو کێڵگانەی لەداهاتوودا دەدۆزرێنەوە هەرچەندە بەرێوەبردنی ئەو کێڵگانەی کە لەداهاتوودا دەدۆزرێنەوە نەدراونەتە دەسەڵاتی هەرێمەکان بەڵام بەپێی هەر شرۆڤەکردنێکی شیاو بۆماددەی ١١٥ ئەو دەسەڵاتە دەگەڕێتەوە بۆ هەرێمەکان.

٣ - سەرباری ئەوەی پەرلەمانتاران زیاتر لەساڵێك لە مشتومڕی یاسای نەوت و گازی فیدراڵی و نووسینەوەی رەشنووسەکەیدا بوون بەڵام ناوەڕۆکی ناکۆکی ئامێزبوو بەجۆرێك تامارسی ٢٠٠٨دەنگی پێنەدرا. لەراستیدا بۆ کورد یەکێك بوو لەناڕەزاییە سەرەکیەکان. ئەوەبوو کێڵگەکانی نەوت لەهەرچوار پاشکۆی رەشنووسی یاساکەداهاتبوو. هەرچی کوتلەکانی تری وەك سەدرو کوتلەعەرەبیە سوننەکانیشە رەشنووسی یاساکە بەلایانەوە پەسەند نەبوو لەبەرئەوەی دەسەڵاتێکی ئەوتۆ ناداتە حکومەتی ناوەندی لەبەرێوەبردنی پیشەسازی نەوتیدا.

٤ - لەنێو بۆندەکانی بەرهەمهێنان کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لەسەرەتای تشرینی دووەمی ٢٠٠٧ رایگەیاندبوو گرێبەستێك بوو لەگەڵ کۆمپانیای نەوتی نیشتمانیی کوردستانی بۆ برەودان بە کێڵگەی نەوتی خۆرمەڵە. بەگشتی ئەو کێڵگەیە بەشێکە لە کێڵگەی کەرکوك بەڵام دەکەوێتە زەوییەکانی پارێزگای هەولێرەوە کە ئەوەش وادەکات بەشێك بێت لەهەرێمی کوردستان.

ئارەزووی کورد لەوەی کێڵگە نەوتییەکانی ناوچەکەیان یەکلایەنە بەرەوی پێبدرێت نەبووە هۆی پەیداکردنی دۆستی زۆر بەڵکو ئەوەی کورد پێیگەیشت لەکانوونی دووەم و لە میانەی دانوستانەکاندا سەبارەت بە بودجەی فیدراڵی بۆی روونبووەوە ئەویش دوور کەتنەوەی کوتلەکانی تر بوون لێی.

کورد چووە دانوستانەوەو سووریش بوون لەسەر قەرەبووکردنەوەیان لەلایەن حکومەتی فیدراڵی لەبەرامبەر خەرجی بلاوکردنەوەی هێزی پێشمەرگە لەدەرەوەی هەرێم بەلام لەکۆتاییدا دووچاری ململانێیەکی دژوار بوونەوە، تەنانەت لە پارێزگاریکردن لەپشکی بودجەکەیان، کە لە١٧٪ بوو لەبودجەی فیدراڵی١.

ئەوەی کوردی زیاتر نیگەران کردبوو هاوپەیمانێتی بەربلاوی نێوان کوتلە سوننی و شیعە جیاجیاکان بوو بەناوی "لێکتێگەیشتنی نیشتمانی" لە بەرەنگاریبوونەوەی خواستەکانی کورد لەبارەی نەوت و بودجەو کەرکووک٢.

## مەرگی ماددەی ١٤٠

لەکاتێکدا سەرانی کورد کەوتبووە شەڕێکی گرانەوە لەگەڵ بەغداد لەپێناو پارێزگاریکردن لەئاستی ئەو پارەپێدان(تمویل) ەی کە بۆ هەرێمی کوردستان لەئارادابوو، ئەوەبوو لەرووی سیاسییەوە لەئاستێکی ئەوتۆدا نەبوون کە پێداگری بکەن لەچارەسەرکردنی دۆزی کەرکووک٣.

بەر لە نزیکەی هەفتەیەکیش لەکۆتایی هاتنی وادەی دیاریکراو بۆ جێبەجێکردنی ماددەی(١٤٠)، ستیڤان دی میستورا - Stefan De Mistur a ، نێردراوی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان رۆڵی نێوبژیوانی گێڕا لەگەیشتن بە رێکەتن لەسەر دواخستنی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ بۆ ماوەی شەش مانگ.

---

١- کوتلە سیاسیەکان بگرەو بەردەیەکی زۆریان کرد لەوانەش کوتلەی سوننی و سەدرییەکان لەوەی کە دەبێت پشکی کورد لە ١٧٪ ەوە بۆ لە١٣٪ کەمبێتەوە.

٢ - پێدەچوو رێکەوتنی "یاداشتنامەی لێکتێگەیشتنی نیشتمانی"کە ١٥٠ پەرلەمانتاری فرە ئینتیمای لەخۆگرتبوو زۆرینەی پێکدەهێنا کە ئەوەش پەرەسەندنێکی مەترسیداربوو بۆ سەر بەرژەوەندی سیاسەتی کوردی.

٣ - هەرێمی کوردستان لەمەسەلەی بودجەدا بەتەواوەتی پشت بە بەغداد دەبەستێت ، جگە لەوەش زۆربەی داهاتی بەردەستی هەردوحزبە کوردییەکە لەحکومەتی ناوەندییەوە دێن. لەبەرئەوە تەمویلی حکومەتی ناوەندی گرنگە بۆ ئابووری هەرێم و هێشتنەوەی هەردوپارتەکە لەپێگەی هەژمونگەرایی سیاسی خۆیاندا.



PDF 4 KURD

دوای ڕێکەوتەکەش لەلایەن پەرلـەمانی کوردسـتانەوە بەزۆرینـەی دەنـگ لـەکۆتایی کـانوونی یەکەمدا پەسەند کرا بەڵام ڕێککەوتنەکـە لـەبری ئـەوەی پرسـەکە دوابخـات هیچـی نـەکرد جگـە لـەهێنانی چـەند تـوخمێکی نـوێی ئـاڵۆز نـەبێت. بۆنموونـە ڕوون نـەبوو کـە ئەگـەر دواخسـتنی جێبەجێکردنی ماددەکە لەوادەی خۆیدا کە دەستوور بڕیاری لەسەرداوە، واتـەی ئەوەیـە کـە ئـەو ماددەیە ڕەتکراوەتەوە هەروەك ئەوەی زۆرێك لەنەیارانی مـاددەی(١٤٠) جـەخت لـەوە دەکەنـەوە. بەهەمان شـێوە پەنهانییـەك بەهەلومـەرجی یاسـایی ڕێککەوتنـە نارەسمیەکـەی نێـوان نێـردراوی نەتەوەیەکگرتوەکان و سەرکردایەتی کوردی و نوری مالکی سەرۆك وەزیرەوە دیاربوو لەوەی کـە ئایـا دەکرێت بەپراکتیکی بەندەکانی ماددەیەکی دەستووری بگۆڕدرێت.

لەچەند بارێکی هاوشێوەی پەیوەست بە دواکەوتنی جێبەجێکردنی وادە دەستوورییەکان بۆنموونـە ماددەی(١٤٢)، لەگەڕان بەدوای چارەسەردا بە پەنابردن بۆ دەنگدان لەسەر درێژکردنـەوەی وادەکـە لەلایەن پەرلەمانەوە کۆتایی دەهات.

بەڵام بێگومان هەرهەوڵێك بۆ درێژکردنەوەی وادەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ بەدەنگـدانی پەرلەمان شکستی بەدواوە دەبوو، چونکە لەلایەن نەیارانیەوە کـەزۆربوون دژایـەتی جێبـەجێکردنی دەکرا، هەربۆیە دواجار ئەوچارەسەرەی کە کورد ناچاربوون پەسەندی بکەن گواسـتنەوەی ماددەکـە بوو بۆ بەردەم دادگای باڵایدەستووریی فیدراڵی بۆداوەری کردن. بەڵام لەسـەروبەندی ئامادەکاریـەکان بۆ گواستنەوەی ماددەکە، لە٤ی شوباتدا نوری مالکی بڕیاریدا بەهەڵپەساردنی کارکردن بـەماددەی (١٤٠). ئیتر لەو خاڵەدا چارەسەرکردنی پرسی کەرکووك لەسەر بنەمای ماددەی(١٤٠) تـەواو دوور ئاستەم بوو.

PDF 4 KURD

# فەسڵی یەکەم

## ململانێ لەسەر کەرکووك

## کێشەکانی پەیوەست بەجێبەجێکردنی پرۆسەکە

مـــاددەی (١٤٠) بۆچارەســـەرکردنی کێشـــەیەکی ئـــاڵۆز –داهـــاتووی کـــەرکووك و ناوچەدابڕێنراوەکان نووسراوە- و شکستهێنانیشی خزمەت بە رزگاربوون لەکێشە بنەڕەتیەکـە ناکات.

جاگەر بخوازرێت چارەسەرێکی باش بـۆ ئـەو کێشـەیە بدۆزرێتـەوە ك بـۆ عێـراق جێگـەی بایەخێکی زۆرە، ئەوا گرنگە بزانرێت کەبۆچی ماددەی(١٤٠) بێتوانا بووە لەدەستە بەر کردنی ئەو چارەسەرەدا.

بێگومان کارێکی کۆمەڵێك فاکتەر رۆڵیان هەبووە لەشکستی مـاددەی(١٤٠)دا لەوانـەش ئەو ئاڵۆزییە یاسای و لۆجستیەی کە پرۆسەکە هەیەتی، ئەمە جگـە لەهەڵکشـانی هێـزی دژ بەمادەی (١٤٠) لەسەر ئاستی فیدراڵیو بەرتەسکبوونەوەی نفوزی پارتە کوردییەکان.

هەروەها دەکرێت بووترێت کەپشت بەسـتنی سـەرانی کـورد بەسـتراتیژێکی هەڵـە دیسـان پشکی هەبووە لە شکسـتهێنانی مـاددەی (١٤٠). بـەڵام فاکتـەری یـەکلایی کـەرەوە دەقـی ماددەکە خۆیەتی.

بەواتایەکی تر ماددەی (١٤٠) بۆخۆی ئامرازێکی گونجاو نیە بۆ ئەوەی کورد ئامانجەکانی خۆی بەدەستبهێنێت.

PDF 4 KURD

## ئاڵۆزییە یاسای و لۆجستیەکانی ماددەی(١٤٠)

لەرووی تیۆرییەوە بەندەکانی ماددەی ١٤٠ زۆر سادەیە، بەجۆرێك ئەو کەسانەی کە رژێمی پێشوو دووریخستوونەتەوە یان رایگواستوون دەگەڕێنرێنەوە سەر ماڵو موڵکی خۆیان، هەروەها ئەو کەسانەش کە تازە هێنراونەتە ناوچە دیاریکراوەکان، بگەڕێنرێنەوە بۆ سەرزێدی ئەسڵی خۆیان و نیشتەجێبکرێنەوە وەك قەرەبووکردنێکیش پارچەیەك زەوی و بڕێك پارەیان پێبدرێت، لەگەڵ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ گۆڕینی سنووری ئیدارەی پارێزگاکە، کە لەلایەن رژێمی پێشووەوە وەك زوڵمێك دەستکاریی کراوە.

تەواو کردنی ئەو قۆناغەش بەر لە گەیشتن بە چارەسەری هەمیشەیی "ناوچە دابڕاوەکان لەوانەش کەرکووك کارێکی پێویست بوو".

خۆ ئەگەر بۆ کاتێکی کەمیش بێت چاوپۆشی لەگرفتەکانی هەردو قۆناغەکانی تر بکرێن لەگەڵ ئەوەی ئەم بەندانە سەرجەم ناوچە دابڕاوەکان دەگرێتەوە ئەوا جێبەجێکردنی قۆناغی یەکەم لەپرۆسەکە دووچاری ئاڵۆزی تەکنیکی و لۆجستی بووەوە و باڵاترین دەزگای لێهاتووی ئیداریشی هیلاك دەکرد.

لەکۆی ئە چوار رەگەزە کە پرۆسەکە لەخۆی دەگرێت –گەڕانەوەی راگوازراوەکان (زۆربەیان کوردن) و سەرلەنوێ نیشتەجێکردنەوەی هاوردەکان(الوافدین) کە زۆربەیان عەرەبی شیعەن- لەگەڵ چارەسەری کێشەی موڵکداریتی و گەڕانەوەی سنووری ئیداری کەرکووك بۆ بەر لەدەستکاریکردنی لەلایەن رژێمی بەعسەوە، دەسەڵاتدارانی کورد تەنیا دەسەڵاتی زۆریان بەسەر رەگەزی یەکەمدا هەبوو.

دوا بەدوای کەوتنی کەرکووك لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە گەڕانەوەی کوردانی راگوازراو دەستیپێکرد وزۆری گەڕاوەکانیش بێ خانوو وماڵ بوون لەشارەکەدا. هەربۆیە کێشەی موڵکداریتی لەئارادا نەبوو بەڵام دیسان قەزاو ناحیەکوردییەکانی دەرەوەی کەرکووکیش ئە گرفتەگەورەیە نەبوو، چونکە عەرەبی هاوردە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا بەر لەگەڕانەوەی دانیشتوانە رەسەنەکەی کە کورد بوون ئەو جێگایانەیان بەجێهێشتبوو.

PDF 4 KURD

ئەو مەسەلە لۆجستیانەی کە پەیوەستبوون بە وردبوونەوە لـەدەیان و بگـرە سـەدان هـەزار کورد لەدەستەبەرکردنی پێداویستی بنچینەیی وەك کارەباو شوێنی نیشـتەجێبوون وچـاودێریی پزیشکی  و تۆڕی ئاوو ئاوەڕی پێویست هەموو ئەوانە سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی ژێـر خـانی کەرکووکیان دەخواست،  بەڵام هـەرگیز نەویلایەتـە یـەکگرتوەکان و نەحکومـەتی عێـراقیش سەرچاوەی دارایی دابین دەرکرد.

کورتهێنان لەو بودجەیەی کە حکومەتی عێراقـی بۆکـەرکووکی تـەرخان دەکـرد بـەواتای ئەوەی کە دەبوو حکومەتی هەرێمی کوردستان لەرێگەی پارتە کوردییەکانەوە سوود بەژێرخانی ئابووری کەرکووك بگەیەنێت،  دواتریش لەلایەن ئـەمریکاوە لەرێگـەی بەرنامـەی تیمـەکانی سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی پارێزگاکانەوە هاوکاری ژێرخانی ئابووری کەرکووك دەکرا.

لەگەڵ ئەوەی گرفتەکانی پەیوەست بـەراگوازراوانی کـورد لەسـەر ئاسـتی جێبـەجێکردنی قۆناغی ئاسـایی کردنـەوە لـەماددەی ١٤٠گرفتگـەلێکی سـادەی ئیـداری بـوو بـەڵام پارتـە کوردیەکانکە کۆنترۆڵی بەڕێوەبەرایەتیە پەیوەندیدارەکانیان کردبـوو لەتوانایانـدا هـەبوو زەوی دابین بکەن بۆ ئەو کوردە گەڕاوانەی کەپێویسـتیان پێیبـوو،  لەکاتێکـدا زۆربـەی گـەڕاوەکان لەپارێزگا کوردییەکانی ترەوە گەڕابوونەوەو ئەوەش گرفتی گواستنەوەی بەڵگەنامـەکانی تـەواو کەمکردبوەوە.

چارەنووسی ئەوەی کە بە(هاوردە)کان ناودەبران تەحەددیـەکی لۆجسـتی زۆر گـەورەتر بـوو بەجۆرێك دەبوو جیاوازی بکرێت لەنێوان توێژەجیاوازەکانی هاوردەکاندا.

ئەوەبوو زۆرێکیان لەو گەڕەکانـەدا نیشـتەجێ کرابوونـەوە کـە لەلایـەن رژێمـی پێشـووەوە دروستکرابوون لـەپێناو کارئاسـانی پرۆسـەی تـەعریبکردنی شـارەکە،  لەکاتێکـدا بەشـێکی تریشیان راستەوخۆ جێگەی دانیشتوانی رەسەنی شارەکەیان گرتبووەوە.

توێژی سێیەمیش لەهاوردەکان هـاتبوون بـۆ کـڕینی ئـەو موڵـك و ماڵانـەی کـە لـەپاش دوورخستنەوەی خاوەنی ئەسڵی چەند دەستێکی کردبوو.

بێگومان ناچارکردنی هاوردەکان بەرۆیشـتن یـاخود بەجێهێشـتنی شـارەکە بەخواسـتی خۆیـان پرسێکی پڕ لە مشتومڕ بـوو. قـەرەبوو کردنـەوەی ئەوانـەی کـە بۆخۆیـان بەجێهێشـتنی شـارەکە هەڵدەبژێرن پێویستی بە بڕیارێکی سیاسـی هـەبوو بـۆ ئـەوەی قـەبارەی قەرەبووکردنەوەکـە دیـاری بکات،  کەئەوەش تەنیا لەئازاری ٢٠٠٧ بڕیاری لەسەردراو بۆ ئەو مەبەستەش پارەی پێویستی بـۆ

بەرخانکراو ئەو کارەش لەکۆتاییەکانی هـاوینی ۲۰۰۷دا بـەدیهات و پرۆسـەی دەرکردنـی چـێکی بانکیش لە۳۰ ئەیلوولی هەمان ساڵ بۆ ئەو خێزانە عەرەبانە دەرچوو کە لەکەرکووك دەڕۆیشتن.

جگە لەوەش پرۆسەکە پێویستی بەهاوکاری چالاکانەی فەرمانبەرانی پارێزگا ئەسڵییەکان هەبوو بۆ گواستنەوەی کارتی نیشتەجێبوون و کۆبۆنی خۆراك ودابین کردنی زەوی بۆ گەڕانەوەیان.

لەزۆربەی حاڵەتەکانیشدا فەرمانبەرانی دەزگـا بیرۆکراسـیەکانی ئـەو پارێزگایانـە شـیاوی ئـەو ئەرکەنەبوون و ئارەزووی ئەوەشیان نەدەکرد کارەکا بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ۱٤۰ رایی بکەن.۱

هەروەها پرۆسەکە پێویستی بەرەزامەندی وەزارەتە پەیوەندیدارەکانی عێراق هەبوو لەوانەش وەزارەتی ناوخۆ کەزۆرجار ئەو رەزامەندییە رادەگیرا.۲ یەکلایی کردنەوەی کێشەی موڵکدارێتی جۆرە ئالۆزییەکی لەخۆگرتبوو. دیارە سەرباری نوێکردنەوەی دەزگای ئیداری پەیوەست بەوکارە لە حوزەیرانی ۲۰۰٤ بەفەرمانی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی، بەڵام لەگەڵ هەڵپەساردنی ماددەی ۱٤۰ کەیسەکانی پەیوەست بە کێشەی موڵکداری کە ژمارەیان تەنیا لەکەرکووکدا(۵۰)هـەزار کەیس بوو، پێشکەوتنێکی ئەوتۆیان بەدەست نەهێنا کە پێویسـتیان بەگرتنـە بـەری رێکـاری ئیداری هەبوو.

وەك رزگار عەلی سەرۆکی ئەنجوومـەنی پارێزگـای کـەرکووك رایگەیانـد: لەوپارێزگایـەدا بەتـەنیا کـەمتر لـە ٦٪ی کێشـەی موڵکـدارێتی تاکۆتـایی کـانوونی بەکـەمی ۲۰۰۷چارەسەرنەکراون، ئەمە جگە لەنەبوونی یارمەتی دارایی پێویسـت و کـادێری ئیـداریی لێهاتوو بۆ بەگەڕخستنی دەزگای بیرۆکراسی تایبەت بە سکاڵاکانی پەیوەست بەموڵکدارێتی.

دیسان کێشەی گەورەی نێو پرۆسەکە لەوەدابوو کەلەسـەر حسـابی لێهـاتوویی و کـارایی، ئەولەویەت درابووە دەستپاکی و شەفافیەت.

هاوکات بەپێی فەرمانێکی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی کە لەحوزەیراندا دەرچووبوو، سەرجەم سکاڵانی موڵکدارێتی پێویستی بەئامادەکردنی راپۆرتێك هەبوو تا لەلایـەن لیژنـەی خـۆجێی تایبەتمەندەوە لایەنی یاسایی ئەو کەیسە وەك ئەو واقیعەی کـە هەیـە لەگـەڵ پاسـاوی لایەنـە ناکۆکەکان و رێنمایی راوێژکاری لیژنەکە بەپوختی ئامادە بکرێت.

---

1 -Kurdistan Nuwe. 2007. "Iraq's Kirkuk Governor Interviewed on Onership.Other Issues." 6 October ( WNC).

۲- بۆنموونـە سـاڵی ۲۰۰۷، جـەواد بـۆلانی وەزیـری نـاوخۆی عـیراق بەفـەرمانێك گواسـتنەوەی بەڵگەنامـەی بـاری کەسـێکی لەپارێزگاکانەوە قەدەغە دەکات. ئەو فەرمانەش دوای ئەوەهات کە بەهۆی هەڵکشانی توندوتیژی تایەفییەوە پرۆسەیەکی راگواستنی فراوان ئەنجامدراو ئەوەش ئەو بۆکەسانەش بوون کە ماددەی ۱٤۰دەیگرتنەوە.



PDF 4 KURD

هەروەها دەکرێت ئەو یاسایەی کە دواتر لیژنەکە دەریدەکات لەماوەی شەش ڕۆژدا ئیستیئناف بکرێتەوە ئەویش لەرێگەی پێشکەشکردنی نارەزایی نامەیەك بەهۆیەی تەمییز لەبەغدادو ئەوەی پێویستیشە لەسەر دادنووسی فەرمانگەی تەمییز ئامادەکردنی راپۆرتێکی تر دەبێت لەسەر ئەو کەیسەو پێشکەشکردنی بەدادگای تەمییز تا دوا بڕیاری خۆی لەوبارەیەوە بدات.

هەڵبەتە پرۆسەکە وردو خاوێن بوو بەڵام شیاوی دەرکردنی بڕیارەکان نەبوو لەکاتی گونجاودو پێویست بۆ جێبەجێکردنی قۆناغی ئاساییکردنەوە لەماددەی ١٤٠لەماوەیەکی دیاریکراودا.١

رەنگە بکرایە لەرەوشێکی ئارام و لەگەڵ هاوکاری دەزگایەکی ئیداری لێوەشاوەو بەئەزموون ودیسان لەگەڵ یارمەتی سیاسی و ئیداری لەگشت ئاستەکان پرۆسەی ئاساییکردنەوە بەپێی ماددەی ١٤٠لەکاتێکی دیارکراودا بەئەنجام بگەیەنرایە.

بەڵام عێراق کە لەشەڕی ناوخۆییدا نوقم ببوو دەوڵەتێکی شکستخواردو بوو، هەرچی دەزگا ئیدارییەکەشی بوو لێوان لێو بوو بەگەندەڵی و کێشمەکێشی دەستەو گروپەکان.

ئەوەی کە بۆکوردیش کوشندە بوو فەرمانبەرەکانی ئەم دەوڵەت بوو کە لەسەرگشت ئاستەکان فەرمانبەری بیرۆکراسی و دژ بە پرۆژەکانی کورد بوون لەکەرکووکدا.

## پەرەسەندنی هێزی نەیاری دژ بەماددەی ١٤٠

لەسەرەتادا لەسەرئاستی پارێزگا جۆرەسازاندنێکی رووکەش هەبوو سەبارەت بە زەرورەتی راستکردنەوەی هەموو ئەو تاوانانەی کەرژێمی پێشوو دەرهەق بەپێکهاتە ئیتنیکییە جیاوازەکانی کەرکووك ئەنجامیدابوو، بەجۆرێك کارئاسانی بۆ گەڕانەوەی کوردو تورکمان بکرێت بۆ سەر ماڵ و موڵکی خۆیان کە بەزۆرەملێی دەرکرابوون.

دیارە لەنێوان هەردو پێکهاتەی کوردو تورکماندا بەرژەوەندی هاوبەش هەبوو، جگە لەوەش کورد رووبەڕووی دژایەتیکردنێکی گشتگیر بووەوە لەبەرامبەر هەوڵەکانی بۆ خۆسەپاندن بەسەرشارەکەدا ئەویش لەرێگەی زیادکردنی ژمارەیانەوە.

---

١- ئامادەکردنی ئەم پرۆسەیە نموونەیەکی کلاسیکییە لەسەر دوورکەوتنەوەی راوێژکارانی دەسەڵاتی ئیئتلافی کاتی لەشاری بەغدا لەراستییەکانی ژیانی رۆژانە لەعیراقدا.بۆ ئاشنابوون بەچارەسەرەکانی ئەو دوورکەوتنەوانە بڕوانە:

Chandrasekaran, R.2007.Imperial Life in the Emerald City :Inside Iraq's Green Zone. New York: Vintage.

بێگومان سیستمێکی لەو جۆرە بەبێ گرفت لەولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یان ئەورووپای خۆرئاوا کاردەکات بەڵام لەبەغدا کە رۆژانە دادوەران رووبەڕووی ناکاوکۆژی دەبنەوە سیستمێکی بێ سوودوو ئاڵۆزە.

هاوپەیمانی عەرەبی_تورکمانی کە لەناوەڕاستی ۲۰۰۳دا سەریهەڵدا، هاوپەیمانێتیەکی سلبی بوو، واتە تەنیا پاساوی ئەو ڕێککەوتنە بۆ دژایەتیکردنی هەوڵەکانی کورد بوو لەکۆنترۆڵکردنی ئیدارەی شارەکەدا.

هەروەها هەردولا پێکەوە سووربوونی خۆیان لەسەرڕێگریکردن لەجێبەجێکردنی ماددەی۱٤۰بەگشتی وەك وەسیلەیەك پیشاندا، لەگەڵ ئەوەشدا هێزی نەیاری ناوخۆی دژ بە ماددەی ۱٤۰راستەوخۆ هێندە بەرهەڵستکارێکی گرنگ نەبووە.

بایکۆتکردنی عەرەب و تورکمان بۆ ئەنجوومەنی پارێزگاکە کوردی لەو شەرعیەتە بێبەش کرد کە پێویستیان پێیبوو لەمومارەسەکردنی دەسەلاتێکی ئەکتیڤدا.

دیارە دەسەلاتەکانی ئەنجوومەنەکە دەسەلاتێکی سنووردا بوو بەجۆرێك ئەو کەیسە بایەخێکی لاوەکی هەبوو. ئەو بایکۆتکردنە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئەو دیدەی کەجیهانی دەرەوە لێیەوە لەململانێی کەرکووکی دەڕوانی.

بەجۆرێك هێزی دژ بە پرۆژەکانی کورد لەکەرکووك و یەکبوونی ئەو بەرهەڵستکارییە توانییان زۆرێك قایل بکەن بەوەی کە سستبوونی پرۆسەی سیاسی بەپلەی سەرەکی دەکەوێتەئەستۆی کوردەوە. بەوپێیەش ڕێگری کردنی کورد لەدابەشکردنی دەسەلاتی یەکسان و وەك یەك لەگەڵ پێکهاتە ئیتنیکییەکانی تردا رەوایبوونی دۆزی کورد وگەڕانەوەی کەرکووکی بۆ سەرهەرێم لاواز کرد.

هاوکات ئەوەی تورکمان و عەرەب پێکەوە پێداگرییان لەسەر دەکرد کە گوایە جێبەجێکردنی ماددەی ۱٤۰ دەبێتە هۆی شەڕی ئەهلی، لەلایەن زۆربەی ماس میدیاکانەوە بەبێ لێووردبوونەوە پەسەندکراو بەوجۆرەش ئەگەری سەرهەڵدانی کاری توندوتیژی ببووە پاساوێك لەدژی ئەنجامدانی راپرسی۱.

بەتێپەبوونی کات دژایەتی ناوخۆیی لەگەڵ باشبوونی ئاستی ڕێکخستنی پەرەی سەند، ئەوەبوو راستەوخۆ لەدوای جەنگ عەرەبی کەرکووك لەحاڵەتی پەرتبوون و شڵەژاندندا بوون و بەتێپەڕبوونی کاتیش ئەو دەمەی هێزە ئەمنیەکوردییەکان عەرەبیان بەتوندی کردە ئامانج و

---

١- بێگومان کوردیش هەندێك جار بۆخۆیان بەهەمان شێوە پەنایان بۆ بەکارهێنانی ئەو تەکنیکە دەبردو هەڕەشەیان لەبارزانی دەکرد ئەگەر بێتوو ماددەی ١٤٠ جێبەجێ نەکرێت ئەوا شەڕی راستەقینەی ئەهلی روودەدات.

PDF 4 KURD

نیشتنی عەرەبی هاوردەش جا بەزۆر یان ئارەزوومەندانە بووبێت، عەرەبی کەرکووك بۆ داکۆکیکردن لەپرسەکەیان چوونە باری ئامادە باشییەوە.

لەساڵی ٢٠٠٦ ئەنجوومەنی راوێژکاریی یەکگرتوەی عەرەبی لەچوارچێوەی پارت و کوتلە جیاجیاکاندا پێکهێنرا، هەرچەندە ئەنجوومەنی راوێژکاریی عەرەبی خاوەنی ئەزموونێکی سیاسیی نیزامی نەبوو بەڵام رەمزێکی گرنگی بۆ یەکێتی عەرەبی لەبەرەنگاریبوونەوەی خواستەکانی کورد لەعێراق دابین کردو بووە پردێك لەنێوان بزوتنەوە عەرەبییەکانی ناوخۆی کەرکووك١.

هاوکات بوونی لایەنگرانی موقتەدا سەدرلەشارەکەدا هەمان وەزیفەیان هەبوو، کاتێکیش سەدر شکستی خوارد لەهەوڵەکانی بۆ دروستکردنی زەمینەیەك لەکەرکووك تا ملشیای سوپای مەهدی لەشارەکە جێگیر بکات، نوێنەرەکانی رۆڵێکی سیاسی گرنگیان بینی لەجۆشدان و دژایەتیکردنی کورد لەسەر ئاستی ناوخۆی و نیشتمانیدا٢.

سەرئەنجامی سەرەکی ئەو دژایەتی و بەرەنگاریبوونەوەیەی کورد لەسەر ئاستی ناوخۆدا رێگە خۆشکەربوو بۆ دەستێوەردانی دەرەکی لەپرسی کەرکووکدا.

لەسەر ئاستی عێراقیش پارتە عەرەبییەکان بەسوننی و شیعەوە بەرژەوەندییان لەوەدابوو پارێزگاری لەمافەکانی عەرەبی کەرکووك بکەن لەبەرامبەر زوڵمی کورددا، تورکیاش لەلایەن خۆیەوە رێگەی خۆشکرد تا بەرگری لە تورکمانەکان بکات، لەسەر ئاستی نیشتمانیش ئاراستەکان رووەو دروستکردنی بەرهەڵستیەکی رێکخراوتر بوو بۆ روو بەڕوو بوونەوەی کورد.

ئەوەبوو لەدوای بایکۆتکردنی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥ نەیارە سەرەکییەکانی کورد لەپرسی کەرکووکدا پارتە عەرەبیە سوننەکان و موقتەدا سەدر- خۆیان بەدوورگرتبوو لەنووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی. لەبەرئەوە گۆڕەپانەکە بۆ هاوپەیمانی نێوان کوردو ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی (ئەو کات)چۆڵکرابوو تا دەستوور و ناوەڕۆکی دوا دەقی دەستوورەکە ئامادە بکەن.

---

- کوتلەکانی ژێر چەتری ئەنجوومەنی راوێژکاری عەرەبی خاوەنی شەش کورسی بوون لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك و نزیکەی 1٠٥کورسیش لەپەرلەمانی عیراق.

٢- لەکۆتایی ٢٠٠٣ و سەرەتای ٢٠٠٤ هەوڵەکانی موقتەدا سەدر لەپێناو دامەزراندنی فیرقەیەکی سەر بە سوپای مەهدی لەکەرکوك دەستیپێکرد ئەویش بەسەرپەرشتی نوێنەرەکەی عەبدولفەتاح ئەلموسەوی . دوای راپەڕینی یەکەمی سەدریش لەنیسانی ٢٠٠٤دا هێزە کوردی و ئەمریکاییەکان هەڵیان کودتایە سەر مزگەوتی ئەلموسەوی و لە کەرکوك دوورخرایەوە.

سەربای ئەوەی رۆژێك لەرۆژان سەركردایەتی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لـەعێراق پەرۆشی خواستی كورد نـەبوون لەگەڕانـەوەی كـەركووك بـۆ سـەر هـەرێمی كوردسـتان بـەڵام ئامادەبوون پشتیوانی لەماددەی ١٤٠ بكەن ئەویش لەچوارچـێوەی سـەودانامەیەكی گـەورەدا كە دەرفەت بەئەنجوومەنی باڵا بدات بـۆ ئـەوەی لەسـەركاركردنی لەدروسـتكردنی هـەرێمێكی شیعە نشین كە لە(٩) پارێزگای باشوور پێكدێت بەردەوام بێت.

بەشداریكردنی پارتە عەرەبیە سوننەكان و سەدرییەكان لەهەڵبژاردەكانی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٥دا كاریگەریەكی گرنگی هەبوو لەسەر تەرازووی هێزە سیاسـیەكانی بەغـداد، ئـەوەبوو دوو كوتلەی سوننی لەهەڵبژاردنەكانەكانـدا بـە(٥٥) كورسـی نێـو پەرلـەمان هاتنـە دەرەوە، لەكاتێكـدا كوتلـەی سـەدری لـەكۆی (١٢٨) كورسـی كـە ئیئـتلافی یـەكگرتووی عێراقـی بەدەسـتیهێنابوو تـەنیا (٢٩)كورسـیان بۆخۆیـان مسـۆگەر كردبـوو لەگـەڵ (٢) كورسـی پەیامخوازەكان كە ئینتیمایان بۆ سەدرییەكان هەبوو.

جگە لەو كوتلەیەش پارتی فەزیلـە (١٤)كورسـی و حزبـی دەعـوە- رێكخسـتنی عێـراق (١٢)كورسی ولیستی نیشتمانیی عێراقییە (٢٥) كورسی وهەرهەمووشیان لەپرسـی كـەركودا بەئاستی جیاجیا دژ بە كوردن.

لەبەر ئەوە لەهەڵبژاردنەكانی كانوونی بەكەمدا زۆرینەیەك لەپەرلەمانتاران پەیـدابوون كـە دژ بەجێبەجێكردنی ماددەی ٥٨/ماددەی ١٤٠بوون[1].

سـەرباری ئـەوەش پێكهێنـانی حكومـەتی یـەكێتیی نیشـتمانی كـە زۆربـەی ئـەو كوتلانـەی لەخۆگرتبوو، بەرهەڵستكارانی ماددەی ١٤٠ ی لە پێگە بەهێزەكانی دەسەڵاتی حوكمڕانیدا دانابوو.

هەرچی قۆناغی ئاسایی كردنەوەش بوو كە مـاددەی ١٤٠ لـەخۆی گرتـووە پێویسـت بـە هاوكاری چالاكانەی وەزارەتە جۆربەجۆرەكانی بەغداد هەبوو، لەنێویشیاندا هـەردو وەزارەتـی ناوخۆوو بازرگانی كە لەچانسی ئەو كوتلەو كەسایەتیانەدا بوون، كە لەباشترین باردا بەسـاردو سڕی مامەڵەی لەگەڵ رادەستكردنەوەی كەركووك بۆ كورد كردووە.

---

١- ناتوانرێت ژمارەی ئەو پەرلەمانتارە نەیارانەی ماددەی ١٤٠دیاری بكرێت چونكە ئیئتلافی یەكگرتووی عیراقی كە ژمارەیەك لـە كەسانی سەربەخۆوی لەخۆگرتبوو ، ئەمە جگە لـەوەی هەنـدێك لایـەن لەوانـەش حزبـی دەعـوەو لیسـتی عیراقییـە هەڵوێسـتێكی یەكگرتوویان نەبوو لەبەرامبەر ئەو پرسەدا. هەروەها جیاوازی لە راو بۆچووندا هەبوو هەندێك لەگەڵ رەتكردنەوەی مـاددەی ١٤٠ و هەندێكیش لەگەڵ دواخستنی راپرسییەكەدا بوون و ئەو بەیاننامەیەش كە لە كانوونی دووەمی ٢٠٠٨ بـەئیمزای ١٥٠ پەرلـەمانتار دەركرا لەدژی جێبەجیچكردنی ماددەی ١٤٠ ئاماژەیەكە بۆ قەبارەی نەیارانی ئەو ماددەیە لەئەرلەماندا.

هەڵبەت جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠بەپێی ئەو وادەیە کە دیاریکرابوو پێویست بە هاوکاری راستگۆیانەی سەرجەم قەوارە بەشداربووەکانی پرۆسەکە هەبوو.

کێشەی کوردیش لەوەدابوو کەتەنانەت ئەو کوتلانەش کە سەرسەختانە دژ بەجێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠نین، ئەوەندە پەرۆشی تەرخانکردنی کات و سەرچاوەی دارایی پێویست نەبوون لەجێبەجێکردنی پرۆسەکەدا کە هێشتا لەلای زۆرێك لەهاوڵاتیانی عەرەب رەتدەکرایەوە.

هاوکات هێزی بەرهەڵستکاری دژ بە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ لە ئەنجوومەنەکەدا ئەگەری بەکارهێنانی پرۆسەی تەشریعی بۆ درێژکردنەوەی وادەکە کە لەکانوونی یەکەمی ٢٠٠٧ تەواودەبوو لەباربرد١.

کورد باش دەیزانی کە ئەنجوومەنەکە لەسەر درێژکرانەوە رازی نابێت بۆیە بەناچاری پشتیان بەو رێککەوتننامەیە بەست کە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام دیسان خاوەن دەسەڵاتێکی دەستووریی گومانداربوو٢. بەجۆرێك ماددەی ١٤٠ لەسەر زەوی فشۆڵ دەبێت و بەناویش بەدەست دادگای فیدراڵییەوە دەبێت.

لەتەك گەڵاڵە بوونی بەرهەڵستی لەسەر هەردو ئاستی ناوخۆی و نیشتمانی، کورد لەدەوڵەتانی هاوسێوە روو بەرووی دوژمنی چاوەڕوانکراو بووەوە.

ئەو تەنیا خاڵەی کە سەرجەم دەوڵەتانی ناوچەکە لە سەری کۆك بوون لەعێراقدا زەرورەتی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی عێراق بوو بەسەر پێکهاتە ئیتنیکی- تایەفیەکاندا. تەنیا خەمی ئەو دەوڵەتانە ئەوەبوو کە کورد دەست بەسەر کەرکوك و کێڵگە نەوتیەکانیدا بگرێت و ئەوەش لەسەر بەخۆبوونیاندا فاکتەرێکی یاریدەدەر بێت.

دیارە تورکیا زیاتر لەلایەنەکانی تر لەبەرژەوەندیدا بوو دژ بەوە بێت، جگە لەئێران و سوریا، ئەنقەرە ترسی ئەوەی هەبوو سەربەخۆبوونی کوردستانی عێراق کاریگەری لەسەر کوردەکانی هەبێت کە لەباری چەوسانەوەدان.

---

١- لەزۆر باری هاوشێوەدا لەدرێژکردنەوەی دووبارەی کاری لیژنەی هەمواركردنی دەستووردا سەرۆك وەزیر پشتی بە دەنگدانی پەرلەمان دەبەست.

٢- پاساوەکە ئەوەبوو کە سەرپەرشتی کردنی رێککەوتنێك لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە رێککەوتنێکی دەستووری دەبێت چونکە بڕگەی(ب) لەماددەی ٥٨ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت رێگە بەنێوبژیوانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەدات چارەسەری چەند لایەنێکی دیاریکراوی پرسی کەرکوك بکات کە لەباشترین حاڵەتدا جێگەی پرسیار بووە.

ئەو بڕگە پەیوەندیدارە تەنیا ئاماژە بەوە نێوبژیوانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەدات لەچارەسەرکردنی ئەو گۆڕانکاریانەی کە بەسەر سنووری ئیداری کەرکوکدا هاتووە نەك پرۆسە سەرەکیەکەی کەرکوك کە سێ قۆناغی لەخۆگرتووە.

هەرگیز رۆژێك لەرۆژان نیگەرانی تورکیا لەبەرامبەر نەهامەتیەکانی هاونەژادە ستەملێکراوەکانی لەکەرکووك ئاشکراو وەك پێویست نەبووە١. گرفتی تورکیا لەوەدابوو کە بژاردەیەکی وای لەبەردەمدا نەبوو توانای مانەوەی مسۆگەر بکات. سووربوونی کوردیش لەسەر پابەندبوونی بەدەستوورەوە وایکردبوو پاساوێکی گونجاو لەبەردەم تورکیا نەهێڵێتەوە بۆ ئەوەی پەنا بۆ دەستێوەردانی سەربازی بەرێت تارێگری لەکورد بکات دەست بەسەر کەرکووکدا نەگرێت. جگە لەوەش هەرهاتنە ناوەوەیەکی سەربازی بۆ نێو قولایی باکووری عێراق مەترسییەکی بێ مانایە، چونکە هەرهەڕەشەیەك بەدەستێوەردان بێ پشتیوانی دەبوو٢. بۆیە نفوزی تورکیا بەجۆرێك لەجۆرەکان سنووردابوو کە ئەوەش بەپلەی سەرەکی خۆی لەوگۆشارە دیپلۆماسیەدا دەبینییەوە کە لەدژی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەکاری دەهێنا بۆ دواخستنی راپرسیە چاوەڕوانکراوەکەو جۆشدانی رای گشتی جیهانی بۆ دژایەتی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠.

بەرپرسانی تورك لەرێگەی گوتارەکانیانەوە توانیان ئەو وێنایە دروست بکەن کە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠عیراق بەرەو شەڕێکی گشتگیری ئەهلی دەبات وجەنگی هەرێمی لێدەکەوێتەوە٣. بۆیە لەبارێکی وەهاشدا لەبەردەم تورکیادا تەنیا بژاردەی دەستێوەردان لەبەردەمیدا دەبێت. هەڵبەتە ئاسانیش نیە مەزەندەی کاریگەری ئەو گوشارە دیپلۆماسیەی تورکیا بکرێت لەسەر حسابی ئیدارەی بوش لەبارەی کەرکووکەوە، چونکە لەلایەکەوە کورد بەپێچەوانەی تورکەوە چالاکانە بەشدارییان لەپرۆسەی ئازادکردنی عێراقدا کردو دواتریش وەك تەنیا هاوپەیمانێکی متمانە پێکراوی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەشەڕی دژ بە گروپە

١- وەك زۆرێك تێبینی ئەوەیان کردووە ئەنقەرە لەسەردەمی سەددام حسێندا بایەخێکی ئەو تۆی نەداوە بە تورکمان و ئەو زوڵمەی کە دەرهەقی کراوە.

١ — دەستێوەردانی سەربازیی بۆ داگیرکردنی کەرکوك دەبووە هۆی لەباربردنی دەرفەتی بەئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپا و بێزارکردنی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی، ئەمەجگە لەوەی دەستێوەردانێکی لەوجۆرە کارێکی مەترسیدارە چونکە پانتاییەکی زۆری خاکەکە بەدەست کوردەوە بوو کە ئەوەش وایدەکرد خۆی روو بەڕووی کاری چەکداری و پەلامار بکاتەوە. کێشەی گەورەتریش نەبوونی ستراتیژێك بوو بۆ هاتنە دەرەوەیەکی روون و ئاشکرا.

٢- تورك هەوڵیشیدا پرسی کەرکوك بە بوونی بنکەکانی پەکەکە لەنێو خاکی کوردستانی عیراقدا ببەستێتەوە ، بەلام لەرووی لۆژیکەوە هیچ جۆرە پەیوەندیەك لەنێوان ئەو دوو پرسەدا نەبوو بەڵام لەتشرینی یەکەمی ٢٠٠٧بەدواوە زنجیرەیەك ئۆپەراسیۆنی سوپای تورکیا بۆ سەر بنکەو بارەگاکانی پەکەکە ئەنجامدراو ئەوەش بووە هۆی دروستکردنی نائارامی لەناوچەکەدا و تا وادەی راپرسیەکەش لە کانوونی یەکەمدا ئەو بارودۆخە بەردەوام بوو.

حەددارییەکان مانەوە١. لەلایەکی ترەوە ئەمریکا سەچڵی دەکرد لەگەڵ سەرجەم کوتلەکانی تری عێراق و دەوڵەتانی ناوچەکە ئەگەر بهاتبایە قورسایی خۆی لەپشت جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ەوە دابنایە.

دواجاریش ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دژ بە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ نەبوو بەڵام هەوڵێکی راستەقینەشی نەدا بۆ پێشتیوانیکردنێکی چالاکانە لەپرۆسەکەدا. لەبەرئەوە گرفتی کورد بەتەنیا لەگەورە بوونی هێزە نەیارەکانی ماددەی ١٤٠ نەبوو بەڵکو لەنەبوونی پشتیوانیەکی ئیجابیدا بوو لەهەرسەرچاوەیەکی دیکەوە.

**ئایا کەموکورتییەکە لەوستراتیژەدا بوو، کە سەرانی کورد پەیڕەویان کردووە؟**

شکستی سەرکردایەتی کورد لەگەڕانەوەی کەرکووك بۆ کورد کە لەچاوەڕوانیدا بوون، کاردانەوەیەکی توندی لەنێو راگەیەنراوی کوردیدا لێکەوتەوە.

راگەیاندنە جیاجیاکان لەتاراوگە رەخنەکانیان ئاراستەی هەردو حزبە کوردییەکە دەکردو شکستی کەرکووکیان دەگەڕاندەوە بۆ گەندەڵی و مەحسوبیەت ونەبوونی لێهاتوویی و پشتگوێخستنی لەلایەن تاڵەبانی و بارزانییەوە.

لەناوخۆشدا میدیای کوردی هەڵسەنگاندنێکی هاوسەنگ و لەبارو وردتری پێشکەش دەکرد، بەجۆرێك کە پشکی گەورە لەبەرپرسیارێتی دەخرایە ئەستۆی حکومەتە یەك لەدوا یەکەکانی عێراق کە کەتەرخەم بووە لەجێبەجێکردنی ماددەکانی(٥٨، ١٤٠) لەکاتی گونجاولەسەردەمی ئیبراهیم جەعفەریشدا بەئەنقەست هەوڵی لەباربردنی پرۆسەکە درا. بەڵام سەرکردایەتی کوردیش لەو گلەییە دەربازیان نەبوو بەڵکو دووچاری رەخنە بوونەوە کە خۆیان لەم سێ خاڵەدا دەبینییەوە:

یەکەم: هەردو حزبەکە ئەولەویەتی کاریان بەخشیبووە بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی لەسەر حسابی گەڕانەوەی کەرکووك.

---

١- توانای هێزە کوردییەکان لە پاراستنی ئۆقرەیی و ئاسایش لە هەرێمی کوردستان و باکووری عێراق بەگشتی بەلای ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە سوودمەند بوو چونکە ئەوە وایکردبوو هێزەکانی ئەمریکا خۆیان بە ناوچەکانی تری وەك بەغداو دیالەوە سەرقاڵ بکەن کە توندو تیژی تیایاندا زیاتر بوو. هەروەها کورد بەناردنی هێزی پێشمەرگە بۆ فەلوجە لەماوەی گەمارۆدانیدا لە یەکی نیسانی ٢٠٠٤دا بەشداری کرد، ئەمەجگە لەناردنی پێشمەرگە لەچەند بۆنەیەکدا بۆ شاری بەغدا.

دووەم: سەرانی کورد شکستیان هێناوە لەبەگەڕخستنی پێگەی بەهێزی سیاسی کوردلەسەرئاستی فیدراڵی بۆ سەپاندنی چارەسەری پرسەکە.

سێیەم: وردەکاری پرۆسەی پەیوەست بەماددەی ١٤٠نەبووە جێگەی بایەخێکی ئەوتۆ بەتایبەتیش داڕشتنەوەی بەندە پەیوەندیدارەکان. وادیارە ئەو ڕەخنانە جۆرە راستگۆییەکی پێوەدیارە چونکە کەرکوك جێگەی بایەخەو دەبوو رکابەری نێوان هەردو حزبە کوردییەکە بوروژایە هەروەك زۆرێك لەچاودێران و بگرە بەرپرسانی کوردیش تێبینی ئەوەیان کردبوو، کە هەوڵەکانی هەردو حزبەکە بۆ تۆکمەکردنی نفوزی خۆیان بووە لەکەرکوك لەسەر حسابی یەکترو، ئەوەش وایکردووە کارێکی زۆر گران بێت. کە بێگومان سەرئەنجام بووە هۆی بەهەدەردانی سەرچاوەکان، کەدەکرا بەشێوەیەکی بەسوودتر کەڵکی لێوەبگیرایە١.

ڕۆژنامەی هاوڵاتی کە بەرۆژنامەیەکی سەربەخۆ دەناسرێت و بەتوندی رەخنە لەهەوڵەکانی ئەو دووحزبە دەگرێت لەکەرکوك دەڵێت: ئەو دوو حزبە سەرقاڵی کۆکردنەوەی هەڕەمەکیانەی خەڵکن لەدەوری خۆیان.

هەروەها تایستا نەیانتوانیوە خانوو لەقوڕیش بۆ ئاوارە گەڕاوەکان لەوشارەدا دروست بکەن٢. بەڵام ئەوەی کەروون نییە ئەوەیە کە ئاخۆ کێبڕکێی نێوان ئەو دوو حزبە کاریگەری راستەوخۆی لەسەر هەرەسی پر ۆسەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ هەبووە.

ڕۆژنامەی هەولێر پۆست لەناوەڕاستی ساڵی ٢٠٠٦تۆمەتێکی مەترسیدار ئاراستەی جەلال تاڵەبانی دەکات بەجۆرێك رۆژنامەکە گومان لەوە دەکات، لەوەتەی تاڵەبانی بووەتە سەرۆك کۆماری عێراق هەموو کاتی خۆی تەرخانکردووە بۆ بەرگریکردن لە عەرەبی سوننەو ستایش کردنی شیعەو ماچکردنی سەران و وەزیرا و باڵیۆزان.

---

1-BBC Monitoring Middle East- Political. 2006. "Iraqi Kurdish Media Note on Corruption 2- 15 June ( LN); BBC Monitoring International Reports . 2006 " Iraqi Kurdish Media Note on Corruption 30 Jul to 11 Aug." 13 August (LN).

بۆ زانیاری زیاتر لەسەر بۆچونی ئەو بەرپرسە کوردە لەسەر رۆڵی ئەو دوو پارتە بڕوانە:

Hawlati.2007 . "Iraq's Kirkuk Governor Admits Parties' Invitation in Administration ." 27 January ( WNC).

1-Hawlati .2007. " Will the Kurdish leaders admit the demise of Article 140?" 7August (WNC).

هاوكات تالْهبانی تۆمەتبار كراوە بەكار كردن بـۆ پاراسـتنی بەرژەوەنـدی(ی.ن.ك) لەسـەر حساب و بەرژەوەندی كورد، بەدیاریكراویش رۆژنامەی هـەولێر پۆسـت ئامـاژەی بـەهۆكاری شكستی تالْهبانی كردووە لە بەگەڕخستنی پۆستەكەی لەئەنجوومەنی سەرۆكایەتی بۆ گەڕانەوەی سنووری ئیداری كەركووك بۆ بەر لەوەی لەلایەن رژێمی بەعسەوە دەستكاری بكرێت.

بەپێی ئەو رۆژنامەیە ئەگەر سلێمانی دەستبەرداری قەزای چەمچەماڵ بوایە بـۆ كـەركووك ئەوا ژمارەی ئەو دەنگدەرانەی كە دەنگیان بۆ(ی.ن.ك)دابوو لەنێو سنووری ئیدارەی پارێزگـای سلێمانیدا دەنگەكانیان بۆ بەرزبوونەوەی ژمارەی دەنگـدەرانی كـەركووك دەبـوو. لەبـەر ئـەوە لەودەمەدا هـەر گۆڕانكارییـەك لەسـنووری ئیـدارەی پارێزگاكانـدا روویبدایـە لەبەرژەوەنـدی یەكێتیدا دەبوو١.

هاوكات بەرپرسانی (ی.ن.ك) ئەو تۆمەتانـەیان بەتـەواوەتی رەتكـردەوە بـەلاّم رۆژنامـەی هەولێر پۆست ئەوەی روونكردوەتەوە كە جەلال تالْهبانی ئامادەیـە كـەركووك بكاتـە قوربـانی بەرژەوەندییەكانی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان.

توندترین رەخنەی میدیای كوردیش كە تەركیزی كردوەتە سەر شكستی ستراتیژی سـەرانی كورد لەلایەن رۆژنامەی هاولاّتیەوەیە كە پرسیار لەسەر پێداگری سەرانی كورد دەكات لەسـەر یەكڕیزی سوننەو شیعەكانی عێراق و ئامادەییان بۆ پشـتیوانیكردنی حكومـەت بـەبێ ئـەوەی هەڵوێستی سیاسی بەهێزی كورد وەك گوشارێك لەسەر بەغدا بۆ جێبەجێكردنی ماددەی ١٤٠ بەگەڕبخرێت.

تەنانەت هەندێك لەماس میدیاكان سـەرانی كـورد تۆمـەتبار دەكـەن بـەوەی كـە زۆرێـك لەبڕیارەكانی پەیوەست بە ماددەی ١٤٠یان پەسەند نەكردووە٢. هاوكـات رۆژنامـەی چـاودێر نزیك بە (ی.ن.ك) ئاماژەی بەوە كردووە كـە سـەركردایەتی كـورد هـەرگیز رۆژێـك پلانێكـی داڕێژراوی نەبووە بۆ گەڕانەوەی كـەركووك. هـەروەها هـەژمونی ئەقڵیـەتی سیاسـیی حزبـی

1-BBC Monitoring International Reports .2006 . "Kurdish Editorial Criticizes Iraqi President for not Helping Kurds ."10 May(LN).

2 - Hawlati .2007. "Will the Kurdish leaders admit the demise of Article 140 ?" 7 August (WNC).



PDF 4 KURD

سەبارەت بەگەڕانەوەی کەرکووك و ناوچە بەعەرەبکراوەکانی تر بۆ سەر هەرێمی کوردستان بەلای هەموانەوە ئاشکرایە١.

قادر عەزیز نێردراوی تایبەتی بارزانی بۆ کاروباری تایبەت بەماددەی ١٤٠- لایەنی کوردی تۆمەتبار دەکات لەشکستهێنان و نەقۆستنەوەی ساتەوەختە یەکلاییکەرەوەکانی پاش جەنگ بۆ خستنە رووی پرسی کەرکووك بەهێزێکی گەورەتر چ جای شکست هێنانیشی لە بەگەڕخستنی پێگەی بەهێزو سەنگی لەبەغدا وەك گوشارێکی سیاسی توند بۆسەر دەسەڵاتدارانی بەغدا٢.

دیارە ئەو جۆرە رەخنانە شیاو نین بەڵام لەبابەخی ئەو هەوڵانە کەمدەکاتەوە کە سەرانی کورد داویانە بۆ بەکارهێنانی هێزی سیاسییان لەپێناو جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ و پەنابردن بۆ ئەو بژاردانەی لەبەر دەستیاندا بووە.

ئەوەی پەیوەستە بەخاڵی یەکەم سەرانی کورد هێزی دانوستانی خۆیان بەکارهێناوە بۆ زامنکردنی باپەندبوونێکی نادیار بەڵام ئەوە بۆ کەرکووك لەیاسای ئیدارەی کاتیدا گرنگ بووە.

پاشان داوای بەڵێننامەیەکی نووسراویان لەئیبراهیم جەعفەری سەرۆك وەزیر کرد بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ٥٨ی یاساکەو ئەو داوایەشیان بەدەستهێنا، بەڵام کاتێك جەعفەری پایەندی بەڵێنەکەی نەبوو کورد ئە هێزە بزوێنەرە سەرەکیە بوو کەرێگەی نەدا جارێکی تر جەغفەری بۆ سەرۆکایەتی حکومەت خۆی کاندید بکاتەوە.

دیسان لەبەرامبەر پشتیوانیکردن لەحکومەت یەکێتی نیشتمانیی عێراق بەسەرۆکایەتی نوری مالکی مەرجی رێککەوتنێکی نووسراویان کرد بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠.

دواتر مالکی پابەندبوونی حکومەتەکەی بەماددەی ١٤٠وە راگەیاند، ئەویش لەمیانەی ئەو وتەیەی کەتیایدا بەرنامەی حکومەتەکەی پێشکەش کرد.

لەهاوینی ساڵی ٢٠٠٧دا سەرانی کورد هەڕەشەی پاشەکشەیان لەحکومەت کرد ئەگەر بێتوو هەوڵەکانی بەجددی بەگەڕ نەخات سەبارەت بەپرسی کەرکووك.

1 - Chawder ( BBC Monitoring Middle East – Political ). 2007 ." Iraqi Kurdish Leaders fail to Return Kirkuk to Kurdistan Region –Paper ." 21 September ( LN).

2 - Hawlati ( BBC Monitoring International Reports .) 2007." Iraqi Kurdish Official Blames Government ,Kurds for failures on Article 140." 11 October (LN).

دیارە ئەو پاشە کشەکردنە لەحکومەت دەبووە هەرەس هێنانی حکومـەت[1].بـەڵام گـرفتی کورد لەوەدابوو کـە ئەگـەر بـەر لەپاشەکشـەکردنی ژمارەیـەك کوتلـەی گـرنگ لەحکومـەت بکشـانایەتەوەئەوا بـەزەرورەت حکومـەت هەرەسـی نـەدەهێنا، چـونکەحکومەتی یـەکێتی نیشتمانی لەپێکهاتە بنەڕەتیەکەیدا لەکۆی ٢٧٥کورسی خاوەنی ٢٤٠ کورسی پەرلەمانی بوو، ئەوەش بەواتای کورسییەکانی هاوپەیمانی کوردستان کە ٥٣ کورسی بـوون، لـەرووی ژمـارەوە پێویست نەبوون بۆ ئەوەی حکومەت پارێزگاری لەزۆرینەی نێو پەرلەمان بکات.

لەدوای پاشەکشەی ئەو کوتلانە گرفتەکە بەجۆرێکی تر دەبوو کە بەدڵنیاییەوە پاشەکشـەی کورد دەبووە هۆی هەرەسی حکومەت بەڵام ئەو کات کوتلەی نیشتمانی لەپەرماندا لەزۆرینەی پرسە گرنگەکاندا دژایەتی کوردی دەکرد ئەوەش لەرووی تیۆرییەوە بـەلانی کـەم رێگـەی دەدا حکومەتی بەدیل بەبێ بەشداریکردنی کورد دروست بکرێت و نەیاری سەرەکی بەرژەوەندیەکانی کورد بێت. لەبەر ئەوەپاشە کشەکردن لەحکومـەت بـەهۆی جێبـەجیکردنی مـاددەی ١٤٠ەوە مایەی هەڕەشە بوو بۆ کورد لـەوەی بـێ بـەش بکرێـت لـە وەرنـەگرتنی پۆسـتە بـەهێزەکانی دەسەڵات، بێئەوەی ئەوەش بەزەرورەت ئەنجامی ئەرێنی بۆ پرسی کەرکووك هەبێت. بەو جۆرە پەنابردن بۆ هەڕەشەی پاشەکشەکردن ئەو چەکە سیاسییە نەبوو کە لەرابردوودا پەنای بـۆدەبرا. تەنیا بژاردەی بەدیل بۆ کورد جگە لە راگەیاندنی سـەربەخۆیی یەکلایەنـە هەڕەشـەکردن بـوو لەسەر لەبەری پرۆسەی سیاسی.

بەدڵنیایشەوە پاشەکشەی پارتە کوردییەکان لەپرۆسەی سیاسیدا لەحاڵەتێکدا دەبوو پـەنای بۆ ببرێت کە تەنگژەی سیاسی بتەقاندایەتەوەو حکومەتی عێراقی ناچـاربکردایە بـەپیر پرسـی کەرکووکەوە بچووبایە.

باشترین کات بۆ پەنابردن بۆ ئەو هەڕەشەیە ماوەی نێوان هەڵبژاردنی کانونی دووەی ساڵی ٢٠٠٥ و پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی بوو لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥دا.

ئەوەبوو لەو ماوەیەدا عەرەبی سوننە بەتەواوەتی لەپرۆسەی سیاسی پاشەکشەیان کردبـوو، خۆ ئەگەر کوردیش بەبێ حسابکردن بەهەمان شێوە لەپرۆسەی سیاسیدا پاشەکشـەی بکردایـە رەنگ بووشتێکی ئەوتۆ رووینەدایە.

---

١- ئەوکاتەی کورد هەڕەشەی کرد، سەدرییەکانو بەرەوەی تەوافوقی عیراقی ولیستی عیراقییە هەرهەموویان بـەهۆکاری جیاجیـا لەپێشتردا لەحکومەت کشابوونە دواوە.

بۆیە دەبوو حسابی خۆیان بکردایە کە ئـاخۆ هەڕەشـەی لـەباربردنی سـەرلەبەری پرۆسـەی سیاسـی خزمـەت بەبەرژەوەنـدی کوردەکـان دەکـات یـاخود بەشـداریکردنیان لەپرۆسـەی ئامادەکردنی دەستووردا دەکرێت بەرژەوەندی کورد لەسەر بنەمای هەمیشەیی بەهێز بکات.

گرفتە راستەقینەکە لەوەدابوو کە هەڕەشەی پاشەکشەکردن پێویستی بەراسـتگۆیی هـەبوو چونکە باجەکانی ئەو جۆرە هەنگاوانە زۆر دەکـەوتن. چـونکە هـاولاتی ئاسـایی باجـەی دەدا لەبەرئەوەی ٩٠٪ی بودجەی هەرێم پشت بەداهاتی نەوتی حکومەتی ناوەندی دەبەستێت.

بەر لەوەش پشکی هەرە گەورە لـە بودجـە، ئـەوەبوو کەلەچوارچـێوەی نـەوت بەرامبـەر بەخۆراك پشتی پێدەبەستراو لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە سەرپەرشتی دەکرا.

لەبەرئەوە هەرێم وەك قەوارەیەکی خاوەن ئۆتۆنۆمی نـەبوو، نەیـدەتوانی رۆژێـك لـەرۆژان لەرووی ئابوورییەوە پشت بەخۆی ببەستێت، بۆیە پاشەکشەکردن لەپرۆسەی سیاسـیدا دەبـووە هەڕەشەی بڕینی سەرجەم سەرچاوی داراییەکانی هـەرێم ١. جگـە لـەوەش پاشەکشـەکردنەکە دەبووە بێبەشکردنی هەردوو حزبەکە لەدەستەبەرکردنی دارایی پێویسـت بـۆ پێـدانی موچـەی زۆربەی فەرمانبەرانی هەرێم، لەنێویشیاندا پێشمەرگە٢.

بەئاوڕدانەوەیەکیش لەدواوە دەبینین سەرانی کورد لەحسابکردنەکانیاندا هەڵـەیان کـردوە، بەلاَم لەو دەمەدا وادەردەکەوت کورد لەتوانایدا هەیە سەرجەم ئامانجەکانی بەدیبهێنێت، جگە لـە سـەربەخۆبوونی راسـتەوخۆ نـەبێت، ئـەویش لەرێگـەی پرۆسـەی دەسـتوورەوە چـونکە لەپێگەیەکی ئەوتۆدا بوون کە کاریگەری یەکلاکەرەوەیان هەبوو.

بڕیاری ستراتیژیی بنچینەیی کە سەرانی کورد لەسەرەتادا دایان ئەوەبوو، کە هەرێم نابێتە قەوارەیەکی سەربەخۆ تا لەتوانایدا بێت لەداهاتوودا بەرگەی مانەوە بگرێت.

بێگومان خواستی سەربەخۆبوونی دەست بەجێ لەلایەن دەوڵەتانی ناوچـەکەوە روو بـەڕووی بەرەنگاریبوونـەوە دەبـووەوە هەرچـی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکاشـە بـەڵێنی دابـوو پارێزگاری لەیەکپارچەیی عیراق بکـات و بـەزۆر دەسـت بەسـەرداگرتنی کـەرکووك و کێڵگـە

- رەنگبوو ئەو هەڕەشەیە راگرتنی پێدانی وزەی کارەبای بەهەرێمی کوردستان لەخۆبگرتایە چـونکە هـەرێم لەتوانایـدا نـەبوو وزەی کارەبا بەرهەم بهێنێت.1

١- ئەو مەسەلەیە تەنیا هەر پەیوەندی بە بێکاری و ئەگەری هەرەسـهێنانی ئابووریـیـەوە نـەبوو بـەڵکو پرسـێکی سیاسـیش بـوو. هەڵبەت دەستبەرکردنی سەرچاوەی داهاتێکی جێگیر بۆ هەردو حزبەکە وایکردوە کە بتـوانن پارێزگـاری لەدەسـەلاتی خۆیـان بکـەن ئەویش لەرێگەی تۆڕەکانی مەحسوبیەتەوە کە بەشێوەیەکی باش دروستکراون.



PDF 4 KURD

نەوتیەکانیشی دەبوو هاوکات بوایە لەگەڵ راگەیاندنی سەربەخۆیی، بەڵام ئەوە یارمەتی کوردی نەدەدا کە لەڕووی ئابوورییەوە بەرگە بگرێت. لەکاتێکدا لەتوانای کورددا بوو دەست بەسەرداگرتنی نەوت یان هەناردەکردنی بەبێ هاوکاری ئەوانیتر بەکاربهێنێت، بەڵام بەدیلەکەی مانەوە بوو لەچوارچێوەی عێراقێکی دیموکراسی نامەرکەزی کە رێگە بەکورد دەدات پارێزگاری لەهێزە ئەمنیەکان بکەن و خۆیان حوکمی خۆیان بکەن بەبێ دەستێوەردانی حکومەتی ناوەندی.

جگە لەوەش هەرێم بەو پێیەی بەشێکە لە یەکەیەکی گەورەتر ئەوا دەبێتە خاوەنی سامانی نەوتی نیشتمانی و لەئاستی نێودەوڵەتیشدا سنوورەکانی پارێزراو دەبێت.

لایەنێکی تری ئەو حسابکردنانە خۆی لەوەدا دەبینییەوە کە نارەزایی سەۆرەکی لەسەرۆ گەڕانەوەی کەرکووك بۆ کورد دەرەوێتەوە، ئەگەر بۆ هەموو لایەك روون بووەوە کە کورد لەچوارچێوەی عێراقدا پابەندن بەداهاتووەوە١.

سەرباری بوونی بەڵگەگەلێك لەسەر راستگۆیی پابەند بوونی سەرانی کورد و مانەوەیان بەبەشێك لەعێراق (لەگەڵ چەند مەرجێك)بەڵام دیاربوو ئەوە بەس نەبوو بۆ باوەڕپێهێنانی زۆرێك بەو مەسەلەیە.بێگومان مەحاڵە بتوانرێت بەڵگەیەکی بڕاو بڕ لەسەر هێزی ئەو پایەندبوونە پێشکەش بکرێت بەڵام لەمیانەی دیدارەکانی هەردو نووسەری ئەم کتێبە لەگەڵ سەرانی کورد لەهەردوپارتەکە اراستەیەکی روون و نەگۆڕ بەرجەستبەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە هیچ کام لەسەرکردەکان لەو بڕوایەدا نین کە سەربەخۆبوون بژاردەیەك بێت بۆ داهاتوویەکی نزیك بەڵکو هەرهەموویان لەو بڕوایەدان کە بەرژەوەندی کورد لەمانەوەیدایە لەعێراقدا٢.

بەدووریش لەو بەڵگانەی کەقسەکان دەیخەنە روو جۆرە تەرزێکی رەفتاریی لەسەر ئاستی کردەوە هەیە.

هاوکات سەرانی کورد تەئکیدیان لەوە کردوەتەوە ەکە بەمافی خۆیان دەزانن سەربەخۆبوون لەهەلومەرجێکی دیاریکراودا رابگەیەنن. چونکە گەڕانەوەی دکتاتۆرێکی عەرەبی لەبەغدا و سەپاندنی حوکمی ئایینی بەسەر هەرێمی کوردستان و پابەند نەبوون بەدەستوور و هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆیی گشتگیر لەنێوان سوننەو شیعە، هەرهەموویان پاساون بۆ جیابوونەوە.

---

1- دیدارەکان.

2- دیدارەکان.



PDF 4 KURD

بەڵام کاتێکیش شەڕ لەنێوان سوننەو شیعە لەدوای شوباتی ٢٠٠٦ تاوی سەند، تاڵـەبانی لـەبری ئەوەی ئەوە وەك بۆنەیەك بۆ جاڕدانی سـەربەخۆبوون بـەکاربهێنێت ڕۆڵێکـی یـەکلایی کەرەوەی بینی لەبەدیهێنانی ئاشتەوایی نێوان شیعەو سوننە لەعێراقدا.

جگە لەوەش کورد هێزی پێشمەرگەیان لەپێناو باشکردنی ڕەوشی ئەمنی لە بەغداوفەلوجە و لەچەند بۆنەیەکی تریشدا بەکارهێنا.بەڵام ماس میـدیاکانی کـوردی دەستەوەسـتان نـەبوون لەرەخنەگرتنیان لەتاڵەبانییەوەی توانای خۆی لـە یـەکبوونی سـوننەو شـیعەدا چـڕکردوەتەوە. هەربۆیە ئاسان نەبوو وا لەسەرانی کورد بگەیت کە چالاکانە بـەدوای پاسـاوی سـەربەخۆبووندا دەگەڕێن.

ئەو وێنە باوەی کە لەنێوان عەرەب و تورکمانی عێراق و تورکەکان و تەنانـەت زۆرێـك لـە ماس میدیاکانی خۆرئاوادا هەبوو، ئەوەبوو کە کورد گەرەکیانە دەست بەسەر کەرکوك بگرن، چونکە بنکەی سەرچاوە داراییەکانیان بـۆ کوردسـتانی سـەربەخۆ دەسـتەبەرکردوە و دەتـوانن لەرووی ئابوورییەوە بمێننەوە.

بەڵام ئەو وێنا کردنە هەڵەیەکی ئەو گریمانەیە بوو کـە دەسـت بەسـەردا گـرتنی کـەرکووك دەستبەجێ سەربەخۆبوون دەستەبەر دەکات١.

بەدڵنیایەوە ڕەخنەگرتن لەدادگایی کردنی حسابە ستراتیژیە بنەڕەتیەکان کە سەرانی کـورد ئەنجامیان دا کارێکی شیاوە، جا سەبارەت بە کەرکووك یان داهاتووی هەرێمی کوردستان بێت بەڵام هەژمارکردنەکان لەسەر هەڵسەنگاندنی واقیعی هێزو لاوازیی لەهەڵوێستی کوردیدا ئەنجام درا.

زۆربـەی ئـەو بڕیارانـەی کـە گـرفتی گـەورەی لـەخۆگرتبوو بڕیـارە تەکنیکییـەکان و پەیوەندیدارەکانی پەیوەست بەداڕشتن وناوەڕۆکی ماددەی ١٤٠ی دەستوورەوە بوون.

---

١- پرسەکانی پەیوەست بە داهاتووی کەرکوك و دەست بەسەرداگرتنی نەوتی کـەرکوك دوو پرسـی جـوداوازن بـەلای کـوردەوە و هەریەکەیان بەجیا مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن و کوردیش هەمیشە ئامادە بووە بەوجۆرە مامەڵە لەگەڵ ئـەو پرسـانەدا بکـات. بـەڵام پاساوێك دەهێنرێتەوە و دەوترێت کوردکەرکوکی لەبەر نەوتەکەی دەوێت بۆ ئەوەی سەرچاوەیەکی ماڵی سەربەخۆی بۆ دابین بکـات و باڵادەستبوونی کوردیش لەرووی یاسایی و کردەیی بەسەر کەرکوکدا کورد دەخاتە پێگەیەکی بەهێز بۆ ئیستغلالکردنی سەرچـاوەکان لەکاتی سەربەخۆبوونیدا. لەبەرامبەریشدا کورد تەئکید لـەوە دەکاتـەوە کـە بەرپرسـیار نـین لـە هەڵوەشـاندنەوەی عـیراق و بـوونی سیناریۆی ئامادەش دەبێتە هۆی سەربەخۆبوونی کورد چونکە هیچ بەدیلێکی تر نییە.بۆ نموونە شەڕی ناوخۆی نێوان شیعەو سوننەیان ستەمکار لەبەغدا دەسەڵات بگرێتەوە دەست و پێشێلی دەسـتوور □گەڕانەوەی سەرکردەیەکی عەرەبی ناسیونالیست یان ئیسلامی 1-بکات. بەو پێیەش هەرگیز دەست بەسەرداگرتنی کەرکوك یان سەرچاوەکانی دوو پرسی جیاواز بەیەکتر نین.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD



ماددەی ٥٨ لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت گرنگ بوو، چونکە هێڵە پانەکانی بۆ چارەسەرکردنی پرسی کەرکووك و ناوچەدابڕێنراوەکان کێشا بوو.

هەرچەندە ماددەکە چووبووە نێو وردەکاریەکانی هەندێك رووەوە بەڵام زیاتر لەجاڕدانی پرانسیپەوە نزیکتر بوو وەك لەوەی لەپلانی کارکردن نزیکتر بێت،

رەنگە ئەوەش لەو کاتەدا راست بووبێت.

ئەوەبوو کورد ئامادە بوو بۆ گەیشتن بە سازاندن سەبارەت بە کەرکووك بۆ زامنکردنی دەستکەوتنەکانی تری وەك دانپێدانانی دەستوور بەهەرێمی کوردستان لەچوارچێوەی سنوورەکەی بەر لەجەنگ، ئەمە جگە لە گرتنە دەستی بەرپرسیارێتی ئەمنی هەرێم و بەکارهێنانی زمانی کوردی وەك زمانێکی رەسمی و چەند شتێکی تریش.لەبەرئەوە چارەسەرکردنی پرسی کەرکووك بەشێوەیەکی کۆتایی دواخرا بۆ دوای پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی لەرێگەی ماددەی ١٤٠وە .

هاوکات زۆربەی ئەو زمانەی کە ماددەی ٥٨ی پێ نووسرابوو گوازرایەوە بۆ نێو دەستووری هەمیشەیی لەگەڵ زیادکردنی سێ روونکردنەوەی گرنگ.

١- دەستنیشانکردنی وادەی ٣١ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧ بۆ تەواوکردنی هەرسێ قۆناغی پرسەکە.

٢- لەبری دەستەواژەی ناڕوونی (ویستی گەل) دەستەواژەی راپرسی بەکارهێنا.

٣- بەرپرسیارێتی جێبەجێکردنی پرۆسەکەی لەماوەیەکی دیارکراودا خستە ئەستۆی دەسەڵاتی جێبەجێکار کە بەپێی دەستوور هەڵبژێردراوە. جگە لەو سێ روونکردنەوەیەش دەقی ماددەی ٥٨ بەبێ گۆڕانکاری ریشەیی لەدەستووری هەمیشەیدا مایەوە.

دوا بەدوای پەسەند کردنی دەستوور بەماددەی ١٤٠یشەوە لەتشرینی یەکەمی ٢٠٠٥دا، دەبوو لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧دا ماددەی ١٤٠لەوادەی دیارکراوی خۆیدا جێبەجێ بکرایە، چونکە دەستوور ئاماژەی بەوەداوە.

بەڵام لەبەرامبەردا بانگەشەی دژ بە مێژووی کەرکووك و رۆشنبیری و دیمۆگرافیاکەی هاتە ئاراوە، کە بەبەراورد بەخواستی ئەو پاساوەی کە دەیگوت ٨٠٪ی عێراقییەکان ئەو بەڵگەنامەیەیان پەسەندکردووە، کە حکومەتی عێراقی پابەند دەکات بەچارەسەرکردنی کێشەی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکان، بایەخێکی ئەوتۆی نەبوو.

PDF 4 KURD

بەکورتی دەبوو ماددەی ١٤٠ لەوادەی خۆیدا جێبەجێ بکرایە، چونکە ئەوە لەدەستووردا هاتبوو بەلاّم سووربوونی کورد لەسەر پاساوەکان بەوەی ماددەی ١٤٠ مەسەلەیەکی دەستوورییە، وایکرد کۆمەڵێك مینی یاسایی لەسەر ڕێگەی خۆیان بچێنن.

بۆنموونە ئەوەی پەیوەستە بەپرۆسەی ئاسایی کردنەوەی ماددەی ٥٨برگەی (ج)لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت داوای دواخستنی چارەسەری کۆتایی ناوچە دابڕاوەکان دەکات تا تەواو کردنی ڕێکارەکانی سەرەوە١.

ئەو زمانە مەرامێکی لەدواوە بوو بۆیە تائاستێك مەنتقی بوو کە کورد ریز بەندی بکات، چونکە ئەگەر بخوازرێت سەرژمێری دانیشتوان و ڕێکخستنی ڕاپرسی بەر لە تەواوکردنی قۆناغی ئاسایی کردنەوە بکرێت، وەك ئەوەی بەرەی تورکمانی داوای دەکرد، گەرەنتی بۆ کورد تێدا نەبوو، کەژمارەی پێویست دەستەبەر بکات بۆ بردنەوە لەراپرسیدا.

لەسەر ئاستی پارێزگاش بەدڵنیاییەوە گەڕاندنەوەی ئەو ناوچانەی کە رژێمی پێشوو لەکەرکووکی دابڕیبوو ژمارەی کوردی لەکەرکووك بەپلەیە یەکەم زیاددەکرد بەرامبەر بە پێکهاتە ئیتنیکیەکانی تر٢ .بەلاّم ئاسایی کردنەوە یەکێك بوو لەئالۆزترین رەگەزەکانی پرۆسەکە.

هەروەها چارەسەری کێشەی موڵکدارێتی کەهێشتا دەیان هەزار کەس چاوەڕوانی یەکلایی کردنەوەی دەکەن پێویستی بە چەند ساڵێکە کە ئەوەش تەنیا لایەنێکی پرۆسەکەیە. بەلاّم بەپێی شرۆڤەیەکی گونجاوی دەستوور ناکرێت سەرژمێری دانیشتوان و راپرسی بکرێت تا ئەو کاتەی کێشەی موڵکدارێتی یەکلایی نەبێتەوە.

پێداگری کورد لەسەر دیاریکردنی وادەی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ قازانجی پێچەوانەی هەبوو. هەرچەندە ماددەی ٥٨چارەسەرکردنی کێشەی ناوچەدابڕێنراوەکانی بۆ پاش رازیبوون لەسەر دەستووری هەمیشەیی دواخست، بەلاّم ماددەکە نەحکومەتی کاتی بەسەرۆکایەتی ئەیاد عەلاوی و نەحکومەتی ئیبراهیم جەعفەری ناچارکرد کاری خێرا بکەن بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی ئاسایی کردنەوە.

---

١- برگەی دوو لەماددەی ١٤٠ دەسەلاّتی جێبەجێکردن ناچار دەکات کە بەتەواوەتی سەرجەم قۆناغەکانی پرۆسەکە لەماوەیەکی دیاکراودا جێبەجێ بکات کە دوا کاتی ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧.

٢-بۆنموونە یەکێك لەو ناوچانە چەمچەماڵە کە سەرجەمی دانیشتوانەکەی کوردن.

ساتێکیش کۆتایی بەماوەی دەسەڵاتی سەرۆکایەتی حکومەتەکەی جەعفەری هات پێشکەوتنێکی ئەوتۆ لەجێبەجێکردنی ماددەکەدا بەدی نەهاتبوو، بۆیە کورد گومانیان لادروست بوو. هەروەها پێشیان وابوو کە گومانەکەیان لەجێگەی خۆیدابوو لەوەی کەبەرەو پێشنەچوون بەئەنقەست بووە. دیسان لەبەرامبەر نەبوونی وادەیەکی بڕیار لەسەر دراو کورد روو بەڕووی ئەوەبووەوە، نەیارانی ماددەی ١٤٠ کە گەلێك بوون، دەتوانن جێبەجێکردنی دوابخەن بۆ کاتێکی نادیار و بەوەش بەندەکانی ماددەکە لەئەنجامی جێبەجێ نەکردنی دژایەتی کرا. بۆیە دانانی وادەیەکی پابەند بوو، پێوەری چارەسەرێکی مەنتقی بوو بۆ دواخستنی بەئەنقەست، چونکە حکومەتی ناچار دەکرد ماددەکە جێبەجێ بکات بەپێچەوانەشەوە پێشێلی دەستوور دەکرا[١].

ئەولێکتر نزیککردنەوەیە لێکنزنزیککردنەوەی ئەقڵانی بوو بەڵام لەسێ رووەوە گرفتی گەورەی هەبوو:

یەکەم/ وادە دیاریکراوەکە جێگەی ئەو گەشبینیە نەبوو چونکە نزیك بوونەوە لەوادەی جێبەجێکردن پێویستی بە هاوکاری هەموو لایەنەکان هەبوو لەسەر گشت ئاستە حکومییەکان و دامەزراوە ئیداریەکانیش لەتواناياندا هەبوو بۆ یەکلایی کردنەوە خێرا بجولێن.

لەراستیدا لەدژی جێبەجێکردنی ماددەی١٤٠چەند کوتلەیەکی گرنگ راوەستانەوە و عێراقیش بۆخۆی دەولەتێکی شکستخواردو بوو.

دووەم/ مێژووی جێبەجێکردنی ماددەکە لەرووی عەمەلییەوە وادەیەکی بۆ نەیارانی دەست نیشانکرد تابیکەنە ئامانج، چونکە نەیاران لەئێستادا دەزانن هەموو ئەوەی پێویستیان پێیەتی بریتیە لە دواخستنی بۆ ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧تا سەرلەبەری پرۆسەکە بخەنە ژێر پرسیاری یاساییەوە.هەڵبەت لەبەرامبەر ئاڵۆزیەکانی خودی پرۆسەکە ئەو ئەرکە ئاسان بوو.

سێیەم/ ئاشکراو روون نەبوو کە ئاخۆ ماددەی ١٤٠ چی بەسەر دێت ئەگەر لەوادەی جێبەجێکردنی خۆی تێپەڕی. چونکە زۆر باری هاوشێوە بەسەر لیژنەی هەموارکردنی

---

[١]- سەرانی کورد باش دەیانزانی کە کات لەبەرژەوەندی ئەواندا نییە و لەسەرەتاشدا لەسەرئاستی نیشتمانی توانایەکی زۆریان هەبوو ئەویش لەبەرئەوەی عەرەبی سوننە بایکۆتی هەڵبژاردنەکانی کردبوو ئەمە جگە لەوەی کوتلەکانی تریش پەرش و بلاوبوون. بێگومان هیچ گەرەنتیەکیش نەبوو بۆ بەردەوامبوونی ئەو بارودۆخە بۆ ماوەیەکی درێژخایان بۆیە کورد پێویستی بەزامنکردنی دەستکەوتەکانی بوو.

٢-



PDF 4 KURD

دەستووردا تێپەڕیوە. درێژکردنەوەی ئەو مەسەلانەی کە شەرعیەتی دەستوورییان هەبوەو جێگەی گومان بوون، لەپەرلەماندا دەنگیان لەسەر دەدرا، کەئەوەش بۆکورد بژاردەیەکی دووربوو، لەبەرئەوەی لەپەرلەماندا هێزی دژ بەماددەی ١٤٠هەبوو.بۆیە تێپەڕبوونی وادەکە هەڕەشەی لەسەر لادانی سەرلەبەری پرۆسەکە هەبوو لەسەر ئاراستەکەی و گەڕانەوەی کەرکووکیش وایکرد کورد بەبێ میکانیزمێکی دەستووری و یاسایی بمێنێتەوە١.

یەکێك لەگرفتی شکستی وتوویژ کاری کورد دابڕانی پرسی کەرکووك بوو لەپرسی ناوچە دابڕاوەکانی تر.

ماددەی٥٨/ماددەی ١٤٠دەستەواژەی "ناوچەی جێ لەسەرناکۆك"ی دیارینەکردووە، کە ئەوەش لەرووی تەکنیکیەوە بەواتای هەرململانێیەك لەسەر پارچە زەوییەك لەهەرشوێنێکی عێراق ئەو ماددەیە دەیگرێتەوە.

ئەوەش شتێکی بەڵگەنەویستی بوو ئەو گرفتە پەیوەست بێت بەماددەی(٥٨)برگەی(ب) لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت کە هێڵەگشتییەکانی بۆ چارەسەرکردنی گۆڕانکاریەکان کێشابوو، کە رژێمی پێشوو بەشێوەیەکی زاڵمانە لەسنووورە ئیدارەیەکاندا ئەنجامی دابوون.

لەباری کەرکودا ئەو گۆڕانکاریانە چوار قەزای لەقەزاکانی کەرکوك لکاندبوو بە پارێزگانی ترەوە کە ئەوانیش چەمچەماڵ و کەلارو کفری و دوز بوون، ئەویش بەمەبەستی کەمکردنەوەی رێژەی کوردو تورکمان لەدانیشتوانی کەرکووك بەبەراورد بەعەرەب.چارەسەرکردنی ئەو بارودۆخەش پێویستی بەئەنجامدانی گۆڕانکاری هەبوو لەسنووری ئیدارەی ئەو سێ پارێزگایەدا "سەلاحەدین(دوز)، دیالە(کفری)، سلێمانی(کەلاروچەمچەماڵ)".

دیارە گرفتەکەش لەوەدابوو کەدەستکاریکردنی سنوورە ئیداریەکان لەلایەن رژێمی بەعسەوە زۆر جار لەپێناو ئامانجی سیاسیدا بووە هەروەك ماددەکە ئاماژەی پێکردووە.

ئەو دوو نەخشەیەی لای خوارەوە قەبارەی ئەو دەستکاریکردنانە دەردەخات کە رژێمی بەعس لەسنوورە ئیداریەکاندا لەماوەی ١٩٧٠- ١٩٩٠ئەنجامی داون.

رژێمی بەعس هەندێك پارێزگای وەك ئەنبارو دهۆك و سەلاحەدین بەتەواوەتی گۆڕیوەو پانتاییەکی فراوانی لەزەوی پارێزگاکانی تر لەوانەش کەربەلا دابڕیوە.

---

١- بڕیاردان لەوەی کە دانانی وادەی کۆتایی هەڵەیەکی تەکنیکی سەرانی کورد بووە کارێکی لەخشتە بەرانەیە، چونکە سەرانی کورد ناچاربوون ئەو وادەیە دیاری بکەن لەبەر ئەوەی ناکرێت ماددەکە بەبێ دیارکردنی وادەیەك بمێنێتەوە بەبەردەوامی بەئەنقەست جێبەجێکردنی دوا بخرێت. ١-

PDF 4 KURD

لەڕاستیدا لەکۆی ١٨پارێزگاکە لەسەرنەخشەی ئیداری عێراق لەساڵی ١٩٧٠دا بەئاستەم پارێزگایەك هەبووە نەکەوتبێتە بەر نەشتەرگەری بەعس.

جا لەبەرئەوەی ماددەی ١٤٠ سنووری کەرکووکی لەپارێزگاکانی تر جیانەکردوەتەوە وایلێهاتووە گەڕانەوەی سنووری ئیداری کەرکووك بۆ سەردەمی پێشووی خۆی بەشێك بێت لەئەگەری چارەسەرەکانی ناوچەدابڕێنراوەکان کە دەکرێت بێ کۆتایی بەردەوام بێت.

بەپێی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەتیش پرۆسەی سیاسی کەماددەی ١٤٠ هێلّەگشتیەکانی بۆچارەسەرکردنی ئەو ململانێیانە دەست نیشان کردووە، کۆدەنگی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی کە لە(٣)ئەندام پێکهاتووە کردوەتە مەرجی رازیبوون لەسەر ئەو رێنماییانەی کە بۆدەنگدان پێشکەش بەپەرلەمان دەکرێن، هەرچەندە ئەم هەنگاوە لەهیچ دەقێکی دیاریکراودا بوونی نییە.

ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی سێ ئەندام لەخۆ دەگرێت عەرەبێکی سوننی(تاریق هاشمی) لەحزبی ئیسلامی عێراقی، شیعەیەك(عادل عەبدولمەهدی) لە ئەنجوومەنی باڵای شۆرشی ئیسلامی لەعێراق، کوردێك (جەلال تاڵەبانی) رابەری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.

هەریەکەشیان مافی ڤیتۆی هەیە لەبەرامبەر ئەو رێنماییانەی کە پێشکەش بەپەرلەمان دەکرێن. بەوجۆرە چارەسەری پرسی سنووری ئیدارەی پارێزگای کەرکووك مەرجدار بوو بە یەکلایی کردنەوەی کێشە ئاڵۆزەکانی تری پەیوەست بە سنووری پارێزگاکانی باشوور.

## ئەوگۆڕانکاریانەی بەسەر سنووری پارێزگاکانی عیراقدا هاتوون

## لەنێوان ١٩٧٠- ٢٠٠٣

بەرپرسانی کورد ئاماژەیان بەوە کرد کەسنووری نێوان هەردو پارێزگای ئەنبارو کەربەلا زیاتر ناکۆکی نێوان دوو پارێزگا بەرجەستە دەکاتن کە لەنێوان پارێزگایەکی عەرەبی سوننەکە لەژێر دەسەڵاتی حزبی ئیسلامی عێراقیدایە لەگەڵ پارێزگایەکی عەرەبی شیعە کە لەژێر کۆنترۆڵی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی عێراقدایە[١]. چارەسەرکردنی ئەو ململانێیەش جیاکردنەوەی پانتاییەکی فراوانی زەویە لەئەنبار کە بەنەوت دەوڵەمەندەو گەڕانەوەی بۆ سەر کەربەلا.

---

١ - لەدوای هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥، پارتی ئیسلامی عیراقی لە پارێزگای ئەنبار بالادەستبوو چونکە زۆربەی کورسیەکانی ئەنجوومەنی پارێزگای بەدەستەوە بوو. بەڵام رێژەی بەشداریکردن بەهۆی بایکۆتکردن لەهەڵبژاردندا تەنیا ١٪ بوو بۆیە زۆرینەی کورسیەکانی ئەو پارتە ئیسلامییە رەنگدانەوەی ویستی خەڵکی ئەنبار نەبوو.

PDF 4 KURD

دیارە رازیبوونی هاشمیش لەسەر ریوشوێنیکی لەوجۆرە لەرووی سیاسیەوە كاریكی بكوژانەیە[1].

لەوچوارچێوەیەدا عەبدولمەهدیش ئامادە نەبوو بەرەو چارەسەر كردنی پرسی سنووری كەركووك هەنگاوبنیت ئەگەر پرسی سنوورەكانی تریش چارەسەرنەكرین كە بەلای شیعەوە گرنگە.

بەوجۆرە گەرانەوەی سنووری كەركووك بۆ بەر لەهاتنی بەعس پەیوەستە بەكیشمەكیشی سیاسی فراوانترلەعیراقدا، هەرچەندە ئەو پرسە ئاشكراو روونەو چارەسەركردنیشی ئاسانە.

بەلام گرفتی مەترسیدار لەناوەرۆكی ماددەی ٥٨/ماددە١٤٠دا دووری نیوان ئەو میكانیزمانەیە كە بۆ چارەسەركردنی كیشەی ناوچەجیَ لەسەرناكۆكەكان دانراون، هەروەها سروشتی ئەو زەویانەش كە كورد لەهەولی گەرانەوەیاندایە. بەزمانیكی ساكار پرۆسەی سەرژمیری دانیشتوان /راپرسی لەیەك كاتدا ئامرازی گونجاو نەبوون بۆ چارەسەركردنی پرسی كەركووك و ناوچەدابرینراوەكان.

گرفتەكە لەجیاوازی نیوان سروشتی زەویە جیَ لەسەرناكۆكەكاندا بوو، جگە لە كەركووك و ئەو چوارشارۆچكەیەش كەلیی دابرینرابوون، چوار جۆر ناوچەی جیَ لەسەر ناكۆكی دیكەش هەن، كەرەنگە چارەسەركردنی ناوچەكانی وەك قەزاكانی ئاكریَ و شیخان لەپاریزگای نەینەوا كە لەسالی ١٩٩١ ەوە كەوتوونەتە چوارچیوەی ئەو ئیدارەی كە لەهەریمی كوردستان دامەزراوە، ئاسانترە.

دیارە بابەتی ململانیَ لەسەر ئەو ناوچانە تەنیا لەرووی تەكنیكیەوە بووە، نەك لەرووی مولكداریتییەكەیەوە.

هاوكات ناوچەیەكی تری هاوشیوەی ئەو دوو قەزایە هەیە(مەخموور)كەبەشیك بووە لەپاریزگای هەولیر بەلام كەوتوەتە دەرەوەی سنووری هەریمی كوردستان، كە ئەوەش دیسان ناكۆكیەكی ئەوتۆ نییە لەسەر كوردبوونی ناوچەكە.

ئەوەی پتر كیشەی لەسەرە ناوچەكانس وەك (خانەقین و مەندەلی)یە لەپاریزگای دیالەو (بەدرە) لەپاریزگای واسیت كە دەكەونە دەرەوەی هەریمی كوردستان و بەشیكن لەپاریزگاكانی تری عیراق.

---

١- كاتێك سەرانی كورد لەسەر ماددەی ٥٨ دانوستانیان كرد لەگرنگی ململانێی نێوان ئەنبارو كەربەلا بێئاگابوون، بڕوانە:
Kurdistan Nuwe . 2007. "The Effect of Karbala and al-Anbar on Kirkuk ." 6 December (LN).

PDF 4 KURD

هەرچی شەنگالیشە تایبەتمەندیەکی خۆی هەیەو بەشێکە لەپارێزگایەکی ناکوردی(نەینەوا) کەدەکەوێتە دەرەوەی هەرێمی کوردستان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شەنگال چووەتە پاڵ هــەرێمی کوردستان و یەکێك لەگرفتەکانی ئەو ناوچەیەش نەبوونی پەیوەندی جوگرافییە لەگەڵ هەرێمدا. بەجۆرێك لەنێوان هەرێم و شەنگالدا قــەزای تەلەعفــەر هەیــە کەزۆرینــەی تورکمانەوشــەنگال لەهەرێمی کوردستان جیادەکاتەوە.

لەبەر ئەوە ئەنجامدانی راپرسی لەسەر ئاستی قــەزاکان لەتەلەعفــەر و شــەنگال بــەم جــۆرە دەبێت کە شەنگال دەنگ بۆ چوونە پاڵ هەرێم دەدات و تەلەعفــەریش دەنــگ بۆمانــەوەی وەك بەشێك لەپارێزگای نەینەوا دەدات و بەوەش گەرشانەوەی شەنگال بۆ کورد بەو جۆرە دەبێت کە تەنیا خاڵی پەڕینەوەی بەرەو هەرێم ناوچەیەکی نەیار دەبێت١.

بەهەمان شێوە لەرووی خۆرهەڵاتیشەوە کورد دووچاری هەمان گرێ کوێرە دەبێتەوە ئەگــەر هاتوو بەدرە بۆ بەرژەوەنــدی گەڕانــەوەی بــۆ ســەر هــەرێمی کوردســتان دەنگــی دا، چــونکە بەلەدروزیش لەقەزای مەندەلی دژی ئەو هەنگاوە رادەوەستێتەوە، ئیتر بەو جۆرە بەدرە لەرووی جوگرافییەوە گۆشــەگیر دەبێــت لەگــەڵ ئــەوەی ئاستەمیشــە بتوانێــت زانیــاری ورد لــەبارەی پێکهاتەی دانیشتوانی هەردو ناوچەی بەلەدروز و بەدرە بزانرێت. بەڵام پێناچێت ئــەو ناوچــانە زۆرینەی کورد بن، بۆیە ئەگەر بێتوو لەسەر ئاستی ناوخۆییدا راپرسی ئەنجام بدرێت ئەوا کورد لەو دوو ناوچەیەدا سەرکەتوو نابن.

دیارە گرفتی سەرەکی لە ماددەی ٥٨/ماددەی١٤٠ دایە، چونکە ئەو ماددانە میکانیزمی سەرژمێری دانیشتوان/راپرســی دانــاوە بــۆ چارەســەرکردنی کێشــەکانی پەیوەســت بــە ناوچــە دابڕاوەکان بەڵام ئاستی ئیداری دیاری نەکردوە کەبڕیارە سەرژمێر و راپرسی لەسەر بکرێت.

بۆ نموونە لەسەر ئاستی شار/شارۆچکە رەنگە کورد بەزۆرینەی رەهای دەنگــەکان لەگشــت ناوچە دابڕاوەکان جگە لەشاری کەرکوك بیباتەوە بەڵام دەرئەنجام کۆمــەڵێك گیرفــانی کــوردی دەبێت کە لەرووی ئیدارییەوە دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی حکومــەتی هــەرێمی کوردســتانەوە بــەڵام لەورووی جوگرافیەوە لەهەرێم دابڕاو دەبن.

لەسەر ئاستی قەزاکانیش رەنگە کورد لەشەنگال و خانــەقین بیبەنــەوە بــەڵام لەوانەیــە لــە مەندەلی و بەدرەو لەکەرکووکیش بیدۆڕێنن. بەدڵنیاییەوە کورد تەنیا لەسەر ئاستی پارێزگــادا

---

١- شاری تەلەعفەر مۆڵگەی چالاکی چەکداری بوو، ئەو هەرێمە کەلەسەر سنووری عیراق □ سوریایەخاڵی پەڕینــەوەی چــەکدارانە بەرەو ناو عیراق.

PDF 4 KURD

براوە دەبێت ئەویش ئەگەربێتو ناوچە دابڕاوەکانی بۆ بگەڕێنەوە.دیسان قەزای مەخموریش ئەگەر راپرسی لەسەر بکرێت ئەوا بۆ کورد دەگەڕێتەوە١.

گریمان راپرسییەکە لەسەر ئاستی یەك ئیدارە ئەنجام دەدرێت ئەوا دەرئەنجامەکەی بۆ کورد جێی مەخابن دەبێت چونکە ناتوانن لەیەك کاتدا بەپێی ئەو میکانیزمەی کە ماددەی ١٤٠هێڵە گشتیەکانی بۆداناوە داوای گەڕانەوەی کەرکوك و ناوچەدابڕێنراوەکان بکەن.

دیارە دوو رێگا هەیە بۆ خۆ بەدوور بگرتن لەو کێشەیە.

رێگای یەکەم/ دەکرێت راپرسی لەسەر ئاستی ئیدارەی جۆراو جۆر بەپێی ناوچە پەیوەندیدارەکان بکرێت.

بەرپرسێکی کوردی دەڵێت پەیرەوی ناوخۆی ماددەی ١٤٠ رێگای داوە، راپرسی لەسەر ئاستی جیاجیا ولەسەربنەمای یەکە ئیداریەکانی ئەوقەزاو ناحیێانەی کە بۆ سەر کەرکووك دەگەڕێنەوە ئەنجام بدرێت یاخود لەسەر ئاستی سەنتەری پارێزگاکە واتە شاری کەرکووك یان سەرجەم ئەو ناوچانەی کە ناکۆکیان لەسەر راپرسییەکە ئەنجام بدرێت٢.(١٩ئەیلول).

جەوهەری ئەم بەهانە هێنانەوەیەش لەوەدایە ئاستی ئیداری گونجاو بۆ سازدانی سەرژمێری دانیشتوان و راپرسی ئەو ئاستە دەبێت کە کورد زۆرینەی تیادا بەدەستیهێنێت و رەنگە ئەنجامی دەنگدانەکەش بەسەرکەوتوویی کۆتایی بێت. بەڵام ئەم پاساوهێنانەوەیە نەیارانی دژ بە بۆچوونەکانی کورد قایل ناکات.

هاوکات ئاستەمە ئەو بۆچوونە کۆك بێت لەگەڵ دەقی ماددەکە کە ئاماژە بە پرۆسەیەکی خاوێن و شەفاف دەکات تا چارەسەرکردنەکە لەگەڵ پرانسیپی دادوەریدا بگونجێت.

رێگای دووەم/ بۆچارەسەرکردنی ئەم کێشەیە جیاکردنەوەی پرسی کەرکووکە لەپرسی چارەسەری ناوچە جێ لەسەر ناکۆکانی تر. لەروانگەی ئامانجی کوردیشەوە باشترین چارەسەر بۆ پرسی کەرکوك ئەنجامدانی راپرسییە لەسەر ئاستی پارێزگا.

هەروەك ئەوەی کەنیازی سەرانی کوردیش بووە کاتێك دانوستان سەبارەت بەماددەکە کرا. هەرچی ناوچەدابڕێنراوەکانی تریشە بەشێکن لەپرسێکی فراوانتر کەخۆی لەدیاریکردنی سنووری نێوان هەرێمی کوردستان و ناوچەکانی تری عێراقدا دەبینێتەوە. ئەو نەخشانەش کە بەرپرسانی

---

1- وەك ئاشکرایە هەر راپرسییەك لەسەر شارۆچکەی مەخمور بکرێت ئەوا کورد لەسەر ئاستی هەولێردا براوە دەبێت.

2 - Rozhnama ( BBC Monitoring Middle East –Political ). 2007. " Iraq Kurdish Official Says Referendum in Kirkuk Possible without Census ." 19 September (LN).

PDF 4 KURD

کورد پێشکەشیان کردوە سەبارەت بە ناوچە دابڕاوەکان لەراستیدا نەخشەیەکە کە هەوڵدەدات سنووری هەرێمی کوردستان بەواژەی ئیتنیکی بنەخشێنێت.

پاشان نەخشەکە پابەند نابێت بەسنووری ئیدارییەوە جا لەسەر ئاستی پارێزگا یان قەزاکان بێت. بەڵکو لەبری ئەوە پارێزگاکان لەت دەکات (دیالەو نەینەوا) و لەناوچەکانی تریش قەزاو ناحیەکان لەت دەکات( بەلەدروز و تەلەعفەر)و لەناوچەکانی سێیەمیش دەست بەو سنوورە ئیداریانەوە دەگرێت کە لەئارادان.

راپرسی میکانیزمێکی لەبار نیە بۆ بەشەرعیکردنی سنوورێکی دیاریکراو لەسەربنەمای ئیتنیکی کە ئامانجی راشکاوانە لێی زیادکردنی رێژەی پێکهاتەیەکی ئیتنیکی دیاریکراوو کەمکردنەوەی قەبارەی پێکهاتەیەکی تریشە بۆ ئەوەی ئەنجامی دەنگدان کە پێشوەخت پلانی بۆ دارێژراوە مسۆگەر بێت١.

ئەمەش بەواتای سنوورێکی هاوبەش کەلایەنی کوردی یەکلایەنە بەسەر بەشەکانی تری عێراقدا دەیسەپێنێت و سنووری لەو جۆرەش پێناچێت بەدیدی کەسانی ناکورد سنوورێکی رەوا بێت.

خۆئەگەر ئامانج نەخشەرێژی سنووربێت ئەوا دەرئەنجامێکی رەوا بۆ رێوشوێنێکی لەوجۆرە پێویستی بە بەشداری کردنی تەواوی لایەنە ناکۆکەکان هەیە.

چارەسەرکردنی پرسی سنوور پێویستی بە پێکهێنانی گروپێك هەیە کەنوێنەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی عێراق و نوێنەراینی پارێزگا پەیوەندیدارەکان بەشداری تێدا بکەن لەگەڵ میکانیزمێکی دادوەری ئەگەر هاتوو لایەنە ناکۆکەکان رێك نەکەوتن، بەلآم گرفتەکە لەوەدایە کەماددەی ١٤٠ئاماژەی بە هیچ کام لەوانە نەکردوە٢.

گرفتی گەورەتر لەماددەی ١٤٠دا لەوەدایە کە میکانیزمی بنەڕەتی کە بۆ یەکلایی کردنەوەی بارودۆخی ناوچەکان دانراوە، دەکرێت بەکاربهێنرێت بۆ خواستی گەڕانەوەی کەرکووك یان ناوچە دابڕاوەکانی تر، بەلآم نەك هەردوکیان لەیەك کاتدا.

زیاد لەوەش ئەگەر ئامانج دیاریکردنی سنوور بێت لەگەڵ بەشەکانی تری عێراق و ئەوەش کەمترین شەرعیەت بەدەستبهێنێت ئەوا ماددەی ١٤٠ئەو ئامرازە گونجاوە نییە کە ئەو ئامانجە بەدیبهێنێت.

---

١- بەم پێیە ئەگەر زۆرینەی کورد دەرفەتیان هەبێت ئەوا دەنگ بۆ بەرژەوەندی گەڕانەوەی کەرکوك بۆ هەرێمی کوردستان دەکات.

تەنیا بەشی ئەم ماددەیە کە رۆڵ دەدات بەنێوبژیوانیکردن ئەوەیە کە پەیوەستە بە سەرلەنوێ سنوور ڕێژکردنەوەی ئیداری بۆ بەر 2-لەسەردەمی هاتنی بەعس بۆ سەر دەسەلآت.

خۆ ئەگەر شەرعیەت خەمێك نەبوایە ئـەوا كـورد توانـاو سەرچـاوەی ئـەوەی هـەبوو كـە كۆنترۆڵی ناوچەدابڕێنراوەكان بكات و یەكلایەنە سنوورەكانی رابگەیاندایە. بەڵام ئەو رەگەزانەی لەپشت بڕیارێكی وا ستراتیژەوەیە راوەستاون بـۆ ئـەوەی شـەرعیەتی پێبـدرێت گرتنـە بـەری دەستووره لەچارەسەركردنی كێشەی ناوچەدابڕێنراوەكان. بێگومان نەیارانی خواسـتی هـەرێمی كوردی لەسەر نارەزاییەكانیان بەردەوام دەبن بەڵام پاساوەكانیان لاوازتر دەبێـت ئەگـەر هـاتوو پرۆسەكە پێـوەرە دەسـتووری و یاسـاییەكانی بەهەنـد وەرگرتـو پێـوەی پابەنـد بـوو. دیسـان هەرهەنگاوێكی كورد بەئاراسـتەی دەسـت بەسـەردا گـرتنی زەوی بەدڵنیاییـەوە كاردانـەوەی دوژمناكارانەی لەلایەن بەغـدادەوە لێدەكەوێتـەوە و ئـەوەش دەبێتـە هـۆی بـڕینی هێڵـەكانی تەمویل لەلایەن حكومەتی ناوەندەوە بۆ هەرێمی كوردستان. بـەواتای هـەمواركردنی مـاددەی ١٤٠بەشێوەیەكی ریشەیی بۆ ئەوەی كـورد بتوانێـت سـەرجەم پرسـەكانی ناوچـەدابڕێنراوەكان یەكلایی بكاتەوە یاخود دانوستان بكات لەبارەی پرۆسەیەكی نوێ سەبارەت بە وردەكاریـەكانی كەركووك و پرسی دیاریكردنی سنووری هەرێمی كوردستان.

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# فەسڵی دووەم

## کێشمەکێش لەسەرکەرکووك: گرفتەکانی بارودۆخی کۆتایی

پێشبینیکردنی ئەوەی ڕووداوەکانی عیراق بەچ ئاقارێکدا دەگوزەرێت ئەرکێکی گرانەو ئەوەی پێش ڕووداوەکانیش بکەوێت جگە لەگێل چیتر نییە.

سەبارەت بە کەرکووك ئەوپێشبینیکردنە مەحاڵە ئەویش بەهۆی ئاڵۆزی و تەنگەتاوی ئەو پرسانەی کە خراونەتە ڕوو. داهاتووی کەرکووك لەسەر ئاستەکانی شێکاری لۆکاڵی و نیشتمانی و نێو دەوڵەتی بەلای لایەنە جیاجیاکانەوە گرنگەو ڕووداوەکانیش لەسەر هەریەکێك لەو ئاستانە چارەنووسی داهاتووی کەرکووك بەشێوەیەکی بنەڕەتی دیاری دەکات.

بۆنموونە مەرگی ئایەتوڵڵا عەلی سیستانی کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر پرسی کەرکووك نابێت بەڵام ئەگەر ئەوە عیراق بەئاراستەی جەنگی تایەفیی گشتگیردا بەرێت ئەوا کورد ئەوەیان ڕوونکردوەتەوە کە بەمافی خۆیان دەزانن جیاببنەوە.

بەدڵنیایشەوە بیر لەوە دەکەنەوە بەشێکی کەرکووك و ناوچەدابڕێنراوەکان یان هەر هەموو ئەو ناوچانە بۆخۆیان بەرنەوە.١

١- دیدارەکان

PDF 4 KURD

بەهەمان شێوە پێدادانی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان کە هەرچەندە ئەوە کارێکی دوورە، رەنگە ببێتە لەدەستدانی "گەڕانەوە" ی کەرکوک کە بەدڵی کوردستان دادەنرێت بۆ کاتێکی نادیار.

لەودیدگا فراوانەشەوە دیسان لەوانەیە ئاسان نەبێت پێشبینی دەرئەنجامی پرۆسەکە بکرێت کە دەوکەوێتە ژێر کاریگەری چەندان گۆڕدراوی زۆر و زەوەند لەسەر ئاستە جیاجیاکانی شیکاریکردن.

لەکاتێکدا کە پێویستە بڕیار لەسەر ئەوە بدرێت پەنهانییەك سەبارەت بەکەرکووك لەئارادایە باشتر وایە پێشبینی سنوورە شیاوەکان بکرێت بۆ چارەسەر کردنی بارودۆخی کەرکووك کەکێشەی لەسەرە.

هەڵبەت کۆمەڵێك چارەسەری شیاو هەن بەڵام هەرهەموویان وەك یەك چارەسەری لەبارنین. بەدیاری کراوی کورد لەوپێگەیەدا نییە کە دەرفەتی ئەوەیان هەبێت سەرجەم ئامانجەکانیان لەو شارەدا لەرێگەی یاساو دەستوورەوە بەدەستبهێنن. لەهەمان کاتیشدا بێ بەشکردنی سەرانی کورد لە چارەسەرکردندا کارەسات دەخولقێنێت، بۆیە چارەسەری تەوافوقی مامناوەند لەنێوان ئەوپەڕی هەڵوێستی سەرانی کوردو هەڵوێستی رەتکردنەوەی نەیارانی، لەبارەی گەڕانەوەی کەرکووك بۆ کورد، لەبارترین رێگا چارەیە.

## باجی زیادەڕۆییکردن بەماددەی (١٤٠)ەوە

لەڕووی تەکنیکییەوە هێشتا ماددەی(١٤٠) تاکاتی نووسینی ئەم دێڕانە ماددەیەکی زیندووە، بەڵام چارەنووسی ئەو ماددەیە بەرەو نادیاری دەچێت. لەدوای شکستی حکومەتی عیراقی لەجێبەجێکردنی هەرسێ قۆناغەکەی ماددەی(١٤٠)لە ٣١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧، چارەنووسی ئەو ماددەیە کەوتە دەست دادگای فیدراڵییەوە. ئەم دادگایەش لەژێرکاریگەری رەوشی سیاسی عیراقدایە کە لەرۆژگاری ئیدارەی کاتی دەوڵەتەوە بەمیرات بەجێماوە.

دادگای فیدراڵی لە(٩) دادوەر پێکهاتووە لەلایەن (مەدحەت ئەلمەحمود)ەوە سەرۆکایەتی دەکرێت. دادگاکە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئەیاد عەلاویدا دامەزراوە، هەربۆیە زۆربەی ئەندامەکانی لەکەسانی عەلمانی و تەکنۆکرات و نیشتمانپەروەرن نەك لەدامەزراندنیاندا حزبەکان دەستیان هەبوویێت.١

---

١ – مەرجی دەستووری عیراقی ئەوەیە، کە بەزۆرینەی دوو بۆ سێی ئەندامانی پەرلەمان لەبری دادگای فیدراڵی دەنگ بدەن ، ئەو دادگایەی بەپێی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت دامەزراوە.

ئەگەر بەدیدێکی سیاسیانەی پراکتیکی ئەو دادگایە لــەو پرســە بڕوانیێــت ئــەوا پێدەچێت لەبەرژەوەندی کورددا حوکم بدات لەمەسەلەی کارپێکردن بەماددەی ١٤٠.١

لەوکاتەدا نــوری مــالکی ســەرۆك وەزیــر بــە بڕیارێــك کارەکــانی لیژنــەی مــاددەی ١٤٠ هەڵپەسارد و زۆرێك لەئەندامەکانی لیژنەکەش کشانەوە و لەهەمان کاتیشــدا زۆربــەی کوتلــە سیاسیەکان جگە لە کورد نەبێت پێیان وایە ماددەی ١٤٠ مردووەو بەخاك سپێردراوە.٢

زۆرێك نیشانەی پرسیارلەسەر رەشنوورسی یاسایی درێژکردنەوەی وادەکە بۆ شەش مــانگی تر دادەنێن کە لەلایەن ستیڤان دی میستۆراوە لەدواساتدا ئەنجامدرا.

دی میستۆرا رۆڵی نێوەندگیری بینی لەنێوان ئەنجوومەنی ســەرۆکایەتی و ســەرۆك وەزیــری عــیراق و ســەرۆکی حکومــەتی هــەرێمی کوردســتان، کــەدەکرێت لــەو چوارچێوەیەشــدا رێککەوتنەکە والێکبدرێتەوە کە لەرووی تەکنیکییەوە هەموارکردنی دەستوورە.

ئەو میکانیزمەش کە بۆدرێژکردنەوەی وادەکانی تر بەکارهێنرا دەستوور پێوەی پابەند بوو، واتە دەنگدان لەنێو پەرلەماندا. بەڵام دیارە ئەو بژاردەیە بەلای کوردەوە پەسەند نەبوو ئــەویش بەهۆی  هێزی دژ بە ماددەی ١٤٠ لەپەرلەماندا. ٣

لەبەرئەوە کورد ناچاربوو خۆی رادەستی بڕیاری دادگا بکات، بەڵام ئــەوەی دادگــا بڕیــاری لەسەر دەدات  لەراستیدا ئەوەیە کە ئاخۆ درێژکردنەوە کە کارێکی دەستوورییە.

بەڵام رەنگە کاتێکیش دادگا بڕیاری خۆی بدات، درێژکردنەوەکــە کۆتــایی هاتبێــت بۆیــە ئەگەری زیندوکردنەوەی ماددەی ١٤٠بەو فۆرمەی کە ئێستا هەیەتی ئەگەرێکی دوورە.

گرفتەکە قوڵترە لەوەی کە کورد روو بەرووی دەبێتەوە ئەویش چــۆنیەتی قەرەبووکردنــەوەی ماددەی (١٤٠)ە بەپرۆسەیەکی نوێ کە لەسەربنەمای یاسایی دابمەزرێت.

دیسان رەنگە دەستوەردانی نەتــەوە یــەکگرتوەکان لەدانوســتانەکان جــۆرە شــەرعیەتیەکی نێودەوڵەتی ببەخشێتە رێککەوتنەکە سەبارەت بە دەستپێکردنی پرۆسەیەکی نوێ  بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر رێککەوتنێك پێویستە لەلایەن ئەنجوومــەنی نوێنەرانــەوە پەســەندبکرێت یــاخود

---

٢ – لەکاتی نوسینی ئەم دێڕانەدا (ئایار/٢٠٠٨) ئاماژەیەك لەئارادا نین بۆ ئەوەی کە ماددەکە ئاراستەی دادگای فیدراڵی بکرێت.

١– سەبارەت بە هەڵپەساردنی کاری لیژنەکەو کشانەوەی ٤ لەئەندامەکانی بڕوانە:

Rozhnama ( BBC Monitoring Middle East ).2008. "Iraq MP Suspends Work of Constitutional Committee ." 6 February

٣ – پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە دەنگــدان لەپەرلەمانــدا بۆنموونــە وەك ئــەوەی لەدرێژکردنــەوەی وادەی نووســینی دەســتوور و تەواوکردنی پرۆسەی ماددەی ١٤٢دا بەکارهێنرا ، دەنگدانێکی گوماندارانەیە کە شەرعیەتیەکی میللی دەداتە درێژکردنەوەکان.

PDF 4 KURD

بەشێك بێت لەپرۆسەی ماددەی (١٤٢) کە بەردەوامی هەیە، بەڵام ناکرێت بیر لەوە بکرێتەوە کە پەرلەمان یان لیژنەی هەموارکردنەوەی دەستوور رێککەوتنامەکە پەسەند دەکەن، کە جگـە لە کۆپییەکی ماددەی ١٤٠چیتر نییە. لەوسۆنگەیەشەوە هەڵوێستی کورد تەواو گرانە چـونکە ئەو بارودۆخەی کە لەئارادایە خۆی لەنەبوونی میکانیزمی یاسایی یان دەستووریدا دەبینێتــەوە تا زەمینە بۆ کورد خۆش بکات لەگەڕانەوەی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکـانی تـر. لەبەرئــەوە دەستکردن بەپرۆسەسەکی نوێ لەلایەن هەموانەوە بەپرۆسەسەکی یاسایی دادەنرێت و ئەوەش وا لەکورد دەخوازێت هەڵوێستێکی مامناوەندی هەبێت چونکە ئەو بارودۆخەی لەئێستـادا هەیـە چارەسەری هیچ شتێك ناکات و ماددەی(١٤٠) یش رەنگە وەك بەرپرسێکی بـەرەی تورکمـانی دەڵێت بێ واتاو رەتکراوە بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پرسی دیاریکردنی بارودۆخی کـەرکووك و جێ لەسەرناکۆکەکان کۆتاییان نایەت و سەرجەم لایەنەکانیش لەوبارودۆخە نارازین.

لەواقیعـدا هــەردو پارتــە کوردییەکــە دەســتیان بەســەر هێــزە ئــەمنی و زۆرێــك لــە بەرێوەبەرایەتییەکانی پارێزگاکەدا گرتووەو لەهەمان کاتەشدا حکومەتی بەغدا دەستی بەسـەر قەبارەی ئەو بودجەیەدا گرتـوە کـە بـۆ کـەرکووك تـەرخانکراوەو دەسـەڵاتی دوورخسـتنەوەی هەندێك لەبەرپرسانیشی لەدەستدایە.

لەڕووەکانی تریشەوە بەهێزترین بـوون لەکەرکووکـدا بـوونی هێزەکـانی ئەمریکایـە بـەڵام لەواقیعدا ئیدارەی کەرکووك ئیدارەیەکی کاتیـەو جـۆرە پشـێوییەك بـاڵی بەسـەردا کێشـاوە. هەروەها جۆرە نائۆقرەییەك لەنێوان ئەنجوومەنی پارێزگاو حکومەتی بەغدا لەلایـەك و هـەردو حزبەکەش لەلایەکی ترەوە هەیە کە لەپێناو نفوزدا کێبڕکێ دەکەن. ئەمــە جگــە لــەنائۆقرەیی نێوان سەرانی سیاسی کوردو عەرەب و تورکمان لەسەرتاسەری پارێزگاکـەدا تەنانـەت لـەنێوان پارێزگارو سەرۆکی ئەنجوومەنی پارێزگا کە هەردوکیشیان کوردن.١

---

١- لەبەرایی ساڵی ٢٠٠٨ عەبدولڕەحمان مستەفای پارێزگار ناکۆکیەکانی خۆی لەگـەڵ رزگـار عـەلی دا وا وەسـفکرد کـە لـەلای هەمووان ئاشکرایە.لەم بارەیەوە بڕوانە:

Rozhnama ( BBC Monitoring International Reports).2008. ( Iraqi Kirkuk Governor defends his Administration of the City ." 8 February (LN).

PDF 4 KURD

هاوكات كەركووك رۆژانە رووبەڕووی كاری توندوتیژی دەبێتەوەو ژێرخانیش بەبەردەوامی دادەڕمێت و سوپایەكیش لە كۆچپێكراوان لەهەڵكشاندایە، كە لەسادەترین خزمـەتگوزاریش بێبەشن.١

دیارە هەرچارەسەرێكیش بۆ بارودۆخی كەركووك یارمەتیدەرە لەدیاریكردنی ئەوەی كـەكێ بەرپرسیارە لەچارەسەركردنی ئەو كێشانە، جا بـەو پێیـەی كـەركوك پارێزگایـەكی دەرەوەی هەرێمە یان بۆخۆی هەرێمێكە یان بەشێكە لەهەرێمی كوردستان ئەوا ئـەوە هەنگاوێكـە روەو باشتربەبەراورد بەو رەوشەی كەئێستا هەیەتی.

هاوكات ئەو بارودۆخەی كە ئێستا تیایدایـە هانـدەر نییـە بـۆ دابەشـكردنی دەسـەڵات و هەوڵەكانی كوردیش بۆ گەیشتن بە رێككەوتن لەسـەر دابەشـكردنی دەسـەڵات لەگـەڵ هـەردو كوتلەی عەرەبی و توركمانی لەئەنجوومەنی پارێزگاكەدا نابێتە هۆی گەشەی پەیوەندی ئیتنیكی لەباری نێوان سەرانی سیاسی. چونكە ئاستەنگی سەرەكی بریتییە لە ناكۆكی لەسەر داهاتووی كەركووك، خۆ ئەگەر ئەو پرسەش چارەسەرنەكرێت ئەوا هیچ جـۆرە شـێوازێكی دابەشـكردنی دەسەڵات ناتوانێـت بەشـێوەیەكی كـارا ئیشـبكات و واتـای هـەبێت، لەبەرئـەوەی سـەرانی هەردوپێكهاتەی عەرەبی و توركمانی گشت توانای خۆیان بەگەڕدەخەن بۆ رێگری كردن لـەوەی كەركووك بۆ سەر هەرێمی كوردستان بگەڕێتەوە.

### باجی ئامادەیی كورد

رەنگە تەنیا شتی خراپتر لـەو رەوشـەی كـە لەئارادایـە گەیشـتن بێـت بەچارەسـەر سـەبارەت بـە داهاتووی كەركووك بەبێ رەزامەندی كورد، هەڵبـەت لەبەرامبـەر هێـزی دژ بـەكورد لەسـەر پرسـی كەركوك ئاستەم نەبێت وێنای ئەو سیناریۆیە بكرێت كە تیایدا زۆرینەی كوتلە سیاسیە عەرەبییـەكان چارەسەرێك ئامادە بكەن و دواتر لەرێگەی یاسایی و دەستووری پەتییەوە بەسەر كورددا بیسەپێنن.

---

٢ - بەپێی خەملاندنی رێكخراوی نێودەولـەتی كـۆچ و كۆچـبەران International Organization for Migration (IOM) ژمارەی خێزانە راگوزراوەكانی كەركوك تا كۆتایی ساڵی ٢٠٠٥، ٢٢ هەزار خێزان بوون. هەر بەپێی خەملاندنەكانی ئەو رێكخراوە ئەگەر هەرخێزانێك لە ٦ ئەندام پێكهاتبێت ئەوا زیاتر لە ١٣٠ هەزار كەس لەو پارێزگایە راگوازراون.

IOM. 2006." Tameem / Kirkuk ,October –December 2005.Phase II Monitoring " ( www. i o m – i r a q. n e t / L I b r a r y / I d p R e p o r t s/ T a m e e m- % 20 K I r k u k %20Phase%20II%20IDP%20Report.pdf)

بۆ نموونە کاتێك ئەرکی لیژنەی تایبەت بەچاوخشاندنەوە بەدەستووردا تەواو دەبێت، رەنگە میکانیزمی هەموارکردنی دەستوور بگەڕێتەوە بۆ ئەو پرۆسەیەی کە رووکارەکانی ماددەی (١٢٦) ی دەستوور دیاری دەکات. کە بەپێی ئەو پرۆسەیەش دەکرێت بەرەزامەندی دوو بۆ سێی ئەندامانی پەرلەمان و رەزامەندی گەل بەزۆرینەیەکی سادە لەراپرسیەکی گشتیدا دەستوور هەموار بکرێت.

هەروەها بۆ لەباربردنی هەمواری پێشنیازکراو لەئەنجوومەنی نوێنەران بۆ نموونە رێگری بکرێت لەوەی کەرکوك بچێتە سەر هەرێم کە ئەوەش پێویست بە (٩٢) دەنگ هەیە مسۆگەر بکرێت و کوردیش تەنیا خاوەنی (٥٨) دەنگە.١

لەبەر ئەوە دەکرێت نەیارانی کورد لەڕووی ژمارەوە چارەسەری پرسی کەرکوك پێشکەش بکەن بەبێ بەشداریکردن و رەزامەندی کورد، بەڵام کارێکی لەو جۆرە ئارامی عێراق بەشێوەیەکی مەترسیدار لەباردەبات و هەرچی سەرانی کوردیشە هەوڵ و سەرمایەی زۆریان بەگەڕخستوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ئەرێنی پرسی کەرکوك چارەسەربکرێت.

بێگومان دەکرێت هەردو حزبەکە پەنا بۆ چارەسەرێکی تەوافوقی بەرن لەنێو جەماوەری وەڕس و بێزاری کورد بەڵام ناکرێت هیچ کام لەو دوو حزبە رەواج بە چارەسەرێکی سەپێنراوی یەکلایەنە بدەن کە لەدژی بەرژەوەندیەکانی کورد.

لەئاستێکی قوڵتردا ئەو چارەسەرەی کە لەرێگەی دانوستانەوە سەرچاوە ناگرێت پرسیاری ئەوە دەهێنێتە ئاراوە کە ئاخۆ بەشداریکردنی کورد لەداهاتووی دەوڵەتی عیراقیدا چ سوودێکی دەبێت.

تائێستا سەرانی کورد پابەندبوون بەگرتنە بەری ستراتیژێکی سیاسی –زامنی زۆرترین مافی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عیراقدا- کە لەگەڵ زۆربەی جەماوەرەکەیاندا لەدوو بەرەوەی دژ بەیەك دایناون.٢

هاوکات گەرەنییە دەستوورییەکان رێگرن لەوەی حکومەتێکی عەرەبی بەهێز لەناوەندا دەربکەوێتەوە و ماددەی (١٤٠) یش لەزۆر رووەوە بەڵگەی ئەو ستراتیژەیە.

---

١ - هەر لەکانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ەوە لانی کەم ١٥٠پەرلەمانتار دژی هەوڵەکانی کورد بوون بۆ گەڕانەوەی کەرکوك. ماوەتەوە لەچاوەڕوانی ئەوەدابین کە ئاخۆ هاوپەیمانەکانی کورد لەوانەش ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی ئامادەن لەگەڵ کورددا دەنگ بدەن بۆ رێگرتن لەوهەموارکردنەی کە زۆرینەی پەرلەمانتاران پشتیوانی لێدەکەن.

٢ - لەکاتی هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٧ داوا لەدەنگدەرانی هەرێمی کوردستان کرا بەشداری ئەو راپرسییە بکەن کە سەبارەت بە جیابوونەوە لەعیراق کرا و بەو پێیەش زیاتر لە ٩٥٪ لەبەرژەوەندی سەربەخۆیی دەنگیان دا.

هێزەكات چارەنووسی ماددەی (١٤٠) ئەوە دەردەخات كە خاوێنی دەستوور لەسەرو گومانەكانەوە نییەو ئەو "گەرەنتی" یانەش كە لەبەندەكانی دەستووردا بەرجەستە بوون لەواقیعدا توانای دەستەبەر كردنیان نییە.

خۆئەگەر زۆربەسادەیی چارەسەرێكی نەرێنی بۆ پرسی كەركوك بەسەر كورددا بسەپێنرێت ئەوا ئاستەمە وێنای ئەوە بكرێت كە كورد بەردەوام بن لەسەر گرتنە بەری ئەو ستراتیژەی كە پەنایان بۆ بردووە.

لەبەر ئەوە یەكێك لە ئەنجامە چاوەڕوانكراوەكان كە یەك لایەنە كورد لای خۆیەوە رایدەگەیەنێت سنووری هەرێمی كوردستانە كە بەشێك لەناوچەدابڕێنراوەكان و سەرجەم پارێزگای كەركووك یان بەشێكی لەخۆدەگرێت.١

لەراستیدا كاری لەم جۆرە مزگێنی خێری بۆ ئارامی عیراق پێنییە.٢ یەكێكی تریش لەو بژاردانەی كە كەمتر دراماتیكیە لەلای سەرانی كورد پاشەكشەكردنیانە لەحكومەتەكەی نوری مالكی یاخود پەكخستنی كۆی ماددەی (١٤٢).

دیارە هەردو بژاردەكەش مایەی مەترسین بۆ كورد بەڵام هەریەكێك لەو بژاردەیە بەسە بۆ ئەوەی بارودۆخی عیراق بەرەو ئاژاوە بچێت تا هەڵبژاردنی كانوونی یەكەمی ٢٠٠٩.

بێگومان بەرژەوەندی لایەنەكانی دژ بە خواستەكاتەكانی كورد لەكەركووكدا لەوەدایە هەڵوێستێكی مامناوەند وەربگرن كە سەرانی كورد پێی قایل نین و ئەوانیش لەناوجەماوەریاندا رەواجی پێبدەن.

لەبەرئەوە دەشێت كورد و نەیارانیان بگەنە فۆرمی رێككەوتنێكی مامناوەند لەسەر كەركووك. بەڵام دەبێت سیماكانی رێككەوتنێكی مامناوەند چۆن بێت؟

---

١ – زۆرێك لەناوچە دابڕاوەكانی وەك شەنگال و مەخمود و ئاكرێ لەژێر كۆنترۆڵی حكومەتی هەرێمدان و دەشكرێت دیسان كورد دەرفەتی ئەوە بقۆزێتەوە بۆ ئەوەی كوردانی موسڵ كە رێژەیەكی گەورە پێكدەهێنن بخاتە سەر هەرێمی كوردستان و ئەوەش روو بەڕووبوونەوەیەكی مەترسیدار لەگەڵ عەرەبی سوننەدا دروست بكات كە زۆرینەی شارەكە پێكدەهێنن. بەڵام بەدیل ئەوەیە كە ئەو كوردانە لەدەرەوەی هەرێمدا بمێننەوەو لەلایەن ئاسایشی هێزە كوردیەكانەوە بپارێزرێن.

٢ – وەك ئاشكرایە رەنگە ئەمە تەنیا یەكێك بێت لەكاردانەوەكان لەبەرامبەر چارەسەری سەپێنراودا بەڵام ناكرێت بیر لەوە بكرێتەوە كە سەرانی كورد بە چارەسەری سەپێنراو سەبارەت بە كەركوك و ناوچە دابڕاوەكانی تر رازی بن.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## پێشنیارەکانی چارەسەری مامناوەند

کەمی ئەو لێکۆڵینەوانەی باس لە ململانێی ئێستای سەر کەرکووك دەکەن رەنگدانەوەی کەمیی شیکاریی مەنهەجی جددییانەی بژاردەکانە لەپێناو چارەسەرکردندا.

بەشێکی زۆری نووسینەکانی سەردەمی نوێ لەبارەی کەرکووکەوە لەو راپۆرتانە پێکهاتوون کە لەمێژووی شارەکەوە وەرگیراون یاخود راشکاوانە دەقی حزبین (بەپلەی سەرەکی) و لەلایەن توێژەرانی کوردو تورکمان نووسراون بۆ پشتیوانیکردن لەبانگەشەی پێکهاتەکانیان سەبارەت بە خاوەندارێتییان بۆ کەرکووك.١

گرفتی ئەو کۆمەڵەئەدەبیاتەش بەزەرورەت ئاماژە نییە بۆ نەبوونی بنەمای زانستی بەڵکو زۆرێك لەو لێکۆڵینەوانە لەبەدۆکیۆمێنتکردنی بەڵگەکاندا ورد بوون بەڵام گرفتەکە لەتەوزیفکردنی ئەو بەڵگانەدایە بۆ خزمەتی" سەلماندن"ی ئەوپاساوانەی کە پێشوەخت بریار لەئەنجامەکانی دراون.٢ سەیریش نییە کە توێژەرانی تورك /تورکمان بیسەلمێنن کە کەرکووك شارێکی تورکمانی بووە بەکاتێدا نووسەرانی کوردیش بە هەمان شێوە دەریدەخەن کە بۆچی کەرکووك شارێکی کوردییەو هەمیشەش هەر کوردی بووە.

پاشان بەخەیاڵ کەسیاندا نەهاتووە کە بگەنە چارەسەرێکی تەوافوقی سەبارەت بە داهاتووی کەرکووك.

هاوکات ئەو وتارە کەمانەش کە لەگۆڤارە تایبەتمەندەکان هەن بەهەمان ئاراستەن. بۆنموونە لەوەرزنامەی(Middle East Quarterly)، زستانی ٢٠٠٧، ژمارەیەك تێزی سادەی تایبەت بەپاساهێنانەوەی کوردو تورکمان سەبارەت بەخاوەندارێتی کەرکووك بڵاوکردوەتەوە. هەرچی

---

١ – سەبارەت بەبیۆگرافیای ژیانی کەرکوك کە لەلایەن کەرکوکیەکی بە رەچەڵەك ئەرمەنییەوە نووسراوە ، دەبینیت زۆربەی مێژووی شارەکە لەشێوەی چیرۆکدایە بەڵام سیحرئامێزە.بڕوانە:

Astarjian, H.D. 2007. The Struggle for Kirkuk ;The Rise of Hussein ,Oil and the Death of Tolerance in Iraq. Westport ,CT: Praeger Security International.

٢ – بۆ نموونە نووسینێکی یۆجل گۆجلۆ Yucle Guclu بەناوی(تورکمان و کەرکوك) ،کە لە ١٠٠ لاپەرە پێکهاتووە، ١٧٩ پەراوێزی لەخۆگرتوە کە ئامانج لێی بۆ سەلماندی تورکمانیبوونی شاری کەرکوکە. هاوکات مێژوو نووسی کورد کەمال مەزهەرئەحمەد لەکتیبی (کەرکوك وتوابعها) وردەکاری زۆری لەخۆگرتوە بۆ ئەوەی دەریبخات کەرکوك کوردییە.

تێزەکەی کـوردە لەلایـەن دکتـۆر نـوری تاڵەبانیـەوە نووسـراوەو بـەوە کۆتـایی هـاتووە کـە ماددەی(١٤٠) لەکاتی خۆیـدا جێبـەجێ بکرێـت و هەرچـی تێـزی نووسـەرو دیپلۆماتکـاری تورکیشە(یوجل گۆجلۆ)یە باس لەدەستێوەردانی نێودەوڵەتی دەکات بۆ ئەوەی کەرکووك نەچێتە سەر هەرێمی کوردستان.١ لەبەر ئەوە تا ئەمڕۆ مشتومڕ لەسەر کەرکووك بەردەوامە لـەنێوان ئەوانەش کە بەرژەوەندی تایبەتیان بەئەنجامەکەی هەیە.

لە نێو ئەو توێژەرە دانسقانەی خۆرئاوا کە بەقوڵایی چـوونەتە نێـو ئـەو پرسـەوە "دیڤیـد ڕۆمانۆ _ David Romano" یە کەشـیکارییەکی مەنهـەجی سـەبارەت بەپرسـی کـەرکووك و داهاتووی پێشکەش دەکات٢.

داهاتووی کەرکووکیش خـۆی لـە ڕێگـەدان بەئەنجامـدانی ریفرانـدۆم وەك ئـەوەی بڕیـاری لەسەردراوە دەبینێتەوە، لەگەڵ پێـدانی بـارودۆخێکی تایبـەت بـە کـەرکووك لەچوارچـێوەی هــەرێمی کوردســتان و ڕادەســتکردنی ئیدارەکەشــی بــە حکومــەتی ناوەنــدی و دواخســتنی چارەسەرکردنەکەشی بۆ ماوەی (١٠)ساڵ.

لەکۆتایشدا ڕۆمانۆ گورزێك لە چارەسەری تەوافوقی مامناوەند پێشکەش دەکات کە تیایدا ئیدارەکردنی کێڵگە نەوتیەکان بەدەست حکومەتی فیدراڵییەوە دەمێنێتەوە لەگەڵ دۆزینـەوەی بارودۆخێکی تایبەت بە پارێزگای کەرکووك لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا.

دیسان لەسیاقی ئەو بارودۆخە تایبەتەدا ڕۆمانۆ داوای فۆرمێکی سیاسی دەکات کە زامنی نوێنەرایەتی و دابەشکردنی دەسەڵات بکات لەئیدارەی کەرکووك(Consociation)دا.

لەوسەروبەندەدا "برندان ئۆلیری _ Brendan o'lery"باس لەچارەسەری بەڵگەنەویستی بـۆ ناوچە دابڕاوەکان دەکات، کە ئەویش دۆزینەوەی فۆرمێکە بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی لۆکـاڵی لەپارێزگای کەرکووك و خودی شارەکە لەژێر سایەی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا٣. هاوکات ئۆلیری داوا دەکات کە"فۆرمێکی لۆکاڵی دابڕێژرێت کە زامـنی نوێنەرایـەتی و دابەشـکردنی دەسەڵات لەشاری کەرکووك بکات بێ گوێدانە دوا بارودۆخی پارێزگاکە.٤

---

1 - Talabani, N. 2007. "The Kurdish Case."Middle East Quarterly,Winter ,14 , 1:75-78, and Guclu, Y . " The Turkmen Case." Middle East Quarterly , Winter , 14, 1: 79-86

2 - Romano, D. " The Future of Kirkuk "Ethnopolitics , 6,2, June: 265-283.

3 -O'Leary , B. "Power- Sharing , Pluralist Federation and Federacy ." In The Future of Kurdistan in Iraq هەمان سەرچاوە ، ل ٧٨.

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو

PDF 4 KURD

هاوكات گروپی قەیرانە نێو دەوڵەتیەكان لەگەڵ ئەوەی سەرچاوەیەكی ئەكادیمی نییە، چارەسەری باشی خۆی پێشنیاز كردوە. لەراپۆرتەكەیدا كە لەتەموزی ساڵی ٢٠٠٦ بەناونیشانی "The Brewing Battle Over Kirkuk" بڵاوكراوەتەوە، پێشنیاز دەكات بۆ ماوەیەكی كاتی كە (١٠) ساڵ بخایەنێت بارودۆخێكی تایبەت بەسەرپەرشتی نەتەوە یەكگرتوەكان بدرێتە كەركووك كە تیایدا دەسەڵات بەسەر هەرچوار پێكهاتە سەرەكیەكەی شارەكەدا دابەشبكرێت١.

هاوكات ئەم جۆرە رێككەوتنامەیە وەك چارەسەرێكی كۆتایی بۆ بارودۆخی كەركووك بەكراوەیی بۆ دوای تەواوبوونی ماوەی ئینتیقالی جێ بهێڵرێت. لەگەڵ ئەوەی هەریەك لەم پێشنیازانە ئیستیحقاقی خۆی هەیە بەڵام هیچ كامیان ناچنە نێو قوڵایی وردەكارییەكانەوە٢.

بۆنموونە لەهیچ كام لەو پێشنیازانەدا فۆرمی دابەشكردنی دەسەڵات بەو جۆرەی لەگەڵ پێویستی تایبەت بە كەركووك گونجاوبێت وەسف ناكات.

هەڵبەت جیاوازی هەیە لەنێوان دابەشكردنی دەسەڵات لەسەر بناغەی یەكسانی و دابەشكردنی لەسەربناغەی نوێنەرایەتی رێژەیی.

بەجۆرێك یەكەمیان هەرپێكهاتەیەك پشكێكی یەكسانی دەسەڵات پێدەبەخشرێت و دووەمیشیان دەسەڵات لەسەر بنەمای هێزی فرەیی بۆ هەر پێكهاتەیەكی دانیشتوان دابەش دەكات.

هاوكات هەردوكیان نموونەی فۆرمی دابەشكردنی دەسەڵاتن و دەكرێت لەچوارچێوەی دیموكراسیدا لەسەربنەمای زامنكردنی نوێنەرایەتی و دابەشكردنی دەسەڵات پشتیان پێ ببەستن بەڵام هەریەكەشیان واتای جیاوازیان هەیە بۆ ئیدارەكردنی كەركووك٣.

بانگهێشتكارانی فۆرمی دابەشكردنی دەسەڵات پێیان وایە كەئەوە ئامرازێكە بۆ هێوركردنەوەی بەردەوامی ململانێی ئیتنیكی و دەبێت فۆرمی لەم جۆرەش لەسەربناغەی جێبەجێكردن و لەسیاقێكی دیاریكراودا دۆوست بكرێت.

---

1 -The International Crisis Group . " Iraq and the Kurds : The Brewing Battle Over Kirkuk , Middle East Report 56, 18 July.

١- مەستیان لەرەخنەگرتن نییەو هیچ كام لەو سەرچاوانەش باس لەوە ناكەن كە خاوەنی پرۆژەیەكی تێروتەسەلن بۆ كەركوك.

2- سەبارەت بەو رەخنانەی لەو شێوازەی نوێنەرایەتی و دابەشكردنی دەسەڵات گیراون بڕوانە:

-Lustick , I .S. 1997. " Liphart , Lakatos and Conscociationalism . "World Politics , 50, 1:88-117.

هەروەها فۆرم(صیغە)ی زامنکردنی نوێنەرایەتی و دابەشکردنی دەسەڵات لە گشت بارەکاندا گونجاو نییە.

## رەهەندەکانی هەرسێ چارەسەری تەوافوقی

هەر رێککەوتنێکی مامناوەند لەسەرکەرکووك پێویستە سێ پرس چارەسەر بکات.

یەکەمیان/ پرسی هەرێمایەتی کەخۆی لە وەدا دەبینێتەوە ئایا کەرکووك دەبێتە بەشێك لەهەرێمی کوردستان یاخود لەدەرەوەی سنووری کوردی دەمێنێتەوە.

دووەم/ پرسی بەڕێوەبردن کە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە ئایا کەرکووك"بارودۆخێکی تایبەت" ی پێدەدرێت یان نا. هەروەها ئەو بارودۆخە تایبەتمەندە تەنیا شارەکە دەگرێتەوە یان کۆی پارێزگاکەش.

سێیەم/ پرسی حوکمڕانی کەخۆی لەوەدا دەبینێتەوە ئایا کەرکووك بەفۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات بەڕێوەدەبرێت و لە بارێکی وەهاشدا شێوازی ئەو فۆرمە چۆن دەبێت.

بۆپتر تێگەیشتن لەم پرسە ئەم خشتەیە کێشراوە کەچوار ئەگەری لەخۆگرتووە:

شێوەی ١١- ١

چوار داهاتوو بۆ کەرکووك

| بارودۆخی تایبەتی پێدەدرێت | بارودۆخی تایبەتی پێنادرێت | |
|---|---|---|
| ٢ | ١ | لەناوهەرێمی کوردستاندا |
| ٤ | ٣ | لەدەرەوەی هەرێمی کوردستاندا |

سیناریۆی چارەکی یەکەم/ کەرکووك دەخاتە سنووری هەرێمەوە بێ ئەوەی بارودۆخێکی تایبەتی پێبدرێت. بەپێی ئەم سیناریۆیە پارێزگای کەرکووك دەبێتە یەکەیەکی ئیداری لەچوارچێوەی کوردستان و هاوتای بارودۆخی پارێزگاکانی تری هەرێم دەبێت.

لەم بارەشدا پرۆژەی دەستووری ئامادەکراوی هەرێمی کوردستان هێندە باس لە خۆ بەڕێوەبردنی یەکەکانی هەرێم ناکات.

دەروازە(باب)ی چوارەم لەپرۆژەی دەستوورەکە هێڵە گشتیەکانی رێکخستنی ئیدارەی خۆجێیەتی و ئەنجوومەنی شارەوانیەکانی کێشاوە.



PDF 4 KURD

هەروەها ئاماژەی بەمافی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنە لۆکاڵیەکان و ئامادەکردنی " بودجەی سەربەخۆ" داوە١. بەڵام نەبوونی وردەکاری لەوبابەدا و نەبوونی وشەی "فیدراڵی" لەهیچ کام لەبەشەکانی پرۆژەی دەستوورەکەدا ئاماژەیە بۆ نەبوونی دەقێکی پەیوەست بە جێبەجێکردنی فۆرمی فیدراڵی لەناوخۆی هەرێمدا.

لەراستیدا ماددەی(٣) رێگە نادات بەپێکهێنانی هەرێمی نوێ لەنێو هەرێمی کوردستاندا.

هەرچی ماددەی(١٤٢) شە، رێگە بەحکومەتی هەرێمی کوردستان دەدات بەعەمەلی یەکلایەنە سنووری ئیداری بگۆڕێت و یەکەی نوێ دروست بکات و یەکەی کۆنیش هەڵبوەشێنێتەوە٢.

دیسان پرۆژەی دەستووری هەرێم لەهیچ کام لەبەشەکانیدا باس لەوە نەکراوە کە یەکە ئیدارەیەکان بوونێکی سەربەخۆیان هەبێت لەحکومەتی هەرێم.

پرۆژەکە بەو شێوەیەی ئێستای سیستمێکی یەکگرتووی توندی هەیە کە راستەوخۆ کەرکووك دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی هەولێرەوە٣. لەبەر ئەوە کەرکووك بەپێی ئەو سیناریۆیە "موڵك"ی کوردە بەواتای بوونی لەچوارچێوەی سنووری هەرێمی کوردستاندا.

سیناریۆی چارەکی سێیەم/ بەو پێیەی ئاماژەی بۆکراوە پێچەوانەی ئەگەرەکەی پێشووترەو کەرکووك دەخاتە دەرەوەی هەرێمی کوردستان و بارودۆخێکی تایبەتیشی پێ نابەخشێت.

لەرووی پراکتیکییەوە کەرکووك حوکم بکرێت یان نەکرێت ئەوا وەك ئەوەی هەبووە لەنیسانی (٢٠٠٣)وە وەك خۆی دەمێنێتەوەو دەسەڵاتەکانی کە بە "پارێزگاکانی دەرەوەی

---

١ – ئەو کوەتێشنسانە لە Kurdish Globe وەرگیراون کە لەم سایتەدا هەیە:
www.kurdishglobe.net/displayprintableAriticle.jsp.?

٢ – دەقی تەواوی ماددەی ١٤٢ لەدەستووری هەرێمی کوردستان دەڵێت" دابەشکردنی ئیداری لەهەرێمی کوردستان (پارێزگا- شارۆچکە- شارەدێ) و نوێکردنەوەو گۆڕینی ناوەندەکانی و دیاریکردن و دەستکاریکردنی سنوورەکانیان و بەستنەوەیان بە یەکەکانی ترەوە بەیاسا دەبێت".

٣- لەدەقەکانی پێشووتری پرۆژەی دەستووردا کەرکوك پایتەختی هەرێم بووە بەلام بەپێی نوێترین رەشنووسی دەستووری هەرێم هەولێر جێگەی کەرکوکی گرتوەتەوە.



PDF 4 KURD

هەریم' ناودەبرێت، لەدەستووری عیراقیدا وەك پێویست دیاری نەکراون، بەڵام لـەرووی عەمەلییـەوە ئەوا بەدڵنیاییـەوە دەسـەڵاتەکانی دەسـەڵاتی هەرێمـەکان لەبەرامبـەر حکومـەتی فیدراڵیـدا لاوازتـر دەبێت١.

سیناریۆی چارەکی دووەم/ کەرکووك دەخاتە نێو هەرێمی کوردستان لەگەڵ پێدانی پێـدانی بارودۆخێکی تایبەت لەچوارچێوەی هەرێمدا. کـە ئـەوەش پێویسـت بەهـەموارکردنی پـرۆژەی دەستووری هەرێم دەکات بۆ ئەوەی ئۆتۆنۆمیەکی فراوانتر ببەخشرێتە ناوچەی نوێی کـەرکووك، بەڵام سادەترینیان پێـدانی دەسـەڵاتی سـەربەخۆو جیایـە لەپەیوەنـدی بەحکومـەتی هـەرێمی کوردستانەوە و هاوشێوەی ئەو دەسەڵاتانەیە کە هەرێمەکان لەپەیوەندیان بەحکومەتی فیدراڵی عیراقەوە هەیانە.

لـــەرووی عـەمەلییـــەوە کـــەرکووك دەبێتـــە "فیـــدراڵی" لەچوارچـــێوەی هـــەرێمی کوردسـتاندا. هەروەك ئـەوەی ئـۆلیری دیـاریکردوە بـەوەی کـە فیـدراڵی بریتیـە لـەفۆرمێکی ئیتیحادی کەبەشێك نابێت لە فیدراڵی لەسەر ئاستی کۆی سیستمەکە، بـەڵکو دەسـەڵاتەکان دابەش دەکات لەنێوان فیدراڵی و حکومەتی ناوەندی وەك ئەوەی لە دەسـتووردا هـاتوەو هـیچ لایەنێکیش ناتوانێت یەك لایەنە بیگۆڕێت.

هاوکات خاوەنی میکانیزمی حوکمکردنەلەنێوخۆو لەئاستی نێودەوڵەتیدا بۆ مامەڵـەکردن لەگەڵ ئەو ئاڵۆزیانەی لەنێوان فیدراڵیەت و حکومەتی ناوەندا دێنە ئاراوە٢. لەباری نموونەیشدا وەك ئـۆلیری دەڵێـت پێویسـتە بـارودۆخی فیـدراڵی و دەسـەڵاتەکانی بـەپێی دۆکیومێنتـە نێودەوڵەتیەکان پارێزراو بێت٣.

---

٣- بـۆ زیـاتر ئاشـنابوون بـەو مشـتومڕانەی سـەبارەت بەجیاوازییـەکانی نێـوان دەسـەڵاتەکانی هـەرێم و دەسـەڵاتی پارێزگـا نارێکخراوەکانی دەرەوەی هەرێمەکان کراون بڕوانە فەسڵی نۆیەم.

2 - O'Leary , B. 2003. " Multi national Federalism , Federacy ,Power- Sharing and The Kurds ", Keynote address, Cafritz Foundation
Conference Center ,George Washington University ,12 September : 20.

٣- پەیوەندی نێوان فنلەنداو دورگەی ئالانـد حاڵـەتێکی نموونییـە بـۆ پشـت بەسـتن بـە شـێوازی فیـدراڵی تۆکمـەو سەرکەوتوو . بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو پەیوەندییە بڕوانە :
Anderson , L. " A Comparative Perspective on Iraq's federal System : Some Concrete Suggestions ." Paper prepared for presentation at the MESA Conference , Montreal , November 2007.

PDF 4 KURD

سیناریۆی چارەکی ٤/ بارودۆخێکی تایبەت دەدرێتە کەرکوک بەڵام لەدەرەوەی سنووری هەرێمی کوردستان.لەهەردو بارەکەشدا بەشێوەیەکی گشتی ئۆتۆنۆمیەکی فراوان دەبەخشرێتە کەرکووك لەپەیوەندییەکانی لەگەڵ دەسەڵاتی حوکمڕانی، جا ئەو دەسەڵاتە لەهەولێر یاخود لەبەغداد بێت.

## ئەو داهاتووەی کەرکووك کە بەلای پێکهاتەکانیەوە باشترە

کۆمەڵێك لەئاڵۆزی پەیوەست بە دیاریکردنی ئەوەی کە بەلای پێکهاتە ئیتنیکی –تایەفییە جیاوازەکانەوە بەباشتر دەزانرێت لەئارادان. قسەکردنیش لەسەر ئەوەی "پێکهاتەکان پێیان باشترە"بەواتای چوونیەکی دیدی پێکهاتەیەکی پەیوەندیدار، کە ئەوەش سادەکردنەوەیەکی گەورەیە.

دووەم، ئەوەی پێکهاتەکان بەپێی گۆڕانکاریە سیاسیەکان پێیان باشترە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. هەڵوێستی بەرەی تورکمانی عیراق سەبارەت بە کەرکوك کە لەنیسانی ٢٠٠٣دەوە گۆڕانکاریەکی ریشەیی بەسەردا هاتووە.

دواجار ئەگەری چەند داهاتوویەك لەئارادایە کە لەشێوەی ١١- ١دا روون کراونەتەوە. لەقۆناغە جیاوازەکاندا بەرەی تورکمانی پێشنیازی کردبوو کە کەرکوك پایتەختی هەرێمی نوێی فیدراڵی تورکمانە. بۆنموونە لەکاتێکدا دابەشکردنی کەرکوك بەزۆر یان لەرێگەی تررەوە ناکرێت وەك ئەگەرێك فەرامۆش بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا دەشێت بەبێ دوودڵی بگوترێت کە ئەو داهاتووانەی کە لەشێوەی ١١- ١دا ئاماژەیان پێکراوە چاوەڕوانیی لێدەکرێت.

کورد بەوپێیەی یەکێکە لە پێکهاتەکان ئەوا بەکۆدەنگی لەگەڵ ئەوەدان کەرکووك بچێتە سەر هەرێمی کوردستان. ئەوەی کە بەدیاریکراوی پەیوەستیشە بەپرسی کەرکووك بەنزیکەیی جیاوازیەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ هەولوێستی هەردو حزبە سەرەکیەکە. بەدڵنیاییشەوە رکابەری لەنێوانیاندا هەیە سەبارەت بەوەی کامیان لەکەرکووکدا پیادەی دەسەڵات دەکەن و رەنگە جیاوازییەکیش هەبێت لەسەر شێوازی پێشنیازکردنی پرۆسەکە لەبەغداد. بەڵام هەردو حزبەکوردییەکە پەیڕەوی یەك بەرنامەی تۆکمەیان کردووە لەسەر زەرورەتی گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان یان بەواتایەکی وردتر بەزەرورەت خەڵکی کەرکووك ئەو مەسەلەیە لەراپرسییەکدا بڕیاری لەسەر بدەن.

بێگومان دەستەواژەکان ئەوەندە زۆرنین کە لەنێوان هەردوحزبەکەدا( پارتی و یەکێتی) هەن بۆ ئەوەی هەڵیانبژێرن بەڵام بارزانی لەچەند بۆنەیەکی جیاوازدا ئەوەی راگەیاندووە" ناسنامەی

PDF 4 KURD

کەرکوك کوردییەو ناکرێت بگۆڕدرێت"١.هەروەها کەرکوك "دڵـی کوردسـتان"ەو ئامـادەین بجەنگین و لەپێناو ناسنامەی کەرکووکدا گیان بکەینە قوربانی٢.

هاوکات تاڵەبانیش دەڵێت"کەرکووك لەڕووی مێـژوویی و دانیشـتوانیەوە رۆژێـك لـەرۆژان بەشێك نەبووە لەعێراق بەڵکو بەشبێك بـووە لەکوردسـتان". دیسـان ئـەوەی زیـاتریش مایـەی وروژاندنە ئەوەیە کە دەڵێت" کەرکووك شارێکی پیرۆزە لەلای کورد هەروەك چۆن قودس لـەلای موسڵمانان پیرۆزەو ئێمەش زیاتر لە٤٠ ساڵە لەپێناویدا خەبات دەکەین"٣.

بەدوور لە رەوانبێژیی گوتارخوازی و موزایەدەی ئیتنیکی هەردو سەرکردە، راو بۆچـوونی میـانڕەویش لـەنێو هەردوحزبـدا بـوونی هەیـە ئەوانـەش لەنموونـەی بەرهـەم ئەحمـەد سـاڵح لەنێو(ی.ن.ك) و هوشیار زێباری لەنێو(پ.د.ك)دا، هەرچـەندە ئـەمانیش هـەمان هەسـتیان بەرانبەر بەکەرکووك هەیە بەڵام زمانێکی دیپلۆماسیتر گوزارشتی لێدەکەن٤.

دیسان لەنێو سەرکردەی پارتـە کوردییـەکانی تر(شـیوعی، زەحمەتکێشـان، یـەکگرتوو) جیاوازیەکی ئەوتۆیان نییە لەگەڵ سەرانی هەردو پارتەکە سەبارەت بەپرسی کەرکووك.

بۆنموونە یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی لەچەند پرسێکدا نەیاری ئاشکرای هەردو پارتـە کوردییەکە بووە بەڵام لەمەسـەلەی فیـدراڵی و چارەنووسـی کـەرکوك بـەپێی مـاددەی ١٤٠ پشتیوانی کردووە.

تەنانەت لەدوای پاشەکشەی لەلیستی سەرەکی کوردی لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥، یەکگرتوو لەپرۆگرامیدا بەڵێنیدا " هەوڵـدات بـۆ دیـاریکردنی سـنووری هـەرێمی فیدراڵی کوردستان و چارەسەرکردنی پرسی کورد لەوادەی دیاریکراوی نێو دەستوورو گەڕانەوەی سەرجەم ناوچە دابڕێنراوەکانی تر بۆ سەر هەرێمی کوردسـتان٥. پـاش بردنـەوەی یـەکگرتووی

---

1- Deutsche Press Agentur .2004. Kurdish Parties Reject Proposed Division of Iraqi Kurdistan ." 6 January (LN).

2- Turish Daily News ."2004. "Barzani : Ready To Fight For Kirkuk ". 10 September (LN).

3 - United Press International .2004. " Talabani : Kirkuk scared for Kurds ." 31 March (LN).

4- Clover ,C .2003. " Dispossessed Kurds beginning to Lose Patience ." Financial Times , 24 May: 8; Congar, Y. 2004."The Kirkuk Incidents and the United States ."Milliyet , 4 January (LN).

٢- بەرنامەی هەڵبژاردنی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانی ،٢١ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٥، لەم سایتەدا هەیە:

PDF 4 KURD

ئیسلامی کوردستان بە(٥) کورسی لەپەرلەمانی عێراق، بڕیاریدا نەچێتە ژێر چەتری فراکسیۆنی هاوپەیمانیی کوردستانی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جەختیکردەوە لەسەر"هەرکاتێك مەسەلەکە پەیوەندی بە پرسە چارەنووسسازەکانی وەك فیدراڵی و کەرکووك و سنووری کوردستانەوە هەبێت ئەوا هاوکاری هاوپەیمانی کوردستانی دەکەین"١.

دیارە هاوڕاییەك هەیە لەنێوان سیاسیەکانی کورددا سەبارەت بە پێگەی کەرکووك لەداهاتوودا، واتە پێیان باشە کەرکووك لەچوارچێوەی سنووری هەرێمی کوردستاندا بێت نەك لەدەرەوەیداو ئەوەی پەیوەستیشە بەوەی کەرکووك بارودۆخێکی تایبەتی هەبێت، ئەوا وێنەیەکی زۆر ئاڵۆزی هەیە.

کاتێك کەرکووك بارودۆخێکی تایبەتی هەبێت لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستان ئەوا مافی ئۆتۆنۆمی پێدەبەشێت و ئەوەش وادەکات دەسەڵاتی هەردو پارتە سەرەکیەکەی کورد بەدوور بێت. هەڵبەت لەلای کوردی کەرکووك هەستکردنێکی زۆر بەنائومێدبوون هەیە و دەستەووەستانن لەبەرامبەر رەفتاری ئەو دوو حزبە بەتایبەتیش لەمەسەلەی پەیوەست بەخڕکرنەوەی سەرچاوەکان لەپێناو ململانێی کوردی —کوردی لەسەر دەسەڵات لەبری بەدەستهێنانی پێداویستییەکانی دانیشتووان.

زۆربەی بەڵگەنامەکان لەسەرئەو مەسەلەیە بەڵگەی وەرگیراون بۆیە قەبارەی ئەو هەستکردنە و قوڵێتی بەشێوەیەکی ئاشکراو روون نەزانراوە. دیسان ئەو بەڵگانەش کەراپرسییەکان فەراهەمیان کردووە لەسەر ئەو پرسە کەمن. لەنیسانی ٢٠٠٥دا بەپێی راپرسییەکی گشتی عیراقی کە لەلایەن پەیمانگەی کۆماریی جیهانیەوە Internation Repuplcan -Institute، سازکروە نزیکەی ٧٣٪ی کورد لەگەڵ ئەوەدا کەرکووك بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمەوە لەکاتێکدا لە١٢٪ی لەگەڵ ئەوەدان کەرکووك لەژێر رکێفی حکومەتی ناوەندیدا بێت و لە٥٪یش لەگەڵ پێدانی بارودۆخێکی تایبەتن بەکەرکووك٢. هاوکات هەرد

---

www.nahrain.com

1 - Kurdistan Nuwe. 2006. "Kurdistan Islamic Union is not ready to join Kurdistan Alliance List in the Iraqi parliament ."27 January(WNC).

3- شێوازی پرسیارکردنەکە بەم جۆرە بووە"کام لەم چارەسەرانە بەلاتەوە گونجاوە بۆ یەکلایی کردنەوەی بارودۆخی کەرکوك؟".بژاردە پێشنیازکراوەکانیش" لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندیدا بێت" یان " لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بێت" یان " لەدوای پێکهێنانی کومەتی هەمیشەیی چارەسەربکرێت" یان " خەڵکی کەرکوك راپرسی بکەن" یان " بارودۆخێکی تایبەتی پێبدرێت" یان" چارەسەر نەکرێت تا ئەو کاتەی سەرژمێری دانیشتوان دەکرێت" یان" نازانم" بڕوانە:

حزبە کوردییەکەش(پارتی و یەکێتی) پێیان باشە کەرکووك راستەوخۆ لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بێت[1].

لەسۆنگەی ئەو وتوویژانەی کە لەگەڵ بەرپرساندا کراون و لەگەل ناوەرۆکی دەستووری هەرێمی کوردستانیش، روونبوەتەوە کە هەردو حزب لەگەڵ ئەوەدانین لەهەرێمدا سیستمێکی سیاسی دابمەزرێت بۆ ئەوەی هیچ کامە لەیەکەکانی بەشێك لەتوانای خۆبەرێوەبردنی هەبێت، ئەوەش شتێکی بەڵگەنەویستە کەکورد پێی باشترەجۆرێك لەسەربەخۆبوونی بەرێوەبردنی هەبێت و بەدوور بێت لەحکومەتی فیدراڵی خاوەن زۆرینەی عەرەبی لەبەغداد.

لەبەرئەوە کورد پێیباشە کەرکووك بەم جۆرە ریزبەند بکرێت:

| | |
|---|---|
| چارەکی(١) | - کەرکووك لەناوهەرێمدا بێت، بێ بارودۆخێکی تایبەت |
| چارەکی(٢) | - کەرکووك لەناوهەرێمدا بێت، لەگەڵ پێدانی بارودۆخێکی تایبەت |
| چارەکی(٤) | - کەرکووك لەدەرەوەی هەرێم بێت، لەگەڵ پێدانی بارودۆخێکی تایبەت |
| چارەکی(٣) | - کەرکووك لەدەرەوەی هەرێم بێت، بێ بارودۆخێکی تایبەت |

سەرباری دابەشبوون و پەروش و بڵاوی عەرەبی عیراقی بەڵام لەسەر پرسی کەرکووك کۆدەبنەوەو جیانابنەوە. لەسەر ئاستی نیشتمانیشدا هەڵوێستی فراکسیۆنە سیاسیەعەرەبییەکان بەسوننی و شیعیەوە لەباشترین باردا لەبەرمبەر گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان سست و خاوە.

دیارە تەنیا هاوبەشی کورد لەنووسینەوەی دەستووردا، ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی بوو لەعیراق، کە لەدوا ساتەکاندا پێکهێنانی گەورە هەرێمەکانی فیدراڵی پەسەندکردو پشکداری کرد لەکارئاسانی سەودانامەیەکی ئاڵوگۆڕکراوی نێوان ماددەی(١١٩) و(١٤٠).

---

International republican Institute .2005. " Survey of Iraqi Public Opinion April 11-20 ":45
(www.iri.org/mena/iraq/2005-05-05-IraqPoll.asp).

١_ ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێت کە بۆچوونی هاوڵاتیانی کورد بەهەند وەرناگیرێت لەسەر ئەو پرسە بەڵام لەهەمان کاتیشدا سەرکردایەتی هەردو پارتە سەرەکیەکە بەشداری دانوستانەکان دەکەن لەسەر چارەسەری تەوافوقی میانگیرانە لەسەر پرسی کەرکوك و بەو پێیەش ئەوەی کە زیاتر بەلایانەوە باشە پەیوەندی بەهێزی دەرئەنجامەکەوە هەیە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

هەرچەندە بەرپرسانی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی هیچ جۆرە لێدوانێكی نەرێنییان نەداوە سەبارەت بە هەوڵەكانی كورد بۆ گەڕانەوەی كەركووك بۆ سەر هەرێم بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پشتیوانیكردنیان بۆ جێبەجێكردنی ماددەی(١٤٠) ئەو پەرۆشییەی پێوە دیار نەبووە١.

لەراستیدا "عەممار ئەلحەكیم" كەدەكاتە كوڕی سەرۆكی پێشووی ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی(ئەنجوومەنی باڵای ئیسلامی) وخاوەنی نفوزێكی زۆرە لەحوزەیراندا رایگەیاند: ئێمە قبوڵ ناكەین كەركووك بچێتە سەر ئەم یان ئەو پارێزگایانەی تر چونكە كەركووك عیراقێكی بچووك كراوەیە٢.

جگە لەوە كورد لەگەڵ لایەنەكانی تردا بەریەككەوتن.هەروەها توندترین سیمای نەیاری و دراماتیكی لەبەرامبەر خواستەكانی كورددا پێكهێنانی كوتلەیەكی نوێ بوو لە نێو پەرلەمان بەناوی لێكتێگەیشتنی نیشتمانی(التفاهم الوگنی).

ئەو كوتلەیە كە (١٠) كۆمەڵەی سیاسی عەرەبی لەخۆگرتبوو ژمارەی ئەندامەكانی (١٥٠) كەس بوون وزۆربەشیان دژی گەڕانەوەی كەركووك بوون بۆ سەر هەرێمی كوردستان.

ئەوەی كوردیشی نیگەران كردبوو، ئەوەبوو كە ئەو كوتلەیە گردبوونەوەیەك بوو كە دابەشبوونی تایەفی و جیابوونەوەی عەلمانی و ئایینی تێپەڕاندبوو.

لەسەر ئاستی لۆكاڵیدا ئۆپۆزسیۆنی عەرەبی بەگشتی دژ بە پرۆژەكانی كوردبوون لەبارەی كەركووكەوەو لەكۆتایی ساڵی (٢٠٠٣)شدا خواستەكانی كورد لەسەر فیدراڵی و كەركووك پێشكەش بە پەرلەمان كران و ئەوەش كاردانەوەی توندی گردبوونەوەعەرەبی و عەشایرییەكانی كەركووكی لێكەوتەوە.

لە٣١ی كانوونی یەكەمی ساڵی ٢٠٠٣دا خۆپیشاندانێكی جەماوەریی نارەزاییان لەدژ لكاندنی كەركووك بەهەرێمی كوردستانەوە سازكرد هەروەك ئەوەی كەناڵی ئەلجزیرە ئاماژەی پێكردووە٣.

دوای ئەوەش گەورە خێڵە عەرەبییەكانی كەركووك (جبوروشەممەر و عوبێدو بەیاتی و سەعدون) لەكانوونی دووەمی ٢٠٠٤دا رێپێوانێكیان بەشەقامەكانی كەركووكدا سازكرد وەك نارەزاییەك لەدژی هەوڵەكانی كورد بۆ لكاندنی كەركووك بەهەرێمی كوردستانەوە.

---

1- Al-hayat ( BBC Monitoring Middle East). 2004. " Official Observes Arab – Kurdish Divisions Within Iraqi Administration ."11 January (LN).

2 - Elaph ( BBC Monitoring Middle East).2005. " Report Sees Iraqi Ruling Shi'i-Kurdish Alliance Crumbling Over Kirkuk ."8 July(LN).

3 - Al- Jazeera TV ( BBC Monitoring Middle East). 2003.31 December ( LN).

بەوتەی یەکێك لەبەشداربووەکان "ئێمە ئەمڕۆ لێرەین بۆ ئەوەی بێژین کە دژی فیدراڵین و کەرکووکیش شارێکی عەرەبییە"١. هەڵبەت سیاسیە عەرەبەکانی کەرکووکیش بەهەمان شێوەی سەرانی کورد ئارەزووی ئەوەیان دەکرد ئاوەژووی گوتارەکانیان بکەن.

بۆنموونە (عەکار ئەلتەویل) ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك لەشوباتی ٢٠٠٤دا دەڵێت: عەرەب بەسوننەو شیعەوە هەڵبژاردنیان گەرەکە بۆ راگرتنی فیدراڵیەتی نەژادی، بۆیە رێگە نادەین کەرکووك ببێتە شارێکی کوردی تەنانەت ئەگەر ئەوەش یەك ملیۆن شەهید بخوازێت٢.

لەکاتێکدا ئاشکرا بوو کە عەرەب بەسەرسەختانە دژی ئەوەبوون کەرکووك بەکوردی ببێت کەچی ئەو چارسەرەی کە پێیان باشبوو کەمتر ئاشکراو روونبوو. لەکۆنگرەی عەشایریە عەرەبیەکان کە لەئەیلولی ٢٠٠٤لەتکریت بەڕێوەچوو، باشترین چارەسەر "گەڕانەوەی کەرکوك بوو بۆ سەردەمی بەر لە رووخانی رژێمی پێشووب عیراق"، واتە باڵا دەستی راستەوخۆی بەغدا٣. بەڵام لەئایاری ٢٠٠٦دا کوتلەی عەرەبی لەئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوك دۆکیومێنتێکی هاوبەشی لەگەڵ ئەندامانی تورکمان ئامادە کرد کە تیایدا داوای سازدانی راپرسی دەکات لەسەر ئەوەی بارودۆخێکی تایبەتی هەرێم بەکەرکووك بدرێت٤. لەهەمان کاتدا زۆربەی لێدوانی سەرانی سیاسی عەرەب لەکەرکووکدا پێکهێنانی هەرشی قسەکەران ماددەی (١٤٠)و یاسای فیدراڵی کە تازە دەرچووبوو رەتیانکردەوە. (شێخ عەبدولرەحمان مونشد) لەخێڵەکانی عوبێد رایگەیاند: گرنگترین شت ئەوەیە کە هەرگیز کەرکووك نەبێتە بەشێك لە کوردستان چونکە شارێکی عیراقییەو ئێمەش هەموو رێگاکان دەگرینە بەر بۆ رێگرتن لەدابەشبوونی عیراق٥.

بەهەمان شێوە گردبوونەوەکەی ئەو (١٠٠) کەسایەتی و ناودارانەی کە بەشداری کۆنگرەکەیان کردبوو لەژێردروشمی "یەکێتی عیراق وکەرکووك عیراقییە" لەشوباتی ٢٠٠٧دا بەوە کۆتایی هات کە کەرکووك بەهیچ پارێزگایەکەوە پەیوەست نابێت جگە لەبەغداد نەبێت.

---

1 - Agence Press France. 2004. " Arab Tribes Rally Against Iraq Oil City's Inclusion in Kurdish Region ." 27 January ( LN).
2- Perlham ,N. 2004. " A Search for Common Ground in Battle- scarred Kirkuk." Financial Times, 11 February :10
3 - Hawlati (BBC Monitoring International Reports ).2004. " Iraqi Deputy Prime Minister Rejects Arab Tribes resolution on Kirkuk." 29 September (LN).
4 - Hewler Post (BBC Monitoring Middle East) .2006. " Turkmens Propose Making Iraq's Kirkuk Federal Region ."28 May (LN).
5 - Howard, M .2006." Iraq : As Violence Grows, Oil-rich Kirkuk Could Hold Key to Iraq's Future :Tribal Chief Call for Return of Saddam While Kurds Eye a New Federal States ." The Guardian, October : 22.



PDF 4 KURD

هەروەها هەوڵە بەردەوامەکانی کوردیش بۆ ئەوەی کەرکووك بخەنەوە تەك هەرێم ناچـارمان دەکـات پەنا بۆ چەك بەرین و بۆئەوەی بەرگری لەخۆمان و عیراقی بوونی کەرکووك بکەین١.جابۆ خوێندنـەوەی چارەسەری گونجاو لەژێر تیشکی ئەم پێدراوانەدا پێدەچێت ئەوەی بـەلای پێکهاتـەی عەرەبیـەوە باشـە مانەوەی کەرکووکە لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان و لەژێر رکێفی راستەوخۆی بەغداد.

راپرسیە گشتییەکانی عیراقـیش ئـەوەیان دەرخسـتووە کـە فیـدراڵی پەسـەندنییە لـەلای زۆرینەی عەرەبی سوننەو شیعە.

1 - Al-Bayyinah ( BBC Monitoring Middle East-Political ) .2007. " Iraqi Leader in Tehran ,Seeks to Revive US- Iran Dialogue on Iraq." February (LN).



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

لەراستیدا زۆرینەی عەربی عیراقی پشتیوانی لەرژێمێکی یەکگرتووی پەیوەست بەحکومەتێکی ناوەندی بەهێز دەکەن. پێکهاتەی عەرەبی پێیان باشە پرسی کەرکووك بەم جۆرە ریزبەند بکرێت:

| |
|---|
| ئەوەی پتر پێیان باشترە |
| - لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بێت و بارودۆخی تایبەتی نەبێت چارەکی(٣) |
| - لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بێت وبارودۆخێکی تایبەتی هەبێت چارەکی (٤) |
| - لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا بێت و بارودۆخێکی تایبەتی هەبێت چارەکی (٢) |
| ئەوەی کەمتر پێیان باشترە |
| - لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا بێت و بارەدۆخی تایبەتی نەبێت چارەکی (١) |

هەرچی پێکهاتەی تورکمانیشە لەدانیشتوانی عیراق کە قەبارەیان زۆر بچووکترە لەوەی کەسەرانی سیاسیان بانگەشەی بۆ دەکەن، بەشێوەیەکی جۆراو جۆر دابەش بوون.

دابەشبوونی تایەفی و جیۆ_سیاسی. دابەشبوونی یەکەم گرنگییەکی لاوەکی لەپرسی کەرکووکدا هەیە. کاتێك پرسەکە پەیوەستە بەکەرکووکەوە ئەوا ناکۆکی سەرەکی نێوان گرنگترین بزوتنەوەی سیاسی تورکمانی سوننی - بەرەی تورکمانی و پارتی تورکمانی شیعی - یەکێتی ئیسلامی تورکمانی عیراق، ناکۆکییە لەسەر رەفتار وەك لەوەی لەجەوهەردا بێت.

لەکۆتاییشدا هەردووکیان بەتوندی دژایەتی ئەوە دەکەن کەرکووك بچێتە پاڵ هەرێمی کوردستان. بەلاّم سەرانی یەکێتی ئیسلامی تورکمانی لەلێدوانەکانیاندا سەرسەختانە دژایەتی کورد دەکەن. شێوازی امەڵەی یەکێتی ئیسلامی تورکمانی بەواتای سیاسی یەکەمجار حزبێکی شیعییەو پشان تورکمانیە. لەکاتێکدا بەرەوەی تورکمانی خاوەنی دەستەواژەی توندی ناسیونالیزمە.

دیارە ئەو جیاوازیەش بووەتە هۆی دابەشبوونی ریزەکانی تورکمان سەبارەت بەپرسی کەرکووك، هەروەك ئەوەی لەکاتی ئامادەکردن و بریاردان لەسەر دەستووری هەمیشەیی روویدا.

سەرانی یەکێتی ئیسلامی تورکمانی عیراق کە بەشێك بوون لە ئیئتلافی یەکگرتوویی عیراقی جگە لە بژاردەی پشتیوانیکردن لەدەستوورو بەندەکانی ئەو دەستووره بەماددەی (١٤٠) یشەوە بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نەبوو، لەکاتێکدا بەرەی تورکمانی ئەو دۆکیومێنتەو زۆربەی بەندەکانی رەتکردەوە.

هەروەها دیدگای سیاسی بەرەی تورکمانی خۆی لەوێنای زهنی "تورکمان ئیلی"دابەرجەستە دەکات کە ئەویش ئەوەیە هەرێمەکەیان لەخۆرئاواوە تەلەعفەر بۆ مەندەلی لەباشووری خۆرهەڵاتەوە درێژ دەبێتەوەو کەرکووکیش لەناوچەرگەی ئەو هەرێمەدایە، کە ئەوەش لەرووی جوگرافیاوە بەجۆرێك لەجۆرەکان هەمان ئەو جێگایانەیە کە لەلایەن کوردەوە داوا دەکرێتەوەو بەناوچەدابڕێنراوەکان ناودەبرێن و ئەوەش ناسیونالیستە کوردو تورکمانەکان دەخاتە ململانێیەکەوە لەسەر خاوەندارێتیان بۆ یەك زەوی جگە لەوەش بەبێ کەرکوك تورکمان ئیلی بوونی نییە.

بەو شێوەیە راوەستانەوە لەدژی گەڕانەوەی کەرکووك بۆ کورد بەپرسێکی سیاسی چارەنووسساو بەلای بەرەی تورکمانیەوە دادەنرێت.

سەرچاوەیەکی تری دابەشبوونی پێکهاتەی تورکمان لەعیراقدا هۆکاری جیۆ- سیاسییە، کەئەوەش تورکمانەکانی نیشتەجێی هەرێمی کوردستانی لەتورکمانەکانی دەرەوەی هەرێم جیادەکاتەوە.

هێڵی جیاکەرەوەی نێوان هەولێرو کەرکووك لەکۆنگرەی چوارەمی بەرەی تورکمانی لەنیسانی ساڵی ٢٠٠٥دا بەگاڵدانی عەبدولقادر بازرگان یەکێك لەسەرکردەکانی ئەو بەرەیە بووە هۆی جیابوونەوەی لقی هەولێری بەرەی تورکمانی.

لەدوو توێی لیستێکی پڕ لەسکاڵا کە ئاراستەی سەرکردایەتی بەرەی تورکمانی کرابوو، لەوانەش فەرامۆشکردنی لقی هەولێری بەرەکەو دەستێوەردانی تورکیا لەبڕیارەکانی بەرەکەیان بازرگان رایگەیاند: لەنیسانی ٢٠٠٣ بەدواوە سیاسەتی بەرەی تورکمانی گۆڕدرا بۆ رەگەزپەرستی دژ بەکورد بەتایبەتیش کاتێك کە ئەنجوومەنی سەرکردایەتی بەرە بۆ کەرکووك گوازراوەیەوە١. دیسان لەو سەرکردە بەرچاوانەی تر کە لەبەری تورکمانی جیابوونەوە( تۆباڵ ئۆغلۆ) بوو، کە لەحوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٦جیابوەوەو گردبوونەوەی سەربەخۆی تورکمانی پێکهێنا.

---

1 - Kurdistan Nuwe ( BBC Monitoring Middle East).2005. " Prominent Official Splits up from Iraqi Turkmen Front ,to Set up New Party." 2 May (LN).

هەروەها (کەرخی نەجمەدین نورەدین) کە لەکانوونی دووەمی ٢٠٠٤جیابوبووەوە بزوتنەوەی دیموکراسی تورکمانی پێکهێناو سەرجەم ئەو گروپ و ڕێکخراوانەش کە لەبەرە جیاببوونەوە(پارتی نیشتمانی تورکمانی، پارتی برایەتی تورکمانی، پارتی گەلی تورکمانی، گردبوونەوەی تورکمانی نیشتمانی) چوونە نێو ئەو لەشکرە گەورەیەی کە پشتیوانیان لەکورد دەکردو دژ بەبەرەی تورکمانی راوەستانەوە.

ئەو ڕێکخراوانە بەئێستاشەوە بەتوندی لە هەڵوێستی کورد دەکەن لەمەسەلەی کۆنترۆڵکردنی کەرکوك لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە لەبری حکومەتی بەغداد. بۆچوونی بازرگان کە لەبەرە جیابوەتەوە نموونەیەکی روونە کاتێك پێگەی کەرکووکی لە" نێو جوگرافیای کوردستان" بە هەقیقەت وەسفکردو لەوەش زیاتر ئەوەبوو کەوتی "کەرکووك شارێکی کوردستانییەو هەر دەبێت کوردستانیش بێت"١. بەهەمان شێوە (دکتۆر سەیفەدین دامرچی) سەرۆکی یەکێتی تورکمانی عیراقی زۆر بە سادەیی رایگەیاند" لەبەرژەوەندی سەرجەم پێکهاتەکانی کەرکووکدایە کە ئەو شارە لەگەڵ هەرێمی کوردستان ئاوێزان بێت"٢. بەوجۆرە دەتوانرێت پشت بەو سیاسیانەی هەواداری کورد ببەسترێت لەوانەش (وەلید شەریکە) سەرکردەی پارتی گەلی تورکمانی و(عرفان کەرکووکی) جێگری پارتی گەلی تورکمانی لەئەمەکدارییان بۆ پێشکەشکردنی دیدگایەکی بەدیلی ئەو گێڕانەوە دوژمنکارانەیەی کە بەرەی تورکمانی پێشکەشی کردووە٣.

ئەو بزوتنەوە نوێیانە کە بەرەی تورکمانی رەتیان دەکاتەوە لەهەندێك باردا لەسەر هەقە، چونکە پارتی کارتۆنین و لەلایەن "هەردو حزبە کوردییەکەوە دروستکراون و قسەکردن و دەرکردنی بەیاننامەکانیان بەفەرمانی ئەو دوو حزبەیە". لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە دوو ئاماژەی لەخۆگرتووە کە بەرەی تورکمانی ناگرێتەوە٤.

---

1 - Ridolpho , K. 2005." Iraq Will TheTurkmen Split Break Turkish Interference ? Radio Free Europe / Radio / Liberty ,6 May.

2 - Chawder .2006. " Turkmen Official Says US Responsible for Increase in terrorism in Kirkuk ".25 July ( WNC).

٢- بۆنموونە شەرکە بەشداریکرد لە ڕێکخستنی ئەو کۆنگرەیەی کە لەژێر ناونیشانی" پشتیوانیکردن لە ماددەی ١٤٠ کلیلی ئارامی و ئاسایشە لەکەرکوکودا" لە ئەیلولی ٢٠٠٦ لەکەرکەوك سازکرا و تیایدا پشتیوانی لە ماددەی ١٤٠ کرا .

٣- " القدس العربی" ،٢٠٠٦" عیراق: بەرەی تورکمانی خۆشحاڵە بە راپۆرتەکەی گروپی لێکۆڵینەوەی عیراق، کە تیایدا رەخنە لەپارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەگرێت. ١٧ی کانوونی یەکەم(WNC).



PDF 4 KURD

یەکەمیان، ڕێژەیەکی گەورەی تورکمان بەتایبەتیش ئەوانەی لەنێو سنووری هەرێمی کوردستان دەژین لەبەرژەوەندیاندا نییە کە روو لە ناسیونالیزمی بکەن کە بە نەیارو دژ بەکورد دادەنرێت.

هاوکات لێدوانی سەرانی ئەو پارتانە تا ئاستێك راستگۆیی تێدایە، چونکە ڕێژەیەك لەتورکمانەکانی کەرکوك لەژێر دەسەڵاتی کورددا دەژین.

دووەم، هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ ئەوەی دەرخست کە بەرەی تورکمانی بەعەمەلی ئەو هێزە سیاسییە نەبووە کە لەدەرەوەی سنووری کەرکوك پشتی پێببەسترێت. بەڵام سەرباری ئەوە بەرەی تورکمانی لەکەرکووك پارێزگاری لەسەنگی خۆی کرد و بەفراوانترین بزوتنەوەی سیاسی تورکمانەکان لەو پارێزگایەدا مایەوە، ئەویش بەو پێیەی ئەو هێزەیە کە بەوەکالەت بەرگری لەبەرژەوەندی تورکیا دەکات.

بەرەی تورکمانی پێیوایە لەبارترین هەڵوێستی دەبێت بۆ خزمەتی مەرامەکانی ئێستای بێت چونکە هەر چارەسەرێکی تەوافوقی کە لەداهاتوودا پێی دەگەن لەبارەی بارودۆخی کەرکووکەوە ئەوا جێگیر دەبێت کە ئەگەر لەلایەن بەرەو تورکیاوە دژایەتی سەرسەخت نەکرێت١.

خۆئەگەر بڕیار بدرێت لەوەی کە باشترین بژاردەی بەرەی تورکمانی بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبارو گونجاوە ئەوا بەتەواوی روون نییە کە ئەم بژاردەیە لەکۆمەڵێك بژاردەی باشەوە سەرچاوەی گرتووە٢. یەکێك لەو گرفتانە ئەوەیە، کە بەرەی تورکمانی بۆچەندان جار بەتێپەڕبوونی کات هەڵوێستی خۆی گۆڕیوە ئەویش بەسازاندنی لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەهەڵوێستی رەسمی تورکیادا روو دەدەن.

دیسان گرفتێکی تری بەرەی تورکمانی ئەوەیە کەلەتێکەڵەیەك لەپارەتە تورکمانیەکان پێکهاتوەو وەك ڕێکخراوێکی سیاسی بەزەرورەت لەتوانایدا نییە هەڵوێستێکی بەهێزو یەکگرتووی لەبەرامبەر پرسەکاندا هەبێت. ئەوەی پەیوەستە بەخاڵی یەکەم ئەوەیە بەرەی تورکمانی بەر لەجەنگ هەڵوێستی روون بوو، واتە هاوشێوەی نەهجی تورکیا بوو، بەجۆرێك

---

١- ئەمە واتای ئەوە نییە کە هەریەك لە بەرەی تورکمانی و توکیا مافی ڤیتۆیان هەبێت و دژی هەر چارەسەرێکی تەوافوقی بن کە لەداهاتوودا پێی بگەن. خۆ ئەگەر هیچ کامیشیان ئامادە نەبوون بە قبولکردنی چارەسەری مامناوەند ئیتر ئەوە واتای ئەوە نییە لەبەرامبەر تانەکەیان پاداشت بکرێن.

٢- ئەوەی بەلای ڕێکخراوە تورکمانیەکانی هەواداری کوردەوە باشە بەهەمان شێوە بەلای کوردیشەوە باشە، بە واتایەش بەپێچەوانەی هەڵوێستی بەرەی تورکمانیە کە شتێکی ئەوتۆی بەلاوە باش نییە و بەو پێیەش لەوشیکاریکردنانەی کە باس لە چارەسەرە تەوافوقیەکان دەکات سەبارەت بە پرسی کەرکوك جێگەی نابێتەوە .



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

کە پەیوەندی لەدژی جێبەجێکردنی هەرشێوەیەك لەشێوەکانی فیدراڵی لەعێراق راوەستایەوە١.
دیارە ئەو هەڵوێستەش رەنگدانەوەی وێنایەکی راست بوو سەبارەت بەجێبەجێکردنی سیستمی فیدراڵی لەعێراق کە هەرێمی کوردستانیش وەك یەکێك لەیەکە فیدراڵیە دروست بووەکان بەفراوانی و بە بەهێزی دەمێنێتەوە٢.

لەدوای جەنگیش بەرەی تورکمانی ناچاربوو هەڵسەنگاندن بۆ هەڵوێستی خۆی بکاتەوە ئەویش بەهۆی جێبەجێکردنی رۆڵی کارای تورکیا لەرەوتی رووداوەکاندا، کەدواتریش کاریگەری نەبوو لەسەر ئاراستەی رووداوەکان.

پەرەسەندنی راستەوخۆی هێزی سیاسی کورد لەدوای جەنگ وایکرد کە جێبەجێکردنی شێوەیەك بەشێوەکانی فیدراڵی لەعێراق بێتە مەسەلەیەکی پراکتیکی حەتمی.

ئەوەبوو دواتر هەڵوێستی بەرەی تورکمانیی عیراقی دانی بەفیدراڵیەتدا نا بەڵام لەسەر بناغەی ١٨ پارێزگاکە.

وەك (مستەفا کەمال یایچلی) یەکێك لەبەرپرسانی بەرە دەڵێت، سیستمی فیدراڵی کە بەلای بەرەکەیانەوە باشە ئەوەیە ١٨ حکومەتی هەرێمی بەسەرۆکایەتی پارێزگارانی بەهێز بوونی هەبێت و لەلایەن ئیدارەیەکی نەرمی ناوەندەوە بەڕێوەببرێت٣.

هەرچی پەیوەستیشە بەکەرکووك ئەوا هەریەك لە بەرەی تورکمانی و تورکیا دوو گوتاری جیاوازیان هەیە سەبارەت بەناسنامەی ئەو شارە ناکوردییە.

وەك ئەوەی گەورە بەرپرسانی تورکمانیش هەندێك جار ئاماژەی پێ دەکەن کەرکووك " شارێکی عیراقی"یە و هەندێك جاری دیکەش" شارێکی عیراقییە و تایبەتمەندی تورکمانی هەیە" و

---

٣- بەپێی رۆژنامەی" تورکش دەیلی نیوز" کۆبوونەوەی نێوان ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو بزوتنەوە ئۆپۆزسیۆنەکانی عیراق کە بە رۆژێك بەر لە جەنگ بەڕێوەچوو ، زاڵمای خەلیل زاد دوو مەرجی بۆ بەشداریکردنی بەرەی تورکمانی لەپێکهێنانی حکومەتی داهاتوودا دانا . یەکێك لە مەرجەکانیش ئەمانە بوون کە سیستمی سیاسی عیراق لەداهاتوودا لەسەر بنەمای فیدراڵی دەبێت، کە ئەو مەرجەش بەلای بەرەی تورکمانیەوە پەسەند نەکرا و بەوەش خۆی لە پێکهێنانی ئەو حکومەتانەدا بەدوورگرت کە لەپاش جەنگ دامەزران.

2 - Turkish Daily News .2003." From the Column :Last- Minute Game to Turkmens ." 16 September ( LN).

3 - Cevik ,I.F . Demirelli , and M . Unlu . 2003. "Turkmens Call for Power- Sharing in Administration of New Iraq." Turkish Daily News , 1 July.

PDF 4 KURD

جاروباریش به" شارێکی گرنگی تورکمان" وەسفی دەکەن١. بەدەر لەو فۆرمەی هەڵدەبژێردرێت هەڵوێستی تورکمانی دوو ڕەگەزی نەگۆڕی لەخۆگرتووە. یەکەم، کەرکوك هەرگیز کوردی نییەو هەرچییەکەیش بکەن وەك بەرپرسێکی تورکمانی دەڵێت نابێتە شارێکی کوردی٢.

لەهەمان کاتدا پەیامێکی لێکدژ هەیە کە ناوەندی سیاسی تورکمانی ئاراستەی دەکەن ئەویش ئەوەیە کە لەلایەکەوە بەرپرسانی بەرەی تورکمانی سەرکۆنەی پرۆژە کوردییەکان دەکەن سەبارەت بە هەرێمێکی فیدراڵی لەسەربنەمای ئیتنیکی و لەلایەکی تریشەوە (سونگیول چاپوك) ئەندامی تورکمانی نێوئەنجوومەنی حوکمڕانی لەکانوونی یەکەمی ٢٠٠٣پێشنیازی دامەزراندنی " یەکێتی فیدراڵی نێوان هەرێمە تورکمانیەکانی کرد کە دەکەوێتە ئەو ناوچانەی کە لەتەلەعفەرەوە تامەندەلی درێژ دەبنەوەو کەرکووکیش چەقەکەیەتی٣.

بەرلەهەفتەیەکیش لەو لێدوانە سەرکردایەتی بەرەی تورکمانی بەیاننامەیەکی دەرکردو تیایدا ئیدانەی بانگەوازەکانی لایەنی کوردی کرد سەبارەت بەدامەزراندنی هەرێمی فیدراڵی لەسەربنەمای ئیتنیکی بەو پێیەی"دژ بەیەکێتی سیاسی عیراق و سەلامەتی خاکی هەرێمایەتی"یە، لەکاتێکدا پارتی تورکمانی ئیلی کە یەکێکە لەپارتە سەرەکیەکانی نێو بەرەی تورکمانی یاداشتنامەیەکی ئاراستەی برێمەر کردو تیایدا داوای دامەزراندنی سیستەمی فیدراڵی دەکات لەسەر بناغەی ٤هەرێمی ئیتنیکی (کوردی و تورکمانی و سوننی و شیعی)٤.

کێشەکە لەو پەیامە لێکدژانەدا ئەوەیە کەدژایەتیەکی بنەڕەتی لەنێوانیاندا هەیە. دەکرا لەبەرامبەر خواستی کورد سەبارەت بەهەرێمێکی ئیتنیکی ڕابوەستنەوە لەگەڵ پارێزگاریکردن

---

1 -Unlu , M. 2003. " New Leader of Turkmens Says Turkey Won't Intervene in ITC's Politics ." Turkish Daily News ,17 September ; Turkmeneli ( BBC Monitoring International Reports ). 2004. " Iraqi Turkmen Official Proposes " Joint Administration " for Kirkuk ." 24 September ;NTV( BBC Monitoring Europe ).2003. " Turkey : Foreign Ministry says Kirkuk Iraqi City ,not Belonging to Kurds ." 24 April (LN

2- Konya ( BBC Monitoring International Reports ). 2003. " Turkish Agency : Iraqi Turkmen Official Says Kirkuk Will Never be Kurdish City ." 23 December ( LN ).

3 - Turkmeneli (BBC Monitoring Middle East ).2003 . " Iraqi Governing Council Member to Propose Federal Turkmen Region ." 30 December.

٤ – هەرچوار هەرێمە پێشنیازکراوەکان: هەرێمێکی کوردی پایتەختەکەی سلێمانی و هەرێمێکی سوننی ناوەندەکەی ڕومادی بێت و هەرێمێکی شیعی سەنتەرەکەی نەجەف و هەرێمێکی تورکمانیش پایتەختەکەی کەرکوك بێت. بڕوانە:

Turkmeneli (BBC Monitoring Middle East ).2003 . "Turkmen Party Proposes Iraq Divided into Four Administrative Regions ." 30 December ( LN

PDF 4 KURD

لەماوەکانی تورکمان و هەنگاونان بەهەمان ئاراستە ئەگەر هاتوو هەوڵەکانی کورد بەو ئاراستەیەدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەڵام کێشەی راستەقینە کێشەیەکی ستراتیژی بوو. چونکە دژایەتی تورکمان بۆ هەموو شێوەیەکی فیدراڵی ئیتنیکی دروستکردنی هاوپەیمانێتی ببوو لەگەڵ عەرەب دژ بە کورد.

هاوکات رەوەجیپێدانی لەگەڵ پرۆژەی دامەزراندنی (تورکمان ئیلی) دەیانتوانی لەگەڵ کورددا هاوپەیمانێتی ببەستن و لەدژی بەشێکی زۆری پێکهاتەی عەرەبی رابوەستنەوە و دەریشگەوت کە پرۆژەی تورکمان ئیلی تەواو دژ بە هەڵوێستی باوی حکومەتی تورکیایە١.

لەراستیدا هەڵوێستی تورکمانی لەسەر فیدراڵیەت هەڵوێستێکی شێواو بوو کە ئەوەش ئاماژەیەك بوو بۆ بێ توانایی بەرەی تورکمانی لەبەرامبەر وەڵامدانەوەی هەڵمەتی یەککگرتووی کورد لەپێناو هەرێمێکی ئیتنیکیدا.

دواتر بەرەی تورکمانی ناچاربوو لەروپەڕی رۆژنامەی تورکمان ئیلی زمانحاڵیەوە راستەوخۆ پرۆژەکەی چاپوك رەتبکاتەوەو رایگەیاند: " بەرەی تورکمانی کە نوێنەرایەتی خەڵکی تورکمان دەکات هەر پرۆژەیەك رەتدەکاتەوە کە زیان بەیەکێتی خاکی عیراق بگەیەنێت و بەئەرکی خۆشی دەزانێت پارێزگاری لەسەروەریی عیراق بکات و هەرگیز رازی نەبێت بەدابەشکردنی نیشتمان لەژێر پەردەی هەردەمامك و بەهانەو پاساوێکدا"٢.

بەڵام بەرەی تورکمانی لەسەر ئاستی نیشتماندا خاوەنی نفوزی سیاسی نەبوو هەربۆیە دەستەوەستان بوو لەبەرامبەر دانپێدانان بە هەرێمی کوردستانی خاوەن مافی ئۆتۆنۆمی لەیاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەتدا.

هاوکات لەپاش ئەو ئەدا خراپەی کە حزبە تورکمانیەکان لەهەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا پیشانیان دا، بەرەی تورکمانی ناچار بوو جارێکی تر هەڵوێستی خۆی بگۆڕێت.

---

١ – لەراستیدا لەکۆتایی کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ سەرۆك وەزیری تورکیا ئەردۆغان رایگەیاند: لەواقیعدا دامەزراندنی چوارچێوەیەکی فیدراڵی لەعیراقدا لەسەر بنەمای ناسنامەی ئیتنیکی یان تایەفی ئایینی دروست نییە و هەریەك لە تورکیاو سوریاو ئێران بێزار دەکات.بڕوانە:

Turkish Daily News.2004.”press Scanner. Erdogans’ warning on Kirkuk”.28january.

2- Turkmeneli ( BBC Monitoring International Reports ). 2004. " Iraqi Turkmen Front Rejects Federal Status in Kurdish Region". 17 January (LN).

(تەحسین کەهیە) ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکوک بێ پێچ و پەنابوو کاتێک لەبارەی بارودۆخەکەوە وتی:" لەئێستادا تورکمان چارەسەری فیدراڵی قبوڵ دەکەن بەڵام دەیانەوێت کەرکوک خاوەن قەوارەیەکی فیدراڵی بێت و باشتریش وایە لەلایەن کوردو تورکمان و عەرەبەوە بەڕێوە ببرێت"[1].

پاشان هەرێمی کوردستان وەك دیفاکتۆیەکی دانپێدانراوی یاسایی لەدوای پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی، بەرەی تورکمانی جگە لە قبوڵکردنی بوونی ئەم هەرێمە هیچ بژاردەیەکی تری لەبەرامبەردا نەمایەوەو ئیتر گشت بایەخی خۆی دا بەوەی کەرکوك لەدەستی کورد بەدوور بگرێت و ئەوەش رەهەندێکی پەککەوتوو بوو لەستراتیژی تورکمانیدا کە ئامانج لێی رێگرتن بوو لەوەی کەرکوك بچێتەوە سەر هەرێمی کوردستان.

هەر لەپێناو ئەو مەرامەشدا بەرەی تورکمانی لەهەوڵی جۆشدانی رای گشتی هەرێمایەتی و نێو دەوڵەتیدا بوو لەدژی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠. لەئاستی ناوخۆشدا بەرە هەموو هێزی خۆی خستە پاڵ کوتلە عەرەبییەکان بۆ جاڕدانی تورەبوون لەبەرامبەر دەست بەسەرداگرتنی کورد بەسەر شارەکەدا ئەویش لەرێگەی گەڕی خۆپیشاندانەوە.

هەرچی رەهەندی ئیجابی ئەو ستراتیژەیە- ئامادەکردنی پرۆژەیەکی بەرجەستەکراوە کە پێویستە لەکرەکوکدا رووبدات و رووشنەدات- کە لەڕووی بایەخەوە شتێکی لاوەکی بوو. ئەوەبوو هەر لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ بەدواوە بەرپرسانی تورك و بەرەی تورکمانی باسیان لە لەپاراستنی " بارودۆخی تایبەتی کەرکوك" دەکرد. کە ئەوەش بەدیاریکراوی روون و ئاشکرا نەبوو کەچی دەگەیەنێت. هەندێك جار ئەو فۆرمەئامازەیەکی راشکاوانەبوو بۆ ئەو بارودۆخە تایبەتەی کە لەماددەی (٥٣)ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت دەدرێتە هەریەك لە کەرکوك و بەغداد. لەسەر ئەو بناغەیەش کەرکوك خاوەنی بارودۆخێکی تایبەتمەند دەبێت واتە رێگە نادرێت بچێتە سەر پارێزگاکانی تر بۆ ئەوەی هەرێمێکی فراوانتر دروست بکرێت.

بێگومان واتای بارودۆخی تایبەت تا دوای پەسەندکردنی دەستووری هەمیشەیی روون نەبوو، هەڵبەت بژاردەی بەڵگەنەویستی لەبەردەم ئەوانەی رێگر بوون لەهەوڵی کورد بۆ ئەوەی

---

1 - Dawde , S. 2005. " New Strategy for Turkmen Bloc." Institute for War and Peace in Reporting , Iraqi Crisis report, 116, 9 March http: //iwp.net /?p = icr&0= 244910&apc-state = heniicr2005

٢- بەرەی تورکمانی عیراقی لەلایەن زۆرێك لەدەوڵەتانی ناوچەکەوە گوێی لێگیرا لەپێش هەمووشیانەوە ئەنقەرەو ئێران و وڵاتانی عەرەبی . بۆ زانیاری زیاتر لەسەر کۆکردنەوەی دەوڵەتە عەرەبیە سوننەکان دژی پرۆژەکانی کورد بڕوانە: " Milliyet .2004. Turkish Column : Egypt ,Jordan Will Train Turkmen for New Iraqi Army , Police ." 5 January ( WNC).

کەرکووك بچێتە پاڵ هەرێمی کوردستان لەسەر بناغەی ماددەی( ١٤٠)، بۆخۆی هەوڵێك بوو بۆ جارِدانی کەرکووك وەك هەرێمێك بەپێی ماددەی (١١٩).

ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە لەسۆنگەی ئەو پێشنیازەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ١٤ ئەندامی عەرەبی و تورکمانی لەئەنجوومەنی پارێزگای کورکوك لەئایاری ٢٠٠٦دا پێشکەشیان کردبوو بۆ سازدانی راپرسی لەسەر دامەزراندنی هەرێمێکی سەربەخۆ لەکەرکووکدا.

هەروەها پێشنیازی رۆڵگێرانی تورکیا کرابوو وەك نێوەندگیرێك لەسەر شێوازی ئەو پرسیارەی کە لەراپرسییەکەدا دەکرێت ئەویش بەر لەوادەی راپرسییەکەو رێککەوتن لەسەری١.

ئەم لۆژیکە تادوای پەسەندکردنی یاسای پێکهێنانی هەرێمەکان لەتشرینی یەکەمی ٢٠٠٧دا رەواجێکی زۆری هەبوو. بەپێی ئەو یاسایەش رێگە بە پارێزگاکان دەدرێت بچنە سەر هەرێمەکان بەلاَم رێگە نادرێت دوو هەرێم یان زیاتر لەگەڵ یەکتری تێکەڵاوبن، لەبەرئەوە رێگە بەکەرکووك دەدرێت بارودۆخی هەرێمی هەبێت بێئەوەی رۆژێك لەرۆژان بگەرِێتەوە سەر هەرێمی کوردستان.

بەلاَم وادیاربوو بەرپرسانی تورکمان و تورکەکان هەرگیز نەگۆرِ نەبوون لەسەر بەکارهێنانی دەستەواژەی "بارودۆخی تایبەت".

زاراوەکە لەلای هەندێك جۆرێکی تایبەت لەقەوارەیەکی سەربەخۆی دەگەیاند، کەتیایدا سەرجەم نەتەوەو کەمینەکان تیایدا بەشداری دەکەن.٢

هاوکات زاراوەکە بەلای هەندێکی تر لەوانەش دکتۆر سەعددین ئارکاچی سەرۆکی بەرەی تورکمانی واتای ئەوەی دەگەیاند، کە بارودۆخی تایبەت یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت دیاری دەکات.

بەبۆچونی ئارکاچ "باشترین چارەسەر ئەوەیە بارودۆخێکی تایبەت بەکەرکووك بدرێت جاسیستمی فیدراڵی دابمەزرێت یان نا، هەروەها پێویستە بەپێی برِگەی(ج) لەماددەی(٥٣)ی یاسای ئیدارەی کاتی دەوڵەت مامەڵە بکرێت"٣.

تیمێکی تریش داوایان دەرکرد کەرکووك لەژێر دەسەلاَتی راستەوخۆی بەغدادا بمێنێتەوە. لەو کۆنگرەیەشدا کە لەئەنقەرە سەبارەت بە"کەرکووك ٢٠٠٧ بەرِێوەچوو، ئارکاچ سەرۆکی بەرەی

---

1 -Hewler Post(BBC Montoring Middel East).2006."Turkmens Propose Making Iraq's Kirkuk Federal Region."28May(LN).

2 - Steel,J.2006."Comment&Debate:Iraq is already enduring two cici wars.Could is survive athird? The Guardian,1December:39.

3- Elaph (BBC Monitoring International Reports).2007."Iraqi Turkmen Front Leader Discusses Kirkuk.Issue,Turkmen Demands."7March.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

تورکمانی پێشتوانی خۆی پیشاندا له سەر رەتکردنەوەی ئەو راپرسییەی کە ماددەی ١٤٠ئاماژەی پێکردووە، لەگەڵ دانانی پارێزگای کەرکووك لەژێردەسەلاتی حکومەتی فیدراڵیدا"١.

هاوکات ئەنقەرە کاری زۆری کرد بۆ رەو رەواجدان بە بیرۆکەی بارودۆخی تایبەت، هەندێك جاریش ئامادەبوو پێشنیازی ئەنجوومەنی حوکمڕانی قبوڵ بکات سەبارەت بەوەی کە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ماوەی (١٠)ساڵ بەر لەدیاریکردنی چارەنووسی هەمیشەیی پارێزگاکە بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە٢. بەگشتی پێکهاتەی تورکمانی بەبەراورد بە پێکهاتەکانی تر کەمتر یەکگرتوو بوو سەبارەت بەپرسی کەرکووك.

سەرباری ناکۆکی نێوان سەرانی سیاسی تورکمانە شیعەو سوننەکان لەسەر ئەو پرسە بەلام ناکۆکیەکانیان سادەبوون و ئەوەی لەیەکتریشی دەترازانن ئەو بۆشاییە بوو کە لەنێوان بەرەی تورکمانی و تورکیا و رێکخراوە تورکمانیەکانی هەواداری کورددا لەئارادابوو.

هەریەك لە پارتی گەلی تورکمانی و پارتی برایەتی تورکمانی پێیان باشبوو، لەکرۆکدا هاوشێوەی ئەو بارودۆخە بوو کە کورد پێی باشبوو، هەربۆیە ئەوانیش دەچنە نێو خانەی ئەوەی کە کورد بەلایەوە باشە لە چارەسەرکردنی تەوافوقی بۆ پرسی کەرکووك. لەبەر ئەوە بەرەی تورکمانی ئەوەی پێباشبوو داهاتووی کەرکووك و بەوجۆرە بێت کە سنوورێك بۆ نفوزی کورد دابنێت.

جگە لەوەش دەستەواژەی"بارودۆخی تایبەت" کە سەرانی بەرە لەلێدوانەکانیاندا باسیان لێدەکرد زۆر روون و ئاشکرا نەبوو کە ئاخۆ پێیان باشە کەرکووك راستەوخۆ لەژێردەسەلاتی بەغدادا بێت. دواجار ئەوەی بەرەی تورکمانی و تورکیا پێیان باشبوو لەبەنەرەتدا جیاوازی نەبوو لەوەی کە پێکهاتەی عەرەبی پێیان باشبوو.

دەکرێت بەم شێوەی لای خوارەوە ئەوە روونبکرێتەوە کەبەرەی تورکمانی/تورکیا بارودۆخەکەی کەرکووکیان بەچ شێوەیەك پێ باشبوو.

---

1 -Sananayake,S.2007."Turkey Keeps aNervous Eye on Kikruk." Radio Free Europe/Radio Liberty,11,13,23January.
www.rferl.org/newsline/2007/01/5-not/not-230107.asp

2 -Sabah(BBC Monitoring International Reports).2007."Turkish Government Said to Propose 10-Year UN Control of Kirkuk."19January(LN).

PDF 4 KURD

| |
|---|
| ئەوەی پتر پێیان باشبوو |
| - لەدەرەوەی کوردستان و بێ بارودۆخی تایبەت / لەدەرەوەی کوردستان و بارودۆخی تایبەتی هەبێت، (چارەکەکانی ٣، ٤). |
| - لەناو کوردستانداو لەگەڵ بوونی بارودۆخێکی تایبەت(چارەکی ٢). |
| ئەوەی کەمتر پێیان باشبوو |
| - لەناوکوردستان و بێ بارودۆخێکی تایبەت(چارەکی). |

کەوابوو لەگەڵ هەندێك مەرجی لاوەکی ریزبەندی ئەوەی تورکمان پێی باشە هاوشێوەی ئەوەیە کە پێکهاتەی عەرەبی پێی باشە. دواجار ریزبەندی ئەوەی پێکهاتەکان پێیان باشە بەم جۆرە دەکەوێتەوە کە ژمارە (١)باشترینیانەو ژمارە(٤)کەمتر پێیان باشە.

| بارودۆخی تایبەت(کوردو پێکهاتەکانی تر) | بێ بارودۆخی تایبەت(کوردوپێکهاتەکانی تر) | |
|---|---|---|
| (٢، ٣) | (١، ٤) | لەناو کوردستان(کوردو پێکهاتەکانی تر) |
| (٣، ٢) | (٤، ١) | لە دەرەوەی کوردستان (کوردوپێکهاتەکانی تر) |

سوودی ئەم ریزبەند کردنەی ئەوەی پێکهاتە جیاوازەپەیوەندیدارەکان پێیان باشە لەسەر شێوەی خشتەی ٢ x ٢ ئەوەیە، دەردەکەوێت ئەو خاڵانەکامانەن کە دەکرێت لەرێگەیەوە بگەنە چارەسەری تەوافوقی سەبارەت بە داهاتووی کەرکووك.

کەوابوو تەنیا رێگە بۆ چارەسەرکردنی هەمیشەیی پرسی کەرکووك رێککەوتنی هەردولایە لەسەر فۆرمێکی تەوافوقی هەروەك پێشتر لەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە.

بەجۆرێك هیچ لایەنێك بەپێی ئەم پێناسەسە ناتوانێت بارودۆخێکی باشتر بۆ داهاتووی کەرکووك لای خۆیەوە بەدیبهێنێت. بەڵام بەسەیرکردنی ریز بەندی ئەوەی پێکهاتەکان پێیان باشە بەوجۆرەیە ئەوەی بەلای لایەنێکەوە زۆر باشە بەلای لایەنەکەی ترەوە پێچەوانەیە. بەهەمان شێوە هیچ لایەنێك ناچار نییە کە ئەو دەرئەنجامە قبوڵ بکات کە بەلایەوە کەمتر

باشتره. لەوسۆنگەیەشسەوە هەردو چارەکی (١+٣) بەوپێیەی دوو ئـەنجامش چـاوەڕوان کـراون رەتدەکرێنەوە. بەواتایەکی تر ئەگەربمەوێت چارەسەری کەرکووك لەرێگەی پرۆسەی دانوسـتان و تەوتافوقەوە بێت، ئـەوا تـەنیا دەرئـەنجام ئەوەیـە کـە بـارودۆخێکی تایبـەت لەناوهـەرێمی کوردستان یان لەدەرەوەی هەرێم بە کەرکووك ببەخشرێت١.

تەنیا گۆڕدراوی بنچینەیش کە دەمێنێتەوە بۆ چارەسەرکردن کە لەزۆر رووەوە گـۆڕدراوێکی گرنگە، پرسی فەرمانڕەوایی و ئیدارەیە.

---

١ – بێگومان ئەگەر پرسی کەرکوك لەچوارچێوەی سەودانامەیەکی گشتگیردا چارەسەر بکرێت و بەوپێیەش وایدابنێین کـە کـورد دەست بەرداری کەرکوك دەبێت و لەبەرامبەر ئەوەشدا گشت ناچە جیّ لەسەر ناکۆکەکانی تری بۆ دەگەڕێنرێتەوە بەڵام کـارێکی لـەو جۆرە وەك پرۆسەیەکی میانگیر دەمێنێتەوەو ئەنجامەکەشی دەکەوێتە دەرەوەی ئەگەرەکانی شێوەی(٨-١). سەودانامەیەکی لەوجۆرە دەشێت ببێت و بەدوور نەزانرێت بەڵام ئەوەی سەرکردایەتی کوردی لەکەرکوکدا کاری بۆدەکات زۆر گـەورەترە لـەوەی زۆر بەئاسـانی بچێتە ژێر باری ئەنجامەکانی چارەکی ٣.

PDF 4 KURD

# فەسڵی سێیەم

### ململانێی کەرکووك: حکومەتی داهاتووی

پرسی بنچـینەیی کـە پێویسـتە لـە هەڵسـەنگاندنی حکومـەتی کـەرکووك و ئیدارەکـەی لەداهاتوودا چارەسەر بکرێن ئەوەیە کە ئاخۆ دەبێـت دەسـەڵات لـەنێوان پێکهاتـە ئیتنیکیـە جیاوازەکانی پارێزگاکەدا دابەش بکرێت، کاتێکیش کەدابەشکرا تاچ ئاستێك و چـۆن دابـەش دەکرێت؟

دابەشکردنی دەسەڵات بەسادەیی بۆ دوالیزمێك کورت ناکرێتەوە، بەڵکو چـەند ئەگـەرێك هەیە کە لەکۆترۆڵکردنی تەواوی زۆرینەوە دەستپێدەکات تـا دەگاتـە دابەشـکردنی دەسـەڵات لەسەربنەمای تەواو یەکسان لە نێوان نێوان پێکهاتەکانی تردا.

لەگەڵ ئەوەشدا وەك هەنگاوی یەکەم گرنگە چەمکی دابەشکردنی دەسەڵات لەدوالیزمێکدا کۆبکرێتـەوە کـەجیاوازی بکـات لـەنێوان دەسـەڵاتی زۆرینـەو دابەشـکردنی دەسـەڵات کـە دابەشکردنێکی واتادار بێت.

بـەوجۆرەی وەك ئـەوەی لەشـێوەی ١١- ١، ١١- ٢ لەفەسـڵی پێشـووتردا هـاتوون، خشتەیەکی x دروست بکرێت و هەرچوار ئەگـەرەکان سـەبارەت بـە داهـاتووی کـەرکووك

دەربخات، پاش ئەوەی لەفەسڵی رابردوودا دەرکەوت کە چارەسەری تەوافوقی بارودۆخێکی تایبەت جا ئەوە لەناوهەرێمی کوردستان یان لەدەرەوەیدا بێت بە کەرکوك دەبەخشێت.

هاوکات خشتەی ١٢- ١ چوار ئەگەر کەماونەتەوە بۆ بارودۆخی کۆتایی کەرکوك پیشان دەدات.

شێوازی ١٢- ١

ئەوەی بۆ حکومەتی داهاتووی کەرکوك گونجاوو لەبارە

| دەسەڵاتی زۆرینە | دابەشکردنی دەسەڵات | |
|---|---|---|
| ٢ | ١ | لەناوخۆی کوردستان(بارودۆخێکی تایبەت) |
| ٤ | ٣ | لەدەرەوەی کوردستان (بارودۆخێکی تایبەت) |

لەچارەکی (١ ) دا کەرکوك لەناو هەرێمی کوردستان بارودۆخێکی تایبەتی لەئۆتۆنۆمی هەیە و بەپێی رێککەوتنێکیش لەچوارچێوەی سیستمێکدا دەسەڵات لەحوکمڕانی و ئیدارەکردنیدا دابەش دەکرێت.

چارەکی( ٢) بارودۆخێکی تایبەت لەناوخۆی هەرێمی کوردستان لەگەڵ پێدانی مافی ئۆتۆنۆمی پیشان دەدات بەڵام بەبێ میکانیزمێکی سیستماتیك بۆ دابەشکردنی دەسەڵات.

بەوجۆرە کورد بەوپێیەی لەڕووی هەڵبژاردنەوە زۆرینە پێکدەهێنێت ئەوا ئیدارەی پارێزگاکە دەگرنە دەست.

هەرچی چارەکی( ٣) یشە بارودۆخێکی تایبەت لەئۆتۆنۆمی دەداتە کەرکوك و سیستمی دابەشکردنی دەسەڵاتیشی بۆ دادەنرێت بەڵام لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان دەمێنێتەوە.

دواجار چارەکی (٤) ئۆتۆنۆمی دەبەخشێتە کەرکوك بەڵام لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان و لەهەمان کاتیشدا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی زۆرینەی کوردەوە. ئەو دابەشکردنەی کە بەپێی خشتەی (١٢- ١) هەیە تائاستێکی شیاو پرۆسەیەکی سادەیە. دیسان بەپێی خشتەی (١٢- ٢) دابەشکردنی دەسەڵات بەم جۆرەی لای خوارەوە کە (٣)گریمانەی لەخۆگرتووە.

PDF 4 KURD

یەکەم: هەرپێکهاتەیەك واپێباشە پشـکی لــە دەســەڵاتی حوکمڕانیـدا تائاسـتێك لەگـەڵ پێکهاتەکانی تردا زیادبکرێت.

دووەم: کورد بەپێی هەڵبژاردن زۆرینە پێکدەهێنن.

سێیەم: سەرجەم پێکهاتەکام هێندەی بایە بە پێگەی جوگرافی کەرکووك دەدەن هێندە بایەخ بەشـێوەی حکومەتەکـەی نـادەن. لەگۆشـەنیگای ئـەو سـێ گریمانەیـەوە خشـتەی(١٢- ٢) لەبارترین دیدی پێکهاتە جیاوازەکان دەردەخات سەبارەت بە هــەر چـوار ئەگـەرەکان لــەبارەی داهاتووی حوکمڕانی کەرکووکەوە.

خشتەی ١٢- ٢

ئەوەی بەلای پێکهاتە جیاوازەکانەوە لەبارترە بۆ حوکمڕانی کەرکووك

| کـــــــــــــــــــۆنترۆڵکردنی زۆرینە(کوردوپێکهاتەکانی تر) | دابەشکردنی دەسەڵات (کوردو پێکهاتەکانی تر) | |
|---|---|---|
| ١، ٤ | ٣، ٢ | لەناوهـــــــــــــەرێمی کوردســــــتان و لەگـــــەڵ بـــــارودۆخێکی تایبـــــەت (کوردو پێکهاتەکانی تر) |
| ٤، ١ | ٣، ٢ | لــــەدەرەوەی هــــەرێمی کوردســــــتان و لەگـــــەڵ بـــــارودۆخێکی تایبـــــەت (کوردو پێکهاتەکانی تر) |

سەبارەت بەکورد، چارەکی (٢) لەبارترینە، کە کـەرکووك لەناوهـەرێمی کوردسـتاندایەو دەکەوێتە ژێرکێفی زۆرینەی کوردی. تەنیا تـەنازولکردنیش کـە پەیوەسـتە بـەو دەرئەنجامـە لەلایەنی کوردییەوە، پێدانی بارودۆخێکی تایبەتە بەکەرکووك لەچوارچێوەی هەرێمدا.

بێگومان ئـەوەش هـەمواركردنی دەسـتووری هـەرێمی کوردسـتان دەخوازێـت بـۆ ئـەوەی دەسەڵاتی ئۆتۆنۆمی ببەخشێتە کەرکووك.

جگە لەوەش دەکرێت کـورد دەسـەڵات دابــەش بکـات، بــەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا لــەڕووی دامەزراوەییەوە ناچارنین. لەو دەرئەنجامەشدا دوو کێشەی گەورە لەئارادان.

PDF 4 KURD

یەکەم، دەکرێت دەسەڵاتی فراوان لەبوارەکانی رۆشنبیری و خوێندن و تەنانەت ئاسایش بدرێتە حکومەتی کەرکوك و ئەوەش گران ناکەوێت مە لەدەستووری هەرێمی کوردستاندا جێگەی بکرێتەوە بەڵام ئاخۆ ئەو دەسەڵاتانە لەجێبەجێکردنیدا کەڵکی دەبێت، لەکاتێکدا هەردوو حزبەکەسەرەکییەکە(یەکێتی و پارتی) هەرێمی کوردستانیان لەژێر دەستدایەو دیسان کەرکووکیش دەکەوێتە ژێر رکێفیانەوە، ئیتر ئەو کات دەستوور بەچ جۆرێك زامنی ئۆتۆنۆمی بۆ کەرکووك دەکات و ئەو ئۆتۆنۆمییەش چ واتایەکی دەبێت.

دیارە ئتۆنۆمی راستەقینە ئەوەیە کە حکومەتی کەرکوك راسپێردرێت لەچەند بوارێکی دیاریکراودا سەربەخۆ بڕیار بدات، کەئەوەش لەدەرەوەی حەزو خواستەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت و ئەگەر واپێویستیشی کرد دژ بێت، کەبێگومان ئەوە مەحاڵ دەبێت. بۆیە لەوبارەدا تەنیا بژاردە سەرهەڵدانی بزوتنەوەکی سیاسیە لەنێو ریزەکانی کورد لەکەرکوك بۆ بەرەنگاریبوونەوەی هەژموونی (یەکێتی و پارتی) کەدیسا ئەوەش کارێکی دوورە.

لەبەرئەوە ئەو ئۆتۆنۆمییەی کەدەدرێتە کەرکوك دەکەوێتە ژێر رکێفی ویستی هەولێرەوە.

کێشەی دووەم، لەسیناریۆی چارەکی (٢) کە بەلای کوردەوە زۆر لەبارە و بەلای پێکهاتەکانی تریشەوە کەمتر لەبارەو لەو حاڵەتەشدا نابێتە چارەسەرێکی تەوافوقی.

لەڕووی پێودانگیشەوە ئیشکالە وەك لەوەی چارەسەرێکی تەوافوقی مامناوەند بۆ داهاتووی کەرکووك دابین بکات.

لەڕووی پراکماتیشەوە دیسان ئیشکالی دەبێت چونکە تەنیا چارەسەری تەوافوقی مامناوەند لەتوانایدا هەیەلەپرۆسەی سیاسیدا بۆ بەدیهێنانی دەستکراوە بێت.

هاوکات دەرئەنجامی چارەکی(٣) واتە کە کەرکوك بارودۆخێکی تایبەتی هەیە لەگەڵ بوونی میکانیزمێکی سیستماتیك بۆ دابەشکردنی دەسەڵات، بەلای کوردەوە کەمتر پەسەندە وەك لەوەی هەمان سەرئەنجام بەلای پێکهاتەکانی ترەوە زۆر لەبارترە. هەڵبەت هەمان دەرئەنجامی چارەکی (٣) بەهەمان شێوەی دەرئەنجامی چارەکی (٢) بەهەمان هۆکار رەتدەکرێتەوە.

لەرووی تیوریشەوە دەکرێت بەپێی ماددەی (١١٩)ی دەستووری عیراق و بەندەکانی ئەوە پرۆسەیەی کە ئیستادا لەئارادایە، باس لەکەرکوك و بارودۆخی تایبەتی بکرێت لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان و بەوپێیەش رێگە بە پارێزگاکان دەدرێت هەرێمی خاوەن دەسەڵاتی فراوان پێکبهێنرێت بەبەراورد بەو دەسەڵاتەی کە پارێزگاکان هەیانە.

دیاره هەڵپەساردنی ئەو پرۆسەیە بەپێی "یاسای پێکهێنانی هەرێمەکان" کە لەتشرینی یەکەمی ۲۰۰۷دا دەرچووە، لەنیسانی ۲۰۰۸دا کۆتایی هات و ئەوەش ڕێگەی خۆشکرد لەبەردەم پارێزگاکان بۆ پێکهێنانی هەرێمەکان لەسەر بنەمای ئەو ڕێکارە دیاریکراوانەی کە لەماددەی(۱۱۹)دا بەپێی یاسا هاتووە.

دیسان لەرووی تیۆرییەوە دەکرێت باس لەبارودۆخی تایبەتی کەرکوك بکرێت لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بەبێ چارەسەری تەوافوقی بەڵام ئەم میکانیزمە بۆ ئەوەی سەرکەوتن بە دەستبهێنێت پێویست بە دەنگدانی ڕێژەیەکی دیاریکراو لەو کوردانە هەیە کە دژی ویستی هەردو حزبەکەن، بۆ ئەوەی بەرژەوەندی کەرکووك لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بەڵام بەووردی نازانرێت ژمارەی ئەو کوردە کەرکووکیانە چەندن، کە لەدەرەوەی هەردو حزبەکەن تا ژمارەیان بەس بێت بۆ دەنگدان ەسەر ئەو پرسە.

ڕەنگە ئەم دەرئەنجامە کارێکی دوور بێت بەڵام مەحاڵیش نییە، هەرچەندە بەپێی دەستوورو یاسا میکانیزمێك نییە بۆ سەپاندنی فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر ئیدارەی کەرکووکدا.

دیسان دەستووری عیراقی حکومەتی ناوەندی سەرپشك ناکات بەوەی دامەزراوەو میکانیزمی حوکمڕانی بەسەر هەرێمەکاندا بسەپێنێت.

کەوابوو هەر فۆرمێکی سیستماتیکی بۆ دابەشکردنی دەسەڵات پێویستی بە دانوستان هەیە بەو پێیەی دەرئەنجامی چارەسەری توافوقی نێوان پێکهاتە ئیتنیکیەکانە.

بەکورتی فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات کەشێوازێکی سیستماتیکی هەبێت لەرێگەی هێزو سەپاندنەوە، ناکرێت لەکەرکووکدا بەبێ ڕەزامەندی کورد جێبەجێ بکرێت. هاوکات بەپێی سیناریۆی چارەکی(۳) کورد هیچ پاڵنەرێکی نییە بۆ دابەشکردنی دەسەڵات و کرۆکی گرفتەکەش لەو دەرئەنجامەدا لەوەدایە کە پێچەوانەی ئەو کێشەیەیە کە پەیوەستە بەچارەکی (۲)ەوە. لەمەی دوایشدا کورد (براوە)یە لەهەردو ئاستەکەدا بەڵام لەیەکەمداکورد (دۆڕاوە) لەهەردو ئاستەکەدا. بەواتایەکی تر نەئەمیان و نە ئەویان چارەسەرێکی تەوافوقی مامناوەند دەستەبەر ناکەن.

کێشەی دووەم، پراگماتیبوونی ئەو چارەسەرەیە کە چارەکی (۳) پێشکەشی دەکات، کەئەوەش ئەوەیە کورد لەتوانایدا هەیە چارەسەرێکی باشتر بەبێ ئەوەی پێویست بە تەوافوق یان هەڵوێستێکی میانگیری و پرۆسەیەکی سیاسی نوێ هەبێت.



PDF 4 KURD

بەپێی ئەو پرۆسەیەی کەماددەی (١١٩) لەخۆی گرتووە، کورد بۆی هەیە ببێتە خاوەنی ئەوەی کە چارەکی (٤)پێیگەیستووە، واتە کەرکووك بارودۆخێکی تایبەتی لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان هەبێت، بەڵام لەژێر کۆنترۆڵی زۆرینەی کوردیدا بێت.

دیسان کورد ئەم بژاردەیە جێبەجێ ناکات چونکە پاش ئەوەی هەرێمەکان پێکدێن بۆیان نییە تێکەڵ بەهەرێمی تر ببن.

بەوپێیەش پێدانی مافی بەهەرێمبوون بەکەرکووك وەك هەرێمێکی سەربەخۆ وادەکات کەرکووك بۆ هەمیشەیی لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بمێنێتەوە. بەڵام ئەگەر تەنیا ئەڵتەرناتیڤ سیناریۆی چارەکی (٣)یە ئەوا ئاستەمە هۆکارێك ببینینەوە، کە رێگە بەسەرکردایەتی کورد نەدات ماددەی(١١٩) کارابکات بۆ بەدیهێنانی دەرئەنجامێکی باشتر لەرێگەی ئامرازە دەستووریەکانەوە.

ئاریشەکانی پەیوەست بە هەردو دەرئەنجانی چارەکی(٢، ٣) کێشەی هاوشێوەن و دەکرێت هەردو دەرئەنجامەکەش وەك چارەسەرێك بسەپێنرێت، لەگەڵ ئەوەی مەحاڵیشە ببێتە هۆی چارەسەرێکی جێگیرو هەمیشەیی.

ئەو راستیەی کە مژدەیەکی خۆشی پێنیە بۆ هەندێك ئەوەیە، کە ئەو دووچارەسەرەی دەکرێت لەرِووی میعیاری و پراگماتییەوە داکۆکیان لێبکرێت بۆ پرسی کەرکووك لەچارەکەکانی (١، ٤) دا هەن.

ئەم دوو بژاردەیە لەنێو هەرێمی کوردستاندا لەگەڵ دابەشکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی سیستماتیکی لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان و لەژێر رکۆنترۆڵی کوددا هەموو لایەنەان بە(براوەیی) و(دۆڕاو) دێنە دەرەوە.

دەکرێت ململانێ لەسەر دیاریکردنی ناسنامەی کەرکووك بۆ ئەو دوو رەهەندە کورت بکرێتەوە  پێگەی کەرکووك و بالادەستی سیاسی.

لەچارەکی (١)دا کەرکووك کوردییە کەدەکەوێتە نێو سنووری هەرێمی کوردستان بەڵام بەو واتایەی بالادەستی سیاسی لەنێوان سەرجەم پێکهاتەکاندا دابەشبووە.

لەچارەکی(٤)دا خاوەنداریێتی کەرکووك بۆ کوردە واتە باڵادەستی سیاسی کوردی بەسەرەوەیە، بەڵام (کوردی) یش نییە، چونکە لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان دەمێنێتەوە.

دیاریکردنی ئەوەی کەکامیان باشترین دەرئەنجامە، پێویستە ئەو پرسیارە بوروژێنرێت: "بۆکێ باشترە؟" گریمان هەرلایەنێك ئەولەویەت دەداتە پێگەی کەرکووك لەروی بالادەستی

سیاسی ن کەدەرئەنجامی(١) بۆکورد باشترەو دەرئەنجامی(٤)یش لەلای پێکهاتەکانی تر لەبارترە.

بێگومان واپێویست دەکات بانگەشەکردن بۆ چارەسەر لەسەربناغەی ئەوە بێت کەکێ مافی هەیە باشترین ئەنجام جێبەجێبکات.

بۆنموونە، ئەگەر هەموو پێکهاتەکان گەیشتنە تەوافوق ل ئەوا پێویستە رۆڵێکی گرنگ بگێرێت لەدیاریکردنی داهاتووی کەرکوك، بەڵام دیسان سازاندن لەسەر هەر ژمارەیەکی گونجاو یان رەوا بوونی نابێت.

هەرچی بەرەی تورکمانیشە پێوەر بۆ قەبارەی دانیشتوانی شاری کەرکوك ئاماری ساڵی (١٩٥٧) ە، کەبە پێوەرێکی شیاوی دەزانێت بۆ ئەوەی داهاتوو و خاوەنداریێتی کەرکوك دیاری بکات. هاوکات کوردیش هەمان ئاماری پێباشەو بەداتایەکی گونجاوی دەزانێت.

دەکرێت لەروانگەی پرانسیپەکانی دیموکراسییەوە گفتوگۆ بکرێت و بەو پێیەش ئیرادەی زۆرینە باڵی بکێشێت بەسەر بانگەشەی کەمینەدا، بەڵام بەرەی تورکمانی عیراق رازی نییە دان بەوەدابنێت بەوەی کە تورکمان زۆرینە پێکناهێنێت سەرباری ئەوەی گشت بەڵگەکان جەخت لەوە دەکەنەوە کەتورکمان کەمینەیەو زۆرینە نییە.

بگرە بەرەی تورکمانی پێیوایە ئەو بەڵگانە دەرئەنجامی سەرکوتکردنی دەنگەکان و پاکتاوی نەژادی و هێنانی کوردە بۆ کەرکوك. ئەگەر پێکهاتەکانی کەرکوك نەتوانن رێك بکەون لەسەر پرسی ژمارەی دانیشتوان بەشێوەیەکی رێژەییو بابەتیانە ئەوا چاوەڕوان ناکرێت لەڕووی سۆزدارییەوە بسازێن لەسەر ئەوەی، کە کام پێکهاتە لەسەردەمی بەعسییەکاندا پتر تووشی نەهامەتی بوەتەوە. جا بۆ گەیشتن بە چارەسەرێکی جێگیر و هەمیشەیی بۆ پرسی کەرکوك پێویستە بچینە قوڵایی پرسی دابەشکردنی دەسەڵاتەوە.

**روونکردنەوەی زیاتر لەسەردابەشکردنی دەسەڵات**

شێوازی ١٢- ١، روونکردنەوەیەکە لەسەر دابەشکردنی دوالیزمی دەسەڵات، واتە دەسەڵات دابەشدەکرێت یاخود دابەش ناکرێت. هەروەها دەشێت پشت بەوە ببەسترێت کە هەرسیستمێکی دیموکراسی کە لەسەر بنەمای زۆرینە یان زامنکردنی نوێنەرایەتی و تەوافوق راوەستابێت، دابەشکردنی دەسەڵات لەخۆبگرێت. جا ئەوە بەشێوەیەکی رێژەیی یان بەکسان بێت لەنێوان لایەنە ناکۆکەکاندا. لەم دیدگایەشەوە گرنگە دابەشکردنی دەسەڵات بەو پێیەی زنجیرێکی پێکەوە لکاوە روون بکرێتەوە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

لەیەكێك لەكۆتاییەكانی زنجیرەكـەدا تـەواو باڵادەسـتی زۆرینــە و لـەكۆتایی زنجیرەكەشـدا دابەشكردنی دەسەڵات لەسەربنەمای تەواو یەكسانی هەیە.

شێوازی (١٢- ٣)، بریتییە لە زنجیرێكی پێكەوە لكاو كە تیایدا گشت مۆدێلەكان وەسف دەكرێن.

شێوازی ١٢- ٣

پلدارییەكانی دابەشكردنی دەسەڵات

| | | |
|---|---|---|
| .............I ........ I.......... | | ..............I.............. |
| I................................... | | |
| مۆدیلی كـۆنترۆڵكردن | كـۆنترۆڵكردنی زۆرینــە | دابەشـكردنی دەسـەڵات لەسـەر |
| بنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی | دابەشكردنی كۆنترۆڵكردن بەیەكسانی | |

مۆدێلی كۆنترۆڵكردن: دەكرێت ئەم جۆرە بەهەژمونی زۆرینــە بەشـێوەیەكی مەنهـەجی و بەدامەزراوكراو بەسەر كەمینەدا ناوبرێت. ئەم جۆرە مۆدێلـە لەلایــەن"ئیان لوسـتیك- Ian Lustic" لەكۆتایی هەفتاكاندا پێشنیازی كردووە.

بۆ شرۆڤە كردنی خۆبەدەستەوەدانی كەمینەی عەرەبی قەبارە گـەورە لەئیسـرائیل(١٥٪)ی دانیشتوان.

لوستیك مۆدێلەكەی پێشنیازكرد بەو پێیەی ركابەری راسـتەوخۆی ئـەو مۆدێلەیـە كـەكار لەسەر زامنكردنی نوێنەرایەتی ودابەشكردنی دەسەڵات دەكات، شـرۆڤەیەك بـۆ سـەقامگیری سیاسی لەكۆمەڵگە دابەشبووە قوڵەكاندا پێشـكەش دەكـات. بەبۆچـوونی لوسـتیك جیـاوازی گەورەی نێوان هەردو نزیككردەوەكە لەوەدایە، كـە"مۆدێلی دابەشـكردنی دەسـەڵات تـەركیز دەكاتە سەر ئاڵوگۆڕی هاریكاریی نێوان دەستەبژێرەكان نەك نیشتمانپەروەری ئەویش بەوپێیەی فاكتەری یەكلاكەرەوەیە...لەكاتێكدا نزیكبوونەوە لەدەسەڵات تەركیز دەكاتە سەر دەركـەوتنی ئەو پەیوەندیەی كە تیایدا هێزێكی باڵادەسـت لـەلای ئـەو توێـژە كۆدەبێتـەوە كـە لەهـەمان

کاتیشدا توانای سەپاندنی سەقامگیری و کۆت و بەندکردنی چالاکی و دەرفەتی سیاسی توێژێك یان توێژەکانی تر و پاراستنی ئەو پەیوەنییەی هەیە"١.

هەروەها لوستیك لەچارەسەرکردنەکەیدا کۆنترۆڵکردنی ئیسرائیل بەسەر کەمینەی عەرەبیدا دیاری دەکات، کە ئەوەش چارەسەرێکە و سیٚ ستراتیژی بۆ باڵادەستی لەخۆگرتووە- لەبەر یەکترازاندن و پاشبەندێتی و توانەوە- کەتوێژی باڵابۆ درێژەدان بەهەژموونی مەنهەجی خۆی بەسەر توێژی ژێرەوەدا پراکتیزەی دەکات.

لەبەریەکترازاندن بەبۆچوونی لوستیك "جیاکردنەوەی کەمینەی عەرەبیە لەدانیشتوانی جولەکە ودابەشکردنی ئەو کەمینەیەیە لەنێوخۆیاندا"٢.

بۆنموونە بەرپرسانی ئیسرائیلی سیسەتێکی هۆشیارانەیان گرتوەتە بەر بەئامانجی لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی نێوان دانیشتوانی عەرەب ئەویش بەپێدانی ئیمتیاز بەدروز و مەسیحی و کۆچەرییەکان(البدو) لەسەر حسابی گروپی عەرەبی کە گروپێکی فراوانترە.

هەروەها لەنموونەی ئەو سیاسەتانە ئیعتراف کردنە بە دروز وەك تایەفەیەکی ئایینی سەربەخۆ بەو مەرجەی دروز ناسنامەی خۆیان بە(دروز) تۆمار بکەن لەنێو بەڵگەنامەو دۆکیومێنتەکان نەك بە عەرەب، ئەمە جگە لەکۆمەککردنی دارایی دەوڵەت بۆگوندە دروزەکان. بەبۆچوونی لوستیك پێبەندێتی(التبعیە)، بریتییە لە پشت بەستنی عەرەب بەزۆرینەی جولەکە بۆ گەیشتن بەسەرچاوە ئابووری و سیاسییە گرنگەکان٣. ئەوەبوو هەڵمەتی بەردەوامی رژێمی ئیسرائیل بۆ رێگرتن لەبوونی بنکەی هێزێکی ئابووری نیمچە سەربەخۆ لەلای دانیشتوانی عەرەب وایکرد عەرەب پاشبەندێتی کەرتی جولەکە بێت لەبواری خوێندن و بەگەڕخستنی هێزی کاروکۆمەکی نێودەوڵەتیدا و بەوەش دووچاری گوشاری ئابووری و ماڵی ببنەوە.

دواجار لوستیك توندنەوە بەم جۆرە وەسفدەکات " لابەلا یارمەتی دەستەبژێری عەرەب یان توێژی هەڵبژێردراو دەدرێت بەمەرامی چاودێری و داماڵین و لێسەندنەوەی سەرچاوەکان٤.

---

1 - Lustick, I"Stability in Deeply in Divided Societies: Consciationalism Versus Contrl."World Politics ,31,31979,p.328.

2 -Kustick, I.,Arabs in the Jewish State:Israel's Control of National Minority ,Ausitn,TX:University of Texas Press,1980,p.77.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل٧٧.

4- هەمان سەرچاوە،ل٧٠.

لەبنەڕەتدا سەرکردە عەرەبییەکان یان ئەو کاندیدانەی کە پێگەی سەرکردایەتیان وەرگـرت، لەرێگەی پارەوە کڕدراون و بەشێوەیەکی ستراتیژی بەگەڕخراون تا سەرکردایەتیەکی یـەکگرتوو سەرهەڵنەدات بۆ ئەوەی داواکاری گروپە عەرەبیە فراوانەکان پێشنیازبکەن.

بە بەکارهێنانی هەرسـێ شـێوازی کـۆنترۆڵکردن لـەماوەی حـوکمی سـەربازیی، رژێمـی ئیسرائیل توانی عەرەب بەنرخێکی کەم مل کەچبکات.

بەکورتی ئەو کۆنترۆڵکردنە ستراتیژییەبەشێوەیەکی دروست سوودمەندبووە لەئیدارەی دابەشـکردنی قـووڵی ئیتنیکـی لەئیسـرائیل. هەڵبـەت لوسـتیك لەبـەر هۆکارگـەلێکی بەڵگەنەویستی ئامادە نییە پێشنیازی کۆنترۆڵکردن بکـات کـە بـەو پێیـەی نموونەیـەکی میعیارییە بۆ فەرمانڕەوایی کۆمەڵگە دابەشبووەکان. هەربۆیە مۆدێلەکەی، مـۆدێلێکی شرۆڤەییە وەك لەوەی وەسفی بێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لوستیك ئامـاژە بـەوە دەکـات کەدەکرێت مۆدێلی کۆنترۆڵکردن لەبارودۆخێکی دیاریکراودا رۆڵی خۆی ببینێت، هەربۆیە دەڵێـت:" لەکۆمەڵگـە دابەشـبووە قوڵەکانـدا میکانیزمـەکانی دابەشـکردنی دەسـەڵات سەرنەکەوتووە یاخود ناکرێت سەرکەوتن بەدیبهێنێت، دەکرێـت کـۆنترۆڵکردن مۆدێلێـك بێت بۆ رێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان پێکهاتەکان، کە لە چارەسەرە شـیاوەکانی تـر باشترە: شەڕی ئەهلی یان قڕکردن یاخود راگواستن"١.

دیسان سەرباری ئەوەی، کـە رۆحـی مـۆدێلی کـۆنترۆڵکردن بـەر نۆرمـەکانی دیموکراسـی دەکەوێت بەڵام ئەزموونی ئیسرائیل دەریخست کـە ئـەو مۆدێلـە بەشـێوەیەکی حـەتمی دژ بـە سیسـتمی سیاسـیی دیموکراسـی راناوەسـتێتەوە. جگـە لـەوەش ئـە مۆدێلـە بـەدوور نییـە لەخەسڵەتەکانی دابەشکردنی دەسەڵات سەرباری ئەوەی کە باڵا دەستی بـەبێ شـێوازی بـەزۆر ناچارکردن بۆخۆی مەرامی کۆنترۆڵکردنە.

هەروەها نکۆڵیش لەوە ناکات کە دەسـتەبژێرە باڵاکـان دەسـتەبژێری نزمتردەتوێننـەوە بـۆ کۆپییەکی بچووکتری دابەشکردنی دەسەڵات، کە ئەوەش ئامانجێکی تەواو نەگریسانەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دابەشکردنی دەسەڵات لەئارادایە. بەجۆرێك لـەواتاکان مـۆدێلی کـۆنترۆڵکردن بۆخۆی سنووری دەرەکییە لەوەی، کە لەئیدارەی پەیوەندی ئیتنیکی نێوقەوارەیەکی سیاسـی دیموکراسـی بـە شـێوزاێکی (پەسـەند) دادەنرێـت، ئامـانجیش لەوەبریتییـە لەهـەژموونی

1- Lustick, I"Stability in Deeply in Divided Societies .هەمان سەرچاوە

سەرهاتەیەك بەسەر پێکهاتەیەکی ترەوە، بەڵام لەچوارچێوەی دیموکراسیدت کە جۆرێکی شیاو لەدابەشکردنی دەسەڵاتی تێدایە، جا ئەوەش ئەگەر کەمیش بێت.

کۆنترۆڵکردن(دەستبەسەرداگرتن) ی زۆرینە: ئەوەی کەمتر مایەی مشتومڕە مۆدێلی دەستبەسەرداگرتنی زۆرینەیە کە لەسیستمی ویستمنستر(Wenstminster system) دا بەرجەستە دەبێت. بەم پێیە سیستمی زۆرینە پەیوەستە بە یەك بازنەو فرە هەڵبژاردنەوە، کەتیایدا دوو حزبی سیاسی کۆبوونەتەوەو کێبڕکێی یەکتری دەکەن، لەم سیستمەدا براوە هەموو شتێك بەدەست دەهێنێت، بەجۆرێك لەسیستمی پەرلەمانیدا ئەو پارتەی زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمانی بۆخۆی مسۆگەر دەکات، حکومەت پێکدەهێنێت و سەرجەم پۆستە حکومییەکان دەخاتە ژێر دەست خۆیەوە.

هاوکات حزبی دۆڕاو (کەمینە) هیچ شتێك بەدەست ناهێنێت جگە لەدەرفەتی رەخنەگرتن نەبێت لەحکومەت وەك لایەنێکی بەرهەڵستکار.

بێگومان لەلایەن ئەوانیترەوە دامەزروەو دینامیکی سیستمەکانی زۆرینە بەتێرو تەسەلی تاوتوێکراون، بۆیە پێویست ناکات لێرەدا دووبارە بکرێتەوە١. لەو سیاقەشدا دەست بەسەردا گرتنی زۆرینە لەرووی شیکارییەوە لەنێوان مۆدێلی کۆنترۆڵکردن و مۆدێلەکانی دەسەڵات لەزنجیرە بەیەکەوە لکاوەکەی پێشوودا راوەستاوەو دەکرێت بەروونی جیاوازی بکرێت لەنێوان سیستمی زۆرینەو سیستمی دەستبەسەرداگرتن، کە ئامانجیش بردنەوەیە لەهەڵبژاردنی دیموکراسی لەبری ملکەچپێکردنی کەمینە لەرێگەی بەکارهێنانی شێوازەکانی کۆنترۆڵکردن.

هەروەها لەسیستمی دابەشکردنی دەسەڵاتدا جیاوازە چونکە مەرج بۆ براوە دانانرێت، تا لەگەڵ دۆڕاو (سەرنەکەوتوو) دەسەڵات دابەش بکەن.بەڵام ئەوەش ئەوە ناگەیەنێت کە سیستمی زۆرینە لێکدژی سیستمی دابەشکردنی دەسەڵاتە سەرباری ئەو وێناکردنە کاریکاتۆرییەی کە پێیوایە دژیەتی.

دیسان پارتی بنکە فراوان، کەزۆر کات لەنێو سیستمی زۆرینەدا بەچەشنی نیمچە هەمیشەیی دەردەکەوێت، لەنێو پەرژەوەندییە هەمە چەشنەکاندا هیچی جیاواز نییە لەحکومەتە ئیئتلافەکانلە سیستمی دابەشکردنی دەسەڵاتدا.

---

١- بۆزانیاری زیاتر لەبارەی بنەماسەرەکییەکانی سیستمی ویستمنستەر بروانە:
Lijpart, A, Patterns of Democracy: Government From and Perfrnance in Thirty-six Countries, News Haven,CT:Yale University Press,1999,Chapter2.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بەهەمان شێوە دەستاودەستکردنی دەسەڵات شەقڵێکی سیاسی زۆرینەیەو بەو واتایەش دەسەڵات بەتێپەڕوونی کات لەنێوان لایەنەکاندا دابەش دەکرێت. جگە لەوەش سەرباری ئەوەی بردنەوەی پارتێك و بەدەستهێنانی کورسی پێویست لەپەرلەماندا بۆ ئەوەی بەتەنیا دەسەڵات بگرێتە دەست پێویست ناکات داوای دابەشکردنی دەسەڵاتی لێبکرێت، بەڵام هیچ شتێك لۆژیکانە ناگۆڕێت ئەگەر دامەزراوەکانی دابەشکردنی دەسەڵات لەچوارچێوەی سیستمی زۆرینەدا بەکارنەهێنرێت.

هاوکات فیدراڵی زۆرینە (کەنەداو ئوسترالیا) ئاستەکانی حوکمڕانی و دیسان دیاریکردنی ناوچەی زۆرینەی رەشەکان لەهەڵبژاردنی کۆنگرێسی ئەمریکاو زامنکردنی مارۆییەکان (Maoris) لەپەرلەمانینیوزلەندە، هەرهەموویان نموونەیەکن لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات و دەکرێت لەچوارچێوەی زۆرینەدا پشتی پێببەسترێت.

هەرچەندە سیستمی زۆرینە لەرووی دامەزراوەییەوە دژ بە دابەشکردنی دەسەڵات نییە بەڵام دابەشکردنی دەسەڵاتمەرجێکی دامەزراوەیی نییە. هەروەها دەکرێت ئەو کێشە مەترسیدارانە دروست بن کاتێك کۆمەڵگەکان بەشێوەیەکی قووڵ لەسەر بنەمای ئیتنیکی دابەشبوون. بۆیە دەسەڵات و شەرعیەتی سیستمی زۆرینەو دیموکراسی بەگشتی، تەرکیز دەکەنە سەر ئەو گریمانەیەی کە دەکرێت ئەوانەی ئەمڕۆ سەرنەکەوتوو(دۆڕاو) ن سبەی براوەبن.

لەگەڵ دابەشبوونی قووڵی ئیتنیکیدا، پارتە سیاسییە رێکخراوەکانیش لەسەر بنەمای ئیتنیکی دابەشبوون، بەڵام مەترسییەکە لەوەدایە کەمینەکان بۆ هەمیشەیی دووچاری هەڕەشەی دوورخستنەوە دەبن لەدەسەڵات، لەبەرئەوە هۆرۆڤیتز (Horowitz) ئەو مەترسییە بە (دکتاتۆری زۆرینە) ناودەبات لەنێو کۆمەڵگە ئیتنیکییە دابەشبووەکان. لەبەرئەوە پسپۆڕانی بواری دەستوور وەك بژاردەیەکی باش لەدیموکراسی زۆرینە ناڕوانن بۆ کۆمەڵگە دابەشبووەکان١.

## دابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی

جەوهەری دابەشکردنی دەسەڵات لەرێگەی نوێنەرایەتی رێژەییەوە لەبنەڕەتدا خۆی بۆخۆی راڤە دەکات، چونکە پێکهاتەکانی کۆمەڵگە لەپێگەکانی دەسەڵاتدا نوێنەرایەتیەکی هاورێژەیە لەگەڵ قەبارەی ژمارەی دانیشتوان. بەپێچەوانەی سیستمی هەڵبژاردنی زۆرینە/

1- Horowitz,D., Ethnic in Conflict, Berkeley:niversity of California Press,1985.p.102.

فەری) سیستمی هەڵبژاردن لەسەربنەمای نوێنەرایەتی رێـژەیی پشـکی حزبێـك لەدەنگـەکان راستەوخۆ بۆ پشکی ئەو حزبە لەکورسی پەرلەمان بەشێوەیەکی لەبارو بێ شێواندن مومارەسە دەکرێت، ئەمە جگە لەوەی سیستمی زۆرینە/ فرەیی ئـارەزوو یەکەمکردنـەوەی نوێنەرایـەتی پارتی کەمینەکان دەکات، کە لەرووی جوگرافییەوە پەرش و بڵاون.

هاوکات لەکۆمەڵگـە دابەشـبووەئیتنیکییەکاندا، پارتـەکانیش لەسـەربنەمای ئیتنیکـی رێکدەخرێن و دەنگدەرانیش دەنگ بەناسنامەی ئیتنیکیان دەدەن و سەرئەنجامی پەرلەمانیش بۆ سیستمی نوێنەرایەتی رێژەیی پەتی هاوشێوەی سەرژمێری دانیشتوانە.

دیسان بەهۆی سیاسەتی فرە حزبییەوە کەسیستمی نوێنەرایەتی رێـژەیی بـرەوی پێـدەدات، مەحاڵە تەنیا حزبێك ژمارەی پێویست لەکورسی بەدەستبهێنێت بۆ پێکهێنانی حکومەتی تاك حزب و بەوەش دابەشکردنی دەسـەڵات لەدەسـتەی جێبـەجێکردن لەسـەر شـێوەی حکومەتـە ئیئتلافیەکان ئەو رێسایەیە کە پەیڕەوی لێدەکرێت.

هەروەها لەسیستمی دابەشکردنی دەسەڵاتدا لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی پێویسـتە ئیئتلافی دەسەڵاتدار نوێنەرایەتی سەرجەم پارتەکان بکـات بـەوجۆرەی لەگـەڵ هێزیـدا لـەنێو سیستمی یاسادانانداهاوڕێژە بێت.

دیسان پێویستە پێگەکانی دەسەڵات لەدامەزراوە هەستیارەکانی تـری دەوڵـەت — سـوپاو پـۆلیس و دادگا...هتـد- لەسـەر بنـەمای رێـژەیی دابەشـبکرێت و سیسـتمی موحاسەسـە بەکاربهێنرێت. بەگشتی ئامانج گەیشتنی هەرپێکهاتەیەك/حزبێکی ئیتنیکییـە بـۆ دەسـەڵاتە باڵاکان بەو جۆرەی هاوتای هێزی ژمارەیی بێت لەنێوان دانیشتواندا.

ئەو سیستمە بۆ کۆمەڵگـە دابەشـبووە ئیتنکییـەکان سـیمای ئاشـکراو روونـە، چـونکە سیاسەت ململانێی کێبڕکێی نییە کە تیایدا براوە لەهەموو شتێکدا قـارازاج بکـات، بـەڵکو فۆرمێکە کە هەرلایەنێك شتێك بۆخۆی دەبات و هەرەشەی دوورخستنەوەی هەمیشەیش لەهیچ لایەنێك ناکات. بەڵام سیستمی دابەشکردنی دەسەڵات لەسـەر بنـەمای نوێنەرایـەتی رێـژەیی تەنانەت لەشێوە پەرگیرەکەشیدا نفوزێکی سیاسی رێژەیی بۆ کەمینەکان لەپرۆسەی دروستکردن و بڕیاریدا زامن دەکات.

هاوکات زۆربەی بڕیارە سیاسییەکان جا لەپەرلەمان یاخودلەئەنجوومەنی وەزیراندا بێت ئەوا بەدەنگدانێکی زۆرینەی سادە دروست دەکرێت.



PDF 4 KURD

لەکۆمەڵگەیەکدا کە بەسەر دوو پێکهاتەی سەرەکیدا دابەشبووبێت کە یەکێکیان لە٦٠٪ و ئەویتریشیان لە٤٠٪ی دانیشتوان پێکبهێنێت، ئەوا هەرپرسێك کە ئەو دوو پێکهاتەیە لەسەری ناکۆك بن ئەوا دواجار پێکهاتەی زۆرینە پرسەکە یەکلایی دەکاتەوە.

بەوجۆرە کۆنترۆڵکردنی ٤٠٪ی کورسییەکانی پەرلەمان یان لە ٤٠٪ی پۆستە وەزارییەکان ناکاتە پشکی لە ٤٠٪ی دەسەڵاتی دروستکردنی بڕیار.

## دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی

دەکرێت ئەم نزیکبوونەوەیە لە ڕێسای نوێنەرایەتی ڕێژەیی لەسەر بنەمای دابەشکردنی دەسەڵاتی یەکسانی نێوان پێکهاتەکان نەك لەسەر بنەمای دابەشکردنی ڕێژەیی جیابکرێتەوە، بەو پێیەش پێکهاتەیەك کە لە ١٠٪ی دانیشتوان و پێکهاتەیەکی تریش کە لە٥٠٪ی دانیشتوان پێکدەهێنێت، هەمان پشکی یەکسانی لەدەسەڵات دەبێت.

هەڵبەت جێبەجێکردنی ئەم فۆرمە پەرگیرەی دابەشکردنی دەسەڵات بەتەواوی وردەکارییەوەدەبێتە هۆی ڕەتکردنەوەی هەڵبژاردنی ڕکابەرانەی نێوان پێکهاتەکان، چونکە هەرپێکهاتەیەکی کۆمەڵگە جا هەرلایەك بێت ئەوا ژمارەیەکی وەك یەك لەکورسی پەرلەمانی پێدەدرێت و لەدەزگای حکومەتدا ومارەسەی دەسەڵاتێکی وەك یەك دەکات و نوێنەرایەتیەکی یەکسانیشی بەنوێنەرایەتی پێکهاتەکەی تر لەدامەزراوەکانی دەوڵەتدا دەبێت. بەپێی ئەم سیناریۆیەش تەنیا دەرفەت بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی ڕکابەرانە لەچوارچێوەی خودی پێکهاتەکە خۆیدا دەبێت بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرایەتی ئەو پێکهاتەیە.

هەروەها شەقڵی دامەزراوەیی یەکلاکەرەوەش بۆ دابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای یەکسانی بریتییە لە مافی ڤیتۆ.

خۆئەگەر لەنموونەی ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن، لەکۆی بڕیارەکاندا پێویستی بە زۆرینەی دوو بۆ سێی بێت لەبری زۆرینەیەکی سادە ئەوا پێکهاتەی زۆرینە کە لە٦٠٪ی کورسییەکانی پەرلەمانی لەدەستدایە، ناتوانێت بەبێ دەنگی پێکهاتەی کەمینە هیچ شتێك تێپەڕێنێت و هەر تێپەڕاندنێکیش پێویستی بە تەوافوقی هەردوو پێکهاتەکە هەیە.

لەو ڕێگەیەشەوە دەتوانرێت سەرجەم پێکهاتەکانی کۆمەڵگە مافی ڤیتۆیان هەبێت و بۆ دەرکردنی هەر بڕیارێکیش بەکۆدەنگی ڕەزامەندی پێکهاتەکان بەدەست بهێنێت.



PDF 4 KURD

لەرووی پراکتیکیشەوە سیستمێك نییە لەجیهاندا کە یەکسانی تیایدا رەها بێت لەنێوان پێکهاتەکانیدا، سەرباری ئەوەی سیستمی سیاسی لە (بۆسنە) زۆر لەوەوە نزیکە، بەڵام چەندان قەوارەی سیاسی هەن کە لەبەلژیکاوە بۆ عێراق درێژبوونەتەوەو تیایاندا پرانسیپی دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی پراکتیزە دەکرێن بەسەر چەند دامەزراوەیەکی دیاریکراوی حوکمڕانیدا یاخود بەکاردەهێنرێن بۆ بڕیاریدانە دیاریکراوە یەکلاکەرەوەکان.

لەراستیدا دەستنیشانکردنی ئارنت لیهارت – Arend Lijphart بۆ واتای ( ڤیتۆی کەمینە) بەو پێیەی توخمێکی یەکلاکەرەوەیە لەچەمکی زامنکردنی نوێنەرایەتی و دابەشکردنی دەسەڵات، گرنگی دامەزراوەکانی دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی روونده‌کاتەوە لەنێوان میکانیزمە تایبەتمەندەکان ئەویش بە پارێزگاریکردنی کەمینەکان لەنێو کۆمەڵگە دابەشبووەکاندا١.

### ئاماژەکانی دابەشکردنی دەسەڵات لەکەرکووك

لەدوای رووخانی رژێمی پێشوو لە نیسانی ساڵی( ٢٠٠٣ )ەوە، کەرکووك ٣ حکومەتی بەخۆوە بینیوە کە هەر حکومەتێکیش لەریز بەندی شێوەی (١٢- ١) دا پێگەیەکی کەمێك جیاواز بەپێگەی ئەویتری هەبووە.

لەماوەی نێوان حوزەیران و کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٣دا لەلایەن ئەنجوومەنی شارەوانییەوە کە لە(٣٠) ئەندام پێکهاتبوو راستەوخۆ لەلایەن سوپای ئەمریکاوە دیاریکرابوون و حوکمی کەرکووکیان گرتبووە دەست. دواتر لەکانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٤، حکومەتی ناوخۆیی کەرکووك - ئەنجوومەنی پارێزگا فراوانکرا (نوێکرایەوە)، کە لە (٤٠)ئەندام پێکهاتبوو.

لەپاش هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٥)، یەکەم ئەنجوومەنی هەڵبژێردراوی پارێزگای کەرکووك لەهاوینی ٢٠٠٥دا ئەرکی ئیدارەکردنی گرتە دەست کە لە(٤١) ئەندام پێکهاتبوو.

---

١- هەرچوار ئەو مۆدێلەی خراونەتە روو بەهیچ شێوەیەك سەرجەم ئەو فۆرمە شیاوانە نین بۆ بەشداریکردن لە بڕیارداندا.

PDF 4 KURD

## خشتەی ١٢- ١

ئەم خشتەیەی لای خوارەوە پێکهاتەی ئیتنیکی لەو حکومەتانەی کەرکووکدا دەردەخات

| ناسنامەی ئیتنیکی | کورسییەکانی ئەنجومەنیشارەوانی (٪) | کورسییەکانی ئەنجومەنی پارێزگا(٪) | کورسییە هەڵبژێردراوەکانی ئەنجوومەنی پارێزگا(٪) | ڕێژەی سەدی لەدانیشتوان (هەڵبژاردنی کانونی یەکەم/٢٠٠٥ | ڕێژەی سەدی دانیشتوان بەپێی ئاماری ١٩٥٧ |
|---|---|---|---|---|---|
| پۆستە **حکومییەکان** | سەرۆکی ئەنجومەنی شارەوانی کوردو جێگرەکەی عەرەب و یاریدەدەرانیشیان کوردو مەسیحی و تورکمان | جێگری پارێزگار عەرەب و یاریدەدەرەکانی کوردو مەسیحی و تورکمان و سەرۆکی ئەنجوومەن تورکمانی | پارێزگار کوردو جێگری بەتاڵ و یاریدەرەکانیش مەسیحی و عەرەبی و سەرۆکی ئەنجوومەن کوردو پارێزگاریش کورد | | |
| کورد | ١١(٣٧٪)(٦ +٥سەربەخۆ) | ١٣(٣٣٪) | ٢٠(٤٩٪) | ٥٣٪ | ٤٨٪ |
| عەرەب | ٦(٢٠٪) | ١٢(٣٠٪) | ٩*(٢٢٪) | ٢٧٪ | ٢٨٪ |
| تورکمان | ٦(٢٠٪) | ٨(٢٠٪) | ١١** | ١٣٪ | ٢١٪ |
| مەسیحی | (٢٣٪)(٦+١سەربە خۆ) | ٧(١٨٪) | ١*** | ٠.٢٪ | ٢٪ |
| تێکڕای ژمارەی کورسیەکان | ٣٠ | ٤٠ | ٤١ | | |

PDF 4 KURD

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| پلەی وردبینی لەهەڵبژاردنی کانونی یەکەمی ۱۲۰۰۵ | %٥٣ | %٤٨ | %٢٥ | | |
| پلەی وردبینی لەئاماری ۲۱۹٥۷ | %٤١ | %٣٧ | %١٣ | | |

*لەنێویاندا (٣) عەرەب هەن کە لەسەر لیستی برایەتی کەرکوك هەڵبژێردراون

** لەنێویاندا( ٢ ) تورکمان هەن کە لەسەر لیستی برایەتی کەرکوك هەڵبژێردراون

***(١) ئاشووری هەیە کە لەسەر لیستی برایەتی کەرکوك هەڵبژێردراوە.ئەو داتایانەی لەم خشتەیەدا پێشکەش کراون لەسەربنەمای ئیتنیکییە نەك لەسەر بنەمای ئینتیمای سیاسی، لەبەئەوە کورد لەخانەی یەکەمدا بە (١١)ئەندام لەئەنجوومەنی شارەوانی ریز بەند کراون سەرباری ئەوەی (٥) لەو ئەندامانە وەك کەسانی سەربەخۆ دامەزرێنراون کە سەر بەهیچ پارتێکی سیاسی کوردی نین٣.

بەهەمان شێوە هەر (٢٦) ئەندامی ئەنجوومەنی پارێزگا لەسەر لیستی برایەتی کەرکوك لەخانەی سێیەمدا بەپێی ناسنامەی ئیتنیکی دانراون.

---

١-ئەم ژمارانە بەکۆکردنەوەی جیاوازی رەهای نێوان رێژەی سەدی پشکی هەرپێکهاتەیەك لە کورسییەکانی ئەنجومەنی نوێنەران وئەو رێژەیەی کە ژمارەی دانیشتوان لەسەر بناغەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانونی یەکەمی ٢٠٠٥ بەدەستیهێناوە هەژمارکراون. بەم شێوەیە کورد لە٣٧٪ی کورسیەکانی ئەنجومەنی شارەوانی مسۆگەرکردووە لە٥٣٪ی دانیشتوانیش پێکدەهێنن. بەوشێوەیە بەشداریکردنیان لەقەبارەی شێواندن ٥٣-٣٧=١٦. سەبارەت رێژەی بەعەرەبیش ژمارەکان ٢٧-٢٠=٧ لەبەرئەوە لەگەڵ بەرزبوونەوەی ژمارەکە ئەوا نوێنەرایەتی لەحوکمڕانیدا رەنگدانەوەی رێژەی دانیشتوانە بەپلەیەکی کەمتر .

٢- ئەم ژمارانە وەك لە پەراوێزی ٩دا هاتووە لە داتای ئاماری ١٩٥٧دا بەکارهێنراوە.

٣- بەرپەرچدانەوە لەبەرامبەر وەسفی دابەشکردنی پۆستە وەزارییەکان بەدەستەواژەی تایەفی لەبری ئینتیمای سیاسی ئەوەیە کە ئەو کەسانەی سەر بە ئیتنیکەکانی ترن و لەسەر لیستی برایەتی کەرکوك خۆیان کاندید کردوە جگە لە بەکرێگیراوی کورد چیتر نین و نوێنەری تورکمان و عەرەب و مەسیحی نین.

لـەم سەروبەندەشـدا هەرچـی خانـەی چوارەمیشـە پشـکی هەرپێکهاتەیـەکی ئیتنیکـی بەنزیکەیی لەکۆی دەنگەکانی هەڵبژاردنی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ دەردەخات. دیارە ئەوەش خەملاّندنێکی نزیکەیی و ئامادەیە بۆ رێژەی هەرپێکهاتەیەك لەدانیشتوان.

خانەی پێنجەمیش پێکهاتەی ئیتنیکی پارێزگاکە روون دەکاتەوە هەروەك ئەوەی لەئاماری ١٩٥٧دا هاتووە. ئەم زانیاری و داتایانەش رێگە بە سازدانی بـەراوردکاری نێـوان پێکهاتـەی ئیتنیکی پارێزگاکە دەدات لـەدوو پـنتی زەمـەنی لەگـەڵ دابەشـکردنی ئیتنیکـی لەهەرسـێ حکومەتەکەی کەرکووکدا کە لەدوای جەنگ بەدوای یەکتریدا هاتوون.

هاوکات پێوەری پلە ورد شێوازێکی سادەیە بـۆ هـەژمارکردنی مـەودای لێنزیکـی نێـوان دابەشـــکردنی راســـتەقینەی ئیتنیکـــی دانیشـــتوان و دابەشـــکردنی ئیتنیکـــی لەهەرســـێ حکومەتەکەدا.

چەند خاڵێك سەبارەت بـەو داتایانـە لـەئارادان، بۆنموونـە کاتێـك حکومـەتی شـارەوانی کەرکووك حوکم بە واژە ئیتنیکییەکان دەکات، ئەوا دوورترین حکومەتە لە رێژەو هاورێژەیی لەرووی نوێنەرایەتی ئیتنیکییەوە.

ئەوەش سەیر نییە، چونکە پێکهاتەی ئەنجوومەنەکە لەلایەن سوپای ئەمریکاوە دیاریکراوە و لەوەشدا پشتی بە یەکسانی نێوان پێکهاتەکان بەستووە، وەك پرانسیپی بنچینەیی.

تەنانەت لەخۆگرتنی کوردە سەربەخۆو بێ لایەنەکان وایکـرد نوێنەرایـەتی کـورد هەنـدێك لەنوێنەرایەتی قەبارەو بوونی ژمارەیان بەدووربێت و نوێنەرایەتی عەرەب و تورکمانیش کـەمتر بێت لەوەی کەماقی خۆیانە، ئەگەر چی وئەوە بۆ حاڵەتی تورکمان ئەوەندە جیاواز نەبوو.

گەورەترین سوودمەندو سەرچاوەی سەرەکی شـێواندن لەتـەرزی نوێنەرایـەتی بـریتی بـوو لەمەسیحییەکان کە لە(٢٣٪)ی کورسییەکانی ئەنجوومەنەکـەیان بەدەسـتهێنا، کـە ئـەوەش لەپشکی عـەرەب و تورکمانـەکان زیـاتر بـوون، لەکاتێکـدا قـەبارەیان لـە٢٪ی دانیشـتوان تێپەڕناکات.

هـــەروەها نۆژەنکردنـــەوەی ئەنجوومەنەکـــە لـــەکۆتایی ٢٠٠٣ و ســـەرەتای ٢٠٠٤ دا، بـەفراوانکردنی ژمـارەی ئەندامـەکانی لـە (٣٠) کەسـەوە بـۆ (٤٠)ئەنـدام، حکومـەتێکی لێکەوتـەوە کەکـەمێك نوێنەرایەتیکردنەکـەی زیـاتر بـوو. ئـەوەبوو عـەرەب گـەورەترین سوودمەندبوون و بەوەش رێژەی لە ٣٠٪ی کورسییەکانی ئەنجوومەنە نوێیەکەیان بەدەسـتهێنا،

لەکاتێکدا بەپێی ئاماری( ١٩٥٧) ڕێژەی لە ٢٨٪ی دانیشتوانیان پێکهێناوە لەکاتێکدا بەپێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٥، لە٢٧٪ی دانیشتوان پێکدەهێنن.

ئەوەی ماوەتەوە تورکمان بوو که هیچ گۆڕانکاریەك لەنوێنەرایەتی تورکماندا بەدینەهات و هاوکاتیش هەریەك لەکوردو مەسیحییەکان بەهۆی فراوانبوونی ئەندامێتی ئەنجومەنەکە نوێنەرایەتیەکی ڕێژەییان لەدەستدا.

دواجار ڕێژەی نوێنەرایەتیکردن لەئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکەدا بەبەراورد بەهەردو حکومەتی پێشوو بەرزتربوو، هۆکاری ئەوەش دابەزینی زۆری نوێنەرایەتی مەسیحییەکان بوو. بەپێچەوانەی ئەوەشەوە نوێنەرایەتی کوردو عەرەب لەئەنجومەنەکەدا لەبەرامبەر ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ بەبەراورد بەقەبارەی دانیشتوان کەمیکرد، لەکاتێکدا نوێنەرایەتی تورکمان زیادیکردو حاڵەتەکەش لەدابەشبوونی کوردسییەکان بەسەر پێکهاتە ئیتنیکییەکان لەئەنجومەنەکەدا هاوشێوەی ئاماری ١٩٥٧ بوو.

بەواتایەکی تر ئەگەر لەساڵی ١٩٥٧دا هەڵبژاردنێکی خاوێن لە پارێزگای کەرکوك ئەنجام بدرایە ئەوا جیاوازییەکی ئەتۆی نەدەبوو لە گەڵ حکومەتە هەڵبژێردراوەکەی ئێستای کەرکوك.

هەڵبەت بەپشتبەستن بەئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥، ئەوا بەشێوەیەکی نزیکەیی ئاماژەیە بۆ ڕێژەی ئێستای دانیشتوانی کەرکوك، هەرچەندە هەریەك لەتورکمان و مەسیحییەکان لەحکومەتە جیاجیاکاندا بەبەردەوامی نوێنەرایەتی کردنیان زیاترە لەقەبارەی ڕاستەقینەی دانیشتوانیان و لەهەمان کاتیشدا هەریەك لە کوردو عەرەب بەگشتی نوێنەرایەتیان بەبەراورد بەقەبارەی ڕاستەقینەی دانیشتوانیان کەمتربووە. بەگشتی ئەنجومەنە هەڵبژێردراوەکە لەنوێنەرایەتیکردندا زۆر وردترە لەئەنجومەنی پێشووتری.

بەپشت بەستن بە ناسنامەی ئیتنیکی وادیارە دابەشکردنی پۆستە حکومییەکانیش هەر ڕەنگدانەوەی دیمۆگرافیای ئیتنیکی کەرکوك دەربخات، بۆنموونە گەورەترین پێکهاتە(کورد) باڵاترین پۆستی حکومی وەرگرتووە و پۆستی جێگریش دراوەتە دووەم گەورە پێکهاتە کە (عەرەب)ە و پۆستی یاریدەدەرانیش بۆ مەسیحی و تورکمان تەرخان کراون، جگە لەو حاڵەتەش نەبێت کە تیایدا دوای نوێکردنەوەی ئەنجومەنەکە پۆستی سەرۆکی ئەو ئەنجومەنە درایە تورکمان و هەرد پۆستی جێگری پارێزگاش بۆ عەرەب و تورکمان تەرخانکرا کە تائێستا بەبەتاڵی ماونەتەوە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**پۆسته ئیدارییەکان**

ئاستەمە داتای وردو باوەڕپێکراو سەبارەت بە دابەشکردنی ئیتنیکی بۆ پۆستە ئیدارییەکانی کەرکووك دەستبکەویت، ئەویش لەبەر هۆکاری ئالۆگۆڕی فراوانی نێوان بەرپرسانی ئیداری و ژمارەیەك پۆستی بالا لەسەر ئاستی جیاوازی شارو پارێزگاو ئاستی فیدرالی — بەلام دیسان ئەو جۆرە داتایانەش تەواو بەسیاسی کراون.

ئەم خشتەیەی خوارەوە و ئەو داتایانەش کە خراونەتە روو سەرچاوەیەکی بەرەی تورکمانییە، لەکاتێکدا هۆیەك نییە کە پێشوەخت وەك گریمانەیەك بوترێت کە ئەو داتایانەی بەرە زیاتر یان کەمتر باوەڕپێکراون بەبەراورد بەسەرچاوەیەکی تر، هەرچەندە ئەم داتایانە ئاماژە بەزیادەڕۆیی نوێنەرایەتی تورکمان ناکات لەدەزگای بیرۆکراسیدا١.

١- داتا تایبەتەکان بە دابەشکردنی ئیتنیکی بۆ پۆستە ئیداریەکانی کەرکوك کە وەرگیراوە لە:" پێشێلکاریەکانی دژ بە تورکمان لەکەرکوك"، لەبلاوکراوەکانی بەرەی تورکمانی، ئەنقەرە،٢٠٠٧، ل٥-١١.

PDF 4 KURD

خشتەی ١٢- ٢ پۆستە ئیدارییەکانی کەرکووك بەپێی ناسنامەی ئیتنیکی:٢٠٠٧

| ناسنامەی ئیتنیکی | پۆستە ئیدارییەکان(باڵا) | پۆستە ئیدارییەکان(مامناوەند) | وەزیفە ئیدارییە گشتییەکان | تێکڕای ژمارەی پۆست و وەزیفە ئیدارییەکان |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| کورد | ١٠(٥٣٪) | ٣٠(٦٥٪) | ١٠(٢٧٪) | ٥٠(٤٨٪) |
| عەرەب | ٧(٣٧٪) | ٨(١٧٪) | ٨(٢١٪) | ٢٣(٢٢٪) |
| تورکمان | ١(٥٪) | ٨(١٧٪) | ١٩(٤٨٪) | ٢٩(٢٨٪) |
| مەسیحی | ١(٥٪) | | ٢(٥٪) | ٣(٣٪) |
| کۆ | ١٩ | ٤٦ | ٣٩ | ١٠٥ |

مەرامی بەرەی تورکمانی لەبلاوکردنەوەی ئەمداتایانە" هێمادانێتی بەو ستمەی دەرهوق بە تورکمان کراوە لەدابەشکردنی وەزیفە ئیدارییەکانی کەرکووکدا".

هەروەها بەرە هەست بەو ناهەقییە دەکات بەتایبەتیش لە نزمی ئاستی نوێنەرایەتی تورکمان لەپۆستە باڵاکاندا"سەرباری ئەوەی کەزۆرینە پێکدەهێنن".

پۆستە ئیدارییەکان هەرهەموویان وەك یەك سەنگ و قورسایی خۆیان نییە، سەرباری ئەو ژمارانەی دانیشتوان کە بەکارهێنراون، چجای ئاماری ١٩٥٧ یان ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەم، هەربۆیە پشکی تورکمان لەپۆستە باڵاکاندا هاوڕێژەی قەبارەی دانیشتوان نییە. بەڵام گرفتەکە لەپشکی کورددا نیە کە لە٥٣٪ی دانیشتوان پێکدەهێنن و ئەوەش هاورێژەی قەبارەیانە بەڵکو گرفتەکە لەژمارەی بەرپرسە ئیدارەکانی عەرەبدایە.

PDF 4 KURD

نوێنەرایەتی عەرەب لەسەرو قەبارەی دانیشتوانەوەن و لەگەڵ ئەوەشدا زۆرێك لەپۆستە ئیداریە باڵاکانیان لەدەستدایە. دیسان پرسێکی تریش هەیە، کە ئەویش ئەوەیە چۆن پۆستە باڵاکان لەپۆستە مامناوەندەکان و ئەم پۆستانەش لەوەزیفە ئیدارە گشتییەکان جیادەکرێنەوە.

ئەمانە زاراوەی تەکنیکی نین و بەرەی تورکمانییش دیارییان ناکات، جا بۆ ئەوەی مەسەلەکان وەك خۆیان باس بکرێن بەرەی تورکمانی ئاماژە بەیەك پۆستی باڵا دەکات بەڵام لەهەمان کاتیشدا تورکمانەکان پۆستی فەرماندەی پۆلیسی کەرکوك و بەڕێوبەرەکانی فەرمانگەی ڕێگاوبان و نەخۆشخانەی کەرکوك و پەروەردەو پۆستەوگەیاندن و تۆڕی دابەشکردنی ئاوو فەرمانگەی ئامارو نەخشەسازی کشتوکاڵیان لەدەستدایەو جگە لەوەش لە کۆی (٩) بەڕێوەبەری لقی بانکە حکومییەکانی کەرکوك (٨) یان تورکمانن.

لەڕاستیدا ئەم داتایانەی بەرەی تورکمانی لەبری ئەوەی ئاماژە بە دوورخستنەوەی تورکمان و باڵادەستی کورد بکات لەپۆستە هەستیارەکانی کەرکووکدا، ئەوە پیشان دەدات کە دابەشکردنی وەزیفە ئیدارییەکان بەگشتی هاوڕێژەی قەبارەی دانیشتوانی پێکهاتە جیاوازەکانە.

بەگشتی پۆستە ئیدارییەکان بۆ هەریەك لەنوێنەرانی کوردو عەرەب بەبەراورد بە نوێنەرانی تورکمان زۆر کەمترە.

ئاسایشی ناوخۆ

ئەو بوارەی کە کورد توانیویەتی زیاد لەهەربوارێکی تر کۆنترۆڵی بکات و بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ئاسایشی ناوخۆیە بەجۆرێك کە زۆربەی ئەو ئەفسەرانەی لەدەزگاکانی بنەبڕکردنی تیرۆردا کاردەکەن کوردن.

جگە لەوەش تەشکیلاتی ئاسایش ناوخۆی سەر بەهەردو پارتە کوردییەکە بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەدەزگا ڕەسمییە ئەمنیەکانی دەوڵەت کاردەکەن بەڵام ئوز بۆچوونەی کە باوە سەبارەت بەوەی کورد دەستی بەسەر دەزگای ئاسایش ناوخۆدا گرتووە بۆچوونێکی ڕاست نییە، هەروەك لەم خشتەیەدا روونکراوەتەوە١.

---

١- لە" پێشێلکاریەکانی دژ بە تورکمان لەکەرکوك" وەرگیراوە ، ل ٣٦-٤٠.

PDF 4 KURD

خشتەی ١٢- ٣

دابەشکردنی ئیتنیکیی دەزگا ئەمنییەکانی کەرکووک

| ناسنامەی ئیتنیکی | پشکی دیاریکراو لەوەزارەتی ناوخۆ | پۆلیس | لێپرسراوانی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس | لێپرسراوانی پۆلیسی شار |
|---|---|---|---|---|
| کورد | ٤٠٪ | ٢٥٥٧ | ١٠(لەنێویاندا بەڕێوەری پۆلیس) | ٤ |
| عەرەب | ٢٩٪ | ٢٥٤٦(٣٨٪) | ٢ | ١ |
| تورکمان | ٢٩٪ | ١١٩٦(١٨٪) | ١(جێگری بەڕێوەبەری پۆلیس) | ٣(لەنێویاندا بەڕێوەبەری پۆلیس) |
| مەسیحی | ٢٪ | ٣٦٠(٥٪) | ١ | ١ |
| کۆی گشتی | | ٦٦٥٩ | ١٤ | ٩ |

هەریەك لەسوپای ئەمریکاو وەزارەتی ناوخۆی عیراق بەردەوام بوون لەجێبەجێکردنی سیستمی موحاسەسە لەپۆلیسی کەرکووکدا.

بەپێی بەراوردکاری ژمارەی ئەو پۆلیسانەی لەئێستادا کاردەکەن دەریدەخات کە ژمارەی کورد لەپشکی تەرخانکراوی خۆیان کەمترن و عەرەبیش زیاترو تورکمانیش لەپشکی خۆیان کەمترن. هەروەك بەرەی تورکمانیش دانیپێدادەنێت ئەو کەمییە لەژمارەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کێشانەی پەیوەستن بەکارکردنی تورکمان وەك پۆلیس و ئەفسەر لەریزەکانی پۆلیس نەك پەیوەست بێت بەسیاسەتی جیاکاری دژ بە تورکمان.

PDF 4 KURD

ئاشكراشه كورد زۆرینه‌ن له‌ناوه‌نده‌كانی فه‌رمانده‌یی پۆلیسی كه‌ركوك و له‌كۆی (١٤)پۆست له‌به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی پۆلیسی پارێزگای كه‌ركوك(١٠)پۆستیان له‌ده‌ستدایه، به‌لاٌم دابه‌شكردنی به‌رپرسیارێتی له‌سه‌ر ئاستی پارێزگاكه دابه‌شكردنێكی عادیلانه‌یه. له‌راستیدا نوێنه‌رایه‌تیكردنی توركمان له‌سه‌رو قه‌باره‌ی دانیشتوانه‌وه‌ن و ده‌توانن بلٌێن كه فه‌رمانده‌ی پۆلیسی شاره‌كه‌و جێگری پۆلیسی پارێزگاكه له‌ده‌ست نوێنه‌رانی ئه‌واندایه. به‌وجۆره به‌پێی هه‌لٌسه‌نگاندنێكی بابه‌تیانه بۆ پێكهاته‌ی پۆلیسی كه‌ركوك به‌و شێوه‌یه‌یه كه كورد ده‌ستیان گرتووه به‌سه‌ر ده‌زگاكانی بنه‌بڕكردنب جموجوٌلی بزوتنه‌وه چه‌كدارییه‌كان و بگره كورد نوێنه‌رایه‌تی زیادیشیان هه‌یه له پۆسته بالاٌكانی هێزه‌كانی پۆلیسدا به‌لاٌم به‌گشتی هێزه ئه‌منییه‌كان پارێزگاری له فره‌یی ئیتنیكی ریزه‌كانی خۆی كردووه‌و ئه‌وه‌ش ره‌نگدانه‌وه‌ی هاوڕێژه‌ی فره پێكهاته‌یی دانیشتوانی پارێزگاكه‌یه.

به‌پێی داتاكه‌ی سه‌ره‌وه بێت ئه‌و وێناكردنانه‌ی كه سه‌رانی به‌ره‌ی توركمانی و كوتله‌ی عه‌ره‌بی ره‌واجی پێده‌ده‌ن و له‌لای خۆرئاواییه‌كانیش به‌بێ وردبوونه‌وه‌یه‌كی ره‌خنه‌ییانه په‌سه‌ندكراوه سه‌باره‌ت به‌وه‌ی كورد هه‌ژموونی ره‌های ده‌سه‌لاٌتی له‌كه‌ركوكدا هه‌یه، وێناكردنێكی ته‌واو ناوردو نادروسته، چه‌نكه دابه‌شكردنی پۆسته سیاسی و ئیدارییه به‌رپرسه‌كان به‌سه‌ر پێكهاته ئیتنیكییه‌كاندا له‌راستیدا دابه‌شكردنێكی هاوڕێژه‌یه له‌گه‌لٌ پشكی هه‌رپێكهاته‌یه‌ك له‌ژماره‌ی دانیشتوان.

دیسان به‌گه‌ڕانه‌وه بۆ مۆدیله‌كانی دابه‌شكردنی ده‌سه‌لاٌت وه‌ك ئه‌وه‌ی له شێوه‌ی (١٢-١)دا هاتووه، ده‌كرێت هه‌رسێ حكومه‌ته‌كانی كه‌ركوك له‌دوای جه‌نگ به‌م شێوه‌به ریزبه‌ند بكرێن.

شێوه‌ی ١٢- ٤

دابه‌شكردنی ده‌سه‌لاٌت و ئیداره‌ی كه‌ركوك

| ئه‌نجوومه‌نی یه‌كه‌م | ئه‌نجوومه‌نی دووه‌م | ئه‌نجوومه‌نی هه‌لٌبژێردراو |
|---|---|---|
| ...........................................I | ...........................I | ..................................I |

حکومەتی یەکەم لەپاش جەنگ کەخۆی لەئەنجوومەنی شارەوانیدا دەبینێتەوە لە(٣٠)ئەندام پێکهـاتبوو، کـە لەلایــەن ویلایەتــە یــەکگرتوەکانی ئــەمریکاوە دیــاریکرابوون، ئــەویش لەسەربنەمای یەکسانی نێوان گشت پێکهاتەئیتنیکیـەکانی کـەرکوك، بـەڵام ئـەم شـێوەی دابەشکردنەی دەسەڵات شێوەیەکی دروست نەبوو، چونکە مافی ڤیتۆ نەدراوەتـە پێکهاتـەکان لەبەرامبەر بڕیاردانەکاندا.

هەروەها دامەزراندنی ٦ ئەندامی سەربەخۆ(٥ کـورد،١مەسـیحی)بووە هـۆی نایەکسـانی لەنوێنەرایەتیکردندا.

هاوکات ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەنجوومەنە نوێیەکەی فراوانکرد تـا ئەنـدامێتی ئەنجوومەنەکە هاوڕێژەی پێکهاتەی ئیتنیکی پارێزگاکە بێت. ئەوەش هـەنگاوێکی مەبەسـتدار بوو تا دابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی ڕێژەیی بێت.

دواجار ئەو ئەنجوومەنەی کە لـەکانوونی دووەمـی ٢٠٠٥ هەڵبـژێردرا، بـەپێی سیسـتمی نوێنەرایەتی ڕێژەیی دەسـتەیەکی تەشـریعی بـوو، کەبەشـێوەیەکی شـیاوو ورد ڕەنگدانـەوەی پێکهاتەی ئیتنیکی پارێزگاکە بوو.

خۆئەگـەر دەزگـای حـوکمڕانی ئێسـتاش لەگـەڵ دابەشـکردنی پۆسـتە ئیدارییـەکان بەدابەشکردنێکی ڕێژەیی وەربگیرێت ئەوا لەدابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی ڕێژەییەو نزیکترە وەك لەهەر مۆدیلێکی تری کە لەخشتەکەدا هاتووە.

بەپێی بەڵگەکانیش نوێنەرایەتی تورکمان بەبەراورد بەقەبارەیان زیاترن لە دامەزراوەکانـدا ئیتر ئەو هەموو پێداگرییەی سەرانی تورکمان و عەرەب بۆچییە کە دەوترێت کورد بەشێوەیەکی ناعادیلانە هەژموونی کەرکووکیان کردوە ؟.

## هەژموونی کوردی (ناڕەوایە)!

بەپێی ئەو ژمارانەی کە وەك پێوەرێك بۆ هەڵسـەنگاندنی ڕێـژەی نوێنەرایـەتی سیاسـی و ئیـداری پشـتیان پێبەسـتراوە، نـاکۆکی لەسـەرە. هەڵبـەت تـەرخانکردنی (٤٨٪)ی پۆسـتە ئیدارییەکانی پارێزگای کەرکوك بۆ کـورد پشـکێکی عادیلانـەو هاوڕێژەیـە لەگـەڵ قـەبارەی خۆیدا، ئەگەر هاتوو مرۆڤ بڕیاربدات کەکورد لە(٥٣٪)ی دانیشتوانی پارێزگاکە پێکدەهێنن.

بەهەمان شێوە لە(٢٨٪)ی پۆستە ئیدارییەکانی کەرکوك پشکێکی سەخییە بۆ تورکمـان ئەگەر مرۆڤ بڕیار لەوەبدات، کە تورکمان لە(٢٠%)ی دانیشتوانی پارێزگاکە پێکدەهێنن.



PDF 4 KURD

بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کە ژمارەکان پەسەند نین و سەرانی بەرەی تورکمانیی عیراقی پێداگری دەکەن لەسەر ئەوەی کە زۆرینە پێکدەهێنن، هەرچەندە سەرجەم بەڵگەکان پێچەوانەکەی پشتڕاست دەکەنەوە.

یەکەم، گشت بەڵگەکانی بەردەست تەواو پێچەوانەی ئەوەن و تەنانەت داتاکانی ئاماری ساڵی١٩٥٧ ئاماژە بە ڕێژەی ئەو کەسانە دەکات، کە بەتورکمانی دەدوێن کە کەمێك لە (٢١٪)ی دانیشتوانی پارێزگاکە زیاترن.

هەروەها لەهەڵبژاردنەکاندا کە ساڵی( ٢٠٠٣) وە دووجار ئەنجامدراون، بەرەی تورکمانی لەکانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٥ نزیکەی (١٨٪)ی دەنگەکان و لەهەڵبژاردنی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵیشدا لە(١١٪)ی دەنگەکانی بۆخۆی مسۆگەر کردووە.

بەپێی ڕاپرسییە زانستییەکانیش کە بەشێوەیەکی هەرەمەکی چەند سامپڵێکی لێوەرگیراون و ئاماژەن بۆ پێکهاتەی ئیتنیکی، ئەوا لەسەرتاسەری عیراقدا تورکمان ١- ٢٪ی دانیشتوان پێکدەهێنن. جا بۆ ئەوەی تورکمان لەکەرکووکدا زۆرینەپێکبهێنێت ئەوا پێویستە سەرجەم تورکمانەکان لەکەرکووکدا نیشتەجێبن.

گرفتی دووەمیش ئەوەیە کە بانگەشەی بەرەی تورکمانی پشت بە شار دەبەستێت وەك یەکەیەکی ئیداری نەك وەك پارێزگا.بەڵام تەنانەت لەسنووری شاریشدا داتاکان ئەوە دەرناخەن کە تورکمان زۆرینە پێکدەهێنن.

تەنانەت لەئاماری ١٩٥٧یشدا ئەوانەی کە بەتورکمانی دواون لە(٣٦٪)یان لەشارەکەدا پێکهێناوەو مەحاڵیشە لەودەمەوە تائێستا تورکمان بەبەراورد بەپێکهاتەکانی تر ڕێژەکەیان زیادیکردبێت.

بەڵام خاڵی گرنگتر ئەوەیە کە دابەشکردنی ئیتنیکی دانیشتوانی خودی شارەکە لەڕووی سیاسییەوە لەبنەڕەتدا هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەبابەتەکەوە نییە، چونکە هەڵبژاردنەکان لەسەربنەمای پارێزگاکان ڕێکدەخرێن بەو پێیەی یەکەیەکی ئیداری گونجاوە، لەکاتێکدا هەر ڕاپرسییەك جا بەپێی ماددەی(١١٩) یان (١٤٠) بێت ئەوا بەدڵنیاییەوە لەسەر ئاستی پارێزگاکە دەکرێت.

هاوکات لەسایەی نەبوونی داتای پێویست و ئاماری دانیشتواندا ناتوانرێت چارەسەری کۆتایی بۆ پرسی ناکۆکییەکانی پەیوەست بە پێکهاتەی دانیشتوانی کەرکووك هەبێت. هەربۆیە لەنەبوونی داتای پێویست باشتروایە کار بەو داتایانە بکرێت، کە لەبەردەستدان و بەو پێیەش

مەحاڵە بوترێت کە تورکمان زۆرینە پێکدەهێنن لەسەر ئاستی شارەکەدا. بگرە لەوەش مەحاڵتر ئەوەیە کە زۆرینە پێکبهێنن لەسەر ئاستی کۆی پارێزگاکەدا.

جا شرۆڤەی لەبار بۆ ئەو داتایانەی لەبەردەستدان ئەوەیە، کەکورد لەسەرتاسەری پارێزگای کەرکووک گەورەترین رێژەی دانیشتوان یان زۆرینەی رەهای بچووک پێکدەهێنن. بەڵام لەشارەکەدا ناتوانرێت شتێکی ئەوتۆ بوترێت.

بەهانەی دووەم، کەلەلای سەرانی بەرەی تورکمانی و کوتلەی عەرەبی جۆرێك لە لۆژیکی تێدایە دانپێدانانیانە بەوەی کە کورد گەورەترین رێژە/زۆرینە پێکدەهێنن، بەڵام ئەوەش لەرێگەی پڕکردنەوەی کەرکووك بەکورد(ناشەرعی)ی دەرەوەی کەرکووك.

بەپێی خەمڵاندنی عەرەب و تورکمان ژمارەی ئەو کوردانەی کە لەکەرکووکەوە راگوێزراون لەسنووری(١٢) هەزار خێزاندان١. هاوکات مامناوەندیی ژمارەی هەر خێزانێکیش شەش کەسەو کۆی سەرجەم ئەندامانی ئەو خێزانانەش دەگاتە (٧٠) هەزار کەس کەمافی گەڕانەوەیان هەیە.

دیارە ئەوەی گومانی تێدا نییە زیاتر لە (٧٠) هەزار کورد لەنیسانی (٢٠٠٣)وە بۆ کەرکووك گەڕاونەتەوەو ئەو ژمارەیەش کە لەسەرو (٧٠) هەزارەوەیە، ئەوە مەسەلەیەکەو دەکرێت لێی بڕوانرێت، بەڵام کاتی هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ نزیکەی ١٠٠ هەزار کوردی گەڕاوە مافی دەنگدانیان هەبوو، بەڵام بەڵگەنامەی پێویستیان نەبوو بۆ ئەوەی ناویان لەلیستی دەنگدەراندا تۆمار بکرێت.

بەپێی جیاوازی دەنگەکان کەلیستی کوردی لەماوەی هەڵبژاردنی کانوونی دووەم و کانوونی یەکەم بەدەستیان هێناوە، (٧٥) هەزار هاوڵاتی کوردی تری گەڕاوەش مافی دەنگدانیان هەبووە یاخود تۆمارکراون بۆ ئەوەی بۆ جاری یەکەم لەو ماوەیەدا دەنگ بدەن.

---

١- سەبارەت بەمەزەندەکردنەکانی عەرەب وتورکمان سەبارەت بەژمارەی ئەو کوردانەی لەلایەن رژێمی سەددام حسێنەوە راگوازراون جیاوازن بڕوانە:

Us-Kurdish rift emerges on Kirkuk refendum's timimg,"Turkish Daily News,27April2007.
www.turkishdailynews.com.tr/article.php?enewsid=70448;"Ethnic Tensions Mount in Kirkuk."WorldPress.org,17November 2006(www.worldpress.org/Mideast/2567.cfm),"Iraq and the Kurds:The Brewing Battle Over Kirkuk,"op.cit.p.10.



PDF 4 KURD

خۆ ئەگەر (١٧٥) هەزار کەس وەك ژمارەیەکی سەرەکی و پێوانەیی بۆ کورد وەربگرین کەمافی دەنگدانیان هەیە ئەوا تێکڕای ژمارەی کوردە گەڕاوەکان بە (٢٣٠- ٢٥٠) هەزار دەخەملێنرێت.

لەکاتێکدا بەدڵنیاییەوە بەڵگەی ئەوە لەبەردەستدایە کە سەرانی کورد گوشاری زۆریان لەسەر خەڵکی ڕەسەنی کەرکوك بەکارهێناوە بۆ ئەوەی بۆ پارێزگاکەیان بگەڕێنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەڵگەیەك لەئارادا نییە ئاماژە بێت بۆ هاوردەکردنی کورد لەجێگەکانی تری هەرێمی کوردستان و ولاتانی ترەوە بۆ کەرکوك.

مەسەلەی ژمارەی کوردانی گەڕاوە بۆ کەرکوك جێگەی مشتومڕەو بەرەی تورکمانی و سەرانی کوتلەی عەرەبیش هەریەکەیان خەملاندنی خۆیان بۆ ئەو ژمارەیە هەیە. بێگومان خەملاندنی سەرانی غەیرە کورد خەملاندنێکی تەواو نادروستەو هەرچی سەرچاوە خۆرئاواییەکانیشە لەنموونەی ڕێکخراوی هیومان رایتس ووچ، ژمارەی تەعریبکراوان کەزۆرینەیان کوردبوون بە نزیکەی (١٢٠) هەزار کەس مەزەندە دەکات، کەئەوانە بەتەنیا لەماوەی نێوان سالانی ١٩٩١ - ٢٠٠٠دووچاری تەعریب بوونەتەوە١.

هەڵبەت مافی گەڕانەوە ئەو کوردانەی نەگرتوەتەوە کە لەساڵی ١٩٦٨وە ڕاگوازراون، هەربۆیە ئەو گرێمانەیەی کەباس لەمافی گەڕانەوەی تەنیا (١٢٠) هەزار کورد دەکات بەپێی بەندەکانی ماددەی(١٤٠) بۆچوونێکی هەڵەیە چونکە ماددەی(١٤٠) بەشێکە لەو بەڵگەنامانەی کەزۆرینەی عیراقییەکان بەپێی ڕاپرسییەك پەسەندیان کردوەو بەو پێیەش گەڕانەوەی زیاتر لەو ژمارەیەی کە ئاماژە بەڕاگواستنیان کراوە مافی شەرعی خۆیانە جا ئەوە ئەگەر بەلای بەرەی تورکمانیی عیراقی و سەرانی کوتلەی عەرەبییەوە بەناسەرعی دابنرێت ئەوا لەلایەن حکومەتی عیراقییەوە شەرعیەتی داوە بەوەی بەشداری هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەم بکەن و جاری دووەمیش لەکانوونی یەکەمی ٢٠٠٥دا بەشداری دەنگدان بکەن. بەلام ئەو بەهانەیە تەنیا تیشك دەخاتە سەر بوونی ناکۆکی قوڵی دیدەکان لەبارەی کەرکوکەوە.

کورد لای خۆیەوە بەشێوەیەکی ڕاشکاوانەو هۆشیارانە پەنای بۆ وەسیلە یاسایی و دەستوورییەکان بردووە بۆ نەهێشتنی ئاسەواری تەعریب و ڕێگەدان بە خەڵکی کەرکوك بۆ

---

١- ڕێکخراوی چاودێریکردنی مافەکانی مرۆڤ.

www.hrw.org/reports/2003/iraq0303/Kirkuk0303.pdf.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دەنگدان لەسەر گەڕانەوەی بۆ پارێزگاکەیان بۆ سەر هەرێمی کوردستان یاخود مانەوەی کەرکووك لەدەرەوەی هەرێم.

لەم روانگەیەشەوە شەرعیەتی پرۆسەکە بۆخۆی رەوایەتی دەبەخشێتە ئەنجامی دەنگدان. بەڵام لەدیدگای تورکمان و عەرەبەوە هەر پرۆسەیەك ببێتە هۆی چوونی کەرکووك بۆ پاڵ هەرێم پرۆسەیەکی ستەمکارانەو ناڕەوایە.

لەوچوارچێویەدا ئاستەمە کورد ئەوە بسەلمێنێت، کە کوردە گەڕاوەکان گەڕاوەی شەرعین و سەرئەنجامی ئەوەش هەر زۆرینەیەك کە کوردبەیارمەتی گەڕاوەکان بەدەستی بهێنێت ئەوا لەلایەن نەیارانیانەوە رەتدەکرێتەوە ئەویش بەو پێیەی زۆرینەیەکی ناشەرعین و ئەوەش هاوشێوەی دابەشکردنی پۆستە سیاسییەکانە کە بەشێوەیەکی رێژەیی لەسەر بنەمای ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دابەشکراون.

ئەم گرفتە لەپرسی دیمۆگرافیایی قوڵترە، بەجۆرێك دەکرێت ئاماری دانیشتوان لەکەرکووکدا هێزی رێژەی ژمارەیی هەر پێکهاتەیەکی دانیشتوان دیاری بکات، بەڵام ناتوانێت چارەسەری مەسەلەی رەوایەتی (شەرعیەت) بکات. لێرەوە گرفتی سەرەکی لەدابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی ریژەیی لەکەرکووکدا بەرجەستە دەبێت.لەرووی تیۆرییەوە دابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی هەڵوێستێکی میانگیریی شیاو لەنێوان دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی دەستبەردەکات، کە ئەوەش فۆرمێکی پەرگیرانە لەفۆرمەکانی پارێزگاریکردن لەکەمینەکان پێشکەش دەکات، بەڵام تائاستێکی زۆر بێ سوددەبێت. هەروەها باڵادەستی زۆرینەش کەشێکی ئەوتۆ ناهێنێتە ئاراوە بۆ پارێزگاریکردنی زامنکراو لەکەمینە، بەڵام جگە لەوەش دابەشکردنی دەسەڵات لەسەربنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی زۆر بە روونی "بە ئینسافترە"لەنێوان هەرچوار مۆدێلەکەی شێوەی (١٢- ٢)، چونکە هەرپێکهاتەیەك نوێنەرایەتی هاورێژەی خۆی لەگەڵ قەبارەی دانیشتواندا دەبێت.

بەڵام دادپەروەری چاوەڕوانکراو لەدابەشکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی مەرجدارە بەهەولۆێستی هەرپێکهاتەیەك لەپەسەندکردنی ئەو ئامارانەی کەدەسەڵاتەکان بەشێوەیەکی رێژەیی دابەش دەکەن، ئەویش بەو پێیەی ئەو ئامارانە راست و شەرعین.

ئەمەش ئەو حاڵەتە نییە کە لەکەرکووکدا هەیە، واتە تەنیا مۆدیل بۆ دابەشکردنی دەسەڵات کەپێدەچێت رەزامەندی عەرەب و تورکمان بەدەستبهێنێت دابەشکردنی دەسەڵاتە بەیەکسانی ئەویش بەوپێیەی بنەمایەکی شەرعییە.

PDF 4 KURD

خۆئەگەر دەسەڵات دابەشکرا لەنێوان پێکهاتەکان لەسەربنەمای تەواوی یەکسانی ئەوا ڕێژەی کورد لەدانیشتوان و شەرعیەتی بارودۆخی گەڕاوەکان بێ مانا دەبێت. بەوجۆرە هەردو سوودی سەرەکی لەدابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی بریتین لە یەکەم، پرسە هەستیارەکانی دیمۆگرافی لەهاوکێشەدا بێ واتا دەبن و دووەمیش، بەلای هەردو پێکهاتەی عەرەب و تورکمان (ڕەنگە مەسیحییەکانیش) ەکانی کەرکووکەوە پەسەند دەبێت.

لەراستیدا فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات کە بەرەی تورکمانی پێشنیازی کردووە لەدابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی لەنێوان پێکهاتەکانی کەرکووکدا (جگە لەمەسیحییەکان) بەپێی ئەم هاوکێشەیەیە ٣٢+٣٢+٣٢+٤.

هەرچەندە ئەم فۆرمە لەلای هیچ کام لەلایەنەکان وردەکارییەکانی ساغ نەبوەتەوە بەڵام ئامانج لێی تەنیا هەرجێبەجێکردنی نییە بەسەر پۆستە ئیدارییەکاندا بەڵکو جێبەجێکردنیشیەتی لەنوێنەرایەتیکردن لەنێوان هەردو دەستەی تەشریعی و جێبەجێکردنیشدا١.

دیارە دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی لەلای سەرانی بەرەی تورکمانی و کوتلەی عەرەبییەوە پەسەندە چونکە دەرفەت لەبەردەم هیچ لایەنێکدا ناهێڵێتەوە بۆ ئەوەی یەکلایەنە هەژموونی حکومەتی کەرکووك بکات، لەبەر ئەوە دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی لەبارترین سەرئەنجامە بۆ هەرپێکهاتەیەك. مەترسیدارترین کێشەش لەفۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی ئەوەیە کە کورد پێیوایە ئەوە فاکتەری هاندەرانەی تێدا نییە تا پەسەندی بکەن بێ ئەوەی لەبەرامبەردا شتێکیان پێشکەش بکرێت.

بەگشتی گرفتی دابەشکردنی دەسەڵات لەکەرکووك بریتییە لە نەبوونی ئەو دابەشکردنەو هەرچی هەڵوێستی بەرەی تورکمانی و کوتلەی عەرەبیشە تەئکیدکردنەوەیە لەوەی، کە کورد کەرکووکیان بەگەڕاوەی ناشەرعی پڕکردوەتەوە و ئەو ژمارە زۆرەشیان لەکۆنترۆڵکردنی پێگەکانی دەسەڵات لەکەرکووك بەکارهێناوە، بەڵام ئەوە ڕاست نییە کاتێك ئامارێکی دانیشتوان نەبێت، چونکە ناتوانرێت خەملاندن بۆ دابەشکردنی ئیتنیکی دانیشتوان بکرێت

---

١- ئەم پێشنیازە لەسەرەتادا پشتیوانی عەلی مەهدی لەبەرەی تورکمانی بەدەستهێناو دواتر بووە پێشنیازی بەرەو عەرەب بۆ دابەشکردنی دەسەڵات لەکەرکوك.

Turkmens propoes Making Iraq,s Kirkuk Federal Region,"Hewler Post(BBC Monitoring International Reports),28May,2006.

PDF 4 KURD

حەتە ئەوە نەبێت کە ناڕاستەوخۆ پەنادەبرێت بۆ ئەنجامی هەڵبژاردنەکان. بەڵام دیسان ئەوە شتێکی ناواقعی دووریشە کەدابەشکردنی پۆستە هەستیارەکان لەپارێزگاکەدا لەرێگەی ناسنامەی ئیتنیکییەوە بێت. بەواتایەکی تر بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی لەبەردەستدان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کەنوێنەرایەتی پێکهاتە ئیتنیکییەکان لەئیدارەدا نوێنەرایەتیەکی هاوڕێژەیە بەپشکی ژمارەیی لەدانیشتواندا.

بێگومان گرفتەکە لەوەدایە کە هێزی ژمارەیی کورد، کەپشکیان لەدەسەڵاتدا پشتی پێبەستووە، ئەو هێزەیە کە بەشێوەیەکی ناشەرعی بەدیهاتووە، جا لەگەڵ مانەوەی ئەو بارەشدا ئەوا بەرەی تورکمانی و سەرانی سیاسی عەرەب رازی نابن دەسەڵات لەسەر بنەمای دابەشکردنی نوێنەرایەتی رێژەیی وەك فۆرمێکی عادیلانە ئەنجام بدرێت.

بەڵام ئەمە روونادات تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کە کەرکوك لەچوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا بارودۆخێکی تایبەتی پێبدرێت.

بۆ تێگەیشتنیش لەهۆکەی باشتر وایە شیکارییەکی پوخت بۆ هەردو ئەو سەرئەنجامە مامناوەندە بکرێت کە لەخشتەی ٢(چارەکی ١و چارەکی ٤)دا خراونەتە روو.

### ئاماژەکانی سەرئەنجامی چارەکی ٤

سەرئەنجامی چارەکی ٤- کەرکوك کە خاوەنی بارودۆخێکی تایبەتە لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان، بەدوور لەفۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات لەنێو هەرچوار سەرئەنجامەکەی خشتەی(٢) لەجێبەجێکردندا ئاسانترە.

چونکە ماددەی(١١٩) لەدەستووری عیراقدا کە پاڵپشتە بەیاسای پێکهێنانی هەرێمەکان رێگە بە(پارێزگایەك یاخود پتر)دەدات راپرسی سازبکات لەسەر پێکهێنانی هەرێمێك ئەویش لەسەر داوای سێیەکی ئەندامانی ئەنجومەنی پارێزگا پەیوەندیدارەکان.

دوای ئەوەش بەرەزامەندی زۆرینەیەکی سادە لەراپرسیدا بەسە بۆ گۆڕینی بارودۆخی پارێزگاکە بۆ هەرێمێکی فیدراڵی.

خۆئەگەر کەرکوکیش بەو پێی هەرێمێکە پشتیوانی هەردوپارتە کوردییەکەی بەدەستهێنا ئەوا ئاستەمە بزانرێت کەچۆن ئەو دەستپێشخەرییە سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت، لەکاتێکدا لایەنگرانی (یەکێتی و پارتی) پشتیوانی لێدەکەن و کوردانی دەرەوەی ریزەکانی ئەو دوو

پارتەش گەرەکیانە کەرکووك لەدەرەوەی حکومەتی هەرێمی کوردستان بێت و لەوانەشە دیسان ئەوە پشتیوانی رێژەیەکی زۆری دەنگدەرانی عەرەب و تورکمان بەدەستبهێنێت.

هاوکات ماوەیەکی زۆرە سەرانی بەرەی تورکمانی و کوتلەی عەرەبی داوای ئەو سەرئەنجامە دەکەن —(بارودۆخێکی تایبەت)بۆ کەرکووك لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان.

پاشان گرفتی ئەم بژاردەیە گرفتێکی رێکاریی نییەو ئەو پرسیارەش کە لێرەدا دێتە ئاراوە ئەوەیە، چی وا لە( یەکێتی و پارتی) دەکات پشتیوانی لەچارەسەرێك بکەن، کەکەرکووك بەرەسمی و بەهەمیشەیی لەدەرەوەی هەرێم بێت؟.

دیارە دوو سیناریۆ هەن کە پێدەچێت سەرانی کورد بەناچاری پەنای بۆبەرن، یەکەمیان : وادەردەکەوێت کەرکووك بەئاراستەی سەرئەنجامی ٣ بچێت، ئەگەر چی ئەوە کارێکی مەحاڵ نییە کە لەرێگەی ئامرازە یاسایی و دەستوورییەکانەوە بەبێ رەزامەندی کورد روودەدات.

دووەمیان: کە ئەو سیناریۆیەیان زۆر نزیکترە، ئەگەر هاتوو چارەسەرکردنی پرسی کەرکووك بۆ کاتێکی نادیار دواخرا، ئەوا رەنگە حسابکردنەکانی سەرانی کورد بەرەو سەرئەنجامی چارەکی ٤ بچێت کە لەم بارودۆخەی ئێستا لەبارترە و بەو پێیەش کەرکووك وەك هەرێمێکی سەربەخۆ دەبێت و ئەویش لەبەر دوو هۆ، کە بەلای کوردەوە باشترە.

هۆی یەکەمیان ئەوەیە کە کورد پەیوەست نابێت بەهیچ جۆرە دەروەستبوونێکی ئەخلاقی یان دەستووری لەدابەشکردنی دەسەلات لەگەڵ پێکهاتەکانی تر.

چونکە دەستوور بەروونی ئاماژە بەجیاوازییە دیاریکراوەکانی نێوان دەسەڵاتی هەرێمەکان و پارێزگاکان ناکات و ئەوەش کە ماددەی(١٤٠) لە(تایبەتمەندێتی) ژمارداوونی لەسەر ئاستی حوکمڕانی دابەش دەکرێن.

بۆنموونە تەنیا ئاماژە بەدەسەڵاتە"هاوبەشەکانی نێوان دەسەڵاتی فیدراڵی و دەسەڵاتی هەرێمەکان کراوە". لەم سەروبەندەشدا پرانسیپی دابەشکردنی دەسەڵاتەکان بەپێی ماددەی (١١٥)، گشت ئەو دەسەڵاتانەی کە لە تایبەتمەندێتی حکومەتی فیدراڵیدا نین دەخرێنە ئەستۆی هەرێم یاخود ئەو پارێزگایانەی کە لەدەرەوەی هەرێمێکدا رێك نەخراون.

لەسەرو ئەوەشەوە لەحاڵەتی ململانێ لەگەڵ یاسای فیدراڵی لەسەر دەسەڵاتە هاوبەشەکان، ماددەکە بۆ خۆی ئەولەویەت دەداتە یاساکانی هەرێم و پارێزگاکان. لەبەرئەوە یاسای پارێزگا لەسەرو یاسای فیدراڵییەوەیە لەبوارەکانی تایبەتمەندی و پسپۆڕییە هاوبەشەکاندا، سەرباری

ەوەی کە پارێزگاکان بەندەکانی پەیوەست بەدەسەڵاتە هاوبەشەکانی ماددەی (١٤٠) نایانگرێتەوە.

هەرچی دەروازەی پێنجەمیشە لەدەستوور بەشی جیاوازو سەربەخۆی تایبەت بەهەرێم و پارێزگاکانی تێدایە، کە ئەوانەش بۆخۆیان هێندەی تر نائارامی دەخولقێنن.

بۆنموونە بەپێی ماددەی(١٢٠) هەرهەرێمێك بۆی هەیە دەستووری خۆی بنوسێت" کە ستراکچەری دەسەڵاتی هەرێم و ئەرك و میکانیزمی مومارەسەکردنی ئەو دەسەڵاتانەی دیاری دەکات" لەکاتێکدا ئەو مافانە نادرێنە پارێزگاکان.

هاوکات ماددەی(١٢١) ی کۆمەڵێ دەسەڵاتی جۆراوجۆری لەخۆگرتوە، هەندێکیان ئاماژە بەهەرێمەکان دەکەن، لەنێو ئەو دەسەڵاتانەشدا مافی "پشکی عادیلانە لەداهاتی بەدەستهاتووی فیدراڵی"(لەسێیەم)دا، هەروەها دەسەڵاتی دامەزراندنی نووسینگە لەباڵیۆزخانەو کونسوڵگەرییەکان(لەچوارەم)دا.

دیسان لەنێوان دەسەڵاتەکانی تریدا مافی دەسەڵاتی هەرێمەکان لە(هەموارکردنی جێبەجێکردنی یاسای فیدراڵی لەهەرێمدا) ئەویش لەبارێکدا ئەگەر هاتوو لێکدژی و ناکۆکی لەنێوان یاسای فیدراڵی و یاسای هەرێمدا هەبوو لەسەر پرسی دەستێوەرنەدان لەکاروبارە تایبەتمەندو پسپۆڕییەکان لەلایەن دەسەڵاتی فیدراڵییەوە.

ئەوەی کەبایەخی زیاترو یەکلاکەرەوەشی هەیە، ئەوەیە حکومەتی هەرێمیی"تایبەتمەندە بەهەموو ئەوەی کە ئیدارەی هەرێمەکە دەیخوازێت و پێویستی پێیەتی، بەتایبەتیش دروستکردن و ڕێکخستنی هێزی ئاسایش لەهەرێمدا لەوانەش پۆلیس و ئاسایش و زێرەڤانی (لە پێنجەم)دا.

هاکات ماددەی(١٢٢)دەسەڵاتی ئیداری و دارایی فراوان دەبەخشێتە ئەو پارێزگایانەی کە لەهەرێمێکدا ڕێکنەخراون، بەڵام وردەکارییەکانی ئەو دەسەڵاتانە پەیوەستن بە یاساوە.

وادیارە ماددەکە بۆخۆی بوارناداتە پارێزگاکان بۆ ئەوەی پشت بە دەستووری تایبەتی خۆیان ببەستن، چونکە بڕگەی(سێیەم) بەتایبەت ئاماژە بە "پارێزگاکان دەکات کە لەلایەن ئەنجوومەنی پارێزگاوە هەڵدەبژێردرێت" ئەویش بەو پێیەی سەرۆکی باڵای ڕاپەڕێنەرە لەپارێزگاکەدا".

لەکاتێکدا بڕگەی (چوارەم) دەسەڵات دەبەخشێتە حکومەتی فیدراڵی لەڕێکخستنی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاو پارێزگارو دەسەڵاتەکان بەپێی یاسا.

PDF 4 KURD

هەرچەندە لێکدانـەوە بـۆ دۆکیـومێنتی فـرە لێکـدژ هـیچ واتایـەکی نییـە بـەڵام چـەند دەسەڵاتێکی گرنگ دراونەتە پاڵ هەرێمەکان کەجێگەی گومان نـین و یاسـای هەرێمـەکانیش لەسەرو یاسای فیدراڵییەوەن لەمەسەلەی دەسەڵاتە هاوبەشەکانی نێوان حکومـەتی فیـدراڵی و هەرێمییدا، ئەویش بەپێی ماددەی(١١٥) یاخود سەرجەم بوارەکانی دەرەوەی پسـپۆڕییەکانی ژێر دەست حکومەتی فیدراڵی بەپێی ماددەی (١٢١)، بڕگەی(دووەم).

هاوکات دەستی هەرێمەکانی ئاواڵاکردوە بۆ نووسـینەوەی دەسـتوورەکانیان و دیـاریکردنی دامەزراوە سیاسییەکانی ناوخۆی دەسەڵاتەکانی پەیوەست بە هەریەك لەو دامەزراوانە، لەگەڵ گرتنە بـەری ڕێوشـوێنی تایبـەت بـە هەڵبـژاردنی حکومـەتی هـەرێمیی، چـونکە دەقێکـی دەستووری تر سەبارەت بەو مەسەلەیە لەئارادانییە(ماددەی ١٢٠).

دواجار حکومەتە هەرێمییەکان ڕێگەیان پێدراوە کۆنترۆڵی ئیدارەی گشـتی هەرێمـەکانیان بکـەن، تەنانەت ئەوەش کە پەیوەستیشە بە ئاسایشی ناوخۆوە بەڵام پەیوەنـدی نێـوان حکومـەتی فیـدراڵی و حکومەتی هەرێم لەپیشەسازی نەوت و گازدا پەیوەندییەکی تەواو پەنهان و ناڕۆشتنە.

هاوکات ئەو خوێندنەوەیەی کە زیاتر مەنتقییە بۆ ماددەی (١١٢) ئەوەیە، کە لەهـەردو ئاستی فیدراڵی و هەرێم و (پارێزگا)دا بەرپرسیارێتی ئیدارەی "کێڵگـەکانی ئێسـتا " دابـەش دەکەن و برەوی پێدەدەن و داهاتەکەشـی بـە شـێوەیەکی دادپەروەرانـە بـەجۆرێك کـە لەگـەڵ دابەشکردنی دانیشتواندا هاوڕێژە بێت دابەش دەکرێت.

هەروەها ئەو ماددەیە تەنیا بەدیاریکراوی و بەئەنقەست ئاماژە بـە (کێڵگـەکانی ئێسـتا) داوە، واتە ئیدارەی ئەو کێڵگانەی کە لەداهاتوودا دەدۆزرێنەوە و دابەشکردنی داهاتەکانی ئەو کێڵگانەش کە بەدەست دێن( بەپێی بنەمای دیاریکردنی ئەو دەسەڵاتانەیە، کە ماددەی(١١٥) لەخۆیگرتوە".

لێرەوە پەنهانی و نا ڕوونی دێتە ئـاراوە، چـونکە دیـار نییـە کـە ئـاخۆ مـاددەی(١١٢) دەسەڵاتە هاوبەشەکان بەپێی ئاستەکانی حوکمڕانی دیاری دەکات یان نا، لەبەر ئـەوەی دەقـی ئەو ماددەیە بەڕوونی ئامـاژەی بەدەسـەڵات و بەرپرسـیارێتیە هاوبەشـەکان کـردووە، بـەڵام لەچوارچێوەی تایبەتمەندی و پسپۆڕی هاوبەش کەماددەی (١١٤) لەخۆیگرتووە.

ئەو شێوازەی کە لەوانیتر لەبارترە بۆ لێکدانەوەی ئەم دەقە ئەوەیە کە یاسای نەوت و گازی هەرێم لەسەرو یاسای نەوت و گازی فیدراڵییەوەیە لەکاتی جێبەجێکردنی لەناوخۆی هەرێمـدا، لەبەرئەوە کاتێك پرۆژەی یاسای هایدرۆکاربۆنی فیدراڵی لەگەڵ یاسای نەوت و گازی حکومەتی

هەرێمی کوردستان سەبارەت بەئیدارەکردن و برەودان بە کیڵگەکانی ئێستای ناوخۆی هەرێم پێچەوانە دەبێت، ئەوا یاسای دووەم لەسەرو یاسای یەکەمەوە دەبێت.

سادەترین شێوەی شرۆڤەکردن بۆ ئەم بەندانەی پەیوەست بە نەوت و گاز ئەوەیە کە حکومەتی فیدراڵی هیچ رۆڵێکی نییە لەئیدارەکردنی کیڵگەکانی نەوت و گاز کە لەداهاتوودا دەدۆزرێنەوە یاخود لەدابەشکردنی وئەو داهاتانەی کە لەوکیڵگانەوە بەدەستدێن.

بەکورتی بەهەرێمکردنی کەرکووك وادەکات ببێتە خاوەنی ئۆتۆنۆمی کەهاوشانی ئەو ئۆتۆنۆمییە بێت کە هەرێمی کوردستان لەپەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەتی فیدراڵیدا هەیەتی.
بەڵام ئەگەر کەرکەوك وەك پارێزگایەکی رێکنەخراو لەدەرەوەی هەرێمدا بمێنێتەوە ئەوا ئەو ئۆتۆنۆمییەی کە لەبەرامبەر حکومەتی فیدراڵیدا دەیبێت لەراستیدا کەموکورت دەبێت، ئەگەر بێتوو بڕیارەکانی یاسای پارێزگاکان نەخرێنە واری جێبەجێکۆردنەوە لەدوای هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی داهاتووی پارێزگاکان.

دیسان بەپێی دەستوور پارێزگاکان نابنە خاوەنی ئەو دەسەڵاتە زۆر گرنگانەی کە لەلایەن هەرێمەکانەوە مومارەسە دەکرێن.

بۆنموونە هەرێمەکان بەرپرسیارێتی ئاسایشی ناوخۆی لەدەستدایە، بەڵام پارێزگاکان ئەو دەسەڵاتەیان نییەو ناشتوانن دەستووری تایبەتی خۆیان بنووسن، ئەمە جگە لەوەی ستراکچەری دامەزراوە سیاسییەکان و میکانیزمی هەڵبژاردن و رێو شوێنی دامەزراندن و دوورخستنەوە لەژێر رکێفی یاسای فیدراڵیدایە.

رەنگە ئەو بەهانەیە هەبێت کەگوایە پارێزگاکان خاوەنی هەمان دەسەڵاتی هەرێمەکانن لەبارەی نەوت و گازەوە بەڵام ئەمە بەهانەیەکی لاوازە کە بۆ بەرژەوەندی پارێزگاکان پێشنیازدەکرێت١ . چونکە دەستوور هێڵە گشتییەکانی بۆ شێوازی هەڵبژاردنی سەرۆکی دەسەڵاتی راپەڕاندنی لەپارێزگادا دیاریکردووە.

پارێزگا بەبڕیاری ئەنجوومەنی پارێزگا دیاری دەکرێت، لەکاتێکدا یاسا رێگە بە پارێزگا دەدات کۆمەڵێك دەسەڵاتی فراوانی لەبواری دامەزراندندا لەدەستدا بێت. بەڵام ئیدارەی خۆجێیەتی کە ئەو بەندانەی لەخۆگرتووە لەرێگەی ئەو بەندەی کە دەڵێت حکومەتی بەغدا

---

١- ئەوەش رەنگدانەوەی ناکۆکی نێوان دەقی ماددەی ١١٥ و ماددەی ١١٢یە کە مادەی یەکەمیان ئاماژە بە هەرێم و پارێزگاکان دەکات و ئەویتریشیان تەنیا ئاماژە بەهەرێمەکان دەکات.

دەسەڵاتی دوورخستنەوەی پارێزگارەکان و هەڵوەشاندنەوەی ئەنجوومەنی پارێزگارەکانی لەهەلومەرجێکی دیاریکراودا هەیە، زۆر لەبایەخیان کەمدەکاتەوە١.

ئەوەی کە دەمێنێتەوە ئەوەیە، کە چاوەڕوانبین و بزانین چۆن ئەو بەندانە بەپراکتیکی جێبەجێ دەکرێن- بۆنموونە، ئاخۆ حکومەتی فیدراڵی مومارەسەی دەسەڵاتەکانی خۆی دەکات لەدوورخستنەوەی پارێزگارەکان بۆ ئەوەی هەژموونی خۆی بەسەر ئیدارەی پارێزگاکاندا بسەپێنێت- بەڵام بەتێپەڕبوونی کات پارێزگاکان دەسەڵاتەکانیان لەبەردەم ناوەندا لاواز دەبن.

کاتێکیش کەرکوك بەهەرێم کرا ئەوا دەبێتە خاوەنی هاوپەیمانێکی بەهێز بەتایبەتیش هەرێمی کوردستان و ڕەنگە هەرێمێکی تری بەهێزیش لەباشوور کە تەوەرەکەی بەسرەیە، کەردوکیشیان پێکەوە بەرژەوەندی هاوبەشیان دەبێت، و واپێویست دەکات بەرگری لەدەسەڵاتەکانی هەرێمەکان بکەن لەبەرامبەر پێشێلکارییەکانی حکومەتی فیدراڵی.

هەرچی کەرکووکیشە بەو پێیەی پارێزگایەکە ئەوا لەچوارچێوەی قەوارەی نیمچە دەوڵەتدا sub- state entities دەهێڵرێتەوە، کە نابێتە خاوەنی جۆرە سەربەخۆییەکی ڕێژەیی بەدوور لە سەنتەرو بەتێپەڕبوونی کاتیش ئاستی جیاوازی نێوان ئۆتۆنۆمی هەرێمەکان و ئەوەی کە پارێزگاکان هەیانە ڕوو لەهەڵکشان دەکات.

هۆکاری دووەم، بەهەرێمکردنی کەرکوك هەنگاوێکە بەئاراستەیەکی لەبارتر بەبەراورد بەو بارودۆخەی کە ئێستا کەرکوکی تێدایەو کوردیش هیچ پابەندبوونێکی نییە لەدابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ پێکهاتەکانی تردا.

خۆئەگەر کورد ناچار بکرێت بەوەی قوربانی بدات بەدەرفەتی گەڕانەوەی "دڵ"ی کوردستان لەرێگەی راپرسییەکی میللییەوە سەرباری گەرەنتییە دەستوورییەکان کەماددەی(١٤٠) لەخۆیگرتوە، ئەوا بەدڵنیاییەوە هیچ پابەندبوونێکی ئەخلاقییان لەسەر نییە بۆ دابەشکردنی دەسەڵاتی حوکمڕانی لەکەرکووك. هەروەها لەدەستووردا شتێك نییە حکومەتی فیدراڵی کوردی پێناچاربکات بۆ ئەوەی دەسەڵات لەسەر ئاستی دابەش بکات، چونکە هەرێمەکان دەسەڵاتی دامەزراندنی دامەزراوە سیاسییەکانی خۆیان هەیە و سیستەکانی هەڵبژاردنیش پشت بەو دامەزراوانە دەبەستن.

---

1- Visser,R,.”The Law on the power of Governorates Not-So-Moderate Tendencies.” Historiae,February11,2008-11-21(www.historiae.org/governorates.asp).

PDF 4 KURD

پاشان لەگەڵ بوونی فرە لایەنە رکابەرەکان لەکەرکووکدا بەڵام لەرووی تەکنیکییەوە ناتوانرێت لەمپەڕ لەبەردەم کورددا دابنرێت بۆ ئەوەی سیستەمی یەك بازنەیی هەڵبژاردن جێبەجێ نەکات و بەکارهێنانی ئەو سیستەمەش دەسەڵاتی سیاسییان لەکەرکووکدا پتەودەکات.

دیسان ئامرازە ناڕاستەوخۆکان زۆر کەمن بۆ ئەوەی حکومەتی فیدراڵی پەنایان بۆ بەرێت و لەو رێگەیەشەوە گوشاری جددی بخاتە سەر هەرێمەکان.

لەئێستاشدا دەکرێت دەسەڵاتی حکومەتی فیدراڵی لەرێگەی ناچارکردنی ئابوورییەوە بەسەر داهاتی نەوتی هەرێمەکاندا زاڵ بکرێت بەڵام لەئاییندەدا دابەشکردنی داهاتەکان بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەبێت و بژاردەی ناچارکردنی بەزۆر لەبار نابێت١. لەبەر ئەوە دەشێت کورد بژاردەی دابەشکردنی دەسەڵات لەکەرکووکدا هەڵبژێرێت بەڵام دیسان دەکرێت ئەوەش نەکەن و شتێکی ئەوتۆش نییە کە ناچاریان بکات دەسەڵات دابەش بکەن.

کەوابوو ئەو مۆتیڤانە چین تاکورد دەسەڵات لەکەرکووکدا دابەش بکات؟

پاڵنەرو هاندان بۆ دابەشکردنی دەسەڵات لەرێگەی دوو مەسەلەی سەرەکییەوە کاریگەری دەبێت، یەکەم: ئەو مۆتیڤانە چین کە وا لە سەرکردە سیاسییەکان دەکات رازیبن بە فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات؟ دووەمیش ئەو مۆتیڤانە کامانەن، کەئەو سەرکردانە هەیانە بۆ ئەوەی والەفۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات بکەن ئەکتیڤ بێت لەبری تێکەڵبوون بە موزایەدەکردنی ئیتنیکی؟

هاوکات لەگەڵ پێشنیازکردنی ئەو دوو مەسەلەیە کە بەلای بانگهێشکارانی دابەشکردنی دەسەڵاتەوە گرنگی خۆیان هەیە وەك چارەسەرێك، ئەوا مەسەلەی یەکەمیان پەیوەندی تۆکمەی بە رەوشی ئێستاوە هەیە. هەڵبەت جگە لەبارە هەلاوێردکراوەکان نەبێت کە تیایدا سەرجەم پێکهاتە ئیتنیکییەکانی کۆمەڵگە/ئەوانەی لەقەبارەدا لەیەکترییەوە نزیکن، دابەشکردنی دەسەڵات پێویستی بەدەستبەردانی پێکهاتەیەك هەیە لەبەشێك لەو هێزەی هەیەتی بۆ پێکهاتەیەکی تر. کاتێکیش کە پێکهاتەیەك نەبێت بۆئەوەی زۆرینە پێکبهێنێت ئەوا پرسی هاندان ئەوەندە پێویست نابێت چونکە دەشێت مۆتیڤێکی زۆر هەبێت بۆ ئەوەی گەورەترین پێکهاتە بەدابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ پێکهاتەکانی تردا رازی بێت.

---

1- - www.forumfed.org/pubs/iraqConstitionalReviewENG.pdf.

گریمان کۆمەڵگەیەك لە٣ پێکهاتەی ئیتنیکی پێکهاتووە، بەجۆرێك پێکهاتەی(أ) لە٤٠٪ی دانیشتوان و هەردو پێکهاتەکەی(ب، ج) لە٣٠ی دانیشتوان پێکدەهێنن، ئەوا هیچ پێکهاتەیەك بۆی نییە زۆرینەی پێویست بۆحوکمڕانی کۆبکاتەوە.

هەروەها دەکرێت پێکهاتەی(أ) لەرێگەی هاوپەیمانێتی (ب) و(ج) ەوە لەدەنگداندا شکست بهێنێت، ئینجا بۆ خۆبەدوورگرتن لەو ئەگەرە ئەوا لای پێکهاتەی(أ) مۆتیڤێك هەیە بۆ رازی بوون بەدابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ دوو پێکهاتەکەی تردا.

بەڵام ئەگەر پێکهاتەی (أ) لە(٦٠٪) و هەردو پێکهاتەکەی دیکەش لە(٢٠٪)ی دانیشتوان پێکبهێنێت ئەوا پێکهاتەی(أ) لەتوانایدا دەبێت بەتەنیا و بەشێوەیەکی دیموکراسی حوکمڕانی بکات.

لەرەوشێکی لەو جۆرەشدا لەلای هەردو پێکهاتەی (ب)و(ج)کۆمەڵێك مۆتیڤی هاوبەش لەفۆرمێکدا هەن بۆ دابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ پێکهاتەی (أ). بەڵام بۆچی پێکهاتەی (أ)خۆبەخشانە دەستبەرداری دەسەڵاتی زۆرینە دەبێت بۆ چوونە نێو فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات لەگەڵ پێکهاتەکانی کەمینەدا؟ سەرجەم تیورە تایبەتەکانی پەیوەست بە دابەشکردنی دەسەڵات لەوەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەدا لەزۆرانبازییەکی سەختدان، هەروەك بەدەربڕینی هۆروفیتز ئەو تیورانە (پەیوەستن بە ئاستی مۆتیڤەکان)١. بەڵام وە نەبێت چارەسەری دامەزراوەییش لای هۆروفیتز بۆ بەرێوەبردنی کۆمەڵگە فرە ئیتنیکییەکان باشتر بێت.

بۆیە سەرلەنوێ دارشتنەوەی سنووری یەکە ئیدارییە بچووکەکان لەسیستمی فیدرالیدا بۆ برەودان بە پێکەوە ژیانی نێوان پێکهاتەکان و بەکارهێنانی ئەو سیستمانەی هەڵبژاردن کە دەنگەکان لەلیستە سەربەخۆکاندا وەك دەنگە بەدیلەکان کۆدەکاتەوە، رەفتای سەرکردە ئیتنیکییەکان هێورد ئارام دەکاتەوە. بەڵام چارەسەری ئەو پرسیارە ناکات، کە دەپرسێت بۆچی پێکهاتەیەکی ئیتنیکی لەسەر ئەو رێو شوێنانە رازی دەبێت٢. لەنەبوونی پاریزانێکی دەرەکی کە ئەو توانایەی هەبێت دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر پێکهاتەی زۆرینەدا بسەپێنێت ئەوا ئاسۆی دابەشکردنی دەسەڵات لەسیاقی زۆرینە/کەمینەدا ئاسۆیەکی روون نییە.

---

1 - Horowitz,D.L.,"Constitutional Design: Proposals Versus Processes," in reynolods,A.,(ed).The Architecture of democracy ,Oxford: Oxford University Pess,2002,p.20.

2 -Horowitz,D.L.,"Constitutional Design: Proposals Versus Processes," in reynolods,A.,(ed).The Architecture of democracy ,Oxford: Oxford University Pess,2002,p.20.



PDF 4 KURD

(ئارند لیپهارت) ئەندازیاری ئەو دیموکراسیەی کە لەسەربنەمای زامنکردنی نوێنەرایەتی و دابەشکردنی دەسەڵات راوەستاوە، ئەوکێشەیە دوورە پەرێز دەگرێت و پەنا بۆ بەدیلی تر دەبات، بەڵام وەنبێت ئەو بەدیلانەش بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخی زۆرینە/کەمینە باشتربن.

جگە لەوەش لیپهارت دان بەوەدا دەنێت کە پرسی زۆرینە/کەمینە، کێشە دەخولقێنێت. هەروەها"بالانسی هێزی فرەلایەن لەنێوان کەلتوورە بچووکەکان لەبری بالانسی دووانە هێز یاخود هەژموونی کەلتووری بچووك کە هەژمونێکی ئاشکرایە، هەلومەرجێکی لەبارتر بۆ چەسپاندنی فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات پێشکەش دەکات١.

هەرچی (بردان ئۆلێری) یشە، کە بانگهێشتکارێکی دیموکراسییە شرۆڤەیەکی باوەڕپێهێنەرانەتر پێشکەش دەکات، سەبارەت بەو هۆکارانەی کە وا لە پێکهاتەیەکی زۆرینە دەکات لەگەڵ پێکهاتەی کەمینەدا دەسەڵات دابەش بکەن.

لەباشترین هەلومەرجیشدا ئۆلێری بەدانانی (مەرجێکی بەشەکی ) لەسەر هەڵسەنگاندنەکانی لیپهارت ئیکتیفا دەکات کە رەشبینە بەئەگەری جێبەجێکردنی ئەو دیموکراسییەی کە لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات و لەگەڵ بوونی پێکهاتەیەکی زۆرینە راوەستاوە٢.

لەدیدی ئۆلێرییەوە ئەو هەلومەرجەی کەدەکرێت لەلای (پێکهاتەی بالادەست) هاندەربێت بۆ دابەشکردنی دەسەڵات برتییە لە: کاتێك لەدەست کەمینەدا سەرچاوەو توانا هەبێت بۆ ئیبتیزاز کردن و تێکڕای گەشەی دانیشتوانیشی لەنێو پێکهاتەکاندا بەرچاو بێت، بەجۆرێك زۆرینە لەماوەکانی داهاتوودا لە بەردەم هەڕەشەی لەدەستدانی پێگەی زۆرینەدا بێت و لەهەمان کاتیشدا پێکهاتەی زۆرینە هەست بەوە بکات لەرووی ئەخلاقیینەوە قەرەبووی کەمینە بکاتەوە لەپای ئەو ستەم زوڵمەی کە لەرابردوودا دەرهەقی کراوە٣.

---

١ - Horowitz, D.,Ethnic Group in Conflict ,Berkeley:University of Californina press,1985.

نیجیریا مۆدیلێکی کلاسیکییە کەسوودی وەرگرتوە لە دامەزراوەکانی (فیدراڵی هەرێمیی و سیستمی هەڵبژاردن کە پشتی بە تێکڕای دەنگ بەستووە).

2 - O’Leary,B.,”Debating consociational politics: normative and explanatory arguments,” in Neoil,S., From power sgarung to democracy: post-conflict institutions in ethnically divided societies, Montreal;Ithaca:McGill-Queen’s University press,2005,p.NEED.

٣ - هەمان سەرچاوە، ل٢٢.



PDF 4 KURD

بەڵام هەردو تەفسیری دووەم و سێیەم هیچ پەیوەندییان بە پرسی کەرکووکەوە نییـە و ئـەو پێکهاتەیەش کە زۆرینە پێکدەهێنێ و تێکڕای لەدایکبوون تیایدا بەبەراورد بەپێکهاتەکانی تر بەرزترە کوردە، کە لەرووی مێژوویشەوە لەکەرکووکدا قوربانی بووە. تەفسیری یەکەم پەیوەندی بەکەرکووکەوە هەیە بەڵام مەحاڵە پاڵنەرێکی بەس بێت بـۆ ئـەوەی کـورد رازی بێـت لەسـەر دابەشکردنی دەسەڵات وەك ئەوەی عەرەب و تورکمان داوای دەکەن.

بەبۆچوونی ئۆلێری رەنگە لەلای پێکهاتەی کەمینـە "هێزێکـی دانوسـتانکارانەی بـەهێز هـەبێت" بەتایبـەتیش ئەوکاتـەی لەلایـەن (هاوشوناسـی ئیتنیکـی و هاوزمـان)ی لـەهێزە گەورەوهاوسێکانی پشتیوانی لێدەکرێت یاخود کاتێك "کەمینەیەك لەرووی زیندە ئابوورییەوە" لەئاستێکی بـاڵای سـەرمایەداری و مرۆیدایـەو خـاوەنی ئـەو ئامرازانەشـە کـە زەمینـە بـۆ کۆچکردنی خۆشدەکات١.

هەرچەندە لەوانەیە لەئایندەیەکی نزیکدا کۆچی بەکۆمەڵی خاوەن تواناو کارامەکانی بواری ئیـداری و پرۆفیشـناڵەکانی عـەرەب و تورکمـان لەکەرکووکـدا گرفـت دروسـت بکـەن، بەتایبەتیش ئەوانەی نێو ئەو دامەزراوانەی کە ئەو دوو پێکهاتەیە تیایدا باڵادەستن، لەنموونەی بەڕێوبەرایەتی پەروەردەو کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی. لەگەڵ ئەوەشـدا هەرچـەندە ئـەزموونی بەڕێوەبردن و حوکمڕانی لەهـەرێمی کوردسـتاندا ئـەزمونێکی لەسـەرو(١٥) سـاڵەوەیە بـەڵام کادێری بەئەزموونی ئەوتۆی هەیە کەدەتوانێت کەموکورتیەکان پڕبکاتەوە.

لەوەشگرنگتر کۆچی زۆری عەرەب و تورکمان وادەکات کەرکووك کوردی تر بێت، لەبەرئەو هۆیە بەدوور دەزانرێت کۆچی لەو جۆرە رووبدات، خۆئەگەر رووشبدات ئەوا لای زۆربەی کورد جێگەی پێشوازی دەبێت.

لەرووی پشـتیوانی دەرەکـی بەهێزیشـەوە هەریـەك لـە تورکیـاو دەوڵـەتی عیراقـی عـەرەبی دوو سەرچاوەن بۆ بەکارهێنانی گوشار بۆ سەرکورد بۆ ئەوەی رازیبن بەدابەشکردنی دەسـەڵات بەشـێوەیەکی یەکسان. بەڵام روون نییە، کە ئاخۆ لەلای ئەو یاریزانە دەرەکیانە زیندەبەرژەوەنـدی هەیـە لەوشـێوازی حوکمڕانیەی کەرکوك و چ کارێك بکرێت بۆئەوەی کاریگەری لەسەر بارودۆخەکـە هـەبێت٢. هاوکـات

١ – هەمان سەرچاوە،ل٢١.

٢– لەروانگەی پراگماتی پەتییەوە تورکمان دەیەوێت کەرکوك لەدەرەوەی هەرێمی کوردستان بێـت. هـەروەها گرانیشە لەوە تێبگەیت کە بۆچی تورك و عەرەب داوا دەکـەن دەسـەڵات لەگـەڵ هاوڕەگەزەکـەیان لەکـەرکوك دابەش بکرێت، لەکاتێکدا ئەو داوایە گەورەترە لەوەی کە کوردی عیراقیش مافی ئەوەی هەبێت بەهەمان شێوە

لەدەل نەبوونی هیچ جۆرە پاڵنەرێك لەلای كورد بۆ دابەشكردنی دەسەڵات لەكەركووكدا، كورد دوو هاندەری بەهێز هەیە كەوادەكەن دەسەڵات دابەش نەكەن.

یەكەم، لەلای كورد پاساوێك بۆ ئەو هەستەیان هەیە كە پێیان وایە دەرفەتی گەڕانەوەی كەركووكیان لەرێگەی فریودان و هەڵخەڵەتاندنەوە لەدەستداوە. كاتێكیش دوای ئەوەی كورد ماددەی(١٤٠)ی لەدەستووردا و لەرێگەی راپرسییەكی ئازادو خاوێن و بە بڕیاری زۆرینەی عیراقییەكان چەسپاند، ئیتر كورد لەوبڕوایەدا بوون هیچ نەبێت لانی كەم بەمافی خۆیان زانیوە، پێشنیازی ئەو پرسە لەدەنگداندا پشتیوانی بۆ بەدەست بهێنن. بەڵام ئەگەر كورد لەوە بێ بەش بكرێت ئەوا هیچ هۆیەك نییە بۆئەوەی دەسەڵات لەگەڵ پێكهاتەكانی تردا دابەش بكەن كە زۆر سەر سەختانە رێگربوون لەجێبەجێكردنی ماددەی (١٤٠).

دووەم، تەنیا شێوەی دابەشكردنی دەسەڵات كە پێدەچێت لەلایەن پێكهاتەكانی كەركووكەوە پەسەند بێت بریتییە لە پرۆژەكەی بەرەی توركمانییە، كە تیایدا وەك بەدیلێك پێشنیازیكردوە دەسەڵات لەسەر بنەمای(٣٢+٣٢+٣٢) لەنێوان هەرسێ پێكهاتە سەرەكییەكەی كەركووكدا دابەش بكرێت، لەگەڵ پێدانی رێژەی تەنیا ٤٪ بۆ مەسیحییەكان. لەبەر ئەوە واچاوەڕوان دەكرێت كورد واز لەوە بهێنێت كەركووك بچێتە پاڵ هەرێمی كوردستان و لەهەمان كاتیشدا دەسەڵات بەشێوەیەكی یەكسان دابەش بكات. رەنگە دابەشكردنی دەسەڵات لە بری بەدیلەكانی تر لە بارودۆخێكی دیاریكراودا لەبارتر بێت بەڵام بەڵنیاییەوە سیستمێكی دادپەروەرانە نییە، چونكە دابەشكردنی دەسەڵات تیایدا هیچ پەوەندی بەقەبارەی رێژەی پێكهاتە پەیوەندیدارەكانەوە نییەو یەكێكیشە لەو فۆرمانەی حوكمڕانی كە كەمتر كارایە.

خۆ ئەگەر كۆدەنگی نێوان پێكهاتەكان پێویستی بێت بۆ رزگاركردنی ژیانی سیاسی لەو بارودۆخەی كە ئێستا تیایدایە، ئەوا دەرئەنجامی چاوەڕوان كراو بریتی دەبێت لە چەقبەستن لەشوێنی خۆیدا.

بێگومان بەبێ دەروەستبوونێكی یاسایی یان دەستووریی یان ئەخلاقیی بۆ دابەشكردنی دەسەڵات لەگەڵ پێكهاتەكانی تر، كارێكی ناواقعیانەیە وا چاوەڕوانی ئەوە لەكورد بكرێت پەنا

---

داوا بكات لەئەنقەرە دەسەڵات لەگەڵ كوردی توركیا بەیەكسانی دابەش بكرێت یاخود داوا بكەن لەبەغدا دەسەڵاتیان بەیەكسانی لەگەڵدا دابەش بكەن.

بۆ فۆرمێکی دابەشکردنی دەسەڵات بەرێت و بەوەشهێزو نفوزی بەشێوەیەی بەرچاو سنووردرابکرێت. بۆیە کاری لەوجۆرە نائینسافی و بێکەڵکە. ئەوەی کە پتر گونجاوە ئەوەیە کورد لەمۆدێلی دابەشکردنی دەسەڵات لەسەربنەمای نوێنەرایەتی رێژەیی دووربکەوێتەوە بەرەو مۆدێلی باڵادەستی زۆرینەی هاوشێوەی خۆرئاوا یان ئەو مۆدێلەی کە لەئیسرائیلدا پەیڕەو دەکرێت و هەردوو مۆدێلەکەش دەسەڵاتی کورد تۆکمە و حوکمڕانییەکەی کاراتر و رێگری دەکەن لەوەی ئیدارەی کەرکوك ببێتە یەخسیری بایکۆتی بەردەوامی عەرەب و تورکمان کەزۆرجار بایکۆتکردنی هەڕەمەکیانەن.

کەوابوو سەرئەنجامی چارەکی ٤ بۆ داهاتووی کەرکوك چیدەگەیەنێت. پێدەچێت کورد بەبەراورد بەئێستا کۆنترۆڵی زیاتری سیاسی و ئیداری کەرکوك بکات و هێزی پێشمەرگەش کەرۆڵی گاردی نیشتمانی دەبینێت ئاسایش بۆ سەرلەبەری پارێزگای کەرکوك دابین دەکات، هەروەها لەدەزگا ئەمنییەکانی تریشدا کورد قەبارەی رێگە پێدراوی بوونی پێکهاتەکانی تر دیاریدەکات و بەپێی یاسا بەرپرسیارێتی سەرجەم بەڕێوەبرایەتییەکان بەتەواوەتی دەگرێتە دەست و کۆنترۆڵی سەرجەم پێگە هەستیارەکانی دەزگا ئیدارییەکانی کەرکوك دەکات، لەنێویشیدا کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی.

هەروەها کۆنترۆڵی بودجەی کەرکوك دەکات و بڕیاریش لەسەر ئەوە دەدەن کە کێ چەندو چۆن و کەی پشکی بەردەکەوێت. هەروەها لەسایەی دەسەڵاتی کورددا کەرکوك دەبێتە خاوەنی مافی ئۆتۆنۆمی لەبەرامبەر دەسەڵاتی ناوەند بەجۆرێك کەهاوشێوەی ئاستی ئۆتۆنۆمی هەرێمی کوردستان دەبێت، دەرئەنجامی ئەوەش یاسا دەرچووەکانی هەرێمی کەرکوك بەسەر یاساکانی فیدراڵی لەگشت بوارە دیاریکراوەکاندا باڵادەست دەبێت، ئەویش بەو پێیەی پشت بە ستووە بەماددەی(١٤٠) لەنێوان دەسەڵاتی هاوبەش لەوانەش تەندروستی گشتی و پەروەردە.

دواجار لەڕووی پراکتیکییەوە هەمان هاوپەیمانێتی حزبیی کە لەکوردستان حوکمڕانن، حوکمی کەرکوکیش دەکەن لەبەرئەوەی گشت ئەو سنوورە ئیداریانەی کەکەرکوك لەهەرێمی کوردستان جیادەکەنەوە هیچ واتایەکی نابێت و لەڕووی تەکنیکیشەوە دوو هەرێمی کوردی دروست دەبن، بەڵام ئەو جیاکارییە تەکنیکییە هیچ بایەخێکی عەمەلی ئەوتۆی نابێت و بەلای کوردیشەوە ئەو جیاکارییە تەنیا بایەخێکی رەمزی قوڵی دەبێت.

ئاماژەکانی سەرئەنجامی چارەکی ١

سەرئەنجامی چارەکی ١ — کەرکووك لەچوارچێوەی سنووری هەرێمی کوردستان لەگەڵ پێدانی بارودۆخێکی تایبەت لەئۆتۆنۆمی و فۆرمێکی نیزامیی بۆ دابەشکردنی دەسەڵات- لەکۆی بژاردەکانی تر کە پێشنیازکراون لەڕووی جێبەجێکردنەوە ئاڵۆزترە. چونکە پێویستی بە هەمووارکردنی دەستووری کوردی و ڕەنگە دەستووری عیراقیش هەبێت، بێگومان هەمووارکردنی دەستووری هەرێم شتێکی بەڵگەنەویستە چونکە لەدەقی ئێستایدا هیچ بەندێکی تێدانییە ڕێگە بە یەکەیەکی ئیداری بداتبێتە خاوەنی مافی ئۆتۆنۆمی خۆی لەپەیوەندی یە حکومەتی هەرێمی کوردستانەوە. بەڵام ئەوە ئەگەرێکی ئاسانە چونکە تائێستا دەستوور دەرنەچووەو لەوانەشە هەمووارکردنی دەستووری عیراقی پێویست نەکات. تەنیا پرۆسەیەك کە دەمێنێتەوەو دەکرێت بۆ زیندوکردنەوەی بەندەکانی ماددەی(١٤٠) پەنای بۆ ببرێت و دواجاریش ڕاپرسی لەسەر داهاتووی کەرکووك بکرێت. لەڕاستیدا لەئێستادا ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتوەکان سەرقاڵی پرۆسەی جێبەجێکردنی ٣ قۆناغە کە بەچارەسەری بارودۆخی ئاسانترین ناوچەی جێ لەسەرناکۆك دەستپێدەکات بۆ سەرخستنی چارەسەری پرسی کەرکووك.

بەڵام گرفتەکەی ئەم پرۆسەیە لەدیدی لایەنە نەیارەکانی ماددەی(١٤٠) ەوە دەستپێدەکات، واتە لەدەرەوەی چوارچێوەی دەستوورو بەوەش پرۆسەکە نارەوایانە دەبێت. لەبەرامبەر دژایەتی توندی لەم جۆرەش بەرامبەر بەکورد هەر ڕێککەوتنێکی کۆتاییبەشەرعی بکات، پرۆسەیەکی نارۆشن و سەرنەکەوتوو دەبێت. لەگرتنە بەری ڕێکارەکان بۆ هەمووارکردنی کاتیی و بەیاساکردنی هەر ڕێککەوتنێك سەبارەت بە کەرکووك لەدەستووری عیراقیدا ٣ بژاردەی لەبارو سەرەکی هەن کە تەنیا یەك سوودی گرنکیان بۆ کورد هەیە.

یەکەم: بەشەرعیکردنی هەر ڕێککەوتنێك کە بەدەقێکی دەستووریی پشتیوانی لێبکرێت ئەوا گومانی لێناکرێت١.

دووەم: هەر ڕێککەوتنێك پشت بەفۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات ببەستێ، ئەوا پێویستی بەگەرەنتی ئەوە هەیە کە ئەو ڕێککەوتنە لەداهاتوودا بەئاسانی هەڵنەوەشێتەوەو لەدەستووردا ڕیز بەند بکرێت.

هەروەها بەدەنگی زۆرینەی ڕەهاش نەبێت ئەوبەندە هەموارنەکرێتەوە ئەویش بۆئەوەی هەموو لایەك دڵنیابن لەوەی ئەو فۆرمە نەگۆڕە.

---

١ - بێگومان مرۆڤ لەتواناییدا هەبووە ڕەوەج بەهەمان بەهانە لەبارەی بەشەرعیبوونی ماددەی ١٤٠ەوە بدات.

سێیەم: هەوڵەکانی ئێستا بۆهەموارکردنی دەستوور لەرێگەی کاری لیژنەی چاوخشاندنەوە بە دەستووردا رێگە دەدات بەگەیشتن بە رێککەوتنێك کە بارودۆخی کەرکووك دەبەستێتەوە بەزمانێکی روون و دیاریکراو لەدەست بەسەرداگرتنی نەوت و گازی کەرکووك بێ ئەوەی گومان دروست ببێت١.

هەروەها دەکرێت نەیارانی کورد ئەوانەی ترسیان هەیە لەوەی، کە پێیان وایە تەنیا ئامانجی کۆنترۆڵکردنی کەرکووك بۆ دەست بەسەردا گرتنی نەوت و گازە لەرێگەی بەندە دەستوورییەکان دڵنیابکرێنەوە.

ئەم هەنگاوەش ئەو لایەنانە دەم کوت دەکات، کە ئەو ترسە بۆ دژایەتیکردنیکورد دۆقۆزنەوە و وەك بەهانەیەك بەکاری دەهێنن. هاوکات لەرێگەی بەستنەوەی پرسی کەرکووك بەهەموارکردنە دەستوورییەکانی ترەوە، کە هەندێکیان لەبەرژەوەندی عەرەبی سوننەو بەهێزکردنی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندە، وا دەکات رێککەوتن لەسەر پرسی کەرکووك ببێتە بەشێك لەو گورزەیەی کەدەکرێت پەسەند بکرێت.

دواجار کورد توانای پەکخستنی هەر رێوشوێنێکی کاتیی بۆ هەموارکردنی سەرلەبەری دەستوور هەیە ئەویش لەرێگەی بەکارهێنانی مافی ڤیتۆوە، کەئەوەش چەکێکە بە دەست کوردەوە بۆ گەمارۆدانی ئەوانەی لەهەوڵی دواخستنی چارەسەری پرسی کەرکووکدان.

وردەکارییەکانی هەموارکردنی دەستوور کەبەئامانجی چارەسەرکردنی پرسی کەرکووکە لە پرانسیپە گشتییەکانی، کە ئەمانەی خوارەوەن کەم بایەخترە.

یەکەم، کەرکووك لەچوارچێوەی سنووری بەر لەساڵی ١٩٦٨، لەرێگەی راپرسییەکەوە دانپێدانان بەدەستدەهێنێت لەسەرئەوەی کەدەکەوێتە سنووری هەرێمی رەسمی هەرێمی کوردستانەوە.

---

٢- لەنوێترین راپۆرتی لیژنەی هەموارکردنەوەی دەستووردا چەند هەموارکردنێك پێشنیازکراوە بەمەبەستی روونکردنەوەی پەیوەندیەکانی حکومەتی فیدراڵی و هەرێمی لەکەرتی نەوت وگازدا. گرنگترین ئەو هەموارکردنانەش پەیوەستن بەماددەکانی ١١٢،١١١لەدەقی ماددەی ١١٥کە گرنگی بە یاسای هەرێمەکان دەدات لەوناوچانەی کە پشت بەدابەشکردنی دەسەڵات دەبەستێت. لەگەڵ سڕینەوەی بڕگەی دووەم لە ماددەی ١٢١.

دووەم، کەرکووك دەبێتە خاوەنی ئاستی ئەو ئۆتۆنۆمییەی کەهەرێمی کوردستان لەبەرامبەر بەغدا هەیەتی. واتە کەرکووك دەبێتە خاوەنی دەستووری خۆی کەناکرێت یەکلایەنە هەموار بکرێت یاخود لەلایەن هەولێرو بەغداوە هەڵبوەشێتەوە. هەروەها دەزگا ئەمنییەکان دەزگا ئەمنییەکانیش دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە.

سێیەم، کەرکووك بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دەبێتە خاوەنی بودجەی راستەوخۆ لەحکومەتی عیراقی و بەشێکیش لەو بودجەیە بەسەر پێکهاتە جیاوازەکانیدا بەپێی قەبارەی رێژەی ئەو پێکهاتانە یاخود بەیەکسانی دابەش دەکرێت.

چوارەم، پۆستە ئیداری و بەرپرسیارێتی دەزگا ئەمنییەکان لەسەرگشت ئاستەکان بەیەکسانی لەنێوان پێکهاتەکاندا دابەش دەکرێت.

پێنجەم، هەرپێکهاتەیەك لەپرسە رەمزی و کەلتوورییەکانی وەك ئایین و خوێندن مافی خۆ بەرێوەبردنی پێدەدرێت.

دواجار داوای دەرکردنی یاسای گرنگ دەکرێت وەك میکانیزمێك بۆ دەستەبەرکردنی زۆرینەی رەهای ژمارە تارێگە بەکورد نەدرێت یاساکان لەدژی خواستی پێکهاتەکانی تر تێپەرێنێت.دیارە بۆ فەراهەمکردنی ئەوەش کۆمەڵێك رێگە هەن، لەوانەش دامەزراندنی ئەنجوومەنی جێبەجێکردن، کەنوێنەرانی سەرجەم پێکهاتەکان تیایدا بەشداری بکەن و هەرپێکهاتەیەکیش مافی ڤیتۆی هەبێت لەسەر بریارەکانی ئەنجوومەنەکە.

مەرجی زۆرینەی دوویەك بۆ بەکارهێنانی مافی ڤیتۆ لەسەر ئاستی جێبەجێکردن پێویستی بە هاوپەیمانێتی نێوان کوردو پێکهاتەیەکی تر دەبێت تایاساکان تێپەرێنێت. لەبەر ئەوە گرنگی پرانسیپە گشتییەکان لەوەدایە کەرکووك بەرەسمی بەشێك دەبێت لەهەرێمی کوردستان و دەبێتە خاوەنی ئۆتۆنۆمی لەئاستێکی بەرزدا.

هاوکات خۆ بەرێوەبردن و سەربەخۆیی بەپێی دەستوور دەبێت و دەسەڵات و سەرچاوەکانیش لەرێگەی تێکەڵەیەك دەبێت کە تیایدا دابەشکردن لەسەر بنەمای پرانسیپی یەکسانی کۆدەکاتەوە و دەرئەنجامی ئەوەش چارەنووسێکی تەواو تەوافوق و میانگیری دەبێت، کەمافی ئەوە بە کورد دەدات کەرکووك بەرەسمی بەشێك بێت لەهەرێمی کوردستان بەڵام لەرووی سیاسییەوە دەسەڵاتیان بەسەریدا نابێت بەو پێیەش کەرکووك نابێتە موڵکی هیچ پێکهاتەیەك.

دیارە ئەم بژاردەیەش بێ گرفت نییە بەڵام دەتوانرێت چارەسەرێك بۆ پرسێکی سەختی وەك پرسی کەرکووك دەستەبەر بکات و نەوتی کەرکووك لەهاوکێشەکە دووربخاتەوە و پرسەکانی



PDF 4 KURD

پەیوەست بەپێگەو جوگرافیای کەرکوك وهەروەها کێ چی دەست دەکەوێت و کەی و چۆن، یەکلایی دەکاتەوە.

جگە لەوەش پرسی پەیوەست بە ڕەوایەتی ئەو کوردانەی گەڕاونەتەوە لەگەڵ دابەشکردنی دەسەلات و سەرچاوەکان لەنێوان پێکهاتەکان لەسەر بنەمای یەکسانی پێشنیاز ناکرێن.

بەچارەسەرکردنی ئەو پرسانەش پەنجەرە لەسەر زۆربەی سەرچاوەکانی پەنگخواردنەوەی ئیتنیکی لەکەرکووك دادەخرێت.

بێگومان ئامانج لەم فەسلە پێشکەشکردنی ڕەچەتە نییە بۆ چارەسەر، دیسان مەرجیش نییە بەزەرورەت هیچ کام لەو سەرئەنجامانە لەیەکتری باشتر بن، هەروەها ئاسانیش نییە نۆرمی بابەتیانە دابنرێت بۆ ئەوەی ڕێگە بدات بەحوکمدان لەسەر ئیستیحقاقەکانیان. بەڵکو مەرامی سەرەکی ڕوونکردنەوەی دەستەواژەی مونازەرە و سنوورەکانیەتی. چونکە بارودۆخی کەرکووك پێویستە بەپێی تەوافوقی نێوان کوردو لایەنەکانی تر کە بەرژەوەندییان هەیە چارەسەر بکرێت، کەهەر ئەوەشە لەنێو گوتاری سەرجەم لایەنەکانی نێوان ململانێکە پەسەندبووە، لەنێویشیاندا بەرەی تورکمانی و تورکیاو کوردو زۆرینەی عەرەبیش.

هاوکات لەرێگەی چارەسەری مامناوەندەوە هەر لایەك شتێکی بەر دەکەوێت و بەتەنیا لایەنێك هەموو شتێك بۆخۆی قۆرخ ناکات، بەجۆرێك نەکورد دەتوانێت کەرکوك بخاتە سەرهەرێمی کوردستان و کۆنترۆڵی ئیدارەکەی بکات و نەبەرەی تورکمانیش دەتوانێت داوابکات، کەرکوك لەدەرەوەی هەرێم بمێنێتەوە و هەروەها داوای دابەشکردنی دەسەلاتیش بەیەکسانی بکات.

دیارە سەرئەنجامی هەردو چارەکی (٢، ٣) چارەسەری تەوافوقی و میانگیرانە نییە لەبەر ئەوە هیچ کامیان چارەسەری کێشەکانی کەرکووکیان پێ نییە.

تەنیا بژاردەی ڕاستەقینە، کە کورد ڕوو بەڕووی دەبێتەوە ئەوەیە، کە ئامادە دەبن قوربانی بە کۆنترۆڵکردنی دەسەلات و سەچاوەکان بدەن لەپێناو گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێم. هەرچی پێکهاتەکانی تریشە تەنیا بژاردەیان ئەوەیە، کە ئایا مانەوەی کەرکووك لەدەرەوەی هەرێم گرنگترە لە گەیشتن بەدابەشکردنی یەکسانی دەسەلات لەسەر بنەمای قەبارەی ڕێژەیی. پێویستە پێکهاتەکان بڕیاربدەن کە ئایا کەرکوك وەك ڕەمزێك گرنگترە یاخود وەك ئەوەی سەرچاوەی دەسەلات و سامانە؟.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## پوختە:

ئاستەمە بەشێوەیەکی بابەتیانە لەسەر کەرکوك بنووسرێت و مەحاڵیشە لەرووی پراکتیکییەوە وێنای ئەوە بکرێت، کە یەکێك هەبێت بەشێوەیەکی بابەتیانە لەسەر ئەو پرسە بنووسێت، چونکە ئارەزووی کوردو تورکمان و عەرەب هەرهەموویان بەوشێوەیەیە کەدیدو روانگەیان یاخود گێڕانەوەیان بریتی بێت لە شرۆڤەیەکی راستەقینە بۆ رووداوەکان.

هەروەها بەڵگە ئەزموونگەراییەکانیش کەپشت بەبانگەشەی ئەملایەن یان ئەولایەن دەبەستن چەندە باوەڕپێهێنەریش ئەوا بەردەوام رەتدەکرێتەوە، ئەویش بەو پێیەی پروپاگەندەی بەحزبی کراوە. بەڵام نەبوونی (راستییەکان)کە لەبارەی کەرکووکەوە هیچ ناکۆکییەکی لەسەر نییە پێویستە رێگر نەبێت لەبیرکردنەوەیەك کە پشت بەستوو بێت بەمەعریفە.

دیسان لۆژیکی دروست لەسەر ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان پێویستە رێگە بەکەسانی ژیرو تێڕاماو بدات لەسەر راستییەکانی پەیوەست بەکەرکوك رێکبکەون و هاوکاتیش هەندێك خورافە کە بەشێوەیەکی ئابڕوبەرانە گوتارەکە دەشێوێنن، لەباربەرن.

## نەوت:

هەندێك باوەڕی باو سەبارەت بەکەرکووك وایە کەبەپلەی یەکەم پرسی ململانێکە لەسەر نەوتە، هەربۆیە کورد گەرەکیانە دەست بەسەر کەرکووکدا بگرن، چونکە نەوتەکەی سەچاوەی پێوست بۆ دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ فەراهەم دەکات.

ئەوەش ئەو شتەیە کە عەرەب و تورکمان وەك سروشتی حاڵ رەتیدەکەنەوە، ئەمە لەرووکاردا میتۆدێکی گونجاوە لەمشتومڕکردندا، چونکە بوونی نەوت ئاراستەی زۆربەی پەرەسەندنە گرنگەکانی لەمێژووی نوێی کەرکووکدا دیاریکردووە.

بۆ تێگەیشتنیش لەیەکەم بڕیاری بەریتانیا سەبارەت بە تێکەڵکردنی ولایەتی موسڵ بە هەردو ولایەتی بەغداو بەسرە تادەگاتە هەوڵی بەربەریانەی هەڵکشاوی حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عەرەب بۆ زامنکردنی بوونی زۆرینەی عەرەب لەناوچەکەدا پەیوەندی بەنەوتەوە هەیەو لەوەش زیاتر بۆ تێگەیشتن لەو پرسە مێژوویەکی نوێی ئەو شارە لەئارادا نییە لەگەڵ ئەوەشدا ململانێی دوای ساڵی ٢٠٠٣ لەسەر کەرکوك هیچ پەیوەندییەکی بە نەوتەوە نییە. دەوترا کە کورد بەهۆی نەوتەوەیە گرنگی بە کەرکوك دەدات و ئەو بەهانەیەش رەواجێکی

زۆری لەنێو ئەو کەسانەدا پەیدا کردوە کە بەپسپۆڕی کاروباری عیراق هەژماردەکرێن، بەڵام گرفتی ئەم بەهانەیەش لەوەدایە کە گشت ئەو بەڵگانەی لەبەردەستدان پێچەوانەی ئەوەن. چونکە دەستووری عیراقی بەئاشکراو بەمەبەست جیاوازی کردوە لەنێوان کێڵگە نەوتیەکانی(ئێستا) و ئەوانەی لەداهاتوودا دەدۆزرێنەوە، لەوسۆنگەیەشەوە کێڵگەکانی کەرکووك لەو کێڵگانەی نەوتن کە لەکۆتایی بیستەکانی سەدەی رابردووەوە تا ئەمرۆ نەوت بەرهەم دەهێنن.

هاوکات دەستووریش مەرجی دابەشکردنی سەرجەم داهاتی کێڵگەکانی ئێستای بەشێوەیەکی دادپەروەرانەو هاورێژە لەگەڵ دابەشبوونی دانیشتوان لەسەرتاسەریس ولاتدا داناوە، ماددەی۱۱۲(یەکەم). هاوکات ئەو لایەنانەش دیاری دەکات کە دەسەڵاتی ئیدارەکردنی کێڵگەکانی ئێستایان هەیەو برەوی پێدەدەن.

هەڵبەت بەپێی ماددەی ۱۲۱(دووەم) ئەو دەسەڵاتەش لەچوارچێوەی دەسەڵاتەکانی حکومەتی فیدراڵیدا نین و ئەوەش وادەکات ئەو یاسایەی کە لەلایەن هەرێمەوە دەردەکرێت لەسەرو یاسای فیدراڵیەوە بێت. واتە هەرێمی کوردستان دەبێتە خاوەن بڕیار سەبارەت بەئیدارەی نەوتی کەرکووك گەرهاتوو بووە بەشێك لەهەرێمی کوردستان.

بەڵام کورد راهاتوون لەسەر ئەوەی تەئکید لەسەر نەهێشتن و لابردنی ئەو سەرچاوە پەنهان و نادیارانەی نێو دەستوور بکەنەوەو لەوەش زیاتر ئامادەن تەنانەت داهاتی ئەو کێڵگە نەوتیانەی کەهێشتا نەدۆزراونەتەوە پێشکەش بەحکومەتی فیدراڵی بکەن تا دابەشی بکات.

ئەوەی گومانیش لەوە دەکات باروداوەکانی راپۆرتی ئایاری ۲۰۰۷ بخوێنێتەوە، کە لەلایەن لیژنەی هەموارکردنەوەی دەستوورەوە ئامادەکراوە. هەروەها جەختکردنەوەش لەسەر هەمواری دەستوور بۆ نەهێشتنی هەر بڕگەو خاڵێکی نارۆشتن سەبارەت بە ئیدارەکردنی نەوتی کەرکووك و رازی بوونیش بەوەی حکومەتی فیدراڵی ئەرکی سەرلەنوێ دابەشکردنەوەی سەرجەم داهاتەکانی نەوت لەئەستۆبگرێت.

دیارە کورد شتێکی ئەوتۆی نەماوە کە بیسەلمێنێت نەوت مەبەست و هۆ نییە، بەڵکو دەکرێت نەوتی کەرکووك لە هاوکێشەکە بەئاسانی لاببرێت.

گەورە خەوشی دووەم لەم جۆرە مشتومڕەدا ئەوەیە کە کۆنترۆڵکردنی نەوتی کەرکووك پەیوەستە بەخواستی کورد بۆ بەدیهێنانی سەربەخۆیی و لەوەش زیاتر باس لەوە دەکرێت کە بەبێ نەوتی کەرکووك، کورد سەرچاوەیەکی ئابووری پێویستی لەبەردەستدا نابێت و دواجارێش

دەست بەسەرداگرتنی نەوتی کەرکووك پێویستیەکی گرنگە بۆ ئەگەری هەوڵی جوداخوازی کە ڕەنگە لەدوای ئەو دەست بەسەردا گرتنە بێتە ئاراوە.

کەوابوو لێکدانەوەی مەنتقی بۆ ئەو بەهانەیە ئەوەیە کە ڕێگەدان بەکورد بۆ ئەوەی کەرکووك بخاتەوە سەر هەرێمی کوردستان، زەمینەسازییە بۆ لەبەریەکهەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عیراقی، بەڵام ئەوەش بەهانەیەکی شیاو نییە چونکە لێدوانی سەرانی کورد ئاشکراو نەگۆڕن کە پرسی سەربەخۆبوونی کورد لەخشتەی کاری ئایندەی نزیکی ئەواندا بوونی نییە، هەرچەندە ئەو هەڵوێستەش پشتیوانی میلیی لێناکرێت بەڵام ەوە هەڵوێستێکی ڕاستگۆیانەیە.

ڕەنگە هەندێك بەگومانەوە لەو لێدوانانەی سەرانی کوردبڕوانن، کە بەگوێی جیهاندا دەیدەن و پێیان وابێت هەرکەرکووك گەڕایەوە سەرهەرێم ئیتر ژێر بەژێر پلانی جیابوونەوە دادەڕێژرێت.

لەراستیدا تاڵەبانی لەلایەن ڕاگەیاندنی کوردییەوە ڕوو بەڕووی ڕەخنەی زۆر بوەتەوە کە ئەولەویەت دەدات بەئاشتەوایی نێوان سوونەو شیعەو یەکێتی عیراق ئەویش لەسەر حساب و بەرژەوەندی کورد. لەرووی ئابووریشەوە کورد زیاتر پشت بەهاوسێکانی دەبەستێت بەتایبەتیش تورکیا لەدەستەبەرکردنی شمەکی پێویستی وەك خۆراك وئاوی کانزایی. بەهەمان شێوەش وەبەرهێنان لەکەرتەکانی گواستنەوەوگەشتیاری ئەوە دەرناخەن کە جیابوونەوە ئامانجێکی نزیك بێت. بەڵام بەهێزترین هۆکار کە پەیوەندی نێوان نەوتی کەرکووك و سەربەخۆیی کورد ناهێڵێت ئەوەیە، کە نەوت بۆ کوردستانی سەربەخۆ بێ سوودە، چونکە کورد توانای ناوخۆیی پاڵاوتنی نییەو بەکاربردنی نەوتی کەرکووکیش لەناوخۆدا نابێت.

دیسان ناکرێت نەوت هەناردە بکرێت بۆ بەدەستهێنانی داهات چونکە کەرکووك بەتەواوەتی پشت بە ژێژخانی نەوتیی دەبەستێت کە لەلایەن ئەوانیترەوە دەستیان بەسەردا گرتووە. جا بۆئەوەی نەوتی کەرکووك بەهایەکی هەبێت ئەوا لەداهاتوودا کوردستان پێویستی بە پشتیوانی هاوسێکانی هەیە یاخود هەیچ نەبێت دەبێ بێدەنگ بن.

جا لەبەرامبەر کۆنترۆڵکردنی چیایەك لەنەوتی بێ سووددا، کوردستانی سەربەخۆ دەستبەرداری پشکی زامنکراوی خۆی دەبێت کەدەچێتە نێو گەنجینەی حکومەتی عیراقییەوە. لەئێستادا داهاتی حکومەتی فیدراڵی نزیکەی(٩٠٪) بودجەی هەرێمی کوردستان دابین دەکات و ئەوەپارەیەش دەدرێتە موچەی فەرمانبەران و کارمەندانی کەرتەکانی دەوڵەت و کادێری حزبەکان و هێزی پێشمەرگە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بەگشتی نزیکەی لە(٦٠٪)ی هێزی کارگەری کورد راستەوخۆ پشت بـەداهاتی حکومـەتی فیدراڵی و بەو تۆڕە جاڵجاڵۆکەییە فراوانەی مەحسوبییەت دەبەستن کە پەیوەندی نێـوان هـەردو حزبەکەو دانیشتوانی کورد دیاری دەکات.

بەواتایەکی رۆشنتر کۆی سیستمی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری هەرێم لەداهاتوویـەکی نزیکدا هەرەس دەهێنێت گـەر بێتـوو تـەمویلی حکومـەتی فیـدراڵی رابگیرێـت. بۆیـە ئـەو بەهانەیەی کە نـەوتی کـەرکووك بەسـەربەخۆیی کـوردەوە دەبەسـتێتەوە لەگشـت روویەکـەوە بەهانەیەکی بێ بنەمایە بەڵام بەهانەیەکی بەسوودیشە بۆ نـەیارانی کـورد، چـونکە پێدەچـێت ئاسان بێت لەلایەن ئەوکەسانە رەواجی پێبدرێت، کەتەمبەڵی لایان گەیشتوەتە ئـەو ئاسـتەی لەبیرکردنەوەی خستوون١.

### دیمۆگرافیا:

لەبەر ئەوەی پرسی نەوت جـۆرە روونییـەکی پێـوە دیـاربووە ئـەوا مەسـەلەی پەیوەسـت بەدابەشکردنی دانیشتوانی کەرکووك شێواندن و پەنهانییەکی پێوەدیارە.

ئاشکراشە لەمشتومڕی فەسڵی دووەمدا روونبوەتەوە، کـەچ جـۆرە بەڵگەیـەکی دژ بەیـەك هەیـە بۆیـە ناکرێـت لـەو بـێ سـەروبەرییەدا حـوکم بـدرێت. بێگومـان بـۆ شـیکردنەوەی ئەزمونگەرایش تەنیا داتـای ئامـاری سـاڵی ١٩٥٧ لەبەردەسـتدایە، چـونکە ئـەو داتایانـە پێـوەرێکی بنـەڕەتی و بەسـوودن و تیایـدا دابەشـکردنی دانیشـتوانی کـەرکووك بەشـێوەیەك تۆمارکراون، کەهێشتا پرۆسەی تەعریبکردن نەگەیشتوەتە بـەرزترین ئاسـتی و رەوابوونیشـی نابێتە جێی تانەی هیچ کام لەپێکهاتەکانی کەرکووك. هەروەها داتاکـان ئامـاژە بەوەدەکـەن، کـەتورکمان لـە(٣٧٪)وکـوردیش لـە(٣٣٪) و عـەرەبیش(٢٢٪)ی دانیشـتوانی کـەرکووك پێکدەهێنن.

هاوکات تەنیا داتـاو زانیارییـەکی تـریش کـە بەشـێوەیەکی ورد نزیکبێـت لەپێکهاتـەی دانیشتوانی کەرکووکەوە ئەنجامی هەڵبژاردنە گشتییەکانی کانونی دووەمی سـاڵی (٢٠٠٥)ە،

---

١- ئاسانترین رێگە بۆ راستی و ناراستی ئـەو بەهانەیـە ئەوەیـە داوا لـەکورد بکرێـت واز لـە بەشـداریکردن لەئیداریەی نەوتی کەرکوك یان برەوپێدانی کێڵگە نەوتییەکان بهێنن لەچوارچێوەی رێککەوتننامەی گەڕانەوەی کەرکوك بۆ هەرێمی کوردستان.

جەندە گشت پێکهاتەسەرەکییەکان لەهەڵبژاردنەدا بەشدارییان کردووەو ڕێژەی بەشداریکردنیش بەرزبووە، ئەمە جگە لەوەی ژمارەیەکی زۆری چاودێری عیراقی و نێودەوڵەتی تیایدا بەشداربوون و تەئکیدیش لەوەکراوەتەوە کە لەو هەڵبژاردنەدا هیچ جۆرە ساختەکارییەکی گەورەوبەرچاو تۆمارنەکراوە. لەبەر ئەوە ئەنجامەکانی ئەو هەڵبژاردنە پێوەرێکی گرنگە بۆ هەڵسەنگاندنی بانگەشەی پێکهاتە ئیتنیکییەکانی کەرکوك، کەلەوهەڵبژاردنەدا لیستی کوردی لە(٥٣٪)ی دەنگەکانی بۆخۆی مسۆگەرکرد١. لەسایەی ئەو داتایانەی کە ئاماری (١٩٥٧) و ئەنجامی هەڵبژاردنی(٢٠٠٥) لەخۆیان گرتووە دەگەینە چ سەرنج و تێبینییەك؟

یەکەم، هەرگیز تورکمان لەپارێزگای کەرکووکدا زۆرینە نەبوون تەنانەت لەساڵی ١٩٥٧یشدا لەنێو شاری کەرکووکدا تەنیا گروپێکی گەورەتربوون و لەساڵی ٢٠٠٥یشدا لەنێو هەرسێ پێکهاتەکەدا لەسەرئاستی پارێزگاکە بەجیاوازییەکی بەرچاو بچووکترین پێکهاتە بوون.

هەروەها لەساڵی ١٩٥٧یشدا کورد لەشاری کەرکووکدا دووەم گەورە پێکهاتەبوون لەپاش تورکمان و لەسەر ئاستی پارێزگاکەشدا زۆرینە بوون. هەرچی عەرەبیشە کە لەساڵی ١٩٥٧دا لەسەر ئاستی پارێزگای کەرکووك دووەم گەورە پێکهاتە بوون لەساڵی ١٩٩١دا بوونەتە زۆرینە(بڕوانە فەسڵی دووەم).

بەڵام لەساڵی ٢٠٠٥دا ڕێژەی عەرەب لەدانیشتوانی پارێزگاکەدا گەیشتوەتە ئەو ئاستەی کە لەساڵی ١٩٥٧دا هەبوون، واتە لە(٢٨٪). ئەم سەرئەنجامەش دەمانگەیەنێتە سێ دەرئەنجام کەجێگەی گومان نین.

یەکەم، لەسایەی نەبوونی تەعریبدا تێکڕای لەدایکبوون لەنێو کورددا لەئاستێکی بەرزدابووەو ئەوەش وایکردووە ئەمڕۆ لەکەرکووکدا زۆرینە پێکبهێنن.

دووەم، ڕەنگە گەڕانەوەی سنووری کەرکووك بۆ بەر لەبەعس کورد بخاتە خانەی زۆرینە لەکەرکووکدا، چونکە زۆرینەی دانیشتوانی ناو قەزاو ناحیە دابڕێنراوەکانی کەرکووك زۆرینەیان کوردن.

---

١- لە٧٪ کەی تر لایەنەکانی تری وەك لیستی نیشتمانی عیراقییان هەڵبژاردووە کە ناسنامەکەی لەسەربنەمای ئیتنیکی دیاری نەکراوە.

PDF 4 KURD

سێیەم، ناکرێت وێنای زۆرینەبۆ تورکمان لەناوکەرکووك و لەسەرئاستی پارێزگاکەدا بکرێت، بەڵکو لەراستیدا تورکمان لەنێو هەرسێ پێکهاتە سەرەکییەکەدا بەجیاوازیەکی بەرچاو بچووکترین پێکهاتەن.

هەڵبەت ئەم سێ دەرئەنجامە ئەوە ناگەیەنێت کە هەرکاتێك کەرکووك گەرشایەوە سەر سنووری پێشووی خۆی ئەوا دەنگ بەچوونە پاڵ هەرێمی کوردستان دەدرێت، چونکە نازانرێت ژمارەی ئەو کوردانەی کەرکووك چەندن، کە گەرەکیان نییە شارەکەیان بچێتە سەر هەرێمی کوردستان. بەم شێوەیە ئاماژەی سەرەکی پەیوەستە بە پرسی دابەشکردنی دەسەڵات. ئاشکراشە کەرکووك لەسێ پێکهاتەی هاوقەبارە پێك نەهاتوون بەڵکو کورد گەورەترین پێکهاتەن و تورکمانیش بە جیاوازییەکی بەرچاو بچووکترین پێکهاتەن، بۆیە فۆرمی دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسانی، رەنگە لەڕووی سیاسییەوە گونجاوبێت بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەهیچ شێوەیەك فۆرمێکی دادپەروەرانە نییە. دیسان هۆکارێکیش نییە تا چاوەڕوانی لەکورد بکرێت لەسەر یەکسانی سیاسی لەگەڵ تورکمان رازیبن، ئەگەر بێتوو لەبەرامبەردا شتێکی گەورە پێشکەش نەکەن.

## دابەشکردنی دەسەڵات و "هەژموون"ی کوردی

پێدەچێت ئەو بۆچوونە باوەی کە لەئارادایە سەبارەت بە باڵادەستی هێزە سیاسییەکان لەکەرکووك و دەست بەسەرداگرتنی گشت پێگەو پۆستەکانی دەسەڵات لەلایەن کوردەوە لەدوای رووخانی رژێمی پێشوو لەگەڵ دوورخستنەوەی تورکمان و عەرەبیش لەبەشداریکردنیان لەدەسەڵات بۆچوونێکی هەڵە بێت و وا بخوازێت کە هەڵوەستەی لەسەربکرێت.

هەرچەندە ئەو ئەنجوومەنەپەراوێزخراوەی، کە ساڵی ٢٠٠٣ لەلایەن سوپای ئەمریکاوە بۆ بەرژەوەندی کورد دروستکرابوو لەکۆی (٣٠)ئەندام(٢٤)یان لەهەرچوار پێکهاتەکە ئیتنیکییەکانی کەرکووك هەڵبژێردرابوون و ئەوانیتریش (سەربەخۆ)بوون و سەر بەهیچ بزوتنەوەیەکی سیاسی نەبوون، کە (٥)یان کوردو ئەویتریشیان مەسیحی بوو.

بەوشێوەیە کورد تەنیا (١١)کورسی ئەنجوومەنەکەی لەکۆی(٣٠)کورسی لەدەستدابوو.دواتریش سەرۆکی شارەوانی کە کورد بوو بە(٢٠)دەنگ(١١کوردو ٧ مەسیحی و ١تورکمان و ١ عەرەب) بەرامبەر بە (١٠)دەنگ هەڵبژێردرا.

PDF 4 KURD

کاردانەوەی سەرانی سیاسی عەرەبی و تورکمانیش لەبەرامبەر هەڵبژاردنی کوردێك بۆ ئەو پۆستەو شکستی کاندیدەکانیان خۆی لەوەدا بینییەوە، کە گوایە پێشوەخت ئەنجامی دەنگدانەکە بۆ کورد یەکلایی کراوەتەوە چونکە ئەنجوومەنەکە لەلایەن ئەمریکاوە بە لایەنگرانی کورد پڕکراونەتەوە.

دواتر سەرانی بەرەی تورکمانی ئاماژەیان بەبوونی (٢٠) کورد لەنێو ئەنجوومەنەکەدا کرد ئەویش پاش نوێکردنەوەی ئەنجوومەنەکە، کە کوردیش وەك زۆرینە لەئەنجوومەنەکە مانەوە١. لەراستیدا ئەوانەی کە بەرەچەڵەك کورد بوون رۆژێك لەرۆژان زۆرینەی کورسییەکانی ئەنجوومەنەکەیان لەدەستدا نەبووە.

پاش بردنەوەی لیستی برایەتی کەرکووکیش بەرێژەی لە(٦٠٪)ی دەنگەکان لەهەڵبژاردنی پارێزگاکان لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا، ئەو لیستە لەکۆی (٤٠)کورسی توانی (٢٦)کورسی بۆخۆی مسۆگەر بکات، بەڵام لەگەڵ ئەو سەرکەوتنەش بەو قەبارەیەی کە بەدەستی هێنا هەرگیز راست نییە کۆنترۆڵکردنی کورد بە دەسبەسەرداگرتن و هەژموونگەرایی ناوببرێت.

یەکێك لەپۆستە هەستیارەکان (جێگری پارێزگار) بۆ ئۆپۆزسیۆن پێشنیازکرا بەڵام بەبەتاڵی مایەوە چونکە عەرەب و تورکمان لەنێوخۆیاندا رێك نەکەوتن لەسەر پڕکردنەوەی ئەو پۆستە.

تەنانەت لەبواری ئەمنیشدا دەوترێت کورد هەژموونی کردوە، هەرچەندە ئەوە راستە بەڵام ئەو هەژموونە رەها نییە چونکە هێزەکانی پۆلیس فرە ئیتنیکن. عەرەب لەو ناوچانەی کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی عەرەبن خۆیان بەرپرسی باری ئەمنی ناوچەکەیانن و تورکمانیش بەهەمان شێوەیە.

ئەوەی دەمێنێتەوە ئەوەیە کە ئاسایشی گشتی کەرکوك لەدەست سوپای ئەمریکادایە نەك هێزە کوردییەکان و بەهەمان شێوەش لەناوچەکانی کە عەرەب زۆرینە پێکدەهێنن لەنموونەی (حەویجە)کورد بوونی نییە.

تەنیا بوار کە کورد تیایدا باڵادەستە بنەبڕکردنی یاخیبوونی چەکدارییە ئەویش لەرێگەی ئەو رۆڵە بەرچاوەی کە لەنێو یەکە تایبەتەکان و هێزی ئاسایشی ناوخۆی هەردو حزبەکە هەیەتی.

---

١- بەبۆچوونی بەرەی تورکمانی هەرکەسێك پشتیوانی لەهەڵوێستی کورد بکات بەدەر لە رەگەزە ئیتنکییەکەی ئەوا دەچێتە خانەی کوردبوونەوەو لەوسۆنگەیەشەوە بەتەنیا ئەوانەی پشتیوانی لەهەڵوێستەکانی بەرەکەیان دەکەن تورکمانی راستەقینەن و بەو شێوەیەش سونگل چاپوك لەئەنجوومەنی حوکمڕانی و دوو تورکمانی تر کە لەسەر لیستی برایەتی کەرکوك بوون نوێنەرایەتی پێکهاتەی تورکمانی ناکەن.

PDF 4 KURD

بەڵام باڵادەستی کورد لەنێو هێزەکانی بنەبڕکردنی یاخیبوونە چەکدارییەکانیش باڵادەستبوونێکە کە ناکرێت فەرامۆش بکرێت ئەویش بەهۆی بوونی ئەزموون و توانای ئەو هێزانەو ڕێگریکردنیان لەدزە کردنی یاخیبووەکان بۆ نێو ریزەکانیان.

هاوکات پێناچێت بەدیلێکی باشتر لەبری ئەو هێزانە هەبێت هەربۆیە سوپای ئەمریکا بەتەواوەتی پشتیان پێدەبەستێت بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوچەکانی باکوور.

سەبارەت بە هاوسەنگی هێزەکانی کەرکوك دەگەینە چەند خاڵێك کەئەمانەن:

یەکەم، وەك ئاشکرایە کورد لەرێگەی هەردو حزبەکەوە بەشێوەیەکی گشتی پتر لەهەرپێکهاتەیەکی ئیتنیکی تر مومارەسەی دەسەڵات لەکەرکووکدا دەکەن.

دووەم، لەدوای هەڵبژاردنەکان وبەدەستهێنانی نزیکەی لە(٦٠٪)ی دەنگەکان لەلایەن کوردەوە رەنگە ئاستەم بێت بۆ تێگەیشتن لەوەی کە بۆچی کورد مافی نەبێت مومارەسەی دەسەڵاتی زیاتر بکەن بەبەراورد بەپێکهاتەکانی تر کە لە(٢٠٪)ی دەنگەکان یاخود کەمتریشیان بەدەستهێناوە.

سێیەم : بەپشت بەستن بە پێدراوەکانی بەرەی تورکمانی، دابەشکردنی پۆستەکان و پێگەکانی بەرپرسیارێتی لەئیدارەی کەرکووکدا رەنگدانەوەی دابەشکردنی دانیشتوانی پارێزگاکە پیشان دەدات.

بەکورتی دابەشکردنی دەسەڵات لەکەرکووك هاورێژەیە لەگەڵ قەبارەی دانیشتوان. ئەوەش کە عەرەب و تورکمان لەکەرکووك داوای دەکەن شێوەیەکی میانگیرانە نییە بۆ دابەشکردنی دەسەڵات کە تیایدا نوێنەرایەتی پێکهاتە ئیتنکییەکان هاورێژە بێت لەگەڵ فرە هێزەکاندا: بۆجارێکی تر ئەو پرسیارە گرنگە دێتەوە پێشەوە : بۆچی واچاوەڕوان لەکورد بکرێت بەو فۆرمە رازیبن بێ ئەوەی لەبەرامبەردا شتێکیان دەست بکەوێت.

## چارەسەرێکی تەوافوقانەی مامناوەند پێویستە

کەپرۆژەی نیشتمانی عیراقیی عەرەبی پرۆژەیەکی ئاشکرای دژ بە کورد بێت، ئیتر بۆچی چاوەڕوانی کورد بکرێت ئەجندەی ئەو پرۆژەیە لەئامێز بگرێت.لەگەڵ ئەوەشدا کورد بەشێوەیەکی لەرادەبەدەر بەرگەی ئەو بارگرانیەی گرتوە کە ئەو پرۆژە نیشتمانییە لەدوژمنایەتی بۆ کورد لەخۆیگرتووە. لەگەڵ ئەوەشدا گلەیی لەکورد دەکرێت لەسەر پەکخستنی کارنامەی نیشتمانی و زیادەڕۆیی کردنیان لەگرێبەستە نەوتییەکان و کەرکووکدا.

PDF 4 KURD

بەم هەڵسەنگاندنانە لەناوەڕۆکدا گریمانەی هەڵەی لـەخۆگرتووە سـەبارەت بـە کـورد و ئـەو پـەڕی داواکارییەکانیان کە گوایە ئاستەنگی سەرەکین لەبـەردەم گەیشـتن بـە ڕێککـەوتنێکی گونجـاو لەسـەر کەرکوك، کە لەڕاسـتیدا پێچـەوانەکەی ئـەوە ڕاسـتە. بـەجۆرێك کـورد ڕازیبـوون لەسـەر بیرۆکـەی دابەشکردنی دەسەڵات بەیەکسـانی لـەنێوان پێکهاتـەکانی کـەرکوك، بـەڵام ئەگـەر ڕێگـە بـدرێت کەرکوك بچێتە پاڵ هەرێمی کوردستان. لەئاستێکی تـری دیبەیتەکەشـدا نـوێترین چارەسـەر لەلایـەن بەرەی عەرەبی عێراقییەوە لەکەرکوك خراوەتە ڕوو بـێ ئـەوەی ئـەو چارەسـەرە جیاوازیـەکی ئـەوتۆی لەگەڵ چارەسەرەکەی بەرەی تورکمانیدا هەبێت، ئەویش بەمانـەوەی کـەرکوك لـەدەرەوەی هـەرێمی کوردستان و بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆشی لەلایەن حکومەتی عێراقییەوەو لەهـەمان کاتیشـدا دەسـەڵاتی سیاسی و ئیداری

لەسەر گشت ئاستەکان و بەپێی پرانسیپی تەواوی یەکسانی دابەش بکرێت.

بـەوجۆرە هەرسـێ پێکهاتەکـە پشـکی خۆیـان لـە(٣٢) کورسـی لەئەنجوومـەنی پارێزگاکـە بەدەستدەهێنن و ساڵانەش بەنۆرەو بەدوای یەکدا پۆستی پارێزگا وەردەگرن. کـەوابوو ئـەو چارەسـەرەی کەعەرەب بۆ دەرچوون لەو بازنە داخراوەی کە پرسـی کـەرکوك دروسـتیکردووە، نەسـازاندنە لەسـەر هیچ شتێك.

هەڵبەت هەرگیز کورد بەو چارەسەرە ڕازی نابێت و پێویستیشە ڕازی نەبن. لەگەڵ ئەوەشـدا ئەمـە بەگشت هێڵە سەرەکی و گشتییەکانیەوە بەجۆرێك لەجۆرەکان ئەو چارەسـەرەیە، کـە لەلایـەن زۆرێـك لەشارەزایانی خۆرئاوا وەك تەوافوقێکی میانگیرانە لێی دەڕوانن و هانی دەدەن. بەواتایـەکی تـر بـەپێی ئەم چارەسەرە کورد دەستبەرداری هەمووشتێك ببێت. بەڵام ئەو کەسانەی کە لەدەستەواژەی تـەوافوقی مامناوەند(میانگیر) تێناگەن ئەوا پێناسەی فەرهەنگیی بۆ ئـەو دەسـتەواژەیە بریتیـە لـە" یـەکلایی کردنەوەی ململانێکان لەڕێگەی ئەو تەنازولکردنانەی کە هەردولا یان سـەرجەم لایەنـەکان پێشکەشـی دەکەن". هاوکـات دوو ڕەهەنـدی یـەکلایی کـەرەوە بـۆ چارەسـەری تـەوافوقی میانگیرانـە لەپرسـی کەرکووکدا هەن.

ڕەهەندی یەکەم، پەیوەستە بەپێگەی ئیداری( لەنێو هەرێمی کوردستان یان لەدەرەوەی هەرێم).

دووەم، پەیوەستە بەبەڕێوەبردنی (دابەشکردنی دەسەڵات یـاخود دەسـەڵاتی زۆرینـە). چارەسـەری تەوافوقی میانگیرانەش پەیوەستە بـەو تەنازولکردنانـەی کەهەریـەك لـەو دوو ڕەهەنـدەدا پێشکەشـی دەکەن.

کوردسیاسیانە دەتوانێت دەست بەسەر کەرکووکدا بگرێـت یـان ببێتـە کـەرکوك ببێتـە بەشـێك لەهەرێمی کوردستان بەڵام ناکرێت چاوڕوانی هەردوکی بێت پێکەوە.

هەروەها دەكرێت نـەیارانی كـوردیش دەسـەڵات لەگـەڵ كـورددا بەیەكسـانی دابـەش بكـەن یـان دەسەڵاتی سیاسی رادەستی كورد بكەن لەبەرامبەر مانەوەی كەركوك لەدەرەوەی هەرێمی كوردسـتان. دابەشكردنی دەسەڵات بەیەكسانی لەنێو هەرێمـدا یـان دابەشـكردنی دەسـەڵات لـەدەرەوەی هـەرێمی كوردستاندا. ئەمانە دوو چارەسەری مامناوەندو راستەقینەی ئەم پرسـەن و ئەوانـەش كـەدژی هـەردو چارەسەرەكەن ئەوا پرسی كەركووك پشتگوێ دەخەن و لەبەرژەوەندی راستەقینەی ئەواندا نییە پرسـەكە بەشێوەیەكی تەوافوقیی میانگیرانە چارەسەر بكرێت.

بەڵام ئەگەر لەبری ئەو چارەسەری تەوافوقی، چارەسەرێكی تر هەبێت و یەكێك لەلایەنەكان بەسەر ئەویتردا بیسەپێنێت ئەوا دەبێت ئەو لایەنەی كە چارەسەری تەوافوقیی میانگیرانەی گەرەك نییە ئـەوە روونبكاتەوە كەبۆچی چارەسەری سەپێنراو لەرێگـەی توندوتیژییـەوە لـەرووی پراگمـاتی و مۆراڵییـەوە لەچارەسەری تەوافوقیی باشترە.

دیارە ئەم بەهانەیە لەخزمەتی کورددا نییە و دەچێتە خانەی نـەیارانی کـوردەوە بـەڵام ئـەوەی کـە خزمەت بەکورد دەکات هۆکارەکەی ئەوەیە کە بەهانەی کورد سەبارەت بـە كـەركووك جاپشـت بـە بنەمای مۆراڵی یان مێژوویی یـان جوگرافیـایی و دانیشـتوان و دەسـتووریی ببەسـتێت بەهانەیـەكی بەهێزترە بەبـەراورد بـەهی پێكهاتـەكانی تـر و بـەبێ بەشـداریكردنی كـوردیش لەهـەر چارەسـەرێك لەداهاتوودا خوێن رشتنی زۆر و جیابوونەوەی كوردی لێدەكەوێتەوە.

رەنگە بەهانەی بەهێزتریش هەبن كە دەچنە خانەی بەرگریكردن بـە هەڵوێسـتی كـورد بـەڵام ئـەم كتێبە نایەوێت لێرەدا پێشكەشی بكات، چونكە پرسی كـەركووك لەرێگـەی تـەوافوقی میانگیرانـەوە یاخود توندو تیژییەوە چارەسەر دەبێت.

جـا ئەگـەر بخوازێـت تونـدو تیـژی بـەدوور بگیرێـت ئـەوا پێویسـتە لەسـەر كـورد وەك لایەنـە پەیوەندیدارەكانی تر ئامادەبن بۆگەیشتن بەچارەسەری تەوافوقی مامناوەند تەنازول بكەن.

